نیوەندی AWDER بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# صدام حسين

## لەگرتوخانەی ئەمریکیدا

# ئەوەی کە ڕوویدا؟!

٧

چاپی دووەم 2010

بیرەوەرییەکانی
خەلیل دلێمی لەگەڵ سەدام حوسێند

- چۆن بەغدا داگیر کرا؟
- چیرۆکی گرتنەکەی چییە؟
- نهێنییەکانی عێراق و درۆکانی ئەمریکا
- بۆچی بڕیاری لەسێدارەدانی دواکەوت؟



پارێزەر: خليل دليمی

وەرگێڕانی
شەماڵ محەمەد

238 posts 19.2k followers 7 following

Promote | Edit Profile

پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVslbo_

Ktebi_PDF

ناوی کتێب : با لێبوردە بێت

ناوی کتێب : سەحەر

ناوی کتێب : زیانی پێغەمبەران

ناوی کتێب : بۆ کوڕان و کچانم 50 مۆم

ناوی کتێب : گورزەیەک بۆ یادگرتنەوەی رابردوو




پارێزەر خەلیل دلێمی

سەرۆکی دەستەی پارێزەرانی صەدام حسێن و هاوەڵەکانی


## صەدام حسێن

## لەگرتوخانەی ئەمریکیدا

# ئەوەی کەڕوویدا


نوسینی: خەلیل دلێمی

وەرگێڕانی: شەماڵ محەمەد



سلێمانی ٢٠١٠

پێناسی کتێب

ناوی کتێب: ئەوەی کەڕوویدا لەگرتوخانەی ئەمریکیدا

بابەت: بیرەوەری

نوسینی: خەلیل دلێمی

وەرگێڕانی: شەماڵ محەمەد

تایپ: لاوەند ئەحمەد

دیزاینی بەرگ: سکای دیزاین

نرخ: (٧٠٠٠)هەزار دینار

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

شوێنی چاپ: چاپخانەی چوارچرا

ساڵی چاپ: ٢٠١٠ سلێمانی

ژمارە سپاردنی ( ١٠٠١ )ی ساڵی (٢٠١٠)ی وەزارەتی رۆشنبیری سلێمانی وەرگرتووە.

## پێشەکی

لەدنیایی ئەمڕۆدا کاری وەرگێڕان یەکێك لەبنەماکانی ئەدەبی گرتووەو بووەتە دیاردەیەکی بەرچاوو پێشکەوتوو لەکتێبخانەی جیهانیدا...

هەربۆیە ئێمەش بەپێوستمان زانی یەکێکی تر لەو کتێبانە بخەینە نێو کتێبخانەی کوردییەوە...

کتێبی (سەدام لەگرتووخانەی ئەمریکیدا) ناونیشانی ئەم کتێبەیە، کەلەنوسینی (خەلیل دلێمی) پارێزەری سەدام حسێنە...

پێم خۆشبوو لەم پێشەکییە کورتەدا ئاماژە بەوە بدەم کەنوسینی ئەم کتێبە زیاتر لایەنگری حزبی بەعس و سەدام حسێنی پێوە دیارە، ئەتوانم بڵێم ئەم کتێبە زیاتر پیاهەڵدانە. چونکە لەسەر بنەمای فکرێکی عەرەبی شۆڤێنی کۆنە پەرستانە نوسراوە، ئەوانەی جگە لەخۆیان بڕوایان بەلێکدانەوەو بیرو ئایدۆلۆژیایی کەسی تر نیە...

من دەمەوێت لەکۆتایدا ئەوە بڵێم کەوەرگێڕانی ئەم کتێبە هیچ پەیوەندییەکی بەشێوازی بیرکردنەوەو ئینتیماو سروشتی وەرگێڕەوە نیە، تەنیا ئەوەندەبێت ئەم کتێبەم وەرگێڕاوە تاوەکو گەلی کورد بزانن شێوازی بیرکردنەوەی ئەو عەرەبە شۆڤێنیانە چۆنە؟ و ئامانجیان چیە؟

وەرگێڕ

## پێرست

## بەرایی
## ئەم کتێبە بۆ

لەسەرەتاوە خاکی نێو دووزێ، لەسەرەتاوە خاکی عێراق مەزن بووە، وڵاتی شارستانیەکان لەگەڵ سۆمەرییەکان‌و پیتەکانی نووسیندا گەشاوەتەوە، شارستانیە یەک لەدوای یەکەکانی کە پاشماوەی بەنرخی لەسەر ئەم خاکە، خاکی دووزێ جێهێشتووە، هەموو گەواهییەکان باس لەگەلێك دەکەن کاری کردووەو هیلاك بووەو هەوڵیداوە، کەهەموو جیهان زانیارییان لەوڵاتی ئەم دوو زێ نەمرەوە وەرگرتووە، دیجلەو فورات، عێراقی دەروازەی نەتەوەی خۆرهەڵات‌و پارێزەری، لەهەموو لایەکەوە بەرەو ڕووی داگیرکاری بووەتەوە، لەسەر ئەم خاکە کەوتنی چەندان دەوڵەت‌و مەملەکەتمان بینیووە.

لەسەردەمی نوێدا عێراق پەرەسەندن‌و گەشەکردنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینیووە، هەر لەڕووی ئابوری‌و مرۆیی‌و ڕۆشنبیری‌و تەندروستی‌و سەربازییەوە، پاش خۆماڵی کردنی نەوتەکەی، ئەم سامانە کەوتە دەست نەوەکانی، کە پێشتر بەدەست بێگانەوە بوو، نەخوێندەواری لەناوبرد، جیهان شاهیدی بۆ پەرەسەندنی بواری تەندروستی‌و تەکنۆلۆژی دەدەن، سوپایەکی پێکەوە نا کە چوارەم سوپا بوو لە جیهاندا لە ڕووی کەل‌و پەل‌و تواناداد، لەجەنگێکی بێوێنەدا بەسەر سەرسەختترین دوژمندا سەرکەوت.

کوردەکان باشترین مافیان لەچاو بەشەکانی تری کوردا بەدەستهێنا بوو، ئەم قۆناغە پەرەسەندنێکی گەورەی پیشەسازی بەخۆوە بینی، شۆڕشێکی زانستی مەزن، ئەگەرچی ئەم تافە بە قورسترین تافی مێژووی عێراقی نوێ دادەنرێت،ئەو تافەش دەکەوێتە نێوان ساڵانی ١٩٦٨ بۆ ٢٠٠٣، جەنگێکی درێژخایەنی هەشت ساڵی، جەنگێکی جیهانی لە ساڵی ١٩٩١، گەمارۆی ئابووری کە زیاتر لە سیانزە ساڵی خایاند، پاشان جەنگی داگیرکاری ئەمەریکی‌و بەریتانی‌و زایۆنیزم‌و ئێران، ڕووداوە خوێناویەکان، کە سەرۆك صەدام حسێن لەم کتێبەدا بە دیکۆمێنت باسی لێوە دەکات.

لە ساڵی ٢٠٠٥ پێشنیاری ئەوەم بۆ سەرۆکی دیل لە زیندان کرد، دەست بکات بە نووسینی یاداشتەکانی تا بڵاوی بکەینەوە، سەرۆك لەسەر بیرۆکەکە ڕازی بوو، هانی جێبەجێکردنی دام، بەڵام پاسەوانە ئەمەریکیەکان هەموو ئاڵوگۆڕێکی کاغەزیان لێ قەدەغە

کردین تاکو بەهاری ساڵی ٢٠٠٦، سەرۆك متمانەو باوەڕی بە ئەمەریکیەکان نەبوو کەڕێگەی بدەن یاداشتەکانی بنووسێتەوەو بڵاوی بکاتەوە، بەڵام بۆ فکرەکە زۆر بەپەرۆش بوو پێی ووتم (( زۆر پێویستە یاداشتەکانم تۆمار بکەم، تەمەن بەدەست خودایە، چەندێك دەرفەتم هەبێت‌و یادەوەریم یارمەتیم بدات بۆتی دەگێڕمەوە تاکو تۆماری بکەیت)).

پێش ئەوە، لە یەکێك لە دانیشتنەکانی لێکۆڵینەوەدا کە لایەن دادوەر منیر حەدادەوە بەڕێوە دەچوو، سەرۆك هەندێك کاغەزی پێدام کە یاداشتەکانی بوو بەدەستی خۆی نووسیبووی، بەڵام کاپتن مایکل ماکۆی (بەڕێوەبەری نووسینگەی پەیوەندی ئەمەریکی) داوای لە سەرۆك کرد کاغەزەکان بدات بە دادوەر، کەوەریگرت بەڵێنیدا پاش ئەوەی دەیانخوێنێتەوە بۆم بگێڕێتەوە، تاکو لەناوەڕۆکی دڵنیا بێت، بەڵام بەڵێنەکەی خۆی بەجێ نەهێنا، کاتێك سەرۆك لە چارەنووسی کاغەزەکانی پرسی، پێم ووت، زۆر تووڕە بوو، پاشان ڕێکەوتین کە یاداشتەکان چەندجار بنووسێتەوەو زۆریان بە ئیمزاو خەتی خۆی دزە پێبکات.

بەم شێوەیە بەڵێنم بەخۆمدا وەك چۆن سەرۆك ئەو بەرپرسیاریەتیەی پێدام کە هەقیقەتی ئەوەی پێش داگیرکاری بەسەر ئەم وڵاتە خۆشەویستەدا هاتووە بگەێنم، ئەویش لەسەر زمانی سەرۆکی شەرعی وڵاتەوە، هەر لەسەرەتای منداڵیەوە تاکو وەرگرتنی سەرکردایەتی تا دەگاتە قۆناغی بوونیادنان‌و ئەو قۆناغە سەختەی عێراقی پێدا تێپەڕی بەتایبەتی لە کاتی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە لە ساڵی ٢٠٠٣، هەروەها ئەو ڕۆژانەی دواتر هاتن کە مێژووی عێراق هەرگیز ئەوەندە قەساوەتی بەخۆیەوە نەبینیوە لەلایەن داگیرکەران‌و هاوپەیمانان‌و دواکەوتووانی ئەوان، لە وەحشیەت‌و تاوانکاری‌و کینیان لە عێراق‌و گەلەکەی، لەلایەکی ترەوە باسی ئازایی‌و جوامێری‌و قوربانیدان‌و خۆڕاگری گەلی عێراق‌و چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکاری.

بەڵێنم بە خۆمدا کە لەگواستنەوەی ئەوەی دەیگێڕێتەوە ئەمین بم، ئەوەی بەبیری دێتەوەو دەیەوێت بۆ گەل‌و نەتەوەکەی بگوازێتەوە، ئەمە جگە لەوەی وەڵامی زۆرێك لە پرسیارەکانی دەدامەوە، زۆری لێدەکردم هەرچی دەڵێت تۆماری بکەم‌و وەك خۆی بیگێڕمەوە، لەبەر ئەوەی لەو بڕوایەدا بوو، ڕۆژێك دێت ئەمریکاییەکان لەڕووی جەستەییەوە لەناوی دەبەن، شێوەی گێڕانەوەی یاداشتەکان، هەڵبژاردنی خانەی

بڵاوکردنەوەکەی بۆ خۆم بەجێهێشت، پرسیاری ناونیشانی کتێبەکەی لێکردم، پێم ووت زۆرێك ناونیشانم لا گەڵاڵە بووە.

یەکەمیان (دادپەروەری لەپشت شیشەکانی زیندانەوە)، پێشنیاری ئەم ناونیشانەی کرد، بەڵام پێم ووت لەوانەیە ئەم ناونیشانە بۆ هەموو ئەوانە باش بێت کەلەناو دادگادا ڕوودەدەن، کاتێك سەربەستی ناونانی کتێبەکەی بۆ جێهێشتم، کە پەیوەستە بە یاداشتەکانی کە بۆی گێڕامەوە.

ئەوەتا یاداشتەکانی سەرۆك صەدام حسێنتان بۆ دەگێڕمەوە، ئەو یاداشتانەی لایەنێکی بنەڕەتی ژیانی عێراق‌و کاروانی دەوڵەتی نیشتمانی بۆ ماوەی چل ساڵ پێکدەهێنێت، لەهەموو قۆناغەکانی بەرەنگاربوونەوەو بیناکردن‌و بەرگریکردن لە نیشتمان کە بەر لە دوژمنکاری ١٩٩١ دا ڕوویانداوە، واتە پاش داگیرکاری‌و قۆناغی بەرگریکردن لە دژی داگیرکاری.

ئەم لاپەڕانە بەڵگەنامەیەکی گرنگە، پێشکەشی گەلی عێراقی دەکەم، بۆ ڕۆڵەی نەتەوەی عەرەب‌و ئیسلام‌و ڕای گشتی جیهانی، هەروەها بۆ مێژوو پێشکەشی دەکەم تاکو هەمووان ئاگایان لە حیکمەتی مێژووی سەرۆك صەدام حسێن بێت، کە سەرکردەیەکی عێراقی‌و عەرەبی‌و موسڵمان بوو، صەدام حسێنی موجاهیدو باوەڕدار، کە ژیانی خۆی کردە قوربانی نیشتمان‌و بیروباوەڕو عەقیدەی نیشتمانی عەرەبی ئیسلامی.

زۆرێك لە پیاوانی سیاسەت‌و یاساو ئاداب‌و هاوڕێیان‌و هاوەڵانی ویستیان دەربارەی صەدام حسێن بنووسن، بەڵام لە پانتاییەکی بەرتەسکدا، بەڵام تەنها ووتەیەکی خاوەن دەڵالەت‌و ڕەمزیەتی بەرز نەبێت کە ڕۆژنامەنووسێکی گەورەی عێراقی نووسی، کە یەکێك بوو لە بەرهەڵستکارەکانی سەرۆك‌و ڕژێمی بەعسی.

تێبینیەك بۆ خوێنەری بەڕێز، یەك کتێب جێگەی یاداشتە زارەکیەکانی صەدامی تێدا نابێتەوە یان نووسراوەکانی کەسەدەها لاپەرە دەبن،ئەمە جگە لە شیعر کە نزیکەی هەزار بەیتی نووسیوە، لەبەر ئەوە لەم کتێبەدا تەنها یاداشتە زارەکیەکانی بڵاو دەکەمەوە.

یەکێك لە یاساناسەکان دەڵێت:(مرۆڤ ناتوانێت کتێبێك لەو ڕۆژەیدا بنووسێت، ئەگەر باسی سبەینێی نەکات، ئەگەر ئەمەی گۆڕی باشترە ئەگەر ئەمەی زیادکرد ئەوا باشتربوو، ئەگەر پێش ئەمە بکەوێت ئەوا باشترینە، ئەگەر وازی لەمە بهێنایە جوانتربووە، ئەمەش

مەزنترین گوزارشتە، کە بەلگەیە بۆ دەست بەسەراگرتنی سەرجەم مرۆڤایەتی).

ئەوەی لە دووتوێی ئەم کتێبەدا پێشکەشی دەکەین دانراوێك یان چیرۆکێك یان ڕۆمانێك نییە، بتوانین گوزارشتو ووشەکانی بگۆڕین، بەڵکو ئەمە گەواهینامەیە، بەڵکو دیکۆمێنتێکە، کەناشێت شیکردنەوەو ڕاڤەو گۆڕانکاری بۆ ووشەکانی بکەین، ئەمە گەواهییە لەسەر زمانی یەکێك لەوانەی مێژوویان دروست کرد، مێژووی عێراقی نوێ، بەلگەنامەیەکە باس لەو زوڵمەتە دەکات کە بەسەر عێراقی مەزندا هاتووە، ئەو پیلانانەی بەدزیو ئاشکرا لەدژی گێڕراون، ئەم کتێبە بەو پەڕی ئامانەتەوە دەگێڕمەوە، هەندێك شتی گرنگ هەیە لەو کاتەی دۆخی عێراق گونجاو بوو باسی لێوە دەکەین، لەوانە هەندێك شت هەیە کە پەیوەستە بە کەسایەتی سەرۆك صەدام حسێنەوە.

لێرەدا سوپاسو پێزانینی خۆم بۆ هەموو ئەوانە دەردەبڕم کە بەشداریان لە بلاوکردنەوەی ئەم کتێبەدا کرد، هەموو ئەوانەی بەفکرێکی پاك هاوکاریان کردم کە کاری دەرهێنانو پێداچوونەوەو ڕێکخستنو کاری کۆتایی بلاوکردنەوە، هەزار سلاویان پێشکەش دەکەم، پایەداربن بۆ خزمەتی عێراقی خۆشەویست.

**پارێزەر خەلیل دلیمی**

**سەرۆکی دەستەی بەرگریکاران**

ئەمە نمونەی شیعرێکی صەدام حسێنە کەبۆ خەلیل دلیمی نوسیوە

لەبەرئەوەی لەمانای راستەقینەی شیعرەکە لانەدەین بەپێویستمانزانی وەکو خۆی بلاوی بکەینەوە.....

## من صدام حسين
## الى محاميه خليل الدليمى

مساء ٦/٣/ ٢٠٠٥

شحت أخلة وتقدم بها خليل      وكل على محتده والأصول
من ذى أصل يجب الغيبة عنه      وتزهو فروعه به والفضول
وأثر بائن يلحقه بنائلة لا      يتردد في دمه أو يميل
هكذا خليلنا عطر وعافية ومن      مثله بالمسك مغمس مأهول
يا دليل المبادى ء مجيئك صادق      ماء عذب دونك ماء سحول
للقلب شارة يعطيها عن صاحبه      نغنى به وهو الأمين الدليل
ينبينا القلب لو عزت تفاصيل      لنا به صول وهو بنا يصول
فما كلت عواتقه في مهمة      صبور في الصعب سخي حمول
لنا شمعة في كل دار شريفة      تعرف الحق ولها به صهيل

# صەدام حسێن لەتەرازووی مێژوودا

بەپێنووسی (دیلێك لەهەڤالانی صەدام حسێن)

ئەگەر مێژووی ڕووداوەکانی سەدەی بیست بە ویژدانەوە بنووسرێت، ئەوا صەدام حسێن وەك مەزنترین سەرکردەی ئەو سەدەیە باس دەکرێت، ئەگەر مێژووی نەتەوەی عەرەب لەو قۆناغەدا بنووسرێتەوە، صەدام حسێن وەك یەکێك لەو دوو سەرکردە عەرەبیە مەزنە باسی لێوە دەکرێت، کە یەکەمیان (جەمال عەبدول ناسرەو دووەم صەدام حسێنە).

ئەو هەموو تۆمەتو خراپەکاریانەمان بینی کە ئاراستەی جەمال عەبدول ناسر کرا، چ لە ژیانیداو چ لە مردنیدا، زۆر لەوە قورسترو دژوارتر ئاراستەی صەدام حسێن کرا، صەدام حسێن بە دیکتاتۆرو جەلادو ئەو سەرکردەیەی وڵاتەکەی نوقمی چەندەها جەنگ کردو بەوە تاوانبارکرا کە سەدەهاو هەزارەها عێراقیو ئێرانیو هتدی بە کوشتدا، هەروەها هەموو سامانی وڵاتەکەی لەم سەرکێشیانە بەهەدەر بردو لە بوونیادنانی کۆشكو شتی لەو جۆرەدا خەرج کرد، ئەمانەو چەندەها تۆمەتی ترکەلای ئێمە شاراوە نییە، لەو پێوەرانەی لە ژیاندا هەڵە ناکەن، لە هەڵسەنگاندنی سستمی حوکمی کۆنو نوێ، دەبێت ئەوە بزانین کە ئەم جۆرە تۆمەتانە لە عێراقیو عەرەبو بێگانە دەیخەنە پاڵی، لەوانەیە پێوەری ڕاست بێت بۆ زانینی ئەو هەقیقەتە وەك شاعیری گەورە ئەبو ئەلتەیب ئەلموتەنەبی دەڵێت:

واذا اتتك مذمتي من ناقص فهي الشهادة لي باني كامل

(واتە ئەگەر دوژمنەکەم بەکەمو کورت باسم بکات، ئەوە ئەمە گەواهی ئەوە دەدات کەمن کامڵم).

سوارچاکانی ئەم ڕێبازە کێن کە چەند دەیەیەکی ئەم زەمەنەی خایاندو تاکو ئێستاو پاش صەدام حسێن بەردەوامە ؟

یەکەمین کەسانێك لەوانە، سەهیۆنیەکانو سەرکردەکانی ئیسرائیلو پیاوانی ڕاگەیاندنو

پروپاکەندەو لایەنگرانیان لە بێگانە، بەتایبەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەوروپا، ئەگەر ئەم ڕاستیە بزانیت، دەتوانیت بە ئاسانی هۆکارەکانی بزانیت، ئەمانە بەسەر صەدام حسێندا دەگونجێن وەك چۆن بەسەر جەمال عەبدول ناسردا دەگونجان.

زایۆنیزم‌و ئیسرائیلیەکان‌و هاوپەیمانەکانیان، درکیان بەوە کردبوو جەمال عەبدول ناسرو صەدام حسێن دوو سەرکردەی عەرەبی ترسناکن بۆ ئیسرائیل، هەر یەکەیان لە زەمانی خۆیدا دوژمنی یەکەمی ئیسرائیل بوون، ئەگەر ئەمە وابێت، ئەوا پێویستە ئەو دوژنمە تێك‌و پێك بشكێنرێت، با نمونەیەکی زۆر سادەتان بۆ باس بکەم، جەمال عەبدول ناسر پیاوێکی جوان‌و بالابەرزو خاوەن سیمایەکی جوان بوو، هەرکەس تەماشای بکردایە خۆشی دەویست، هەروەها صەدام حسێنیش کە جوانترین پیاو بوو لەڕووی بالاو سیماو قامەتەوە، ڕۆژنامە خۆرئاواییە زایۆنیەکان‌و ڕۆژنامەکانی دژی عەرەب بەناچاری جارجار وێنەی ئەو سەرکردەیەی بلاودەکردەوە، بەلام هەمیشە چەکی کاریکاتێر ئامادە بوو، سەدەها هێندەی وێنەکانی خۆیان بلاویان دەکردەوە، بەلام کە تەماشای سیمای کاریکاتێرەکانی ئەم دوو سەرۆکە دەکەیت، پیاوێکی سیما دڕندە دەبینین، خاوەن جەستەیەکی لاواز خاوەن تێڕوانینێکی تۆقیو، کاریکاتێر دەربارەی جەمال عەبدول ناسرو صەدام حسێن بۆ ئەوە داواکراو بوو تاکو خەلك بەتایبەتی لە خۆرئاوا بەو شێوەیە ببینن، کە ئەمانە بوونە هۆی مەترسی بۆ سەر زایۆنیزم‌و ئیسرائیل، دەبوایە بە دڕندەیی‌و ناشرینی‌و سروشتی خراپ وێنا بکرانایە، بەم شێوەیە جوانترین سەرکردە عەرەبەکانی سەردەمی خۆیان بوون بە ناشرینترین پیاو.

لەگەڵ ئەو ڕك‌و کینەی جولەکە لەبەرامبەر صەدام حسێن‌و جەمال عەبدول ناسر هەیانبوو، تاکو ئێستاش ئەو ڕکەی یەهودیەت لە عێراق هەر بەردەوامە، کە ئەم ڕك‌و کینەیە بۆ سەردەمی نەبو خوز نەسرو بابلیەکان دەگەڕێتەوە، لەوانەیە بلێن ئەم قسانە دوورن لە ڕاستی‌و پەرگیرانەیە، بەلام هەقیقەتە، ئەو کردەوەیەی ئیسرائیل بۆ پالاوگە ئەتۆمیەکانی عێراق ئەنجامیدا سالی ١٩٨١، ئەو کاتە سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل (بیگن) ناوی بابلی لێنا،وەك بیرهێنانەوەیەك کە جولەکە لەسەردەمی نەبو خوز نەسردا هاتوونەتە بابل.

لەگەڵ ئەو کینەی جولەکە لە عێراق هەیبوو کە هۆکارەکانی ئاشکران، فارسەکان هەمان کینەیان هەبوو لە دژی عێراق‌و پاشان لە صەدام حسێن، فارسەکان بەدرێژایی مێژوو

هەوڵیانداوە دەست بەسەر وڵاتی دووزێدا بگرن، بەرلە هاتنی ئیسلام فارس دەستی بەسەر عێراقدا گرتبوو، لەجەنگی قادسیەدا عەرەبو ئیسلام عێراقیان لەژێر دەستی فارسەکان ڕزگار کردبوو، لەوانەیە هەندێك بپرسن ئەمە چ پەیوەندیەکی بەکۆماری ئیسلامی ئێرانەوە هەیە، من دوو بنەمای بنەڕەتیتان بۆ باس دەکەم، یەکەمیان: ئەو خەونە ڕەگەز پەرستیە فارسیەی کەتاکو پاش دامەزراندنی ئەو کۆمارەی ناوی ئیسلامی لێنرابوو هەرمابوو، دووەمیان: سروشتی ئەوەی بەکۆماری ئیسلامی ئێرانی ناسرابوو، لەوانەیە هەندێك وابێتە پێش چاویان ئێران لەبەر جەنگی هەشت ساڵە ڕکیان لەصەدام بوو، بەڵام کاتێك خومەینی بەر لەشۆڕش لەپاریس بوو، ڕۆژنامەنووسێکی بیانی لێی پرسی دووژنەکانی ئێوە کێن ؟ خومەینی وەڵامی دایەوە: دووژمنەکانم ئەمریکاو شاو صەدام حسێنە، صەدام حسێن ئەوکات هێشتا جێگری سەرۆك کۆمار بوو، جەنگی عێراقو ئێران هێشتا ڕوونەدابوو، لەبەر چی خومەینی عێراقو صەدام حسێنی کردبووە ئامانج، لەکاتێکدا صەدام حسێن جێگری سەرۆك بوو، کەدەزانرا لەوکاتەدا سەرۆکی ڕاستەقینە خۆی بوو، هۆکاری دووەم بۆ ئەو تیۆرەی خومەینی دەگەڕێتەوە کە ڕژێمەکەی لەسەر بوونیاد نابوو (تیۆرەی ولایەتی فەقێ) و دەبێتە جێگری ئیمام مەهدی چاوەڕوانکراو، دواتر دەبێتە سەرۆکی هەموو موسڵمانە شیعەکانی جیهان،بەبێ ئەمە ناتوانێت ببێتە جێگری ئیمام مەهدی چاوەڕوانکراو، هەروەها فقهی فارسی ناتوانێت ببێتە سەرکردەی شیعەی جیهان، تەنانەت ئەگەر ببێتە حاکمی ئێرانیش، ئەگەر کۆنترۆڵی سەنتەری سەرەکی نەکات کە ڕەمزەکانی مەزهەبی شیعەی (جەعفەری) پێکدێنن، ئەوانیش نەجەفو کەربەلاو کازمیەو سامەڕایە،جێگری ئیمام دەبێت ببێتە سەرۆکو مەرجەع لەو پێگە ڕەمزییە سەرەکیانەدا، ئەم پێگانەش هەمووی پێگەی عێراقین، دەبێت دەستی بەسەردا بگیرێت تاکو سیفەتەکانی جێگری ئیمامی مەهدی تەواو بکات، کەواتە دەبێت حزبی بەعسو سەرکردایەتیەکەی لەعێراق لەناو بەرێتو دەست بەسەر ئەم ناوچانەی عێراقدا بگرێت، ئەم ئامانجانە زۆرێك لە هەڵوێستو هاوپەیمانی نێوان هەردوو پارتی شیعی (دەعوەو ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی) دەردەخات لەگەڵ هەردوو پارتی کوردی (دیموکراتیو یەکێتی نیشتمانی کوردستان) ئەم ئامانجە شیدەکاتەوە، مادامەکی ئەو دوو پارتە کوردیە ئامادەن دەسەڵات بدەنە دەست ئەم دوو حزبە جەعفەرییە لەو پێگە ڕەمزیە سەرەکییە، لەبەر ئەوە ئەم دوو پارتە شیعیە جەعفەریانە بەلایانەوە گرنگ نییە ئەوەی لە عێراق دەمێنێتەوە بیدەن بەهەردوو حیزبە کوردیەکە،

ئەوەش ئەو هەڵوێستانەی سەبارەت بە کەرکوکو موسڵو دیالە هەن ڕوون دەکاتەوە.

ئەوەی لای جولەکە گرنگە کەسێك نەمێنێت لە عێراق پەیکەرێك بۆ نەبو خوز نەسر دابنێت، کە ئیسرائیلی داگیرکردو جولەکەکانی ئاوارەی بابل کرد، یان پەیکەرێك بۆ صەدام حسێن نەبێت کەبەدەنگی بەرز لەدوا ڕۆژەکانی ژیانیدا هاواری کرد (بژی فەلەستینی ئازادی عەرەبی لەڕووبارەوە بۆ دەریا) ئەوەی لای فارسەکانو لایەنگریان گرنگە بوونی ڕابەرە (کە دەبێتە جێگری ئیمام) سەرکردەی بێ ڕکەبەری سامەڕاو کازمیەو نەجەفو کەربەلا، پەیماننامەیەکی شاراوە لەنێوان ئێرانو ئەمریکای زایۆنیزمی لەسەردەمی بۆشو ئیسرائیلدا لەگەڵ شوێنکەوتووانی خومەینی لە عێراقدا هەیە.

بارودۆخی ئێستام لەبەر چەند هۆکارێك ڕێگەم نادات هەموو شتێك بڵێم، بەتایبەتی سەبارەت بە جەمال عەبدول ناسرو صەدام حسێن، لەبەر ئەوەی من لە پیاوەکانی ئەو بوومو زۆر لێوەی نزیك بووم، بەڵام سەرنجتان بەلای یەك ڕاستیدا ڕادەکێشم، ئەگەر بارودۆخ ڕێگەبدات لەوانەیە زیاتر ... پێنج ساڵ زیاتر بەسەر داگیرکردنی عێراقو روخانی ڕژێمی صەدام حسێندا تێپەڕیووە، ئەوانەی پاش صەدام و حیزبی بەعس هاتن لەئەمریکیەکانو عێراقیەکان دەڵێن ئێمە عێراقی نوێ پاش لابردنی دیکتاتۆریەتو ڕژێمی تاك حزب دروست دەکەین، من سەبارەت بەمە هیچ ناڵێم، بەڵام داوا لەهەموو چاودێران دەکەم بەشێوەیەکی بابەتیو شەریفانە، بەتایبەتی ئەوانەی لایەنگری صەدامو پیاوەکانی نەبوون، بەڵکو لە عێراقیەکانو عەرەبو بیانیەکان داوادەکەم تابلۆیەك بکێشنو بەراوردی ئێستاو سەردەمی صەدام حسێنو حزبی بەعس بکەنو بەم عێراقە نوێیە بەراوردی بکەن، گومانی تێدا نییە لە سیاسەتدا گرنگی پێدانی زۆرهەن، کە سیاسیەکان بۆ دەرکردنی حوکم پشتی پێدەبەستن، بەڵام لەژیاندا وەك حاڵەتی زۆرێك لەدەوڵەتان، هەندێك پێوەرهەن هەڵەو کۆشش قبوڵ ناکات لە هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی دەوڵەتان، جا ئەو کۆششکارە شیوعی بێت یان پێشکەوتنخواز یان کۆنەپەرست، دیموکراتخواز بێت یان دیکتاتۆر.

با تەماشای جیاوازی نێوان هەردوو دۆخی صەدام حسێنو پاش ئەو بکەین، ئەویش لە هەندێك کاروباری جەوهەریدا لە ژیانی خەڵکیو وەسفی سستمی حوکمڕانی.

یەکەم: ئاسایشی ناوخۆ، یەکەم شتێك هەموو گەلانی دنیا داوا لە حکومەتەکانیان دەکەن کە ئاسایشیان بۆ فەراهەم بکەن، هاوڵاتی لەماڵی خۆیدا بنوێتو هەڵسێتو بچێتە سەر کارو ئێوارە بەسەلامەتی بگەڕێتەوە، هەروەها ئەگەر سەردانی هاوڕێیەك یان خزمێکی

کرد یان حەزی کرد فلیمێکی سینەمایی ببینێت یان شانۆییەك یان لە چایخانەیەك دانیشێت .. چەندەها چالاکی مرۆیی تر .. کەس نکوڵی لەوە ناکات کە خەڵك لە عێراق لەماوەی سی ساڵدا چێژیان لە ئاسایشی تەواو وەرگرتووە، تەنها چەند ماوەیەکی کەم نەبێت لەسەرەتای جەنگ لەگەڵ ئێران یان ئەو ماوانەی ئەمریکا جەنگو بۆمبارانی عێراقی کردووە.

لەگەڵ بوونی ئەو هەموو کێشمە کێشمە سیاسیە زۆرەی هەبووە، ڕوویندداوە لە عێراقی سەردەمی صەدام حسێندا خەڵك هەڵبسێت لەخەو لاشەی کوژراو لەسەر شەقامەکانو سەرەنوێلکەکان. بەژمارەی زۆر ببینێتو دەسەلات بڵێت جەستەکان نەناسراو بوون، بۆ زانیاریتان لەعێراقدا هیچ کەسێکی نەناسراوی تێدا نەبووە، هەموو عێراقیەك ناوی لە فەرمانگا حکومییەکان تۆمار کرابوو، خاوەنی ناسنامە بوون، بەرواری لەدایکبوونو شوێنی نیشتەجێی تێدا نووسراوبوو .. هەروەها کۆمەڵێك زانیاری بنەرەتی تریش، ئەگەر ڕوویبدایە یەکێك لەو هاوڵاتیانە بە جەڵدەی دڵ بمردایە یان تووشی ڕووداوی هاتووچۆ یان کوشتن بهاتایە، پۆلیس لەچەند خولەکێکدا دەیناسیەوە لە خراپترین حاڵەتدا پاش چەند کاتژمێرێك دەیانناسیەوە.

ئەمە حاڵی عێراق بوو لە سی ساڵی حکومڕانی صەدامدا، بەڵام لەسەردەمی نوێدا کەپاش صەدام حسێنو حیزبی بەعس هات، عێراقیەکانو دەسەڵاتی ڕەسمی دەیەها لاشەی هاوڵاتیانی عێراقی فڕێدراو لەسەر شەقامو سەرەنوێلکەکاندا دەدۆزنەوە، دەسەڵات بۆ بەستەرەی مردووەکان دەیگوازێتەوە، بەبێ ئەوەی بزانێت بکوژو کوژراو کێیە، پاش چەند هەفتەو مانگێك، پاش ئەوەی بەستەرەکان پڕ دەبن، لاشەی مردووەکان دەبرێتە کەربەلاو لە گۆڕێکی بەکۆمەڵدا دەنێژرێن، کە گەورەترین گۆڕی بەکۆمەڵە لە عێراقدا، کە سوارچاکی تافی نوێ دەڵێن کە لەسەردەمی صەدامو بەعسدا پڕ بووە لەگۆڕی بەکۆمەڵ.

مرۆڤ تەنها لەسەر ئاسایش ناوەستێت کە نەبێتە یەکەم پێویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگا، جگە لە ئاسایشی ناوخۆ کە پاش صەدام حسێن بوونی نەما، هەندێك پێداویستی سەرەکی ترهەن، هەندێکی بۆ هەموو خەڵکە، هەندێکی تر عێراقیەکان لەسەری ڕاهاتوونو لەگەڵیدا دەژین، ڕاستە عێراقیەکان هەندێك شتیان لەدەستداوە، کەلەسەری ڕاهاتبوون، بەڵام کەی ئەمە ڕوویدا ؟ تەنانەت لەکاتی شەڕی درێژخایەن لەگەڵ ئێران کە هەشت ساڵی خایاند، ژیانی خەڵك لە عێراق باشربوو، باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە گەلی عێراق لەم جەنگەدا خۆڕاگربوو بەئازایانە دەجەنگا، لە کۆتایدا دەسەڵاتی ئێرانیان ناچارکرد واز لە

خەونەکانیان بهێنن جا ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت، ئەویش روخاندنی رژێمی نیشتمانیو کۆنترۆلکردنی عێراق بوو، عێراق لەم جەنگە هاتەدەرێ، گەر چی زۆرێك گرەوی ئەوەیان کردبوو ئەم جەنگە دەبێتە هۆی رووخانی عێراق، بەلام بەهێزو چوستی مایەوە.

ئاستەنگی ژیانی کە عێراقیەکان لەگەلیدا ژیان لەکاتی سەپاندنی گەمارۆی ئابوریەوە دەستی پێکرد، هەمووان دەزانن گەمارۆ لەپاش سالی ١٩٩١ سەپێنرا، کەپێشتر لە مێژووی نەتەوە یەککگرتووەکاندا وێنەی نەبووە، پێشتر سزا بەسەر دەولەتانی تردا سەپێنرابوو، بەلام ئەو گەمارۆیەی بەسەر عێراقدا سەپێنرا، پرۆژەیەك بوو ئامانجی خنکاندنو تێکشکاندنی عێراق بوو، ئاسانکردنی رووخاندنی رژێمە نیشتمانیەکەی بوو، پێویست ناکات بەلگەو گەواهی لەسەر ئەمە بهێنینەوە، لای هەمووان ئاشکرایە، پاش چەند سالێك لەو گەمارۆ گشتگیرە، گۆرانکاری لە هەلوێستی نێودەولەتیدا دروست بوو، لەو کاتەی ئەمریکاو بەریتانیا مومارەسەی ئەم سیاسەتەیان دەکرد، هەلوێستی رووسیاو فەرەنسا پلە بەپلە گۆرا، چیدی بەشداریان لەرووخاندنی رژێمدا نەدەکرد، لەبەر ئەوەی ئەمریکاو بەریتانیا خاوەنی مافی ڤیتۆ بوون لە ئەنجومەنی ئاسایش، لەبەر ئەوە زۆر بریار هەبوو دەرنەدەکراو بوونە هۆی ئەوەی گەمارۆ کەمنەکرێتەوەو لەبرگەی ٢٢ لە بریاری ٦٨٧ی تایبەت بەچەکی کۆکوژ قەتیس درا، بەلام سالانی دواتر گۆرانکاری سەری هەلداو بووە هۆی کەمکردنەوەی گەمارۆ، بەلام لە سالی ١٩٩٧دا چەند پێشکەوتنێك روویدا وایکرد عێراق بەشێوەیەکی ئاسانتر جولە بکاتو ئەمە لەسەر ژیانی خەلکی عێراق رەنگی دایەوە، بنەرەترین هەقیقەت لەم بارەیەوە لای سەرکردایەتی عێراق، لەگەل بوونی ئەو گەمارۆ دلرەقو گشتگیرەدا، زۆر هەولیدەدا قورسایی سەر شانی گەلانی عێراق کەمبکاتەوە، یەکەم شت کەتوانی بیکات هەلمەتێکی گشتی بێوێنە بوو بۆ ئاوەدانکردنەوەو چاککردنەوەی ئەوەی لە دوژمنکاریەکەی سالی ١٩٩١ دا تێکدرابوو، ئەو داگیرکاریەی وێنەی نەبوو، عێراق چی هەبوو هەمووی وێران بوو، بەو هۆکارو توانایەی هەیانبوو، عێراقیەکان بەرابەرایەتی صەدام حسێن دەستیان کردەوە بە ئاوەدانکردنەوە، ئەویش بەو توانا دیاریکراوەی عێراق هەیبوو.

جەنگی ١٩٩١ هەموو پردو رێگا سەرەکیەکانی عێراقی وێران کرد، وێستگەی کارەباو پالاوگەی ئاوو کارگەکانو تەنانەت کارگەی شیری مندال، بەلام عێراقیەکان بەهیمەتی خۆیان بەشێوەیەکی بێوێنە توانیان زۆرترین وێرانەی جەنگ ئاوەدانبکەنەوە، ئەم خالە بریتی بوو لە هەقیقەتی جەوهەری رژێمی صەدام حسێن، هەروەها لێرەدا هەقیقەتی

جەوهەری جیاوازی نێوان ئەمو ئەو ڕژێمەی ئەمریکا لە ٢٠٠٣/٤/٩ بۆ عێاقی هێنا دەردەکەوێت.

دووبارە ئاوەدانکردنەوە بڕیارێك نەبوو سەرکردایەتی دەریکردبێت، بەڵکو هەوڵێکی نیشتمانی گشتگیر بوو ملیۆنان عێراقی بەجۆشو خرۆشەوە بەشداریان تێداکرد، دەکرێت لەمەوە ئەوە تێبگەین پەیوەندیەکی تەندروست لە نێوان سەرکردایەتیو گەلدا هەبوو، بەتایبەتی توێژە ڕۆشنبیرەکەی لە زانایانو ئەندازیارانو دکتۆرو مامۆستای زانکۆو هەموو ڕۆشنبیرە عێراقیەکان، ئەگەر ڕژێمی دیکتاتۆری ستەمکار کە هێز لە دژی خەڵك بەکاردەهێنێت تاناچاریان بکات بەرد هەڵبگرنو شتێکی وەك هەرەمەکان دروست بکەن، ڕژێمێکی دیکتاتۆری قێزەون ناتوانێت گەل ناچار بکات دووبارە کارگەو پردو وێستگەی ئاوو تەلەفۆنو چەندەهای تری پێچاکبکاتەوە، ئەویش لەبارودۆخی گەمارۆی نێودەوڵەتی توندو گشتگیر.

بوونیادنانەوەی هەموو ئەم شتانە بەڵگەیە بۆ ڕۆحی نیشتمانی بەرز لای عێراقیەکان، هەروەها بەڵگەیە بۆ پەیوەندی تەندروستی نێوان گەلو حکومەت، ئێستا بۆ نمونە یەك پرد لە بەغدا بەهۆی کردەوەی تیرۆرستیەوە ڕوخاوە، بەڵام ساڵی ١٩٩١ دەیەها پرد لەبەغدادەوە بۆ بەسرە ڕووخابوو، بەڵام ئەو تاکە پردە تاکو ئێستا گیراوەو کەسی پێدا تێپەرنابێت، بەڵام ئەوکات بینای ئەو دەیەها پردە کرایەوە لە عێراق، بەڵام ئێستا عێراق لەژێر قورسایی گەمارۆی ئابووریدا نییە.

ئەمریکیەکان پڕوپاکەندەی ئەوە دەکەن یارمەتی عێراق دەدەن بۆ بوونیادنانەوەی وڵاتەکەیان، لە کاتێکدا داهاتی سەرچاوە نەوتیەکان بەشێوەیەکی خورافی زیاد دەکات، عێراق بەبێ هیچ لەمپەرێك دەتوانێت مامەڵە لەگەڵ هەموو جیهاندا بکات، بەڵام حکومەتەکانی ئێستا دەستەوەستانن لە دابینکردنی کارەباو ئاوی خواردنەوەو تەلەفۆن بۆ هاوڵاتی، کارگەکان لەبەرهەمهێنان کەوتوون، سەنتەرە زانستیو زانکۆییەکان تووشی داڕمان بوون، ئەندازیارو هونەرییەکان بەرەو دەرەوەی عێراق هەڵدێن، بەڵکو زۆرێکیان کوژرانو هەواڵیان وونبوو، لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی ئێستا ناوی خۆی ناوە حکومەتی دیموکراتیو لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردراوە.

ئەگەر بەراوردی حاڵەتی گەندەڵی لەنێوان ئیدارەی عێراق لە سەردەمی صەدام حسێنو بەم گەندەڵیەی کە ئێستا هەیە بکەین، دەبینین ئەوکات زۆر سنووردار بووەو قەبارەی

بچوك بووە، ئێستا گەندەڵی بەهەموو کەلێنەکانی دەوڵەت لە عێراقدا ڕۆچووەتە خوارێ، تەنانەت عێراق بووەتە نمونەیەك بۆ حاڵەتی گەندەڵی.

ئەم بارودۆخە لەنێوان دوو سەردەمدا، پێوەرێکمان دەداتێ کە گفتوگۆ قبوڵ ناکات لەنێوان فلأنە یان ئەو هەڵوێستی سیاسی، ئەمانە جیاوازی جەوهەرین لە سروشتی رژێمەکاندا کە ئەمریکا بۆی هێناوین لەگەڵ لایەنگران و بەکرێگیراوەکانیاندا، ئەوانەی خۆیان بۆ حوکمی عێراق هەڵبژاردووە هەر لە سەرەتای پێکهێنانی ئەنجومەنی دەسەلأت لەسەردەمی برێمەر تاکو ئەمڕۆ.

دەکرێت فۆرمی خۆراك پێوەرێکی بنەڕەتی بێت بۆ هەڵسەنگاندنی ڕژێمی صەدام حسێن بەم ڕژێمەی ئێستا، کە ئەو فۆرمە چ پەیوەندیەکی بەگەلی عێراقەوە هەیە، بەتایبەتی هەژاران، پاش دەرچوونی بڕیاری گەمارۆی ئابوری لە ١٩٩٠/٨/٢، صەدام حسێن بڕیاری دابینکردنی بەشە خۆراکی مانگانەی سەرەکی دەرکرد،لەخواردنە سەرەکیەکان وەك (برنج، شەکر، ئارد، چا، شیر، پاککەرەوە)، چەندان ماددەی خۆراکی تر کەلەدەستی دەوڵەتدا بوون، لەگەڵ بوونی گەمارۆو وشکبوونی سەرچاوەکانی دەوڵەت، ئەم فۆرمە بەردەوام بوو هەموو مرۆڤێك کە لەعێراق دەژیا لە عێراقیو عەرەبو هەندێك بیانی هەژار لانی کەمی پێداویستیە سەرەکیەکانی بۆ دابین کرابوو، حاڵەتی برسێتی لە عێراق ڕووینەدا، لە پاش ئەو ساڵانەی بەرنامەی نەوت بەرامبەر خۆراك جێبەجێ کرا، بەشە خۆراك گەیشتە (٢٠٠٠) کالۆری لەیەك ڕۆژدا بۆ هەر تاکێکی گەلی عێراق، بەرلە جەنگی کۆتایی ٢٠٠٣، صەدام حسێن بڕیاریدا بەشەخۆراکی سێ مانگی داهاتوو دابەش بکەن، ئەویش لەبەرامبەر ئەوەی لەکاتی هێرشو حاڵەتی پشێویدا کاریگەری خراپی نەبێت.

لەو کاتەی لایەنگرانی ئەوەی بە ڕژێمی نوێ ناودەبرێت لە خۆشیاندا سەمایان دەکرد، کاتێك دەبابەکانی ئەمریکا لە گۆڕەپانی فیردەوس پەیکەری صەدامیان دەروخاند، ئەو کاتە ئەوانو بەکرێگیراوەکانیان لەو بەشە خۆراکەیان دەخوارد کە صەدام حسێن پێی دابوون.

بەلأم بارودۆخی ئێستا چییە؟

یەکەم: گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق لابراوە، عێراق دەتوانێت نەوتو بەرهەمەکانیو کبریتو هەموو شتێك هەناردە بکات، هەروەها دەتوانێت بەبێ هیچ سانسۆرێك هەرچی بوێت بیکرێت بەبێ ئەوەی لیژنەی سزاکانی سەر بە ئەنجومەنی ئاسایش دەست بخاتە

کارەکانیانەوە، نرخی نەوت بەڕادەیەك بەرزبووەتەوە کە سەد دۆلاری بۆ بەرمیلێك تێپەڕاند، بەرپرسانی عێراقی نوێ دەڵێن کە داهاتی نەوتیان بۆ ساڵی ٢٠٠٨ گەیشتووەتە شەست ملیار دۆلار، لەوانەیە سەد ملیاریش بێت، بەڵام داهاتی عێراقیەکان لە نەوت نەگەیشتە سی ملیار دۆلار لەکاتی صەدامدا، بەتایبەتی پاش ئەو گۆڕانکاریانەی لە ئێرانی پاش ١٩٧٩دا ڕوویداو هەناردەی نەوت پەکی کەوت.

ئێستا پاش پێنج ساڵ لەو بارودۆخە گونجاوە بۆ حکومەت، فۆرمی خۆراك پەکی کەوتووە، زۆرجار ناگاتە دەستی ئەوانەی پێویستیان پێیەتی، یان کە دەیانگاتێ کەمو کورتە، زۆرجار بەشەخۆراکەکەیان هەمووی ماددەی ماوە بەسەرچوون یان ناشێت بۆ بەکارهێنانی مرۆڤ، ئەمانە هێچی نهێنی نین بەڵکو بە ئاشکراو هەمووان باسی لێوە دەکەن، ئایا دەتوانین بەراورد لەنێوان ڕژێمێك لە تاریکترین ساتەکاندا ئاگای لەگەلەکەی بێتو ماددەی خۆراکی بۆ دابین بکات، لەنێوان ڕژێمێك بتوانێت هەموو شتێك دابین بکاتو دەوڵەمەند بێت، بەڵام گرنگی بەگەل نەدات بەتایبەتی هەژارانو بەشەخۆراکیان بدزێو وەزیرو بەرپرسە گەورەکانی ئەم ڕژێمە نوێیە یاری بە گرێبەستەکانەوە بکەن تا پارەیان دەست بکەوێتو لە بانکە جیهانیەکان حەشاری بدەن بەتایبەتی بانکەکانی ئێران !! بەڵام ئەمانە زۆر بە ئاشکرا باس لە خراپی صەدام حسێن دەکەن، باس لەوە دەکەن ئەوان بوونیادی عێراقێکی نوێ دەنێن، حکومەتەکەیان بەشێوەیەکی دیموکراتی لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردراوە.

پێوەرێکی بنەڕەتی تر هەیە، بەرپرسە نوێیەکانی ڕژێمی نوێ چۆن کار دەکەن، لە سەردەمی صەدام حسێندا بەرپرسەکان چۆن کاریان دەکرد، لەسەردەمی ڕژێمی صەدام حسێندا ئەو کاتەی جێگری سەرۆك بوو، پاشان کە بوو بە سەرۆك، صەدام حسێن سەردانی هەموو عێراقی دەکرد، لە شەقامو شارو گوندەکاندا دەگەڕا، لەگەڵ خەڵکانی ئاسایی کۆدەبووەوە، دەچووە ماڵەکانیانەوەو باری ژیانیانی بەسەردەکردەوە، ئەم سەردانو چاوپێکەوتنانە دەبوونە بڕیارو ڕێوشوێن بۆ چارەسەری گرفتەکانو باشکردنی بارودۆخی خەڵك، ژمارەی تەلەفۆنی صەدام حسێن لای هەمووان ئاشکرا بوو، زۆرجار هاوڵاتی ئاسایی دەیتوانی تەلەفۆنی بۆ بکات، کاتی دیاریکراوی هەبوو بۆ چاوپێکەوتنی هاوڵاتیان، ئەوانەی داوایان دەکرد بیبینن، ژمارەی ئەوانەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامدەدان دەیانو بگرە سەدان کەس دەبوون، صەدام حسێن وەزیرەکانی ناچار کردبوو کاتێك بۆ چاوپێکەوتنی

ئەوانە دابنێن کە دەیانەوێت سەردانیان بکەن، وەزیر وابەستە بوو کە راپۆرتێك لەسەر ئەو چاوپێکەوتنانە ئامادە بکاتو ئەو رێوشوێنانەی کە گرتوویّتەبەر باس بکات.

بەلام سوارچاکانی رژێمی دیموکراتی نوێ، وەك خۆیان دەلێن بە هەلبژاردنی ئازاد هاتوونەتە سەر حوکم، ئەوان لەماوەی پێنج سالی حوکمیاندا لە ناوچەی سەوز بە پارێزەری هێزی ئەمریکا لەوێ بەدەگمەن دێنەدەرێ، بەلکو هەندێکیان لەوەزارەتەکەی خۆی هەر دەوام ناکات، کاروباری وەزارەتەکەی بەتەلەفۆنو چاوپێکەوتن رایی دەکات، ئەویش کاتێك فەرمانبەرێك بۆ ناوچەی سەوز دێتەلای.

لەماوەی جەنگی ئێراندا، صەدام حسێن سەرکردەی هێزە چەکدارەکانی بوو، سەردانی کەرتەکانی سوپای دەکرد، تەنانەت کەرتو یەکە بچوکەکانی سوپا، لەگەل سەربازو ئەفسەرە گەورەو بچوکەکان کۆدەبووەوەو لەبارودۆخو خواردنو پێداویستیان پرسیاری دەکرد، بەلام سەرەك وەزیرانی هەلبژێردراوو سەرکردەی هێزە چەکدارەکان، کاتێك هێرش کرایە سەر بەسرەو موسل، کەس نەیبینیو چاوی بەخەلکی بەسرە نەکەوت، تەنها لە بنکەی سەربازی بەریتانی لەبەسرە مایەوە، کە خەلکی موسلو بەسرە لە هەلبژاردنێکی ئازاددا هەلیانبژارد، تاکو ببێتە سەرەك وەزیران، کە صەدام حسێن سەردانی دەکردو وەزیرەکانی وەك ئەویان دەکرد، کە هەموو هەفتەیەك سەردانی یەکێك لە فەرمانگەکانی سەر بەوەزارەتەکەی خۆی دەکرد، چاوی بەفەرمانبەرەکانی خۆی دەکەوت، سەردانی پرۆژەو شوێنی کارەکانی دەکرد، عێراقیەکان ئەوەیان لەبیرە، لەسەردەمی گەمارۆی ئابووری سەپێنراودا خزمەتگوزارییەکان بەهۆی کەمی ماددەکانەوە پاشەکشێی دەکرد، صەدام حسێن هەموو وەزیرەکانی راسپارد کە هەر یەکێکیان ببێتە بەرپرسی یەکێك لە ناحیەکانو بەبەردەوامی سەردانی بکاتو هەولی چاککردنی خزمەتگوزاریەکانی بداتو سەرچاوەی وەزارەتەکەی بەکاربهێنێت، بەو پارەکەمەی لە بودجەی دەولەت پاشەکەوتی کردووە، بۆ هەندێك حالەتو پێویستی ئێمەرجنسی بەکاری بهێنێت، لەو کاتەی بانگەشە بۆ سەردەمی دیموکراتی نوێ دەکرێت، کە زۆرێك لە وەزارەتەکان لەگەل بوونی ئەو بودجە زەبەلاحانەدا، کەوەك خۆیان دەلێن کە بەشێك لە بودجەکەیان خەرج نەکردووە بۆ چاککردنی بارودۆخی خەلك، ئەمەش مانای وایە ئەو وەزیرانە کاریان نەکردووەو نەیانزانیوە ئەرکی وەزارەتەکەیان چییە ؟ بەلام ئەو وەزیرە شکۆدارانە هەرگیز لە سیماو کۆنگرەکانی دەرەوەی ولات دواناکەون، بەتایبەتی لە ئەمریکاو ئەوروپا، هەروەها سەردانی

بەردەوامی ئێران، بەڵام ئەوکات خێزانی بەرپرسە عێراقیەکان لەناو عێراقداو تەنانەت لەکاتی جەنگەکانیشدا عێراقیان بەجێنەدەهێشت، تەنانەت لەکاتی جەنگو بۆمبارانو موشەکبارانو نەهامەتیەکانیشدا، بەڵام زۆربەی یان هەموو خێزانی بەرپرسەکانی ئێستا لەدەرەوەی وڵات دەژینو خانوو کۆشکیان لەو وڵاتانە هەیە، هەندێکجار سەردانی عێراق دەکەنەوە ئەویش وەك گەشتیار، زۆر دەربارەی ئەو ملیارەها دۆلارانە وترا کە گوایە صەدام حسێن ناردوویەتە دەرەوەی وڵات، پاش تێپەڕبوونی پێنج ساڵ لە ڕووخاندنی بەهۆی جەنگو کوشتنو لە سێدارەدان، سوارچاکانی ئێستاو ئەمریکاو بەریتانیا لە هەموو بانکەکانی دنیا یەك دۆلاریان بەناوی صەدامەوە نەدۆزیوەتەوە، ئەمەش لایەنێکی تری درۆو ساختەکاری کە دژی صەدام حسێنو سستمە نیشتمانیەکەی دەیلێن.

دواجار وتیان کە صەدام حسێن خاوەنی دوو کۆشکە لە باشووری فەرەنسا، هەوڵیاندا داوای دوو کۆشکەکە بکەن بەوەی بەشێکە لە موڵکەکانی دەوڵەتی عێراقی، بەڵام ئەوانەی لەوەزارەتی دەرەوەی عێراقی کاردەکەنو باڵوێزی عێراقی لە فەرەنسا دەزانن ئەو دوو خانووە نەك کۆشك، ئەوانە موڵکی دەوڵەتی عێراقینو بەناوی سەفارەتی عێراقەوەن لە فەرەنسا، کە دەبێت ئەو باجەی لەسەریەتی هەر لەکۆتایی حەفتاکانەوە تا ئەمڕۆ بیدەن، هەروەها هیچ کەس صەدام حسێنی نەبینیووە، بەتایبەت سەردانی فەرەنسا بکاتو لەوماڵەدا بمێنێتەوە، لەڕاستیدا یەکێك لە وەزیرەکانی ڕژێمی پێشوو ئەو دوو خانووەی لەبەرپرسێکی فەرەنسی کڕیوە، لەبەرامبەر هەندێك خزمەتگوزاری کە پێشکەشی عێراقی کردووە.

دواجار باس لەیەختەکەی صەدام حسێن دەکەن، لەڕاستیدا صەدام حسێن خاوەنی هیچ یەختێك نەبووە، بەڵکو ئەو یەختە موڵکی دەوڵەتەو تایبەت بەسەرۆکی عێراق بووە، وەك چۆن سەرۆکی دەوڵەت لەسەردەمی پاشایەتیدا خاوەنی یەختێك بووە، صەدام هەرگیز ئەو یەختەی بەکارنەهێناوە، چونکە پاش هەڵگیرسانی جەنگ لەگەڵ ئێران ئەو یەختە تەواو بوو، کە زەحمەت بوو بگاتە بەسرە، لەدەرەوە مایەوە.

ئەمانە چەند نمونەیەکی سادەن کە جیاوازی بەرهەمی نێوان هەردوو سەردەم ڕوون دەکەنەوە، سەردەمی دیکتاتۆریو جەللادو سەردەمی حکومەتی دیموکراتیو هەڵبژێردراو لەلایەن گەلەوە، بەڵام گەلی عێراقی لە ژێر داگیرکاری ئەمریکیدا دەناڵێنێت، هەروەها بەدەست داگیرکاری نا ئاشکراکراوی ئێرانەوە، زۆرێك لە خەڵك ئەم ڕاستیە دەزانن کە

هێشتا پێنج ساڵ بەسەر داگیرکاریدا تێپەڕیووە.

خەڵکی باس لەوە دەکەن، ئەوانەی لەژێر سایەی ڕژێمی صەدام حسێندا ژیاون، چۆن ژیاونو صەدام حسێن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا کردوون، چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ وەزیرەکانی کردووە،دەبینین سوارچاکەکانی ئێستا چۆن دەژینو چی دەکەنو چی ناکەن، لە ئەمانە گرنگتر ئەوانە چەندێك پارەیان لە بانکەکانی ئەمریکاو ئەوروپاو ئێراندا هەیە.

چەند لاپەڕەیەك ناتوانێت وێنەیەکی تەواو دەربارەی ئەم سەرکردە جیاوازە بدات، سەردەمی صەدام وەك جێگر دەستی پێکردو پاشان بۆ ماوەی سی ساڵ سەرۆکی عێراق بوو، کە درێژترین ماوەیە لەسەدەی بیستدا سەرۆکێك حوکمی عێراقی کردبێت، لەبەر ئەوە پێویستمان بەبابەتیانەو ئەمانەتی زۆرە .. زۆر کتێب لەبوارە جیاجیاکاندا وەك سەرۆکی حیزبی بەعسی ئیشتراکیو ڕۆڵی وەك سەرکردەیەکی گشتگیر لەماوەی نەوەتەکانداو جەغت کردنەوە لە ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندن، هەروەها نەخشەکێشان بۆ پەرەپێدانو ڕۆڵی سەرکردایەتی ئەو بۆ خۆماڵی کردنی نەوت، پێش ئەوە ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی ئازارو دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی لەو پارێزگایانەی کورد زۆرینەی پێك دەهێنن، هەروەها ڕۆڵی وەك سەرۆکی لیژنەی کاروباری باکور بۆ ماوەی چەندەها ساڵ، هەروەها سەرپەرشتی کردنی چارەسەری هەڵگەڕانەوەی بارزانی پاش ساڵی ١٩٧٤، ڕۆڵی ئەو لە ڕێکەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥دا، ڕۆڵی لەکۆنگرەی باڵای بەغداد، هەروەها ڕۆڵی لەو هەڵسوکەوتە یەك لایەنەی میسر لە ڕێکەوتنی کامپ دیڤددا، هەروەها چەندەها مەسەلەی حزبیو سیاسەتی ناوخۆییو دەرەکیو ئەو پرۆژە زەبەلاحانەی بەکاریگەریو سەرکردایەتی ئەو ئەنجامدران، هەروەها مامەڵەکردنی لەگەڵ بەرەی نیشتمانیو پەیوەندی لەگەڵ شیوعیەکان لە ساڵانی حەفاکاندا، لەگەڵ زۆرێك لە پارتو کوتلە سیاسیەکانی تر.

کاروانێکی درێژەو پڕیەتی لە ڕووداوو مەترسیو کاری مەزن لە پێناو خزمەتی گەلو پەرەپێدانی عێراقو بوونیادنانی هێزی چەکداری، ئەمە جگە لەو ڕۆڵەی وەك سەرکردەی هێزە چەکدارەکان گێڕای لە جەنگی قادسیەی صەدامدا، کە بەگەورەترینو مەزنترینو گرنگترین داستانی عێراقیو عەرەبی لەسەردەمی نوێدا دادەنرێت، کاتێك وڵاتێکی عەرەبی بۆ ماوەی هەشت ساڵ لە جەنگێکی توندا دەژیا، کە ڕژێمی خومەینی وەك پێشتر باسمان کرد مەبەستی بوو دەست بەسەر عێراقدا بگرێت.

صەدام حسێن بە درێژایی ئەو ساڵانەو لەو ڕووداوە شکۆمەندانەداو لەو هەموو مەترسیە

گەورانەدا، هەموو کات سەرکردەیەکی خۆڕاگربووە، خاوەنی بیرکردنەوەی خۆی بووەو دەستپێشخەرو بیرمەندو سەرکردەی هەموو لایەك بووە، ئەو سەرۆکەی گوێی لەهەموو کەسێك دەگرت، پاش گفتوگۆی درێژ بڕیاری بنەبڕ دەدات.

ئەم کاروانە پڕ شکۆیە بە ڕاستی پێویستی بە لێکدانەوەی زۆر هەیە، پێویستی بە چارەسەری زۆرە، دەبێت زۆرێك لە هاوڕێیانی صەدام حسێن بەشداری تێدا بکەن، بە تایبەتی ئەوانەی لەو ڕووداوانەدا لەگەڵی ژیاونو لەزۆربەی ئەو کارانەدا لەگەڵیدا بەشداربوون.

ئەم هەوڵدانە لە یەکێك لە هاوەڵەکانیەوە تەنها پێشەکیەکە بۆ ئەو کاروانە درێژەی، هەروەها پاڵنەرێکە بۆ ئەوەی هاوڕێکانی قسەی تێدا بکەنو لەو بارەیەوە بنووسن.

دواجار صەدام حسێن کۆچی دوایی کردو بەدەستی داگیرکەری ئەمریکیو بەکرێگیراوە عێراقیەکان کوژرا، مێژوو پێیان دەڵێت ئەوان کورتە بنەن لەچاو ئەو کێوەدا، خوا ڕەحمی پێبکات لە ژیاندا سەرکردەیەکی مەزن بووەو لە کوژرانیش پیاوێکی ئازا بووو بوو بە شەهیدی ئەم سەردەمە.

ئەگەر ئەم گرگنانە لە ئەمریکای داگیرکەرو بەکرێگیراوە عێراقیەکان توانیان پەیکەری صەدام حسێن بڕوخێننو وێنەکانی دابگرنو ناوەکەیان لەزۆر شوێن سڕیەوە، بەڵام مێژوو ناوی صەدام حسێن دەگێڕێتەوە، یادەوەریەکانو دەسکەوتەکانی، کە دەستی ئەو گرگنانە هەرگیز نایگاتێ.

# صەدام حسێن
# دێڕی یەکەم لەکتێبی ئەفسانە

بەپێنووسی: عەلی ئەلسەراف *

ئەو دادگایکردنە، هیچ قسەوباسێکی جیای تێدا نەبوو، تەنها وەك گەواهی مێژوویەکی تر وابوو لەو دابڕانە هەمیشەییەی نێوان هەق و ناهەق.

زۆر ڕووداوهەن لەژیانی ئەم پیاوەدا، کە ئاماژەن بۆ کرۆك و ئەسڵی، ڕەگو ڕیشەی دیاری دەکەن، بەڵام صەدام حسێن ڕۆشن و دیار نەبوو لەناو ئەو ڕەگو ڕیشەدا، هێندەی ئەوەی لە زینداندا ڕۆشن و لە دادگاکاندا دیاربوو.

تەنها لەوێدا هەقیقەتی ڕووتی ئەو پیاوە دەرکەوت، وەك ئەوەی خوا لە ڕۆحیدا چاندبووی.

بەتەنها لەوێدا شکۆی دەسەڵاتی فەرامۆش کرد، تاکو شکۆی ئەفسانەیی دەربکەوێت.

لەوێدا دیکتاتۆر هەقیقەتی دەرکەوت.

دیکتاتۆر زۆر لەوە گەورەتر بوو کە زنجیرو قەفەس و کۆت و بەند بتوانێت لە گەورەیی بخات، بە شکۆمەندیەوە دەهاتە ناو هۆڵی دادگا، بەهەمان شکۆوە دەچووە دەرەوە، پیاوێك بەمردنی دەوت (ئەها ئەوەتام) وەرە، ئەگەر ئازای وەرە بمبە.

مردن نەیبردەوە،

بەڵێ لەبەردەم پەتی سێدارەدا وەستاو دوو شەهادەی هێنا.

بەڵێ بینیمان بەسەری دیارو نەپێچراوەوە هاتە پێشێ، بەچاوی کراوەوە، پەتی سێدارەی لە مل کرد، بەڵام کەمێك زبربوو، بەڵێ بینیمان جەستەی کەوتە خوارێ، پاشان

جەستەی درێژ بوو، بەڵام دوابزەی سەر لێوی هەموو شتێکی ووت. دەزانی ئەمە دوا دێڕی کتێبی خەباتکارێکو هەڤاڵو سەرۆکو سەرکردەو باوکێکە، بەڵام دێڕی یەکەمی کتێبی ئەفسانەیەك بوو.

چۆن بە دیکتاتۆریەتەکەی هەڵخەڵەتاین، کە لەسیمایدا هەق دەبینرا، هەروەها لە مردنیشیدا ئێمەی خەڵەتاند.

ئەو نەمر بوو، هەنگاوێکی ناو بزەگرتیو چووە قۆناغێکی تر، وەك چۆن مرۆڤ بەسەر پەیژەیەکدا سەردەکەوێت، ماوەی ژیانو ئەبەدیەت تەنها لەو پلیکانەیە زیاتر نییە.

جەستەی کەوتەخوارێ، بەڵام مردن نەیبردەوە بۆ خۆی، لەو چرکەساتەوە صەدامێکی تر لەدایك بوو، صەدامی نەمر، ئەو صەدامەی مەرگ هەرگیز ناتوانێت بیباتەوە بۆ خۆی.

کەمێك گریاین، کەمێك خەمبار بووین، بەڵام پێکەوە بزەمان کرد، کاتێك فێڵی پاڵەوانمان ئاشکرا کرد، بەدڵمان لە ئامێزمان گرت، رۆحی ئەو خەباتگێڕەمان لەباوەش گرت، ئێمە ماڵئاواییمان لەبەشێك لەو کردو ناردمان بۆ لای خوای خۆی، بەڵام شکۆدارترین بەشمان گەڕاندەوەو برەومان بەخەباتی بەرگریکاریدا.

ئەوەمان بۆ ئاشکرا بوو، لەلایەکی ترەوە بزەی دەکرد، بزەی ئەو دەسەڵاتە پڕە، بەهەموو شێوەیەك لەناو شکۆی بابلیایانەی خۆیدا بوو، مرۆڤێکی خۆڕاگربوو، خاوەن سادەییو دڵسافی، لەوانەیە فرمێسکەکانی بەسەر ڕومەتیدا بێتە خوارێ، خەمبار دەبوو، تووڕە دەبوو، پێدەکەنی، وەك هەموو مرۆڤێکی تر خاوەنی دڵێکی زیندوو بوو، بەڵام بە شکۆی پیاوێكو قامەتی پاڵەوان، کە هەرگیز بەو شێوەیە دەرنەکەوتووە.

لە ((زۆری نەهامەتیەکاندا)) دەیویست مەبەستێکی هەبێتو بگاتە ئامانجێك، ئەم مرۆڤە دابەش ببوو، هەندێك وەك دیکتاتۆرێك کە وردەکارییەکانی باس دەکەن، بەڵام ئەمیان هیچ مانایەکی نییە، هەروەها ئەوانەی ئامانجو مەبەستی بەهەموو ووردەکارییەکانەوە دەبینن، بەتایبەتی لە هەموو زانکۆو دامەزراوەو کارگەکان.

مانگ هەر یەك دانەیە، لەهەر نیوەیەکی بڕوانیت، ئەوا نیوەکەی تری دەبینیت.

بەم شێوەیە سەرسوڕماو دەبێت، هەروەها دەبێتە خولیایەك، بەم شێوەیە هەنگاوێك عێراق دەباتە پێشێ، هەنگاو دوای هەنگاو، تاکو هەموو ئەوانەی دڵیان لێی ڕەشبێت ڕقیان لێی ببێتەوە، پیلانی بۆ دادەڕێژنو بۆ کوشتنی هاوپەیمانێتیان بەستو هەوڵی دارمانی

عێراق دەدەن.

بەم دڵە ڕەشەوە، حوکمڕانی دەکەن، کاول دەکەن، دەکوژن‌و ئەشکەنجە دەدەن، بەم دڵە ڕەشەوە عێراقیان کردووە بە قەسابخانەو گۆمی خوێن، ئەمان هیچی تریان نەبوو وەک ئەوەی بە زۆر لە هەسارەیەکی تاریکەوە هاتبن.

دەبوایە صەدام حسێن بکوژرایە، لەبەر ئەوەی ئەیانویست خواستی عێراقیەکان بکوژن، ئەو خواستەی بۆ هێزو شکۆو خۆشنوودی بوو.

ئەو سۆمەرییەمان دەبینی بوونیادی دەناو دەجەنگا تاکو بە بەرەبەیانی نەمری بگات، بەڵام وەک چۆن گلگامێشی یەکەم لەدەستیدا، ئەویش لەنێو ددانی ئەو مارەی قوتیدا، پێش ئەوەی ئەم جەنگاوەرە بگاتەسەری، گلگامێشی دووەمیش لە نێو ددانی مارەکەدا هەمان شتی لەدەستدا.

پاڵەوان درەوشاوە نەبوو، وەک چۆن لە زیندان‌و دادگادا درەوشاوە بوو سەرەتا ویستیان ئیهانەی بکەن، بەڵام ئەو ئیهانەی کردن، ویستیان دادگایی دیکتاتۆر بکەن، ئەو دادگایی ملکەچی‌و بەکرێگیراویەتی‌و داروخانی کردوە.

ویستیان بەلاوازی بیبینن، بەڵام ئەو بوێری جەنگاوەری نیشاندان، کەناتوانن ملی پێکەچ بکەن.

بەزمانی پاراوو نیشتمانپەروەری‌و بیری قوڵی، بووە پارێزەری یەکەمی ئێمە، هەموو گروپی بەرگریکارانی بوون بەگروپی یاریدەدەر.

صەدام حسێن لە زیندان ڕووت بوو، مرۆڤ لە نەهامەتیدا ڕووت دەبێتەوەو ئاشکرا دەبێت، زیندان ئاشکرای کردووو ڕووتی کردەوە، کە هیچ سەرکردەیەک بەو شێوەیە نەبووە، بە یەکسانی خۆیەوە جوان بوو، زیاتر ئازایانە هەنگاوی دەنا، زیاتر مەزنتر بوو لەبەردەم پارێزەرەکانیدا خۆڕاگرو هێزو توانای خۆیان لەودا دەبینیەوە، نەک بە پێچەوانەوە، ئەو دڵنەوایی دەکردین، نەک ئێمە، ورەی بەرزدەکردینەوە، نەک بەپێچەوانەوە لەسەر ڕێی ڕاست دەیهێشتینەوە، نەک بەدوایدا بگەڕێین، کەمترین ئازادیخواز ئەو شەرەفەیان پێبڕاوە کەبەو شێوەیە بەرەو ڕووی داگیرکەراندا بەشکۆوە بووەستێتەوە. کەمیان مێژوویان کردە نەبەردی‌و خاڵی وەرچەرخان.

بەشوێنی پاڵەوانێتی ئەودا ڕۆیشتین، پارێزەرەکانی بوونە پاڵەوان، وەک ئەو ڕووبەڕووی

مردن دەبوونەوە، بەئازایی جەنگاوەر نەك بەپیشەی پارێزەر، ئیدی چۆن ئەم پیشەیە بەرەورووی ئەو میلیشیایانە ببنەوە کە لە ژوورەوە جلی دادوەریان پۆشیوە، گێرەشێوێنەکانیش لە دەرەوە بەرگی میلیشیایان پۆشیووە.

لەناو هۆڵی دادگا، دادوەر دادوەر نییە، بەڵکو لایەنگرێکە گفتوگۆ دەکات، هاوار دەکات، دڵەڕاوکێیەتی، تووڕە دەبێت، وەك گێرەشێوێنەکان دەیانکاتە دەرەوە، هەروەها گوێ ناداتە (مغاویرەکانی ناوخۆ)و پاسەوانانی داگیرکەر کە لەناو ڕێڕەوی هۆڵی دادگادا لە تۆمەتباران دەدەن و ئەشکەنجەیان دەدەن.

لە دەرەوەش میلیشیاکان ئەو کارە تەواو دەکەن، پارێزەرەکان دەتۆقێنن و بەدوایان دەکەون و هەرەشەیان لێدەکەن، تەنانەت پێنجیان لێکوژرا،ئەویش پاش پەلبەست کردن و ئەشکەنجەدانیان، بەڵکو یەکێکیان بە ستونی کارەبادا هەڵواسیبوو، نەك تەنها وەك کارێکی وەحشیگەرانە بەڵکو وەك بەڵگەیەك کە چاوپۆشی لێناکرێت، مانای ئیفلاسی ئەخلاقی تەواوە بۆ داگیرکەران و حکومەتەکەی و میلیشیاو دادگاکەی.

لەبارودۆخێکی لەو جۆرەدا، (دەستەی پارێزەران) تەنها پارێزەر نەبوون، بەڵکو پیاوان و ژنانێك بوون، ئامادەبوون واز لە کارەکانیان بهێنن تاکو ببنە شەهیدو بەپێی خۆیان بچن بەرەوپیری مەرگ، ئەمانە جەنگێکیان ئەنجامدا لە چوارچێوەی یاسادا نا، بەڵکو هەوڵیان دەدا هەق دەربخەن و دادپەروەری دیاربخەن، ئەویش لە چوارچێوەی نایاسادا، لە نێوان یاسای جەنگەڵدا بەسەرەتاییترین ماناکانی و بەدواکەوتوویی و دەسبەرداربوون لە بەها مرۆییەکانی، ئەویش هەوڵدان بۆ ڕزگاربوون لە چاڵی مارو دوپشکەکان، کە لێواری چاڵەکە بەگورگ و کەمتیار دەورەدراوە و هەریەکەیان چاوەڕێی بەشە خۆراکی خۆی دەکات.

دەیانوویست ئەو دادگایە ببێتە (دادگای سەدە) .. بەڵام بووە گاڵتەجاڕییەك کە بەدرێژایی ئەم سەدەیە دەنگدەداتەوە، وەك نمونەیەکی خراپ کە مرۆڤایەتی نایبیستێ بۆ ئیهانەکردنی بەهای هەق و دادپەروەری و یاسا، دەبێتە ئابڕوچوونێك وەك سەرشۆڕیەك دوای ئەوانە دەکەوێت کە تێوەی گلاون.

مردن لەهەموو ساتێکدا ئامادە بوو، لەهەموو پێچ و پەنایەکی ئەم کێشەیەدا لەنێو ئەمانەدا تەنها یەك ئامانج لە پشت ئەم گاڵتەجاڕییەوە بوو، ئەویش کوشتنی تۆمەتباران بوو لەژێر پەردەی یاسادا، بەتایبەتی وەك جەنگەڵێك زۆرێك لە چەقۆ ئامادەکرابوو، تاوەکو

جەستەی قوربانیەکان بەغەدرو ناهەق لەتو پەت بکەن، چەندێك لەم دۆخەدا دڵان ئازابوون، ئەوەندە پارێزەرەکان بەدوای ستراتیژیەتو نەخشەی بەرگریکردندا دەگەڕان، چەقۆکان باڵادەستی کێشەکەبوون، نەك دژی سەرۆكو دەسەڵاتەکەی، لەژێر پەردەی زاڵمو بوونیادنانی درۆو دەلەسەی بەتاڵ، نەك تەنها لە دژی پارێزەرەکان، کە ئەوانیش بوونە قوربانی هەرەشەو کوشتنو هەڵواسین بەستونی کارەبادا ، بەڵکو لەدژی گەلێك کە بێتاوانەکانی لەناودەبرێت، بەژنو پیاوو منداڵیەوە، بەبەرچاوی هەموو جیهانەوە هەموو مەرەکانیان سەردەبڕی.

بەتێڕوانینێك لەو ڕووداوانە دەزانین ئێمە چەند لەسەر هەقبووین، شەهیدەکەمان دیکتاتۆرێکی تەواو نەبوو، ئەگەر ئەو سیفەتە لەبنەڕەتدا لەگەڵ ئەو بگونجێت، چەندێك سیمای ئەویتر ڕۆشن بوو، بوونیادنانو گەشەسەندنی هێز لەسەردەمی ئەودا ڕووکاری ڕاستەقینەی عێراق بوو.

ئەو گێرەشێوێنانە بۆ خۆیان دەبن بە شاهیدی دادگای پاشەڕۆژ، تاوانەکانیان بەسە کە لەبەردەم مێژوودا بووەستێتو بڵێت لەچ دنیایەکی نزمەوە هاتووم، لە هەسارەی تاریکیەوە هاتووم، سەربە چ دنیایەکم، کەدەکەوێتە پێش یاساوە، لە پێش یاساوە، یاساو دەوڵتیان وەرگرتووە.

لەگەڵ ئەوەی ئەوان دیلێکیان کوشتو جەستەیان پڕ کرد لە ڕكو کینە، بەڵام هەر دەکوژنو وێران دەکەنو لاقە دەکەن، تەنانەت وایانلێهاتووە لەهەموو عێراقیەکدا بەهانەیەك بۆ ڕقو کینەیان دەبینن، لە ڕاستیدا ئەم نائەخلاقیەی جیهانی خوارەوە لە هەسارەی تەواو تاریکیەوە هاتووە، لەدەروونیانەوە دەکەوێتە پێش سەرهەڵدانی بەهاو پێوەرە مرۆییەکان، ئەمە بەتەنها بووەتە هۆی حوکمڕانی چەقۆکانیان، نەك تەنها لەسەر جەستەی بێتاوانەکان بەڵکو لەسەر جەستەی عێراقیش، لەسەر ئایندەی عێراقو مافی ڕۆڵەکانی لە ئاسایشو خۆشنوودیو ئازادیش.

لەم ڕاستا خوێناویەدا دەستەیەك لە پاڵەوانان بڕیاریاندا سەرکێشی بەژیانیانەوە بکەن، وەك پارێزەری ئازادیخواز بێنە پێشێ، لە باشترین زانکۆکان زانست فێربوون، پسپۆڕییان لە باشترین گۆڕەپانی دادوەریدا بەدەستهێناوە، تا بەرگری لە شەهیدێك بکەن، پێش وەخت دەیزانی کە شەهیدە، هەروەها هەڤاڵەکانی تری کە وەك ئەو ئازا دەمێننەوە،

جارێکی تر ئازایەتیان بەئاگادێتەوە.

کاری (دەستەی بەرگری) وەك دەستەی شەرەف وابوو زیاتر لەوەی لە دەستەی یاسا بچێت، یاسا مەسەلەکە نەبوو ، بەتایبەتی بەگوێرەی ئەو دادگایە، کەواتە ناکرێت بەبێ ئەو کەشی کوشتنەی کە عێراقی گرتووەتەوە تەماشای ئەو دادگایە بکەین، ئەو شاهیدی مردنی خودی ویژدان بوو، بەڵگە بوو بۆ هەموو بەها مرۆییەکان، لە مردنی ویژدانو داڕمانی بەهاکان، (کێڵگەکانی کوشتن) لە عێراق زیاتر خوێنڕێژانە بوو، لەهەموو (کێڵگەکانی کوشتن) کە وەحشیگەری سادی پێشتر لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ناسیوویەتی .. لە هێتلەرەوە بۆ پۆل پۆت تاکو بینۆشێت (نووسەر صەدامەکەی لەمەڕخۆی لەبیرچووە) وەرگێڕ.

بەڵام ئەو کێشەیەی ئەو پارێزەرانە بەرگریان لێدەکرد پێش وەخت دەیانزانی دۆڕاون بەڵام هەرگیز ئەمە دۆڕاندن نییە.

لەوێ لە زیندانەکەیدا پیاوەتی شەهیدێکی ئاشکرا کرد، پاڵەوانێك بوو بەهێزتر لە پۆڵا، مرۆڤێك بوو ڕۆحی خێرو ڕۆحی لێبووردەیی‌و نیشتمانپەروەری تێدابوو، هەرگیز گیانی تۆڵەسەندنەوەی تێدا نەبووە، داوای نەکردووە تۆڵەی بسەننەوە، بەسەر هەموو دەسەڵاتەکاندا تێپەڕیووە، تەنها عێراقی مەزن سێبەری ڕەشماڵی بەسەر دڵیدا کێشابوو.

لەوکاتەی کاتژمێری ڕۆیشتن هات، بەبزەو دڵنیاییەوە هەنگاوی دەنا، لەوانەیە ئێمە سەرۆکێك‌و سەرکردەیەکمان لەدەست دابێت، بەڵام پاڵەوانێکی ئەفسانەیی‌و ڕەمزێکمان دەستکەوتەوە.

هەموو هەڤاڵەکانی تری وەك ئەویان کرد، هەروەك ئەو هەموو هاوڕێیانی کاروانی ئازادی وادەکەن، عێراقی مەزن، عێراقی خێرو لێبووردەیی‌و ئازادی‌و شادمانی، ئەو دارە نەمرەیە، کەگلگامێشێکی لەدەستداو گلگامێشێکی تر لە دایك بوو.

وتەیەك کەهەر دەبێت بوترێت

## صەدام حسێن

## لەعۆجەوە ... بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی

هیچ کەسێك وەك صەدام حسێن لە کۆتایی سەدەی بیستو سەرەتای هەزارەی نوێدا دنیای پڕ نەکردو خەڵکی سەرقاڵ نەکرد، ژیانی جگە لە بەرەنگاربوونەوەو سەرکەوتنو تراژیدیاو نەهامەتی نەمر هیچی تر نەبوو، ئەمەش ڕێگای هەموو مەزنەکانی ڕێگای مێژوون.

ئەستێرەیەك هەیە لە یاداشتی صەدام حسێندا دەدرەوشێتەوەو هالەیەکی گەورەی دەداتێ لە هەڵوەستە لەسەر کردنو گرنگیپێدان، لەبەر ئەوەی لە کەلێنی فەرامۆش کراوەوە هاتووەتە دەرێ، لەناو بەرزیو نزمی ژیانی هەژاریو تاڵی ژیان، بەگەشتێکی سەختدا بەرەو بەیداخی شکۆ چووە، کەبەڕۆحی پێبگەیشتو بەڕووی زەمانەوە بمێنێتەوە.

کۆمپانیای (المنبر) بۆ چاپکردنی دیاریکراو لە سودان، ئەم کتێبەی بڵاوکردەوە، کە گرنگترینو مەترسیدارترین دیکۆمێنتی سیاسیە لە جیهانی هاوچەرخماندا، جێگەی شانازیمە شەهید بوونی صەدام حسێن ببێتە نۆبەرەی چاپکراوەکانی، چ بەهایەك لەمە گەورەتر هەیە، کە پێویستە لێرەدا هەڵوەستە لەسەر ئەم پیاوە صەدام حسێن بکەین.

لە کوخێکی بچوکدا، رەشەبای هاوینە لە گوندی عۆجە دەدات، یەکێك لە ناحیەکانی شاری تکریت کە تەنها ١٧٠کم لەباکوری خۆرئاوای بەغدادەوە دوورە، لە ١٩٣٧/٤/٢٨ی زاینی لەدایك بووە، لەخانوویەکدا تەنها یەك ژوور بووە، منداڵێکی ساوای هەتیوو، کە حسێن مەجیدی باوکی لەدایکبوونی ئەم کورەی بەچاوی خۆی نەبینی، شەش مانگ بەر لە دایکبوونی بوو باوکی مرد، دایکی (صبحە طلفاح) ناوی صەدامی لێنا.

خێزانێکی بچوك، سەرقاڵی کشتوکاڵو شوانکارەیی بوون، لەوپەڕی هەژاریدا دەژیان، ئەوکات عێراق جوڵانەوەیەکی سیاسی چالاکی تێدابووە، کە رژێمی پاشایەتی تووشی

دڵەڕاوکێ کردبوو، وەك ئەوەی مێژووی درێژی خۆی بەدەستبهێنێت، مێژووی عێراق هەر لەسەرەتاوە لانکەی شارستانیەتە دێرینەکان بووەو لانکەی پاڵەوانانی مێژووو داستانی نیشتمانیو پێگەی جوڵانەوە سیاسیەکانو هەروەها مێژووی ئیسلام هەر لەسەرەتای خولەفای ڕاشدینەوە تاکو سەردەمی ئەمەویو عەباسی .. تاکو مێژووی نوێ.

لەم کەشوهەوایەدا جەنگی جیهانی دووەم کەرەنای خۆی کوتی، صەدام حسێن لەدایك بوو، بەهەتیوویو هەژاریو بێکەسی کە تەنها لەم دنیایەدا سەبری جوانو ژیانی سەختیو ئومێدی کوژاوەی هەبوو، دایکی شووی دووەمی کردەوە بەپیاوێك ناوی ئیبراهیم حەسەن بوو، لەم پیاوە ئەم برایانەی لە دایك بوون (بەرزان، وەتبان، سەبعاوی)، صەدام ساڵانی یەکەمی لەژێر دەستی دایکیدا پەروەردە بوو، لەگەڵ مێردی دایکی کە تەنها کاری شوانی دەزانی، ئەم منداڵە تەمەنی منداڵیو هەرزەکاری لەنێوان شوانی مەڕوماڵاتو گەڕان بەدەشتودەرو فرۆشتنی کاڵەك لە وێستگەی شەمەندەفەردا بەسەربردووە، تاکو خێزانەکەیو برا بچوکەکانی بەخێو بکات.

صەدام لە ناخیدا گەورەبوو، لەڕۆحیدا تۆوی جیاکاریو سەرکردایەتی چەسپا، هەر لە منداڵیەوە سیماو پێکهاتەکانی دەرکەوتن، لەو کاتەی قوتابی قۆناغی سەرەتایی بوو لە تکریت، کە زۆر بەباشی هەوڵیدەدا، هەروەها ئاگای لە هێزی ژینگەی شوانکارانەی بوو کە لەخوێنو مۆرکیدا چەسپیبوو.

لە قۆناغی ناوەندیدا ئەم سیماو پێکهاتە سەرکردایەتیە ڕۆشنتر دەرکەوت، کاتێك ڕەوتە فکریو سیاسیەکان بەتوندی بەپانیو درێژی نیشتمانی عەرەبیدا دەهاتووو دەچوو، صەدام حسێن چووە ماڵی (خیرالله طلفاح)ی خاڵی تاکو لە شاری بەغدا بخوێنێتو لە کەرخ خوێندنی ئامادەیی تەواو بکات، ئەم ماوەیە بەگرنگترین ماوەی پێکهێنانی سیاییو فکری دادەنرێت بەتەواوەتی تێڕوانینی نیشتمانی کامڵ بوو، کەوتە ژێر کاریگەری فکری قەومیەوە، لەناو بزوتنەوە نیشتمانیە عێراقیەکاندا لە دژی داگیرکاری بەریتانیا دەستی بە خەبات کرد، کە ئەوکات بەسەر دڵی عێراقەوە بوو، ماڵی خاڵی کە خێروڵا ئەوکات مامۆستا بوو، بەبەردەوامی ماڵەکەی ببووە شوێنی چالاکیو کاری قەومیو پیاوانی جوڵانەوەی نیشتمانی عێراقیو پڕ بوو لە کتێبو چاپەمەنی کە هەڵگری فکری قەومی عەرەبی بوون، هەروەها کتێبی مێژووییو فەلسەفەو ئاداب، کە بیری قەومیو فکری سیاسی لە ماوەی

ساڵانی پەنجاکاندا خەمڵاو وەك چرایەکی ڕۆشن دەرکەوت، کەبەرچاوی ڕۆشنبیران‌و لاوانی عەرەبی ڕۆشن کردەوە.

پاش ئەوەی خوێندنی دواناوەندی تەواو کرد، صەدام هەوڵیدا بچێتە ئەکادیمیای سەربازی لەبەغدا، بەڵام لەبەر هەندێك هۆکاری تایبەت‌و هەندێکی تر پەیوەست بەبارودۆخی سیاسی ئەو تافە، بوونە ڕێگر تاکو بچێتە ئەکادیمیای سەربازی، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی یەکێك بوو لەلایەنگرانی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستی لە ساڵی ١٩٥٦، دواتر تووشی گرفتی تاوناتاو دەبوو، یەکجاریان شەشە مانگی خایاند ئەویش لەنێوان ساڵانی ١٩٥٨- ١٩٥٩، صەدام ئەوکاتە سەرکردەیەکی لاوی حیزب بوو، لەماوەیەکی کەمدا شارەزایی ڕێکخستنی وەرگرت، بووە دیاریترین کادیرە تەمەن منداڵەکانی حیزب.

ساڵی ١٩٥٨ کودەتا سەربازیەکەی عبدول کەریم قاسم ڕوویدا، وەك ڕووداوێکی گرنگ لە عێراق‌و گۆڕانکاری سەرەکی لە پێکهاتەی حوکمڕانی، حوکمی پاشایەتی بە سەرۆکایەتی فەیسەڵی دووەم کۆتایی پێهێنا، ئەو ئەفسەرانەی کودەتاکەیان دژی پاشا ئەنجامدا، لەو ئەفسەرانە بوون کە سەر بەحیزبی بەعس نەبوون، حیزبی بەعس لەدژی دەسەڵاتی نوێ بوو، کە نەیتوانی ئاسایش بەدەست بهێنێت‌و جڵەوی دڵەڕاوکێکان ڕابگرێت‌و هەڵچوونە سیاسیەکان‌و بارودۆخی سیاسی ناوخۆ هێور بکاتەوە، حیزبی بەعس بڕیاریدا گۆڕانکاری لە ریزی کادێرو ئەفسەرەکانیدا بکات، ئەویش بەهۆی ئەو زنجیرە لە سێدارەدانانەی ریزی ئەفسەرانی گرتەوە، لەناویشیاندا ئەفسەرە بەعسیەکان، هەوڵی کوشتنی عەبدول کەریم قاسم لەلایەن کادیرانی حیزبەوە درا کە صەدام حسێن یەکێك بوو لەو کادیرانە، ئەم هەوڵە پاش ئەوەی کەژاوەی سەرۆك قاسم بەر گولەدرا، شکستی خوارد، صەدام لەوکاتەدا بریندار بوو، بەو برینداریيەوە توانی لە رووباری دیجلە بەمەلە بپەڕێتەوە، بەرو شارۆچکەکەی خۆیان لە تکریت هەڵهات، دەزگا ئەمنیەکانی عەبدول کەریم قاسم بەدوایدا دەگەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە، بەم شێوەیە ئەستێرەی صەدام لەناو حیزبی بەعسدا درەوشایەوەو لە گۆڕەپانی سیاسی عێراقدا گەشەی سەند.

لەو ماوەیەدا زۆر لە ژێر کاریگەری فکری نەتەوەیدا بوو، بەتایبەتی نووسینەکانی میشێل عەفلەق، کەلەو کاتەوە پەیوەندی پتەوی لەگەڵ ئەو سەرکردەیەدا هەبوو.

بەهۆی ئەو گەڕان و پشکنینەی بۆ صەدام لەلایەن دەزگا ئەمنیەکانی قاسمەوە دەکراو ئەو هەموو فەرمانی گرتنەی بۆی دەرکرا، ببووە جێگەی گرنگی دەزگاکانی ئەمن، ئەم پیاوەی ناچارکرد خۆی بشارێتەوەو جێ گۆرکێ بکاتو بەبەردەوامی شوێنی خۆی بگۆرێت، لەبەر ئەوە بڕیاریدا تکریتو عێراق جێبهێڵێت.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٩ داو لەمانگی دیسەمبەری هەمان ساڵدا گەشتێکی پڕ مەترسی بە ناوچە بیابانەکاندا دەست پێکرد بەپێ بەرەو سنووری سوریاو عێراق، ئەوکاتە سوریا یەکێك بوو لەو وڵاتانەی هەڵچوونی نەتەوەیی و یەکێتی عەرەبی تێیدا کڵپەی سەندبوو.

صەدام نزیکەی سێ مانگ لە دیمەش مایەوە، لەوکاتەدا تێڕوانینی سیاسیانەی پێگەیشت، لەگەڵ چەندەها لە ڕەمزەکانی فکری نەتەوەیدا تێکەڵاوی پەیداکرد، پەیوەندی بەحیزبەوە لەناو عێراق هەر مابوو، هەمیشە پەیوەندی پێوە دەکردن و لە ڕووداوەکان ئاگادار بوو.

قاهیرە وێستگەی دووەمی بوو لە ڕۆژی ٢١ی فێبرایەری ١٩٦٠ دا گەیشتە ئەوێ، ئامانجی لەم سەردانە تەواو کردنی خوێندنو زیادکردنی مەعریفەی بوو، پەیوەندی بە خوێندنگەی کۆشکی نیل لە قاهیرە کرد، تاکو دواناوەندی ئاراستەکانی تەواو بکات، کە دەتوانێت لە زانکۆو لە کۆلێژی یاسا بخوێنێت، لەگەڵ هاوەڵە بەعسیەکانیدا لەلانەی قوتابیان دەژیا لەگەڕەکی ئەلدەقی لە قاهیرە، چووە ناو ڕێکخستنی قوتابیانو سەرکردایەتی حیزبی بەعس، تاکو گەیشتە بەرپرسی یەکەمی قوتابیانی حیزب لە میسری عەرەبی، لەناو هەڤاڵەکانیدا واناسراوبوو کە حەزی لەشەومانەوەو ڕابواردن نییە، کاتەکانی بە خوێندنەوەو یاری شەترەنج بەسەر دەبرد.

لەو ماوەیەدا لە بەغدا بەغیابی حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، لەگەڵ کۆمەڵێك لە هەڤاڵانی لە دەرەوەی وڵات ئەویش بەتۆمەتی هەوڵی تیرۆر کردنی عەبدول کەریم قاسم، دادگا لە ساڵی ١٩٦٠ ئەو حوکمەی دژی صەدام دەرکردو بەم شێوەیە لاپەرەیەکی بەرەنگاربوونەوەی نوێی لەناو حیزبو دەسەڵاتدا دروست کرد، صەدام حسێن قۆناغەکانی خوێندنی بڕی، چووە کۆلێژی یاسا لە زانکۆی قاهیرە، ئەویش لە ساڵی ١٩٦١، خوێندنی تەواو نەکرد، گەڕایەوە بۆ عێراق، ئەویش بەپێی ڕێنمایەکانی حیزب، کە خۆی بۆ کودەتایەك لە دژی عەبدول کەریم قاسم ئامادە دەکرد، حیزب توانی لە ١٤/ تەموز/١٩٦٣

دا حوکمی قاسم بروخێنێت، عەبدول سەلام عارف کرا بە سەرۆك کۆمار.

لە هەمان ساڵدا صەدام لەگەڵ (ساجدە خیرالله طلفاح) ی کچە خاڵی خێزانی پێکهێنا، وەك سەرپەرشتیاری ڕێکخستنی سەربازی حیزب دامەزرا، لەکاتی ئەو کودەتایەی بەسەر بەعسیەکاندا بەسەرکردایەتی عەبدول سەلام عارف لە ١٩٦٣/١١/١٨ دا بەڕێوەچوو، ئەویش پاش ئەو ناکۆکیە قوڵەی لەگەڵ حیزب هەیبوو، زۆرێك لە سەرکردەکانی حیزب دەستگیرکران کە لەناویاندا صەدام حسێنی تێدا بوو، بەڵام توانی لە زیندان هەڵبێت، وەك پیشەی هەموو جارێکی لە هەموو شوێنێکی عێراق بەدوایدا دەگەڕان و بەدوای کەوتبوون، ئەم ئەزمونە توانای ڕێکخستن و ووردی نەخشەکانی دەرخست، ئەو بووە بەڕێوەبەری یەکەمی کردەی خۆشاردنەوەو لە خشتەبردن و لێڵکردن بۆ سەرکردەکانی حیزب و کادیرەکانی، لەو ماوەیەدا کەحیزب حوکمی بەدەستەوە بوو پەیوەندی پتەوی لەگەڵ سەرەك وەزیران و عەبدول سەلام عارف و ئەحمەد حەسەن بەکر دروست کرد، کە ئەمەی دواییان پەیوەندیەکی نزیکی لەگەڵ صەدامدا دروست کرد.

لەو ماوەیەدا صەدام حسێن توانی ڕێکخستنێکی سەربازی پتەوو کارا پێکبهێنێت، سوودی لە تواناو ئەزموونی خۆی وەرگرت، هەموو جوڵەو کارە نهێنیەکانی ڕێکدەخست، دڵنیا کردنەوەی کادیرو سەرکردە سەربازیەکان و یەکەکانی سەر بە حیزب لەناو ڕیزەکانی سوپادا، هەروەها کاری شانە حیزبی و سەربازییەکانی ڕێکدەخست.

لە چڕبوونەوەی ڕووداوەکاندا، ساڵی ١٩٦٣ صەدام حسێن عێراقی بەجێهێشت و چوو بۆ سوریا، تاکو چاوی بەسەرکردەکانی حیزبی بەعس بکەوێت، چاوی بە میشێل عەفلەق دامەزرێنەری حیزب کەوت و بەشداری گفتوگۆی لەگەڵ سەرکردەکانی حیزبداو تاوتوێی پەرەسەندن و هەڵچوون و داچوونەکانی ناو عێراقی کرد، هەروەها باسیان لە لێکترازانەکانی ناو حیزب کرد بەتایبەتی باڵی عێراق، هەروەها کێشمەکێشی نێوان باڵە جیاوازەکانی ناو حیزب، صەدام متمانەی عەفلەقی لەو ماوەیەدا بەدەستهێناو پەیوەندیان پتەو بوو، شتی زۆری بۆ بەعسیەکانی عێراق بەدەستهێنا، بوو بە جێگەی ڕەزامەندی و سەرنجی سەرکردایەتی قەومی حیزبی بەعس و وەك ئەندام هەڵیانبژارد، پەیوەندی حیزبی لەگەڵ میشێل عەفلەق و هەڤاڵانی سوریادا پتەوکرد.

لە دیارترین سیماکانی ئەو پەیوەندییە، سەرکردایەتی حیزب لە سوریا زۆر سووربوون

لەسەر ئەوەی کە دەبێت صەدام حسێن لە دیمەشق بمێنێتەوە، لەم بارەیەوە ئامۆژگاریان کرد، ئەویش پاش ئەوەی عەبدول سەلام عارف ئەوەی ئاشکرا کرد کە ئەندامانو کادیرانی حیزبو ڕێکخستنی سەربازی حیزب سەرقاڵی کودەتان بەسەریدا، ئامۆژگاری عەفلەقو سەرکردایەتی قەومی ئەوە بوو عارف صەدام لەناو دەبات، بەڵام صەدام گوێی لە ئامۆژگارییەکانیان نەگرتو بۆ بەغدا گەڕایەوە.

پاش لێکۆڵینەوەو وەدووکەوتن دەزگا ئەمنیەکانی عەبدول سەلام عارف توانیان لە ١٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٤ دا صەدام حسێن دەستگیر بکەن، بەرەو زیندانو گرتووخانەیەکی سەربازی پەلکێشکراو خرایە ناو زیندانێکی تاکە کەسیەوە لەوێدا هەموو جۆرەکانی ئەشکەنجو ئازاری بینی.

سەرکردایەتی نەتەوەیی حیزبی بەعس لە سوریاو عێراق لە بواری بەدواچوونی هەواڵی لە زیندانو خۆڕاگری لەبەردەم ئەو هەموو ئەشکەنجە دڕندانەیەدا، بڕیاریاندا وەک ئەمین سری حیزب هەڵبژێردرا، ئەگەر چی لەوکاتەدا لە زینداندا بوو.

تواناو لێهاتووی‌و پتەوی‌و هێزی ڕێکخستنی لەوێدا دەرکەوت کە نەخشەی بۆ هەڵهاتنی دووەمی کێشا، بەڕاستیش لە کردەیەکی پاڵەوانی‌و ووردو تۆکمەدا لە زیندان هەڵهات، ئەویش بەهۆی هاوکاری هەندێك لە هاوڕێکانی لە کادیرانی حیزب، کە لەکاتێکدا بەرەو دادگای سەربازی دەبرا بۆ دادگایی کردنی، ئەمەش لە ٢٣ی یۆلیۆی ١٩٦٦ دا بوو، ئەم هەڵهاتنە بووە شۆکێکی گەورەو لەرزاندنی بەهێزی دەسەڵاتی حوکمی عەبدول سەلام عارف، دەزگا ئەمنیەکان لە هەموو شوێنێك بەدوایدا دەگەڕان، لەو کاتەی صەدام لە زیندان بوو ڕێکخستنێکی نهێنی دروست کرد بوو سەر بە حیزب بوو، کە بریتی بوو لە دەزگایەکی ئەمنی لەناو حیزبدا، کە بەناوی (حەنین) ناسرابوو، لەگەڵ کاری ئەمنی یەکەیەکی بەرپرسیاری هەبوو بۆ جوتیارانو ڕێکخستنی ژنان لە حیزب.

لەو کاتەدا عەبدول سەلام عارف بەهۆی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەیەوە گیانی لەدەستدا، پاش ئەو براکەی عەبدول ڕەحمان عارف هاتە سەر حوکم، لەو کاتەدا حیزب پلان بۆ ئەوە دادەڕێژێت کە دەسەڵات بگرێتە دەست، لەوکاتەدا صەدام حسێن ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە سەرپەرشتیکردنو نەخشەدانانی کودەتایەك بەسەر عەبدول ڕەحماندا، بەم شێوەیە شۆرشی تەموز لە ١٩٦٨ دا سەرکەوت، کە توانیان دەسەڵات بڕوخێننو

بەسەرۆکایەتی صەدام توانرا گەمارۆی کۆشکی کۆماری بدرێت‌و بانگەشەی کۆتایهێنانی ڕژێمی کۆن‌و سەرەتای سەردەمێکی نوێی بۆ عێراق کرد.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش بەسەرۆکایەتی فەریق روکن ئەحمەد حەسەن بەکر پێکهات، صەدام نەکرا بە جێگری، ئەگەر چی هەڵسوکەوتی جێگری دەکرد، تاکو لە ١٩٦٩/١١/٩ بەڕەسمی کرا بە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی شۆرش، ئەوکات تەمەنی سی‌و سێ ساڵ بوو، لەگەڵ بەرپرسیارێتی ئەمین سرِی حیزب‌و بەرپرسی ئەمنی ناوخۆ.

لەماوەی ئەو دە ساڵەی وەك جێگری سەرۆك بەسەری برد، توانی بەشدارییەکی کارا بکات لە بوونیادنانی دامەزراوەکانی دەوڵەتدا، هەر لە سوپای عێراق‌و دەزگای ئەمنی‌و هەموو دامەزراوەکانی حوکم‌و خزمەتگوزاری گشتی، دەستی کرد بەسەرپەرشتی‌و جێبەجێ کردنی گەشەسەندنی گشتگیر لە عێراق تاکو ڕووکاری ژیان بگۆڕێت‌و سوود لە سەرچاوەو تواناکانی عێراق وەرگرێت.

لەم ماوەیەدا پەیوەندی باشی لەگەڵ هەردوو جیهانی عەرەبی‌و ئیسلامی دروستکرد، پەیوەندی لەگەڵ چەندین دەوڵەتی جیهاندا بەست، لە گرنگترین کارەکانی صەدام لەو کاتەی جێگری سەرۆك بوو، جێبەجێکردنی چەندین پرۆژەی ستراتیژی گەورە بوو، بەتایبەتی وەستانی لە پشت بڕیاری خۆماڵی کردنی نەوت لە ساڵی ١٩٧٢ دا، پرۆژەیەکی خوێنەواری بەرفراوانی دەستپێکرد لەسەر ئاستی وڵات‌و هەڵمەتی نەهێشتنی نەخوێنەواری، کە حوکمی سێ ساڵ زیندانی دەرکرد بۆ هەر کەسێك کە لە پۆلەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری دوابکەوێت تا فێری خوێندن‌و خوێندنەوە دەبێت، لەگەورەترین بەرهەمەکانی ئەم پرۆژەیە سەدان هەزار عێراقی بە ژن‌و پیاوو منداڵەوە فێری خوێندەواری بوون.

صەدام لە ٦ی مارسی ساڵی ١٩٧٥ لە جەزائیر، پاش ئەوەی سەرۆکی جەزائیری هەواری بو مدین کەوتە نێوانیان بۆ مۆر کردنی ڕێکەوتننامەیەك لەگەڵ ئێرانی شا محمد ڕەزا پەهلەوی بۆ کێشانی سنووری نێوان عێراق‌و ئێران‌و لەگەڵ دابەشکردنی شەتولعەرەب، ئەویش لەبەرامبەر ئەوەی ئێران دەست لەکاروباری ناوخۆی عێراق وەرنەدات‌و جێگری‌و ئاسایشی تێکنەدات، لەوانە پاڵپشتی نەکردنی هەڵگەڕانەوەی کوردەکان لە باکوری عێراق.

لەحەفتاکاندا صەدام سەردانی فەرەنسای کرد بۆ بوونیادنانی پرۆژەیەکی گەشەپێدانی

ستراتیجی زەبەلاح بۆ وزەی ئەتۆمی ئاشتیانە.

سەرکردایەتی وەفدی دانووسانی لەگەڵ سەرکردەکانی کورد کرد لە باکوری عێراق، پاش دانوسانێکی ماراسۆنی، کە ئەو ئەندازیاری ڕاستەقینەی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی بوو کە لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤ دا بەخشرا بەکەمینەی کوردی، کەئەم حاڵەتە بێوێنە بوو لەچاو ئەو شوێنانەی تر کە کوردی لێیە وەك ئێرانو تورکیاو سوریا.

لە ١٦ی حوزەیرانی ١٩٧٩ هۆکارەکانی ڕاگەیاندنو ڕادیۆو تەلەفزیۆن لە عێراق پەخشی خۆی ڕاگرت تاکو بەیاننامەیەکی گرنگ بخوێنێتەوە، کە سەرۆك کۆمار ئەحمەد حەسەن بەکر دەست لەکار کێشانەوەی لە پۆستەکەی خۆی ڕایگەیاند، بەهانەی بۆ ئەم کارە ئەوە بوو کەچووەتە تەمەنەوەو باری تەندروستی باش نییە، ئەوکات نفوزی صەدام زۆر بەهێز بوو، بۆیە لەو بڕوایەدا بوون کەصەدام لەپشت ئەم دەست لەکار کێشانەوەیە بێت، تاکو ڕێگا بۆ خۆی خۆش بکات دەسەڵات بگرێتە دەست.

صەدام حسێن لە عێراق حوکمی گرتەدەست، وەك سەرۆك کۆمارو ئەمینداری گشتی حیزبو سەرکردەی ئەنجومەنی شۆڕش هەڵبژێردرا،یەکەم هەنگاوەکانی لە سەرۆك کۆماریدا دەستپێکردو هەڵمەتێکی بەرفراوانی بۆ چاکسازی لەناو حیزبو دەوڵەتدا دەستپێکردو بووە سەرۆکی کردەی چاکسازیو پاکتاوکردن ... لەوێوە لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی عێراق دەستی پێکرد، کە لە بەشەکانی تری ئەم کتێبە ئاشکرای دەکات.

# بەشی یەکەم

سەرەتا

داواتان لێدەکەم کەحوکمی دادگا دەرچوو بەدبینی نەبن
هەروەها مێشکتان قاڵ مەکەن بەوەی چاوەڕێی دەرچوونی
حوکمی دڵخۆش نەبن، ئەگەر دەرچوونی حوکم دواخرا
ئێوە مەسەلەکەتان نەدۆڕاندووە.
لەوانەیە جەستە بمرێت، بەڵام مەسەلەکەمان زیندووەو نامرێت.

صەدام حسێن لەبەندیخانەدا

سەرم لەوە سورِما بوو لە نێوان ئەوەی دوژمن ڕایگەیاند کە ئامانجی گەورە خەریکە نزیک دەبێتەوە، هەروەها لەوەی گوێم لە مۆسیقایەکی بڵند بوو لە یەکێك لە کۆشکەکانی سەرۆکایەتیدا، بەئامادەبوونی ئەوەی بەئەنجومەنی دەسەڵاتو بریمەرو جۆقەی سەرۆکایەتی سوپای داگیرکەری ئەمریکی، کەشی عێراق پڕ ببوو لەبۆنی باروتو مەرگو تێکەڵاو بوونی بۆمبی بەرگری لەگەڵ تۆپی دوژمن، ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێك بوو، ئەو ڕۆژەی عێراق ، کەلە هیچ ڕۆژێکی تر نەدەچوو، ڕۆژێکی زۆر درێژ کە کۆتایی نەدەهات، زستان نزیك ببوەوەو هەور بە ئاسمانەوەو خۆریش ملی داداوە، خۆری بەغداد بەرەو ئاوابوون دەچێت، میللی کاتژمێرەکان خێرا دەکەن، کاتژمێری سفر خەریکە لێدەدات، تاکو بەیاننامەکەی ئەمریکا ڕایگەیاند کە ئامانجێکی گرنگیان دەستگیر کردووە .. حاڵەت چاوەڕوانی .. چرکە ساتێکی ترسناك تێدەپەڕێتو مێشك تووشی شڵەژان دەکات، دەبێت چ ئامانجێك بێت پاش داگیرکردنی بەغداد، چاوەڕوانیەکی سوتێنەر، پاشان کارەساتێکی تر دێت، ئەویش بەدیل کردنی صەدام حسێنە، خەڵك واقیان وڕماوەو باوەڕ ناکەن، دەپرسن: بەڕاستی ئەوە سەرۆکە یان هاوشێوەیەکەیەتی، لەناخیاندا دەڵێن هیوادارین هاوشێوەکەی بێت، خەڵکی داوایان لە خاوەن موەلیدەکان دەکرد کارەبایان بدەنێ تاکو تەماشای شاشەی تەلەفزیۆن بکەن، هەواڵی هاوشێوە لە هەموو شارەکانی عێراق بڵاوبووەوە، بەتایبەتی لە ڕۆژی پاش دەستگیرکردنی خەڵك دەیانووت صەدام لە شاری فەلوجە بینراوە، لەبەر ئەوە تەقەی خۆشی لە هەموو پارێزگاکانی عێراق دەستی پێکرد، لە خۆشی ئەوەی سەرۆك ئەسیر نەکراوە، من یەکێك بووم لەوانەی تەقەی خۆشیم کرد، بەڵام لەناخمدا باوەڕم بەو چیرۆکی هاوشێوەیە نەکرد، رەغد قسەی بۆ یەکێك لە کەناڵە ئاسمانیەکان کردو وتی کاتێك ڕاوی شێریان کردبوو، تەخدیر کرابوو.

پرسیارێك ناخمانی دەهەژاند، ئەمریکیەکان لەبەر چی ویستیان صەدام بەو وێنەیە نیشان بدەن، ئایا صەدام دەبرێتە بەر دادگا، چ دادوەرێك دەوێرێت دادگایی ئەو سەرکردە نەتەوەیی‌و نیشتمانپەروەرەدا بکات .. ڕووداوەکان بەدوای یەکدا هاتن.

## دەستەی پارێزگاری لە سەرۆك

مانای چی صەدام حسێن بکەوێتە ژێر چەپۆکی دوژمنان ؟ بەپێی یاسای نێودەوڵەتیو عێراقیو نەریتو ئەخلاق، صەدام حسێن سەرۆك کۆماری عێراقە، سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانی عێراقە، ئەمریکییەکان خۆیان ڕایانگەیاند صەدام حسێن دیلی جەنگە، بەپێی ڕێکەوتننامەکانی ژنێڤ تایبەت بەدیلی جەنگ، دەبێت وەك دیل مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵام صەدام حسێن وەك دیل نەکەوتە بەردەستی دوژمنان کە ڕێز لەیاساو ڕێکەوتننامەو عورفە جیهانیەکان بگرێت، بەڵکو کەوتە دەست کۆمەڵێك سیاسی ئەمریکی کە هەێندەی نوێنەرەکانیان لە عێراق ڕکیان لێیدەبووەوە، وەك قەوارەو مێژووە شارستانیەکانی کە ڕۆڵێکی پێشڕەوانەی لە شارستانی مرۆڤایەتیدا بینیووە، بەتایبەتی لە شارستانی عەرەبیو ئیسلامیدا، لە جولانەوەی هەستانەوەو خۆڕاگری عەرەبیدا بەرووی نەخشەی داگیرکاریو فراوانخوازیو بالادەستی کۆلۆنیالیو زایۆنیزمی، بەهەمان هێندە کارەساتی هێناوە، پرۆژەی هەڵلوشینی عێراقو دزینی سامانەکەیو دواتر لەناوبردنی هەموو ولاتە عەرەبیەکانی تر.

ڕۆژی دوای دیلکردنی سەرۆك صەدام حسێن، پارێزەرە پاڵەوانەکانی ئۆردن خۆبەخشانە ڕایانگەیاند کە بەرگری لە صەدام دەکەن، لە هەفتەکانی داهاتوودا دەستەیەکیان پێکهێنا جگە لە ئۆردنیەکان، پارێزەرێکی فەرەنسی تێدابوو بۆ بەرگریکردن لە صەدام حسێنو تاریق عەزیز، هەروەها پارێزەرانی عەرەب لە پێش هەموویانەوە دکتۆر عائیشە ئەلقەزافی، چەندینجار لەخۆم پرسی: ئەی پارێزەرە عێراقیەکان لەکوێن ؟ ئەوەتا ئەمریکا گاڵتە بە هەستی هەموو عەرەب دەکات بەوەی سەرۆکیان دیل کردووەو بەو شێوەیەش پێشانیاندا کە بۆ سەرکردەیەکی وا گەورە شیاو نەبوو.

لە ڕۆژی داهاتوودا، وەك ڕۆژانی تر چوومە دادگای شاری رومادی، لەوێ لەگەڵ هاوڕێکانم کۆبوومەوە، پێشنیاری ئەوەم بۆ کردن دەستەیەك بۆ بەرگریکردن لە سەرۆك دروست بکەینو خۆبەخشانە کاربکەین، لەخۆمەوە دەستپێدەکەم، هەندێك ڕازی بوون، هەندێك خۆیان پاراستو هەندێکی تر ڕەتیان کردەوە، لەنێو ئەوانەی ڕازی بوونو خۆبەخشانە هاتنە پێشەوە کە بەرگری لە سەرۆك بکەن سێ ژنە پارێزەر بوون، کە یەکێکیان پێشتر خێزانەکەی زیانی پێگەیشتبوو، بەڵام زۆر بە پەرۆشەوە ئامادە بوو بەرگری لە سەرۆك بکات، بەڵام ئەوانەی خۆپارێزیان هەبوو، باسیان لە مەترسی بارودۆخەکەو مەترسی ڕێگاکە دەکرد، وا حسابیان کردبوو سەردەمی صەدام حسێن کۆتایی هاتووەو جارێکی تر ناگەڕێتەوە، چ سوودی هەیە خۆیان بخەنە ناو ئەو گێژاوەی

کۆتاییەکەی دەزانن، زۆرێك لەو هاوکارانە لەوانە بوون کە دەیانویست بە هێمنیو ئاشتی بژین، بەڵام ئەوانەی ئەم کارەیان ڕەتکردەوە، لەو پارێزەرانە بوون کە سەر بە ڕەوتو پارتە جیاوازەکان بوون.

ئەو کاتە هەستم کرد ئێمە ئەرکێکی گەورەمان لەسەر شانە کە بەیەك هەڵوێست لەگەڵ برا ئۆردنیو عەرەبیەکاندا دەوەستین، بەڵام نەقیبی پارێزەران وەك دامەزرێنەری دەستەکە من ببم بە سەرۆکی، ئەگەر چی بارودۆخی عێراقمان لەبەرچاو بوو، کۆبوونەوەیەکمان ئەنجامداو بڕیارماندا نامەکانمان نهێنی بێتو نەقیبی پارێزەرانی ئەنبار خۆی ببێت بە سەرۆکی دەستەکە، بەڵام ئەو پێشنیاری منی کرد، ڕۆژی دواتر چووینە سەندیکای پارێزەران تاکو دەستەکە بەشێوەیەکی ڕەسمی پێکبهێنین، پارێزەر (زیاء ئەلسەعدی) ئەمین سڕی سەندیکا دەستی بە توندی گوشین، کە ئەو باشترین یارمەتیدەری هەموو پارێزەرەکانی عێراقە، عەرەبێکی ڕەسەنو نیشتمانپەروەر، کە نەلەنزیكو نەلەدوور پەیوەندی بە سەرۆك صەدام حسێنەوە نەبووە.

فەلوجە وێسگەی دووەممان بوو، لە ڕۆژی سێیەمدا چووین بۆ ئەوێ، بەڵام نەقیبی پارێزەران ناوی پارێزەرە خۆبەخشەکانی نەداینێ، لەبەر ئەوەی دەترساو باوەڕی بەنییەتی ئێمە نەبوو، لەوانەیە لەمەیاندا لەسەر هەق بووبێت، پاش تاوتێکردنی بابەتەکە، لەسەر فکرەکەمان ڕازی بوو، پاش ئەوەی متمانەیان پێکردین دواتر ناوەکانیان داینێ.

وێستگەی دواترمان شاری حەدیسە بوو، پاشان شاری ئەنبار، تاکو ژمارەی پارێزەرەکان گەیشتە (٩٠) پارێزەری ژنو پیاو، دەستەکەمان ناونا (دەستەی بەرگری ئەنبار)، وێستگەی گرنگمان شاری بەغداد بوو کە دەیەها پارێزەر لەهەردوو ڕەگەز ئامادەییان نیشاندا، دواتر ژمارەکە گەیشتە سەدان پارێزەر لە ناویاندا سونیو شیعیو مەسیحیو کوردو تورکمان هەبوون، پاشتر کۆنگرەیەکمان لە سەندیکای پارێزەران بەست، بەکۆی دەنگ خەلیل ئەلدلێمی، هەروەها پارێزەری شەهید خالید ئەلعوبێدی وەك جێگری سەرۆكو دکتۆر حەمید ئەلسەعدون وەك وەتە بێژی ڕەسمی دەستەکە ڕاگەیەنرا.

لە ڕۆژانی یەکەمی پێکهێنانی دەستەکەدا، هەڤاڵانی ئەنبار لە بەغداد پشتگیریان لێدەکردم، پاشان بەپێی نووسراوێك کە لەلایەن خێزانی سەرۆکەوە ئاراستەی دادگا کرا، هەموو پارێزەرەکان وەلانران، جگە لەمن، ئەویش لەسەر بنەمای ڕاوێژی ڕاوێژکاری یاسایی خێزان بۆ مەبەستی ڕێکخستن.

پاش ئەوەی کرام بە سەرۆکی دەستە، ئەرکی قورس دەستی پێکرد، دەبوایە بەبەردەوامی بچوومایە بۆ سەندیکای پارێزەران لە بەغداد ئەویش بەئەرکێکی نیمچە نهێنی،

لەسەر ئاستی خێزانی سەرۆک، کەس نەیدەزانی من بووم بە سەرۆکی دەستەی بەرگری لە سەرۆک صەدام حسێنو هەڤاڵەکانی، تەنها یەک برام نەبێت، کە پەیوەندییەکی گەرممان پێکەوە هەبوو، خێزانەکەم دەیپرسی لەبەرچی ڕۆژانە سەردانی بەغداد دەکەمو کاری پارێزەریم بەجێهێشتووە، ئەمە جگە لەوەی باری ماددیمان زۆر خراپ ببوو، ئەویش بە هۆی ئەوەی ناچاربووم کارەکەم جێبهێڵم، وەڵامم بۆ خێزانەکەم ئەوە بوو کە لە سەندیکای پارێزەران حوکمم هەیە.

یەکێك لە برا گەورەکانم، لە شوێنێکی دوور لەمن دەژیا، پاش ئەوەی هەواڵی تەوکیل کردنەکەم بڵاوبووەوە پرسیاری لێکردم کە ئایا ئەو هەواڵە ڕاستە، کەواتە ئەو خەلیل ئەلدلێمە کامەیە ؟ هەموو جارێك دەمووت ئەو شێتە دلێمیە ماڵیان لە تارمیەیە، بەڵام برا گەورەکەی ترم بەبەردەوامی پێیدەووتم: تۆ هەمیشە ئەوە ڕەتدەکەیتەوە، بەڵام با پێتبڵێم کە ئەم کارەی تۆ سەرکەوتوو نییەو دەرئەنجام دەردەکەوێت، هەروەها ئەمریکیەکان هەرگیز سەرۆك بەرنادەن، ئەترسم ئەمریکیەکان نیازیان بێت لەناوی بەرن، لەبەر ئەوەی ئەوان ئەم دەرئەنجامەیان دەویست، ئەوەی ویستیان بەرامبەری کردیان، من لەوە دەترسم تۆ ئەم کێشەیە بدۆڕێنیت، ئەوا زمانت لێدرێژ دەکەنو بەکەمتەرخەم تۆمەتبارت دەکەن، چۆن کارێکی وا دەکەیت کە لەتواناو ووزەی ئێمەدا نییە، پاشان سەیری منداڵەکانت بکە، تۆ خێزانێکی گەورەت کەوتووە بەسەرداو لەولاشەوە وازت لە ئیشو کارت هێناوە.

لەملاو ئەولا دەنگی ناڕەزایەتی بڵاوببووەوە، هەموویان لە ژیانی من دەترسان ژیانی خۆمو خێزانەکەم، هەندێکی تر دەیانوویست ورەم بروخێنن، بەوەی کە پێویست ناکات خۆمان بخەینە مەترسیەوەو دەرئەنجامیش لای هەمووان ئاشکرایە، بەڵام من بڕیارم دابوو لەسەر کارەکەم بەردەوام بم، لەبەر ئەوەی سەرۆك صەدام حسێن سەرۆکو سەرکردەمانە، ئێمەی پارێزەرانی عێراق لە هەمووان باشترین بۆ ئەوەی بەرگری لێبکەین، بەخۆم ووت ناوی خوای لێبێنە.

دەستم کرد بەدانانی ڕێو شوێن بۆ پاراستنی خۆمو خێزانەکەم، کە ترسێکی گەورە بەرەورووومان ببووەوە، وەنەماندەزانی کە سبەینێ چی بۆ حەشارداوین، دەبوایە هەزاران کیلۆ مەتر ببڕم بەناو زرێپۆشو تانکی ئەمریکیدا بڕۆم بۆ عەمان، هێزی ئەمریکی جارێکیان بەتانكو هامفیو سەدان مارینزەوە بە پاڵپشتی کۆپتەری ئاپاچیو بلاك هۆکەوە هێرشیان کردە سەر ماڵەکەم لەنیوەشەودا منداڵەکانیان تۆقاندم، ئەویش لە شەوی ٢٠٠٥/٥/١٥ دا کاتێك دەرگای ماڵەکەیان تەقاندەوەو بۆمبی دەنگیان تەقاندەوە، کە خانووی یەکەمم لە گەڕەکی ئەفسەران لە ڕومادی فرۆشتبوو، چومە دەرەوەی رومادی لە باکوری خۆرئاوای

شارەکە، منداڵەکانمو دایکە پیرەکەم بە تۆقیوییەوە لە بەرامبەر لێزمەی گولەی تفەنگی داگیرکەراندا وەستابوونو تفەنگی داگیرکەران لەسەر سنگیان بوو، لەو کاتەدا سەربازەکان ماڵەکەیان دەپشکنی، ئەوەی بەردەستیان کەوتبوو دزیبوویان، لەناو ئەوانەدا چلو چوار هەزار دۆلاری نرخی ئەو خانووەی کە لە رومادی فرۆشتبووم، هەروەها پێنج ملیۆن دیناری عێراقی، لەگەڵ ئاڵتونی خێزانەکەم، هەروەها ئەو کلاشنکۆفەی هەمبوو، ئەمە جگە لە دزینی چەندین کاغەزو دیکۆمێنتی گرنگ، ئەمە جگە لە شکاندنی کەلو پەلی ناو ماڵەکەم، هەموو ئەمانە بە بەهانەی ئەوەی ئەوان بەم شەوە درەنگە بەدوای تیرۆرستێکدا دەگەڕان، کە ئەوکات لە عەمان بووم لەگەڵ ڕەمزی کلارکو پارێزەر مامۆستا زیاد ئەلخەصاونە.

پاش ئەو پەلامارە دڕندەیەو دزینی هەموو ئەو سامانەی هەمبوو بۆ منداڵەکانم، کارەکەم ئاراستەیەکی قورسی وەرگرت، پاش ئەوەی خزمەکانم ئەو هەموو دەرگاو پەنجەرە شکاوانەیان بینی، بەرهەڵستکاریان لە کارەکەم زیاتری کرد، بەتایبەتی کەلەو پەلامارەدا یەکێك لە خزمەکانم بە گولەی ئەو هێزە کوژرابوو، هەروەها یەکێکی تر بریندار ببوو، ئەم پەلامارە بۆ ڕۆژی دوایی دووبارە بووەوە، ئەگەرچی سوپای ئەمریکی نکوڵی لێدەکرد، دواتر لەو کاتەی من لە ماڵ نەبووم، داوای لێبووردنیان لە خێزانەکەم کردبوو.

پاش ئەو پەلامارە ئەرکی سەرشانم قورس بوو، زۆرێك بەرەورووم دەبوونەوە، بەڵام هاندانی ئەو برایەم کە زۆر لێمەوە نزیك بوو، هەروەها سووربوونی لەسەر ئەوەی واز لەو کارە پیرۆزە نەهێنم، ئەمە جگە لەدابو نەریتی پارێزگای ئەنبار و هەموو عێراقیەکان بەشێوەیەکی گشتیو عەشرەتی دلێم بەتایبەتی، ئەوانە بوونە پاڵنەری سەرەکیم تاکو بەردەوام بم، لەو کاتەوە خۆم بە شەهیدێك دانا وەك فیداکاریەك بۆ عێراقو صەدام حسێن، ئەو پرسیارەی هەمیشە بەرەورووم دەبووەوە: لەبەرچی لەناو ئەو هەموو پارێزەرە عێراقیەدا تەنها تۆیان هەڵبژارد بۆ ئەرکێکی وا پڕ مەترسی ؟

لەبیرمە ئەوکاتەی سەرۆکی دەستە بووم لە عێراق پارێزەر زیاد ئەلخەصاونە، کە سەرۆکی دەستەی ئەوسا بوو لە ئۆردن، تاکو پیرۆزبای لە پارێزەر صالح ئەلعەرموتی بکەین بەبۆنەی ئەوەی وەك نەقیبی پارێزەرانی ئۆردن دەستنیشانکرا بوو، یەکێك لە هاوکارەکانم لێم نزیك بووەوە کە ئەندامی سەندیکای پارێزەران بوو لە ئۆردن، لە خۆشەویستیم بۆ عێراقو سەرۆك صەدام حسێن ڕێزی لێگرتم، هەمان پرسیاری لێکردم سەبارەت بەهەڵبژاردنم، وەك ئەوەی ئەو پیاوە بەم پرسیارە تووش بووبێت، بەڵام مامۆستا صالح ئەلعەرموتیو زیاد ئەلخەصاونەو زیاد ئەلنەجداوی پرۆتستۆی ئەم پرسیارەیان کرد، ئەو پیاوە ناچار بوو داوای لێبووردن بکاتو سەرم ماچ بکات، کە ئەو لەسەر هەق بوو کە

پرسیاری کرد. ئۆفیسی دەستەکە لە شاری رومادی بوو لە پارێزگای ئەنبار، لە شوێنێك کە تەنها چەند کەسێك نەبێت کەس نەیدەزانی لە کوێیە، هیچ پارێزەرێکی دەرەوەی شاری رومادی شوێنەکەی نەدەزانی، ئەویش لەبەر چەند هۆکارێکی ئەمنی، ئەو شوێنە بە کەسانی دڵسۆز پارێزرابوو، لە پێش هەموویانەوە فەریق روکن محمد ئەلفەهداوی، یەکێك لە سەرکردەکانی هێزی بەرگری (المقاومە) هەروەها شەهیدی پاڵەوان جاسم عەبدول حەمید ئەلفراجی، هەروەها پیاوانی ئازای تر کە کاتی خۆی هاتو باری ئەمنی باش بوو ناویان دەهێنین، ئەو خانووە خانووی پاڵەوانێکی دلێمی بوو کە دواتر ئازاری زۆری چەشت بەهۆی گرتنیەوە، ئەوەی زۆر دەچووین بۆ ئەو شوێنەو پەیوەندیکردن بە ئامێری سورەیا کە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە چاودێری دەکرا، هەروەها لە رێگەی بەکارهێنانی هێڵی ئەنتەرنێتەوە، یارمەتی هێزەکانی ئەمریکایدا کە پەلاماری ئەو شوێنە بدەن‌و لە شەوێکی درەنگ وەختدا، هەروەها گرتن‌و بەندکردنی ئەو پیاوە بۆ چەندجارێك، کە لەجارێکیاندا خەریك بوو بکوژرێت، ئەو پیاوە بوو بە پاسەوانی تایبەتیم لەو کاتەی لە نێوان بەغدادو ئەنبارو بەپێچەوانەوە هاتووچوم دەکرد، ئەو لەگەڵمدا بوو.

ئەم بنکەیە رۆڵێکی گرنگی لە کاتی دادگایی کردنی سەرۆك صەدام حسێندا گێڕا، کاتێك رۆژێکیان لەناو رێڕەوی دادگادا بووین، خەریك بوو دادگا رێگە لە دکتۆر نەجیب ئەلنعێمی بگرێت‌و نووسراوێکی سەبارەت بەمە بنێرێت، کاتێك لە یەکێك لە دانیشتنەکاندا هۆکاری ئەمەمان لە دادگا پرسی، دادوەر رەئوف نکوڵی لەمەکرد.

ئێمە زۆرمان پێویست بەو نوسراوە هەبوو، لە کاتی پشوودا تیمی دەستەکە لە ئەنبار خێرا بە ئیمێل نووسراوەکەیان بۆ ناردین، ئەم نووسراوەمان خستە بەردەم رای گشتی، هەروەها ئەو پاڵەوانەی ئەنبار زۆرێك لەو زانیاریانەی لە کاتی دانیشتنماندا پێویستمان پێبوو، بۆیان رەوانە دەکردین، لە رەتکردنەوەی بەهانەو درۆی شاهیدەکان، هەروەها پەیوەندی کردن بە ژمارەیەك سەرکردە سەربازی‌و مەیدانیەکان‌و سەرکردەی بنکەی هێزی ئاسمانی بوو لە پارێزگای سەلاحەدین، پاش شەهید بوونی سەرۆك ئەو هەڵدەستا بەکارەکانی، بەڵام رۆڵی نووسینگەی عەمان ((لەوانەیە نەشیاو بێت بەراوردیان بکەین بە هۆی پێگەی نووسینگەی ئەنبار لە ناو قەبارەی جەنگ لەو شوێنەدا، بەتایبەتی هەردوو نووسینگە خزمەتی یەك مەسەلە دەکات))، ئەو گەورەتر بوو بەهۆی ئەو توانا پیشەییەی تێیدا بوو، پێگەی لە دەرەوەی عێراق، هەروەها بوونی کادیرانی قەبە لە وەرگێڕو فەرمانبەران، هەروەها فەراهەمکردنی هەموو پێداویستیەکانی وەك راگەیاندن‌و پەیوەندیکردن‌و کارەباو هۆکارەکانی گواستنەوەو هتد ، هەروەها ئەتوانن بە ئاسانی

پەیوەندی بە تاکەکەسی خێزانی صەدام حسێنەوە بکەن، واتە خاتوو رەغد، کە نوێنەری خێزانی سەرۆك بوو بۆ تەخویلو هەلسوکەوت لەگەڵ دەستەی پارێزەرانی باوکی، ئەو ئۆفیسە بچوکەکاری گەورەو کاریگەری ئەنجامدا لە بەرامبەر دەزگایەکی قەبەی دەوڵەتێکی گەورە، کە لە ساختەکردنی ڕاستیەکان هونەری دەنواندو لە دروستکردنی درۆو لادان لە یاسا نێودەوڵەتیەکاندا وەستایەکی کارامە بوو.

لە مانگی ئاياری ساڵی ٢٠٠٤ دا پەیوەندیمان بە پارێزەر زیاد ئەلخەصاونیەوە کرد تاکو هەمئاهەنگی لە نێوان هەردوو دەستەدا بکات، عێراقو ئۆردن، لەو کاتەی گەشتی زستانو هاوین بە ڕێگەی سەرزەویدا دەستی پێکرد، ئەو ڕێگایە پڕ بوو لەمەترسی، ئەویش بەهۆی ئەوەی هێزەکانی ئەمریکا ڕێگای نێوان بەغدادو عەمانیان بڕیبوو، دەبوایە بە ڕێگای بیابانی نێوان ئەنبارو عەماندا بڕۆم، هەندێك شەو بەهۆی ڕەتڵی هێزەکانی ئەمریکیەوە لەو ڕێگایە شەوم دەکردەوە، کە نەیاندەهێشت لێیان نزیك بکەویتەوە، چەندجارێك بەهۆی نزیك بوونەوەم لەو ڕەتڵانە خەریك بوو بکوژرێم، یان بەهۆی ئەوەی دەستەی مقاوەمە چالاکیان لە دژی هێزی داگیرکەر ئەنجامدەدا.

لەماوەی چەند ڕۆژێکدا وەکالەیەکی سزایمان ڕێکخستو تەسلیمی سەندیکای پارێزەرانمان کرد، پاشان دامان بە دادگای سزایی ئەوانیش بە دەوری خۆیان دابوویان بە ئەمریکیەکان، تاکو صەدام حسێن ئیمزای تایبەتی خۆی لەسەر دابنێت، ئەو وەکالەتە ئیمزا کراوانەمان وەرگرتەوە بەهەمان ڕێگا بۆمان گەڕایەوەو دواتر ئێمەش دامانەوە بە سەندیکای پارێزەرانی عێراق، پاشان درا بەهەردوو دەستەی بەرگری لە عێراقو ئۆردنو خێزانی سەرۆك کە بریتی بوو لە یانزە وەکالەتی سزایی بۆ هاوەڵە پارێزەرەکانمان لە دەستەی بەرگری لە عێراق، ئەو وەکالەتە بنەما بوو کە پارێزەرەکان دەستیان بەکارکردن کرد.

### پارێزەری یەکەم:

پاش تەواو بوونی ئەو ڕێوشوێنانە، لە یاسای دادگادا ئەوەمان بینی کە دەبێت ناوی پارێزەری یەکەمی عێراقی دیاری بکرێت، کە لەلایەن پارێزەرە عێراقیو عەرەبیو بیانیەکانەوە دیاری دەکرێت، لێرەوە سەرکردایەتی شەرعی ناو زیندان هاتە وەڵام، دەبێت سێ پارێزەر بەپێی پێوەری تایبەتی دیاری بکرێت کە گرنگترین سیفەت ئازایەتیو نەزاهەت بوو، سێ پارێزەرمان دیاری کرد، هەڵبژاردنی پارێزەری یەکەم کەوتە سەر من، ئەمە جگە لە سەرۆکایەتی دەستەی بەرگری عێراقی، ئەوەی کارەکەی ئاسان کرد هەڵوێستی

نیشتمانی مامۆستا (ضیاء السعدی) بوو، کە ئەوکات ئەمین سڕی پارێزەران بوو، ئەو نەقیبی شەرعی پارێزەرانی عێراق بوو، بەڵام دەسەڵاتی داگیرکەر لای برد، لە هەموو بوارەکانی کارکردنماندا هاوکاری دەکردین، هەموو ئاستەنگیەکانی بەردممان دەسڕیتەوە، راوێژی یاسایی پێشکەش دەکردین، بەو سیفەتەی پارێزەرێکی کۆنی خاوەن ئەزموونی گەورەیە، هەموو کەلێنە شاراوەکانی پارێزەری نیشان دەداین، راوێژی ئەو بەپێی پێویست ئەو ئەمانەتە قورسەی لە مل کردینەوە، کە ئێمە لە تواناماندا نەبوو هەڵیگرین.

سەرەڕای ئەوەی لە دەستەی عێراق گرفتی زۆر گەورە تووشمان دەبوو، بەڵام برا پارێزەرە ئۆردنیەکان بەتایبەتی مامۆستا محەمەد ئەلرەشدان یەکەم سەرۆکی دەستەی ئۆردن‌و پارێزەر زیاد ئەلخەصاونەو چەندی تریش تووشی فشاری ناوخۆیی‌و دەرەکی دەبوون لەلایەن هەندێك لایەنەوە بۆ شێواندنی ناوی دەستەکەو ئەندامەکانی.

ئەم لایەنانە هەر هەموویان بۆ حسابی ئەجندای دەرەکی کاریان دەکرد، دەیانویست هەقیقەتەکان بشێوێنن‌و گرفت لە نێو پارێزەرەکاندا دروست بکەن‌و کەشێکی بێمتمانەیی لە نێوانیاندا دروست بکەن، ئەم ئەجندەیە تا رادەیەك سەرکەوتوو بوو، هەندێك لە ئامانجەکانی هاتەدی، بەو شێوەیە هەندێك لە ئەندامانی دەستە لە دەستەکە دوورخرانەوە یان پاشەکشەیان کرد، هەروەها دوو پارێزەری مالیزیمان لەدەستدا، کە بەسەرۆکایەتی سەرەك وەزیرانی پێشوو مەهاتیم محەمەد بوو، کە هەموو تواناکانی خۆیان خستە خزمەت دەستەکەوە، ئەمە جگە لەوەی تووشی فشاری گەورە هاتن‌و دەست تێوەردانی ناشرین لە کارەکانیاندا هەبوو، تاکو لەم کارە پیرۆزە دووریان بخەنەوە، ئەویش بەرگریکردنە لە سەرۆك صەدام حسێن.

بەڵام دەستەکە لە عێراق لەسەر کارەکانی بە چوست‌و چالاکی بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەو هەموو دەست تێوەردان‌و ئاستەنگی‌و هەوڵدان بۆ ناوزڕاندنمان، ئەمە جگە لەوەی ژمارەیەك لە پارێزەرەکانمان بەدەستی میلیشیا تیرۆرستیەکانی عێراق کوژران.

هەندێك پارت‌و میلیشیای سەفەوی‌و هەندێك لایەنی حکومی کە لەو دادگایە سوودمەندبوون لە رێگەی مۆبایل‌و ئیمێلەوە زانیاری ساختەیان بۆ دەناردین، کە باسیان لە زیندوو بوونەوەی ویژدان دەکرد، یان هەندێکجار باسیان لەوە دەکرد لەبەر هۆکاری ماددی ناچارن ئەو زانیارییانەیان بدەنێ، لەبەرامبەریشدا زۆرێك زانیاریمان دەستکەوت کە لە هۆڵی دادگاوە دەردەچوون، ئەویش لەلایەن هەندێك نیشتمانپەروەرەوە یان بە هۆی (زیندووبوونەوەی ویژدان) لای هەندێك یان بەهۆی کێشەیەك کە دەکەوتە نێوان ئەندامانی ئەو دادگایەوە، بەوپەڕی ئاگاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو زانیاریانە دەکرا.

لەبەر ئەوەی ئەم کێشەیە کێشەیەکی مێژوویی زۆر گرنگە، لەبەر ئەوەی ڕیزەکانی دوژمن تێیدا زۆرن، دەبێت ئەوە بڵێم چەندجارێك هەوڵی ئەوە دراوە بە پارەی خەیاڵی فریو بدرێم تاکو لەو ئەرکە پیرۆزە بەردەوام نەبم، بەڵام خوا پشتیوانم بوو، باوەڕیش لە سنگمدا پتەوبوو، شەرەفی بەرپرسیارێتی ئەو ئەرکەم لەبەرچاوی خۆم دانا بوو، لەگەڵ متمانەی ئەو پیاوە گەورەیەو عەشرەتو پارێزگاکەمو سەرجەم عێراق، هەروەها متمانەی هەموو ئەوانەی پشتگیریان دەکردم، هەروەها حوکمی نەوەکانی ترو مێژوو کە هیوادارم کە جێگەی ئومێدیان بن.

پاش ئەوەی دوژمن کۆڵیان لێدام، پیلانەکانیان گواستەوە بۆ لاپەرەیەکی تر، هەموو هەوڵیان بۆ فڕاندنو کوشتنم خستەگەڕ، بەڵام هەموو ئەو هەوڵانە شکستیهێنا، نامەوێت بچمە ناو ووردەکاریەکانەوە، ئەو قسەیە بۆ مێژوو جێدەهێڵم، ئەگەر لەو کارەدا بەهۆی توانای کەممانەوە سەرکەوتوو نەبین، ئەوا داوای لێبووردن لە نەوەکانی داهاتوو دەکەین، ئەگەر سەرکەوتوو بووین، بەجیا لە دەرئەنجامەکەی کە پێش وەخت دانراوە، ئەوا سوپاسی خوا دەکەین، دەبێت ووتەیەکی دڵسۆزانە بۆ هاوڕێکانم بکەم، کە تەواو دڵسۆز بوونو سەرۆك خۆشی ویستوون، باسی لە شادمانیو پێزانینی خۆی بۆ کردوون، بەتایبەتی پارێزەرە عەرەبەکانی وەك دکتۆر عائیشە قەزافیو مامۆستا نەجیب ئەلنعێمیو مامۆستا صالح ئەلعەرموتیو مامۆستا ئەمین دیبو چەندی تر لەو پارێزەرانە، هەروەها لەگەڵ مامۆستا ڕەمزی کلارك لە هاوەڵە بیانییەکانمان.

بۆ ڕاستی ئەڵێم هیچ پارەمان نەبوو، هەروەها هیچ پاڵپشتێکی مادديشمان نەبوو، لەکار وەستاینو نووسینگەکانمان داخستو بەئەرکی پارێزگاری کردن لە سەرۆك صەدامو هەڤاڵەکانی پەیوەست بووین.

لە مانگی ٨ی ساڵی ٢٠٠٥ دا بارودۆخی دەستەو نووسینگەکەی ڕومادی دەگاتە ئاستێك کە نەتوانین وەك پێویست کاربکەین، کاتێك خاتوو ڕەغدەی کچی سەرۆك بەحاڵی دەستەکەمانی زانی، پاڵپشتی کردینو دوو کۆمپیوتەری بە هەموو پێداویستیەکانیەوە بۆ کڕین، لەگەڵ دابینکردنی خەتێکی ئەنتەرنێت تایبەت بە ئۆفیس لە ئەنبار تاکو پەیوەندیمان بە جیهانی دەرەوە هەبێت، ئەویش لەو کاتەی هاتووچۆ کەمبووەوەو قەدەغەکردنی هاتووچۆ زیادی کرد، هەروەها موەلیدەیەکی کارەبایی ١٣ KV بۆ کڕین، هەروەها پێداویستی چاپو کاغەزو شتی تر، هەروەها موچەیەکی سێ سەد دۆلاری بۆ دوو کارمەند کە لەو ئۆفیسەدا کاریان دەکرد بڕیەوە، هەروەها مۆبایلێك بۆ پەیوەندی نێودەوڵەتی.

لەبەر ئەوەی پێویستم بە پاسەوانێك هەبوو بۆ زامنکردنی هاتووچۆ لە نێوان عەمانو بەغدادداو بۆ پاراستنی خێزانەکەم لە ڕومادی، لەبەر ئەوەی سەرقاڵی کاروباری دەستەکە بوومو لە کارکەوتبووم، خێزانی سەرۆك پارەی سێ پاسەوانی بۆ دابین کردم، لەگەڵ کرێی هاتووچۆکانم بۆ ماوەی پێنج مانگ لە ٢٠٠٥/١٠/١ وە بۆ ٢٠٠٦/٣/١، بەهۆی بارودۆخی ماددی خێزانی سەرۆکەوە هەندێك خەرجی تر لەلایەن کەسانی دڵسۆزەوە دابین دەکرا، وەك دابینکردنی شوێنی مانەوە بۆ پارێزەرەکان لە ئوردنو هاتووچۆیان بۆ بەغدادو گەڕانەوەیان بە پێچەوانەوە.

ئەوەی جێگەی باسە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو لایەنە پەیوەستەکان بە پرۆژە داگیرکارەکانیەوە لە عێراق، بە هەموو هۆکارێك هەوڵیاندەدا دەستەی بەرگری سەرۆك صەدام حسێن لەناو ببرێتو تەوقی ڕزگاربوونی سەرۆكو هاوڕێکانی نەشکێنێت، هەروەها سیناریۆی دادگاییەکان سەرکەوتوو بێت، ئەویش لەبواری هەوڵدان بۆ زانینی چی لە ئەجندای دەستەی بەرگریدا هەیەو نەخشەو ئامادەکاری بۆ چی دەکەن، هەوڵیاندا دزە بکەنە ناو دەستەکەوە ئەویش لەلایەن ئەفسەرێکی CIA وە، کە بەڕەگەز عێراقی بوو زۆر هەوڵیدا لە ڕێگەی پەیوەندی ئەلیکترۆنیەوە بێتە ناو دەستەکە، ئەو دەزگایە کەسانی تری پاڵپێوەنا کە کێشە لەناو دەستەدا دروست بکەنو دیاریترین کەسەکانی لێ دووربخەنەوەو کەنارخستنی پارێزەرە بە تواناکان، کە جێگەی باوەڕی صەدام حسێن بوون، هەندێك لەو هەوڵانە سەریان گرت کە بوونە هۆی وەلانانی هەندێك لە سەرۆکی دەستەکان لە پارێزەرە عەرەبە پاڵەوانەکان.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانو گاڵتەجاڕییە، یەکێك لە ڕاوێژکارەکانی یاسایی CIA کارەکەی گۆڕیبوو لە ڕێکخەری ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ ڕاوێژکاری یاسایی لە دەستەی دادگای ئەمریکی – ئێرانی، دەستە داوای لە دادگا کرد بەشێوەیەکی ئاشکرا وەلابنرێت، ئەویش پاش ئەوەی سەرۆك صەدام حسێن بۆ ئەم مەبەستە پێشکەشی کرد، بەڵام بێسوود بوو، ئەم ڕاوێژکارەی CIA بوو بە ڕاوێژکاری دەستەی دادگا کە بە عێراقی ناودەبرێت، بە هەموو شێوەیەك هەوڵیدەدا سەرۆکی دیل بەرەو لە سێدارەدان بەرێت، دەست لە کاری دەستەو چۆنێتی بەڕێوەچوونی کارەکانیدەدا، ئەو ڕۆژەی بڕیاری ئەمریکی – ئیسرائیلی – ئێرانی دەرکرا ، بڕیاری لە سێدارەدانی سەرۆك کۆمار صەدام حسێن لە ٢٠٠٦/١١/٥.

دەستەو سەرۆكو ئەندامانیو ئەوانەی لە تیمی بەرگریدا بوون لە دەرەوەی دەستە، لە بارودۆخێکی زۆر قورسدا دەژیاین، زۆر لە ئاڵۆزیو مەترسی لە ڕێماندا بوو، ئاکار گەیشتە

کوشتنی ژمارەیەك لە ئەندامانی دەستە، ئەگەر ئێمەی تیمی بەرگریکار ئەو هەموو سەختیەمان تێپەڕاندبێت، ئەو هەموو مەترسیەمان تێپەڕاندبێت، بەڵام ئێمە لەو باوەڕەداین تاکو ئێستا خزمەتی گەلی عێراقی بریندار دەکەین، خزمەتی ئایندەی عێراق دەکەین جا داگیرکەری ئەمریکیو هاوپەیمانەکانو گورگەکان چ پلانێك بگێڕن، جا ئەمانو بەکرێگیراوەکانیان چەندێك تاوانی دڕندەو پاکتاوکردن لە دژی گەلەکەمان ئەنجامبدەن، ئەوا بەم زووانە دەڕۆن، ئەو کاتە زۆر لەوە نزیکترە کە بیریان لێکردووەتەوە، عێراق بە هیمەتی هێزەکانی مقاوەمەی عێراقیو دەستەو هێزی عێراقی نیشتمانیو نەتەوەیی دەگەڕێتەوە. سەربەخۆییو یەکبوون ڕۆڵێکی سەرەکیە لە ئەرکەکانی نەتەوەیی عەرەبیو ئیسلامی، هۆکاری هاوسەنگیو سەقامگیری سەرەکییە لەم بەشە زیندووەی جیهان.

بۆ مێژوو، بە ئینسافەوە لەگەڵ هاوەڵە پارێزەرەکانم وتمان: ئەو ڕایەی لە ساڵی ٢٠٠٥ دا لەسەری ڕێککەوتین ئەوەیە لە کاتی دادگایکردندا سەرۆك ڕۆڵی پارێزەرو سەرکردە بگێڕێتو وەك پیاوی یەکەم دەربکەوێت، نەك وەك تاوانبارێکی لاواز، وەك ئەوان دەیانویست کە هیچ هێزێکی نەبێت تەنها لەلای پارێزەرەکانیەوە نەبێت، لەبەر ئەوە دەستە پاڵپشتی لێکرد، ئەم بیرۆکەم کاتی خۆی لای سەرۆك باس کرد، پێشوازی لێکرد، بەڵام مەسەلە هونەریە ڕووتەکانی بۆ ئێمە جێهێشت، لەبەر ئەوەی هەرگیز کاری پارێزەری نەکردووە، لەم سۆنگەیەوە دەستمان پێکرد کە پیاوێکی وەك صەدام حسێن بە هەموو تواناو شکۆو ئازایەتیەوە پێویستی بەکەس نییە بەرگری لێبکات، بەتایبەتی ئەمریکاییەکانو دەستو پێوەندەکانیان هەوڵیاندەدا وەك تاوانبارێکی لاواز نیشانی بدەن، سەرۆکی شەهید لە یەکێك لە دانیشتنەکاندا بە دادوەری وت (ئەی دادوەر، لەگەڵ شانازیکردنم بەو پارێزەرە سەربەرزانە، بڕیاری خۆم کۆتاییە، مافی ئەوەتان نییە ڕۆڵی من ڕەتبکەنەوە، لەبەر ئەوەی پارێزەر وەکیلە نەك بەدیل)، لە ڕاستیدا هەر وایە، هەر لەسەر ئەمە ڕێکەوتینو قەناعەتیشمان بەمە هەبوو.

# بەشی دووەم

## گەشتی چاوپێکەوتنی مێژوویی

خەلیل کوڕم، بەخوا ئەمڕۆ کوڕ کار بۆ باوکی ناکات،هەروەها باوك کار بۆ کوڕەکەی ناکات، ئەوەی تۆ دەیکەیت کەس نایکات، خوا ئەوەندە دەرفەتم بدات هەندێك لەچاکەکانت بدەمەوە، هەرچی بکەم ناتوانم چاکەی تۆ بدەمەوە، من دەزانم تۆ بەم بەرگریکردنەت لەمن چ نرخێکی گران دەدەیت کە ئەویش ژیانی خۆتە، خوا لەبری کوڕە شەهیدەکانم تۆی پێبەخشیم.

صەدام حسێن لە زینداندا

گەشتی دووەمی نەهامەتیەکانم دەستی پێکرد، ئەمجارەیان لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا، زیاتر لە جارێك داوامکرد چاوم بە صەدام حسێن بکەوێت تاکو گوێی لێبگرمو گوێ لە ئامازەکانی بگرم، لەوانەیە لەبەر ئەو خولیایە بێت کە حەزم دەکرد ڕووبەڕوو چاوم بە سەرۆکەکەم بکەوێت، کە پێشتر تەنها لە تەلەفزیۆندا بینیبووم، زۆر چاوەڕێم کرد بەلام وەلام نەبوو.

لە ڕۆژی ٢٠٠٤/١١/٢٦ دا نەقیبی پارێزەرانی عێراقی بۆ کارێکی گرنگ بانگی کردم، دالغەی زۆرهات بە مێشکمدا، لەوکاتەی لە ئۆتۆمبێلەکەی خۆمدا بووم، لە نێو هەراو زەنای ئۆتۆمبێلی سەربازی ئەمریکیدا، لەگەڵ ئەو هەموو مەترسیانەی هەبوون، کە نەدەبووایە لێیان نزیك بکەوینەوە، گەیشتمە بارەگای سەندیکا، کەسێك کە نوێنەرایەتی دادگای دەکرد بە چرپە پێی وتم لەگەڵ سەرۆك صەدام حسێن چاوپێکەوتنت هەیە لە ڕۆژی ٢٠٠٤/١٢/٨ دا، بەلام دەبێت ئەم مەسەلەیە بە نهێنی بمێنێتەوە، لەبەر چەند هۆکارێکی ئەمنی، بەر لەوەی بڕۆم، نەمدەتوانی ئەم هەواڵە بە ڕاست بزانم، داوای لێکردم ژمارەی ئۆتۆمبێلو ڕەنگو مۆدێلو ووردەکارییەکانی بدەمێ، ئایا هەر خۆم دێم یان کەسێکی ترم لەگەڵدایە، بە چ ڕێگایەکدا دێم، خالی سفر کەدەبێت لەوێبم، پرسیارگەلێکی زۆری سەرسوڕهێنەر، ناچاربووم ووردەکاری تەواوی بدەمێ.

پاش دوو ڕۆژ زەنگی مۆبایلەکەم لێیدا، ئەوکات لە ڕومادی بووم، بە زمانێکی عەرەبی کرچوکاڵ وتی من وەرگێرمو لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا کار دەکەم، کە صەدام حسێنی تیا زیندانە، لێی پرسیم ئایا من پارێزەر خەلیل ئەلدلێمیم، پاشان کاتی سەردانەکەی پێدام، هەمان ڕۆژ بوو ٢٠٠٤/١٢/٨، هەروەها ئەو شوێنەی دەبێت لەوێدا ئامادەبم، جەختی لە نهێنی ڕێوشوێنەکان کردەوە، ئەویش لەبەر ترسناکی بارودۆخەکە لەسەر ژیانم.

چەند چرکە ساتێکی مێژوویی بوو، ناتوانم وەسفی بکەم، یان وەسفی ئەو هەستە ڕاستو چەپانە بکەم، کە لە مێشکمدا دەهاتنو دەچوون.

لە ڕۆژی دیاریکراودا، بە ئۆتۆمبێلیەکەی خۆم بەرەو بەغداد بەڕێکەوتم، بەر لەوەی بگەمە شوێنی مەبەست، هەمان کەس (نوێنەری دادگا) داوای لێکردم بەرەو سەندیکا بچم، واهات بە مێشکمدا ئەمەیان تەڵە بێت، ئۆتۆمبێلەکەم لە شوێنێکی تر ڕاگرت، بە ئۆتۆمبێلێکی تر چووم، چەند کەسێك لە خزمانی خۆمم لەگەڵدا بوو، کاتێك گەیشتمە بارەگای سەندیکا، نوێنەری دادگا پێی وتم کە ڕۆژی سەردانەکە بۆ ٢٠٠٤/١٢/١٦ گۆڕاوە.

لەو ڕۆژەشدا هەمان ڕێگەم گرتەبەر، بەلام بە هۆی گەمارۆی فەلوجەوە ناچاربووم

ڕێگای بیابان بگرمەبەر کە ماوەی چوار کاتژمێر ڕێگام بڕی تاگەیشتمە بەغداد، لەبەدبەختیدا بەر لەوەی بگەمە بەغداد ئۆتۆمبێلەکەم شکا، ئەوە یەکەمجاربوو ئۆتۆمبێلەکەم بشکێ، چونکە مۆدێلەکەی نوێ بوو، بیابان زۆر چۆڵ بوو، تەنها ڕەشماڵی شوانەکانی لێبوو، ئۆتۆمبێلەکەمان لای ئەوان داناو سواری ئۆتۆمبێلێکی خزمەکانم بووم، لەوە دەچوو قەدەر ئەم شکانەی دروست کردبێت، کە دواتر بۆم ئاشکرا بوو، ئەمیان تەڵەیەکەو بۆ کوشتنم نراوەتەوە.

گەیشتمە ئامانج، ئۆتۆمبێلێکی سەربازی ڕێونکەر لەسەر ئەو ڕێگایە بوو کە دەمانگەیەنێتە زیندانەکەی سەرۆك، هەروەها شەش ئۆتۆمبێلی سەربازی لە جۆری هامفی وەك هێزی پارێزگاری لەگەڵمان بوون.

ئەفسەرێکی ئەمریکی لێم نزیك بووەوە، پرسیاری ناوو ناسنامەی لێکردم، پاش ئەوەی ئۆتۆمبێلەکەم جێهێشت لەگەڵ یاوەرەکەمدا دوورکەوتینەوە، داوای لێکردم سواری زرێپۆشەکە بم، ئەویش بە بیانوی ئەوەی ئەم ڕێوشوێنانە هەمووی بەمەبەستی کاری ئەمنیە لە پێناو خۆم‌و موەکیلەکەمدا، لەناو زرێپۆشەکەدا کەسێك لە تەنیشتمەوە دانیشت، جلو بەرگی مارینزی لەبەردابوو، بەدرێژایی ڕێگا هەر چاودێری دەکردم، کاتێك ڕوومان بەرەوڕووی یەك دەبووەوە بزەیەکی دەکرد لەوکاتەدا هیچم لا مەبەست نەبوو، تەنها چاوپێکەوتنی سەرۆك نەبێت، گەشتەکەمان پەنجا خولەکی خایاند، پاشان سەیارەکە وەستا، بینیم پێنج ئەفسەری ئەمریکی پێشوازیان لێکردم، پاشان چووینە ناو لولەیەکی چنراو (بۆری) پرتەقاڵی کە درێژیەکەی ٢٥ مەتر بوو، بەرزیەکەی نزیکەی ٤ بۆ ٥ مەتر دەبوو، بۆ ئەوە دانرابوو تا گومڕامان بکەن‌و شوێنی سەرۆك نەزانین، پاشان چوینە ناو هۆڵێکی چوارگۆشەوە کە پانتاییەکەی ٢٥ مەتر دووجا بوو، جگە لە دەرگای سەرەکی دوو دەرگای تری تێدابوو، دەرگایەکیان دەچووە سەر ژوورێك ١٢ مەتر دووجا بوو، لەو شوێنەدا چاوپێکەوتنەکە ئەنجام دەدرێت، بەڵام دەرگایەکی تر دەچووە سەر ئەو ژوورەی سەرۆکی تێدا گیرابوو.

لە ساڵۆنە سەرەکیەکەدا کۆمپیوتەرێکی لێبوو، چوار ئەفسەری لەدەور بوو، دواتر زانیم ئەوە ئامێرێکی چاودێرییە بۆ چاودێریکردنی چاوپێکەوتنەکەم لەگەڵ سەرۆك، ئەگەرچی پێشتر لەوە دڵنیا بووم کە بە ڤیدیۆ چاوپێکەوتنەکە تۆمار دەکرێت.

پاشان جانتاکەیان پشکنیم کە پڕ بوو لە کاغەزو ئەجندەیەك بۆ نووسینی تێبینی، ئەمە جگە لە هەندێك کتێب‌و قورئانێك کە بۆ سەرۆکم هێنابوو، شتەکانیان بۆ گێڕامەوە بەڵام جانتاکەیان لای خۆیان دانا تا گەڕامەوە، هەروەها قورئانەکەیان لای خۆیان گلدایەوە

تا ئەو کاتەی لە سەرۆکیان پرسی ئایا دەیەوێت، هەروەها پێم وتن کە هیچ نامەیەکم نە لەلایەن خزمانیەوە یان هیچ کەسێکی ترەوە پێنیە.

**فەرمانی توووند:**

ئەفسەرێك لێم نزیك بووەوەو وتی: دەست ناکەیتە ملیو ماچی ناکەیت، یان باوەشی پێدابکەیت، دوو مێزمان لە نێوانتاندا داناوە، تەنها دەتوانن تەوقە بکەن لە دوورەوە، کاتێك دێت نابێت لەبەری هەڵسیت، سەربازێکتان لایە بۆ پێشکەشکردنی ئاو، عەرەبی نازانێتو ئەندامی دەزگاکەمان نییە، سەرنجی خۆم پێوتن کە ئێمە کەسمان ناوێت خزمەتمان بکات، ئەفسەرەکە وەڵامی دامەوە: کەواتە بۆ ئەوەیە لەیەکتری بتانپارێزێت، ئەم ڕێو شوێنە هەر دەبێت بکرێت، وە ئەو هەڵدەستێت بە پێدانی کاغەزو کتێبەکان بە صەدام، قەدەغەیە هیچ شتێکی لەگەڵ بگۆڕیتەوە، تەنها لە ڕێگەی ئەم سەربازەوە نەبێت.

ئەو سەربازە سەر بە CIA بوو، زمانی عەرەبی بە تەواوەتی دەزانی، هەستم دەکرد لە قسەکانمان تێدەگات، لەبەر ئەوەی جوان گوێی لێگرتبووین، لەوێدا تێگەیشتم بەم هەموو ڕێو شوێنە توندەو بەو لیستی مەرجانەی دایاننابوو دەیانویست جەنگێکی دەروونی لەگەڵ منو سەرۆکدا بکەن.

داگیرکەران دەیانەوێت لە یەکێك لە ئەندامانی گەلەکەی بپارێزن کە دەیەوێت زۆر بەگەرمی سڵاوی گەلی پێبگەیەنێت، بەر لەوەی وەك پارێزەرێك سەردانی بکەم، گفتوگۆی نێوانمان چلو پێنج خولەکی خایاند، کە سووربووم لەسەر ئەوەی بە شێوازی گەرمی عێراقی سڵاوی لێبکەم، قسەی زۆریان کرد کە ئەم پیاوە ئێستا سەرۆکی تۆ نییە، ئەو بە تۆمەتی تاوانی جەنگ تۆمەتبار کراوە، پێم وتن کە ناتوانم ئەو ڕێنماییانەی تایبەتە بە سڵاوکردن لە سەرۆك جێبەجێ بکەم، دەبێت مێزی دووەم لابەرن، جەختم لەوە کردەوە کە ئامادەم چاوپێکەوتنەکە ڕەتبکەمەوە، ئەگەر ئامانج لەم ڕێو شوێنانە ئیهانە کردنی سەرۆك بێت، هەستام کاغەزەکانم خستەوە ناو جانتاکەمەوەو داوام کرد بمگەڕێننەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووم، پێم وتن: (من چاوپێکەوتنێك ڕەتدەکەمەوە کە ئێوە کۆنترۆڵی هەموو وردەکاریەکانی بکەن)، پاش دەنگە دەنگێکی توووندی زۆر، ژنە ئەفسەرێکی ئەمریکی هاتە ژوورەوە، کەمێك عەرەبی دەزانی، وتی بە هەموو مەرجەکانم ڕازییە، ئەمەش مانای وایە من لە ژێر چاودێریدام، کە گوێی لە هەموو ئەو شتانە بوو کە لە نێوان منو ئەو ئەفسەرانەدا ڕوویداوە، ئەویش لە ڕێگەی ئامێری چاودێری کە لە هۆڵەکەی تردا دانرابوو، لە کۆتایدا هەوڵیدا نەرمو نیان بێت لەگەڵمدا، تەوقەی لەگەڵ کردمو وتی:

(هەر چیت ئەوێت بیکە، بەڵام باوەشی پێدامەکە).

ئایا دەتوانم هەستو خۆشەویستیم بۆ سەرۆکەکەم دەرنەبڕم، جا هەر چۆنێك کەوتووە لەسەرم ؟!

وەك ئەوەی لەسەر ئاگربم ئاوا چاوەڕوانم دەکرد، چاوەڕێی ئەوە بووم کێ دەست بە گریان دەکات، پاشان خستمیانە ئەو ژوورەی چاوپێکەوتنەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت، لە شوێنی دیاریکراودا دانیشتم، ئەفسەرەکە وتی: پاش پێنج خولەکی تر صەدام دێت).

خولەکەکان دەبن بە کاژمێرێك ..

پێنج خولەك .. پێنج خولەك .. وەك درێژبوونەوەی زەمەن، چەند خولەکێك وەك خولیا، پڕیەتی لەشۆڕو شەوق، پڕ ئازار، پڕ لە دڵەڕاوکێ، هەموو مێژووی ژیانم لەیەك ساتی داهاتوودا کورت بووەوە نازانم شێوەی چۆنە .. هەوڵمدا هەموو هەڵچوونەکانی ناخم خاوبکەمەوە، لە هەستی پێکدادراوی چاوەڕێی ژوورەکەدا بووم، پەنجەرەکان بەرزن لەسەقفەکەوە نزیکن، بەڵام بێهوودە هەوڵمدەدا لەو دڵڕاوکێو ناسەقامگیرییە ڕزگارم بێت، ئەوە یەکەمجارە چاوم بە صەدام حسێن دەکەوێت، سەرم لە کاری خۆم سوڕما، ئەوەی بەسەرمدا هات هەقیقەتە یان خەیاڵ ؟ ئایا .. ئایا .. ئایا .. لە ژێر چەندەها پرسیاردا مامەوە، بەهەموو لایەکدا دەمبات، هەموو گیانم خرۆشابوو، چۆن دەیبینم .. چی پێدەڵێم، کاتێك ئەو هەموو گریمانانە داگیریان کردم، خولیای زۆر .. ویستم گاڵتە بەڕۆحی خۆم بکەم، لە ناکاو دەرگاکە کرایەوەو چوار ئەفسەر هاتنە ژوورەوەو لە نزیك دیوارەکەوە بە ڕیز ڕاوەستان، هێندەی چەند چرکەیەکی برد صەدام حسێن هاتە ژوورەوە، بەو باڵا کەڵەگەتەیەوە، بەو شکۆ مەزنەوە، وەك هەموو جارێکی قژو ڕیشی درێژ بوو، بەشێوەیەکی بەرچاو لاوازبوو.

هەر ئەوەندەی چاومان بەیەکتری کەوت، لەو مێزەی کە لە نێوانمان بوو هاتمە دەرێ، یەك سڵاوم بۆ کرد شایستەی بێت، هەموو ئەو ڕێنماییانەی پێیان وتبووم فڕێمدایە دەرەوە، بەگەرمی دەستم لە ملی کرد، بەسۆزەوە کێشای بە پشتمدا، سیمای ئەفسەرەکان سەرسوڕمانی پێوەدیاربوو، دەیانپرسی ئەوە چی ڕوویدا، لە خۆیان دەپرسی: ئایا ئەمە ئەو پیاوە نییە کە دیکتاتۆر بووو عێراقیەکان چاوەڕێ بوون خۆیانی لێڕزگار بکەنو ئێمەیان ناچارکرد ئەو کارە ئەنجامبدەین ؟ بەسەرسوڕمانەوە چوونە دەرەوەو دەرگاکەیان داخستو لەگەڵ سەرۆکو پاسەوانە ئەمریکیەکە جێیان هێشتم، کە هەر نیوکاتژمێر دەیانگۆڕی، وە پێشتر ماوەی چاوپێکەوتنەکەیان بەچوار کاتژمێرو نیو بۆ دیاریکردبووین.

لەبەرامبەر یەك دانیشین، گومان دەهات بە مێشكمدا، ئایا ئەوە سەرۆك صەدام حسێنە، زۆر گۆڕابوو، لە سیمایدا هەندێك نیشانەی هیلاكی پێوە دیاربوو، ئەویش بەهۆی ئەو دۆخە سەختەی تێیكەوتبوو بە تایبەتی لەناو زینداندا، پاڵتۆ ڕەشەكەی لەسەر مێزەكەی نێوانمان دانا، چاكەتێكی ڕەشی خەتخەتی لەبەردا بوو، لەگەڵ كراسێكی سپیو پانتۆڵێكی ڕەش، لە گیرفانی قەڵەمێكو دەفتەرێكی دەرهێنا، لاپەڕەكانی زەرد بوو، لاپەڕەكانی هەڵدایەوە بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت، منیش بێدەنگ بوومو باوەڕم نەدەكرد، تۆ بڵێی ئەمە هاوشێوەكەی نەبێت، كەباسیان لێوە دەكرد، لەو كاتەی هەندێك تێبینیم نووسی گومانەكەم زیادی كرد، جارناجارێك سەرم هەڵدەبڕی، دەمبینی گاڵتەی لەگەڵ سەربازە ئەمریكیەكە دەكردو پێدەكەنی، كێ بە كێ پێدەكەنێت، ئایا هاوشێوەكەی بە ئەمریكیەكان پێدەكەنێت، سەرۆك هێشتا ئازاد بێتو لە دەرەوە بێت، ئایا دەستگیركردنی ئەو هاوشێوەیە بۆ ڕووخاندنی ورەی گەلی عێراقو مقاوەمە خۆڕاگرەكەی نەبێت .. بێگومان هاوشێوەو ئەمریكیەكە بە من پێدەكەنن، بەڵام دڵم دەیگوت وانییە ئەوە صەدام حسێنە، هێشتا لاپەڕەكانی ئەمدیواو ئەودیوو دەكردو پاشان سەری هەڵبڕیو وتی: (كوڕم گوێ لەم قەسیدەیە بگرە).

**ان لم تكن راسا فلاتكن اخره　　　فليس الاخر سوى الذنب**

لە خوێندنەوەی قەسیدەكە بەردەوام بوو، كە من توانیم تەنها ئەم دێڕەی لێ لەبەر بكەم، كاتێك لە خوێندنەوەی بووەوە وتی: لەناو زیندان نووسیومە، لەبەر ئەوەی زیندان ناتوانێت بمبەزێنێتو ئیرادەی عەرەبێكی خەباتگێڕی باوەڕدار ببەزێنێت كە بەرگری لە زمانی نەتەوەكەی دەكات، ئەوی مێژوو بخوێنێتەوە دەزانێت عەرەبی ئازاد قبوڵی ئەوە ناكات ژێر دەستو زەلیلو ڕوخاو بێت، بەڵكو هەمیشە سەری بەرزە، تەنانەت لە چركەساتی جەورو ستەمداو لە ژێر دەستی جەبەروتی داگیركەرانیشدا. پاشان تەماشای كردم (سەرۆك یان هاوشێوەكەی) ، دەیویست بزانێت لەدەرەوەی زیندان چی ڕوودەدات، داوای مۆڵەتم لێكردو خۆم پێناساند، خۆمو عەشیرەتو پارێزگاكەم، پێم وت: گەورەم بە گوێرەی منەوە بەر لەوەی پارێزەربم، هاوڵاتییەكی عێراقیم، سڵاوی عێراقیەكانو گەلی عەرەبیم پێیە، من قوتابیمو تۆ مامۆستا، من ئامادەی ڕێنماییەكانی بەڕێزتانم.

نیشانەی دڵنیاییو پشوودان لە سیمایدا دەركەوت، لەسەر مێزەكەوە دەستی گرتمو وتی (**شرناهاو عيت مظلومة**)[1] چەندجارێك ئەم قسەیەی دووبارەكردەوە، لەو كاتەدا

---

[1] ئەم پەندە لە فۆلكلۆری عێراقیدا ناسراوە. باس لە پیرێژنێك دەكات ناوی مەزلومەیە لەسەردەمی عوسمانیداو سەربە

سەربازە ئەمریکیەکە بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەکردین وتی (کوڕم خەلیل مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، خوا بتپارێزێتو لەگەڵ ئەو دایکەی تۆی لێبوویت، لەگەڵ عەشیرەتو هەموو خەڵکی ئەنباری پاڵەوان)، پاشان بۆم باس کرد چۆن دەستەی بەرگریم لە عێراق دروست کردووە، هەروەها چۆن پارێزەرە عەرەبیەکان لەناو ئەوانیشدا ئۆردنیە پاڵەوانەکان دەستەیەکی عەرەبی نێو دەوڵەتیان دروست کردووە، ئێمە هەردوو دەستەکەمان کرد بەیەکو بارەگاکەی لە عەمانە، ئەوکات دەستەکەی عێراق (٢٥٠) پارێزەر بوون، دەستەی نێودەوڵەتی ژمارەیەکی زۆرن لە باشترین پیاوانی یاسا لە عەرەبیو بیانی، پاش ئەوەی دوو دەستەکەمان لێکدا پارێزەر زیاد ئەلخەصاونە بوو بە سەرۆکی دەستەکە، منیش وەك جێگری سەرۆك، هەموو پارێزەرەکانی دەستەکە خۆبەخشن بۆ پارێزگاری کردن لە سەرۆكو ئەندامانی سەرکردایەتی، ناوی دەستەکە (دەستەی بەرگریکردنە لە صەدام حسێن)، سەرۆك هەندێك تێبینی نووسی، هێندەی نەبرد سەری لەسەر کاغەزەکان بەرزکردەوەو سوپاسی کردم ((سڵاوی من بگەیەنە بە هەموو ئەندامانی دەستە بەتایبەتی مامۆستا زیاد ئەلخەصاونەو خێزانو عەشرەتی ڕەسەنیان، کە خاوەنی مێژوون، هەروەها پارێزەر هانی ئەلخەصاونە))، سەرۆك داوای لێکردم دەستەکە ناوبنێین (دەستەی پاڵپشتی

---

خێڵی منه، کاتێك ژەندرمەی عوسمانی دوای باپیرانی سەدام کەوتبوون، هەندێك لە خێڵەکان وازیان لێهێنان لەترسی ستەمکاری ژەندرمە، ناچار پەنایان بۆ یەکێك لە خێڵەکانی دلێم برد، شێخ پێی وتن لە ترسی زوڵمی ژەندرمە ناتوانێت داڵدەیان بدات، ناردنی بۆ لای شێخێکی تر، ئەویش هەمان شتی پێوتنەوەو وتیان تەنها خێڵی ئەبو عەلی ئەلجاسم نەبێت (واتە خێڵی ئێمە)، کە یەکێکە لە خێڵە بەهێزەکانی دلێم، کاتێك دەگەنە ئەو خێڵە، خێمەیەکی ئەریتی دێتە بەردەمیان کە بە تەیمانێك لە لقی دارخورما دەورەدراوە، خاوەن ماڵ کۆچی دوایی کردبوو، کە ئەوان خاڵوانی منن، واتە ماڵە خاڵی دایکی من، لەو ماڵەدا پیرێژنێك دەژیا ناوی مەزلومە بوو وەك عەرەب دەڵێن (زەلامێك). بووە بۆ خۆی، واتە لە هەموو هەڵسوکەوتیدا لە پیاوچووە، لەهەرچوارلاوە دەوری ماڵیان داوین، دەڵێن دەریان بکەن تا بیانگرین ئەگینا بە زۆر دێنە ژووریو دەیانبەن، مەزلومە سەری بادەداتو دەڵێت ئەگەر تەسلیمیان بکەن هەردوو مەمکی خۆم دەبڕم، دەبێت قەناعەتیان پێبکەن کە بگەڕێنەوە، منداڵەکانی هاتنە دەرەوەو وتیان (شرناهاء عیت مظلومة)، واتە ڕاویژمان پێکرد بەڵام بەتووندی ڕەتی کردەوە، مەزلومە هەستا پەرژینی دەوری ئەو خێمەیەی گرتیبەردا کە باپیرانی سەرۆکی تێدا بوو، بە تفەنگە کۆنەکەی کەوتە تەقەکردن، ژەندرمە لەبەردەم ئەم بەرگریەی ژنەکە پاشەکشێیان کرد، پیاوانی خێڵ لەگەڵ کوڕەکانیان کە گوێیان لەمە بوو هەلهەلەیان لێدا، منداڵەکانی دەیانووت (شرناها و عیت مظلومة)

بەرگری لە سەرۆك صەدام حسێن‌و هەموو گیراوە عێراقی‌و عەرەبەکان).

سەرۆك باسی حاڵ‌و ئەحواڵی گەلی عێراقی لێکردم، بە درێژی ئەوەی لەسەر زەوی ڕوودەدات بۆم باسکردو وتی: بەڵێ چاوەڕێی ئەوەو زیاتریش دەکەم، لەبەر ئەوەی ئەمریکا کە هاتووەتە عێراق ئامانجی خۆی باش دەزانێت، هاتووە دەوڵەتی عێراقی تێکبشکێنێت‌و بڵاوکردنەوەی گێرەشێوێنی لەسەر زەوی عێراق، فیتنەو لێکترازان بخاتە نێو ڕۆڵەکانی عێراقەوە، کوشتن‌و وێرانکاری‌و کاولکاری‌و دزینی سامانەکەمان، پاشان وتی: من‌و هەڤاڵانم لە سەرکردایەتی دەمانزانی دوژمنکاری دێت‌و گومانی تێدا نییە، هەموو بانگەشەکانی بۆشی بچوك‌و ئەوانەی لە دەورین بریتیە لە جاڕدان بۆ دوژمنکاری، نییەتیان دیاربوو بەدەر لەڕاستی‌و درۆی قسەکانیان، سەرۆك جەختی لەوە کردەوە هەموو درۆکانیان دەرکەوتن، ئەمەش خزمەتی هەڵوێستی یاسایی سەرۆك دەکات‌و پاڵپشتی دەکات‌و وتی: کاتێك ئەمانووت عێراق خاوەنی چەکی کۆکوژی نییە، ڕاستگۆ بووین، بەمە ویستمان بەڕای گشتی جیهانی بڵێین ئێمە تا دواسنوور هاوکارین، بەتایبەتی پاش ئەوەی لەلایەن هەندێك سەرکردەی عەرەبەوە داوام لێکرا، بەڵام بەداخەوە ئەمریکا هەموو چوارچێوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەزاند، دوژمنکاری کرد بەبێ ئەوەی سەنەدێك یان شەرعیەتێك یان یاسایەك پاڵپشتی بکات‌و لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەنجومەنی ئاسایش ئەم کارەی ئەنجامدا، بەڵام گوێمان لە دەنگێك نەبوو بڵێت لەبەر ئەوەی ئەمریکا درۆی لەگەڵ کردین دەبێت لێپێچینەوەی لەگەڵ بکرێت، دواتر کارەکە دەرکەوت وەك ئێمە هەمیشە دەمانووت پەیوەندی بە نەوت‌و ئیسرائیلەوە

هەیە، لەبەر ئەوە داواتان لێدەکەم هەموو ئەو لێدوانانە دیکۆمێنت بکەن کە لە لەلایەن

فەرەنساو ئەڵمانیاو ئەوانی ترەوە دەرچووە،ئەوەم بە سەرۆك وت کە لێدوانێکی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان (کوفی ئەنان) هەیە دەڵێت ئەوانەی ڕوویدا هەمووی لادان بوو لە نەتەوە یەکگرتووەکان، داگیرکاری بە ناشەرعی‌و بێبەهانەزانی، سەرۆك وتی ئەوەیش دیکۆمێنت بکەن‌و وتی:

(هەست دەکەم ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەڵوێستی ئەمریکا تەنگەتاو بووە، ئەو لە ڕاستی ئامانج‌و کاروبارەکان تێدەگات، دەزانێت ئەمریکا وەك پاشکۆیەك دەیەوێت نەك وەك خاوەن بڕیار)، هەروەها بەسەرۆکم وت لە ئیسپانیا لە هەڵبژاردندا سەرەك وەزیران شکستیهێنا، سۆسیالیستەکان دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست، هەروەها هێزی ئیسپانیایان لە عێراق پاشەکشێ پێکردووە.

خۆشی بەسیمای سەرۆکەوە دیابوو، وتی:ئەمە مەزنە، هەموو کلکەکانی بۆش بە پشتیوانی خوا ناچار دەکرێن هێزەکانیان لە عێراقو زەوی دووزێ پاشەکشێ پێبکەن، بۆش خۆی بەتەنها دەمێنێتەوە، ئەوکات گەلی ئەمریکا ناچاری دەکات هێزەکانی پاشەکشێ پێبکات ئەم پیلانەش درێژە ناکێشێت.

بەبۆنەی ئیسپانیاوە سەرۆك باسی سەردانی خۆی بۆ ئیسپانیا لە ساڵی ١٩٧٤ دا کردو وتی: (ئەو کاتەی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش بووم، بانگێشتێکم بۆ ئیسپانیا پێگەیشت، ئەوکات گەنج بوومو مەرجی تەندروستیم نەدەزانی، وام هەست دەکرد مرۆڤ تاکو پیر نەبێت نەخۆش ناکەوێت، وارڕوویدا تووشی سێ ڕووداوبووم، یەکێکیان لەسەر ئەسپ کەوتمە خوارەوە، دووەمیان لە حەمامو سێیەمیان لەو کاتەی یاری تێنسم دەکرد، پاش ئەم ڕووداوانە لەو بڕوایەدابووم پێویستم بە دکتۆرە، دکتۆر پێی وتم دەبێت یەك مانگ لەسەر پشت پاڵبکەویتو ئامۆژگاریان کردم سەردانەکەی ئیسپانیا دوابخەم، بەڵام ڕەتمکردەوە، لەبەر ئەوە ناچاربووم پشتێنم بۆ بهێنن، چووم بۆ ئیسپانیا لە غەرناتە گەڕاین، لەناو ئیسپانیا زۆر داوەتم قبوڵ کرد، کە گەڕامەوە بۆ وڵات، پزیشکەکان بڕیاریاندا نەشتەرگەریم بۆ بکەن، هەندێکی تریان ئامۆژگاریان کردم یەك مانگو نیو لەسەر پشت بکەوم، ئەوکات بڕیار دەدەن چی بکەن، کورتەی قسە پێم وتن: ئەگەر یەك مانگو نیو لەسەر پش پاڵبکەوم تەندروستیم چاك دەبێتەوە ؟ وتیان لەوانەیە، بەم شێوەیە یەك مانگو نیو لەسەر پشت کەوتم، پاش تەواو بوونی ئەو ماوەیە بینیان حاڵم زۆر باشە، پاشان لەسەر دەستی دکتۆرێکی کوبی کرداری شێلانم بۆ کرا.

## گرنگیدان بەیەکێتی گەل

سەرۆك دووبارە باسی دۆخی گەلی عێراقی لێکردمو سەبارەت بە یەکێتی نیشتیمان، هەروەها ئایا داگیرکەر توانیوویەتی یەکێتی نیشتمان لەتبکات، تۆوی فیتنەی چاندووە، وەڵامم دایەوە، ئەمریکا هەمیشە هەوڵدەدات، بەڵام تاکو ئێستا شکستی خواردووە، زۆر لەو بارەیەوە قسەمان کرد، سەرۆك وتی زۆر لایەن هەن لەگەڵ ئەمریکا دەیانەوێت عێراق کاول بکەنو یەکێتیەکەی هەلا هەلابکەن کە بە درێژایی مێژوو چەسپاوە، پاشان وتی: (دەزانم ئەو هێزانە کاری کوشتنو تەقینەوە مومارەسە دەکەن، زانیاری هەڵە دەدەن بە کۆمەڵگای عێراقی بۆ تەقاندنەوەی پەیوەندی نێوانیانو هاندانی شەڕی ناوخۆو تایەفەگەری، بەڵام من گەلی عێراق دەناسم وەك پێشتر وتم گەلی عێراق مەعدەنەکەی ڕەسەنە، تەنها خەڵکی عێراق ئەمە دەزانێ، متمانەی تەواوم هەیە کە هەموو ئەو هەوڵدانانە

شکست دەهێنێت، هەمووشی بەر سەروچاوی داگیرکەران دەکەوێت لەگەڵ کلکو بەکرێگیراوەکانیان، لەبەر ئەوە کوڕم ئەم وەسیەتەت پێدەڵێم بیگەیەنە بەگەلی عێراقی پاڵەوان:

- بۆ هەموو ئەوانەی خاوەنی پێگەی خۆیانن کە ئامانەتی نیشتمانو مانا بەرزەکانیو ڕاستگۆییو پێگەی ڕاستگۆیی شەریفانە.

- ئەوانەی دوودڵن بیری بەیعەتو وابەستەبوونیان لەبەردەم خواو نیشتماندا هەبوو.

- داوا لە هەموو زانایانی موسڵمانو پیاوانی ئایینی دەکەم کە پەیوەندیان لەگەڵ هەبێتو کۆنتاکتێیان بەردەوام بێت، بەدەر لەو ناوانەی هەڵیانگرتووە دەبێت ئەمین بنو ڕیزەکانیان ڕێکبخەن.

- داوادەکەم نابێت سەرکردایەتی قبوڵ بکرێت تەنها لەسەر بنەمای حەزمو جەزمو ئازایەتیو پتەوی هەڵوێست نەبێت.

- لە عێراقیەکان داوادەکەم ڕیزەکانیان یەکبخەنو کات بەفیڕۆ نەدەنو نەیدەنە دوژمنان، کە بەهەموو شێوەکان هەوڵی لێکترازانی دەدەن، پاش ئەوەی ئەم گەلە خوێنی لێڕژا داگیرکەر هات.

- داوادەکەم پەیوەندی بە ڕێکخراوە میللیو حکومییو نێو دەوڵەتیەکانەوە بکرێت.

- قبوڵی ئیهانە مەکەن، خەم مەخۆن، ئێوە شکۆمەندنو هەمووان دەست بە ڕێبازی خواوە بگرنو لەیەکتری جیامەبنەوە.

## ئێران دوژمنی مێژووییە

کاتێك باسی هەڵوێستی ئێرانم بۆ کرد، کە دەیەها هەزار ئێرانی هاتوونەتە ناو عێراقەوە، بەکرێگیراوەکانیان لە تۆماری دانیشتواندا ناو نووسیان کردوون، ناسنامەی باری شارستانیو دیکۆمێنتەکانی تریان ساختە کردووە، لە خشتەی ئەو کارەی ناوی هەڵبژاردنە تۆماریان کردوون، کە ئەمانە عێراقین، ئەویش پاش ئەوەی هەموو تۆماری مەدەنی عێراقیان سووتاند، صەدام وتی:

((ئەو فارسانە بۆ ئەسڵی خۆیان دەگەڕێنەوە، ئەمەش ڕێڕەویانە، لە غەدری ئێرانو دەست تێوەردانی خراپیان لە کاروباری عێراق ئاگادارتان دەکەمەوە .. ئەو لە پشت ئەو فیتنەوەیەیە، دەیەوێت باشووری عێراق دابڕێتو بەدەوڵەتی فارسیەوە بیلکێنێت، بەڵکو دەیەوێت دەست بەسەر هەموو عێراقدا بگرێت، ئەمە خەونو ئامانجی ئەوانە، کە زۆر زوو درکمان پێکردو دەوڵەتانی ناوچەکەمان لێئاگادارکردەوە، خەونی فارسی بریتیەلە

دروستکردنی دەوڵەتی فارسی گەورەو زیندووکردنەوەی ئیمپراتۆریەتی فارسی ڕەگەزپەرستی فراوانخوازییە لەسەر حسابی عێراقو وڵاتانی کەنداو، ئەمەش ڕێکەوتنی نێوان هەموو سەرکردە فارسەکانە، لەبەر ئەوە ئەوەی تۆ باسی لێوەدەکەیت بە دووری نازانم بە تایبەتی ئێستا دەستی لە ناو عێراقەو بەئارەزوی خۆی یاری دەکات، گومانی تێدا نییە کلکەکانیان لەوانەی بە هێزی بەدر ناودەبرێن ناشرینترین تاوان لە دژی گەلی عێراق ئەنجامدەدەن، دەستەبژێری نیشتمانی عێراقی دەکوژن، ئەوانەی بە عروبەتەوە پەیوەستن‌و لۆژیك‌و میتۆدی باڵادەستی‌و داگیرکاری ڕەتدەکەنەوە.

بەر لە جەنگی عێراقو ئێران، دەست تێوەردانی ئێران بۆ عێراق گەیشتە ئاستێك نەدەکرا بێدەنگی لێبکرێت، ئامانجی فراوانخوازی لە بەرزترین ئامانجەکانی بوو، لەسەردەمی شادا یەکەم هاندەری هەڵگەڕانەوەی ناوچەی باکور بوون، ئەو دەست تێوەردانە گەیشتە ئاستێك ئەو گروپە خاکی ئێرانی بەکاردەهێنا لەگەڵ تەواوی یارمەتی لۆجیستی‌و چەك‌و زەخیرەکانی، ڕێکەوتنامەی جەزائیرمان بەست، تەنازولی دڵتەزێنمان کرد، وەك لای هەمووان ئاشکرایە، ئەویش لەبەرامبەر پاراستنی یەك پارچەیی خاکی عێراق‌و یەکێتی گەلی عێراق، لە دیارترین بەندەکانی ئەو ڕێکەوتننامەیە بریتیە لە دەست تێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی هەردوو وڵات.

کاتێك خومەینی پەنای بۆ عێراق برد، لەنێو عێراقیەکان بەوپەڕی ڕێزەوە ژیا، چاومان لە زۆرێك لە هەڵسوکەوتەکانی دەپۆشی کە هەوڵی دەدا دەست لەکاروباری ناوخۆی عێراق وەربدات، بەڵام هەر ئەوەندەی هەستا بە ئەنجامدانی شۆڕش، زەوی عێراقی بۆ ئامانجەکانی خۆی بەکاردەهێنا، تاکو داوامانلێکرد عێراق بەجێبهێڵێت‌و ڕێز لەسەروەری وڵاتەکەمان بگرێت کە تێیدا دەژی، بەڵام ئەم کارەی بەدڵ نەبوو، دواتر لێدوانەکانی هەموو دژی عێراق ئاڕاستە دەکرد، تا کار گەیشتە ئەو ئاستەی وتی عێراق بەشێکە لە خاکی فارس، ئەمە پاش ئەوەی دەزگا سیخوریەکانی خۆرئاوا بردیانە سەر کورسی دەسەڵات، دەستی کرد بە هەڕەشەو دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبی بە پارێزگای ئێرانی ناودەبرت.

هەموو دەزانن بە هەموو شێوەیەك هەوڵماندا تووشی بەریەککەوتن نەبین، پاش ئەوەی گەیشتە تاران، هێزەکانی لە سنووری عێراق کۆکردەوە، بە ئاشکرا باسی لەوە دەکرد کە شۆڕشەکەی هەناردە دەکات‌و یەکەمینجار بۆ عێراقی دەنێرێت، لە ساڵی ١٩٨٠ تۆپەکانیان دەستیان بە بۆمب بارانی شارو گوندە سەرسنووریەکانیان کرد لە سەیف سەعدو زرباتیەو مەندلی‌و بەدرەو شارەکانی تر، داوامان لێکردن ئەو ئیستفزازانە بوەستێنن، ئەویش بەپێی دەیەها یاداشتنامە، بەڵام هێڵی دوژمنکاری خاڵێکی ترسناکی وەرگرت بەتایبەتی

١٩٨٠/٩/٤، گرەویان لەسەر وروژاندنی بیری مەزهەبی دەکرد لەوەشدا شکستیان هێنا، چونکە شیعەکان بەر لە سونەکان لە دژیان جەنگان، زۆرێك لەسەرکردە ئیسلامیەکان لە جیهانو ئەفریقا، لەوانە بەڕێز ئەحمەد سیکۆتۆری خوا لێیخۆش بێت، داوای لێکردین جەنگ بووەستێنین، بەڵام خومەینی لەسەر دوژمنکاری لە دژمان سووربوو، ئێمەش ئازایانە لە دژیان جەنگاین، پاش سەرکەوتنە یەك لەدای یەکەکانمان شکستیان هێنا، فاو یەکەمین شاری عەرەبی بوو داگیر بکرێتو ئازاد بکرێتەوە، بانگەوازی سەرکەوتنمان لە دژی خومەینی ڕاگەیاندو ژەهرمان پێخواردەوە، کە واژۆی بڕیاری وەستانی جەنگی قادسیەی صەدامی پیرۆزی کرد، بانگەشەی سەرکەوتن لە ١٩٨٨/٨/٨.

کاتێك ساڵی ١٩٨٠ بە ڕووی ڕەشەبای زەردەوە وەستاین، کە لە ئێرانەوە دەهات، هەڵوێستی هەندێك لە برا عەرەبەکانمان دڵی کردین بە سەهۆڵ، دەوڵەتانی عەرەبی هەستیان بە مەترسی ئێران دەکرد لەگەڵ ڕەوتی مەزهەبی کارەساتبار، بەتایبەتی لەسەر ئایندەی ڕۆڵەکانیان، بەڵام هەڵوێستیان هەرگیز بیرمان ناچێتەوە، کاتێك بەو قۆناغە قورسەدا تێپەڕین لەکاتی جەنگدا پشتیان لێکردین.

لەو کاتەی خومەینی مرد، یەکێك لە دەستەی پاسەوانەکانم هاتو بە خۆشیەوە هەواڵەکەی پێراگەیاندم، وتم (انا لله وانا الیه راجعون) و خوا لێیخۆش بێت، ئێمە ڕقمان لەکەس نییە.

لە ماوەی داگیرکردنو پێش دیلکردنم چاودێری ئەوانەم دەکرد بە چ ڕۆڵێکی تێکدەرانە گەمە دەکەن، چۆن ئەمریکیەکان ڕێگایاندان لە خاکی ئێرانەوە بە هەموو پێداویستیەکانیانەوە بێنە عێراقو دژمان بووەستنەوە، تەنانەت ئەو کاتەی پەیکەرەکەی گۆڕەپانی فیردەوسیان ڕووخاند، لەو شوێنە زۆر دوور نەبووم، بەڵام لەو کاتەدا زۆر گرنگیم بە کاروباری شکڵی نەدەدا، ئەوەندەی خەمی بارودۆخی عێراقم بوو، ئەو شانۆییە (ڕوخاندنی پەیکەر) کۆمەڵێك درندە کردیان خوێنی عێراقی لە دەمارەکانیاندا نییە، پێشتر مەشقیان بۆ ئەم شانۆییە پێکرابوو ئەویش بە یارمەتی داگیرکەر، لە نێوانیاندا عێراقیەکم نەبینی تەنها ئەوانەی حەزیان دەکردو حەز پاڵی پێوەنابن، گومانی تێدا نییە ئەو عێراقیانەی لەم کارەدا بەشداربوون ئەوانەن خاوەن تاوانی ترن، لەبەر ئەوەی عێراقی شەریف ڕێگە نادات بەوەی ڕوویدا)).

سەرۆك بەردەوام بوو وتی:

((زۆرێك لە زانایانیان کوشت، لە کردەی پەلاماردا بەشداریان لەگەڵ داگیرکەردا کرد، هەموو ئەمانەش بەڕەزامەندی هەندێك لەوانەی خۆیان بە پیاوانی ئاینو موفتی دادەناو

ئاین لەوانە بێبەریە، بەرژەوەندی عێراقو گەلەکەی لامەبەست نییەو ئینتمای بۆ ئەم نەتەوەیە نییە، بگرە ئێرانی بەلاوە گرنگترە، تاکو گەمە بە عێراقو کەنداو بە ئارەزووی خۆی بکات)).

سەبارەت بە جەنگی ئێران سەرۆك وتی:

((ئەوانەی باسیان لە هەڵەی جەنگی بەرگریکاری لە دژی فارسەکانو تەماعو خواستە شەڕانگێزەکانیان کرد لە دژی عێراقو ناوچەکە، لە سالانی هەشتاکانی سەدەی بیستدا، دەبێت ئێستا ئەو دۆسێیە بخوێننەوە بۆ ئەوەی بۆیان دەربکەوێت ئێرانی فارسی بۆ یەك چرکە وازی لە خولیا فراوانخوازیەکانی نەهێناوە، کە ئەو ئێستا بەشێکە لەو گەمە قێزەونەی دژی عێراقو عەرەبو موسڵمانانە، ئێران ئاسانکاری بۆ هاتنە ناوەوەی ئەمریکا بۆ ناو عێراق کرد، ئەمریکاش پەلکێشانی ئێرانی بۆ ناو عێراق ئاسان کرد)).

هەروەها سەرۆك وتی:

((ئێمە پێش وەخت نیەتی باشی خۆمان بۆ ئێران لە پاش کۆتایی جەنگ دەربڕی، ئەویش بە گەڕانەوەمان بۆ ڕێکوتننامەی جەزائیر لەگەڵ ئەو هەموو سلبیاتەی تێیدابوو، هەروەها نیەت باشی خۆمان دەربڕی ئەوانیش بەڵێنیاندا نیازپاکی خۆیان دەرببڕن، وتیان ئێمە لەیەك سەنگەرداین لەگەڵ ئێوە لە دژی ئەمریکا لە ناوچەکە، هەروەها فڕۆکە جەنگیەکانمان لای ئەوان دانا، بۆ ئەوەی لە جاری دووەمدا ئەوان لە دژی ئەمریکا بەکاریبهێنن، بەگوێرەی ئەو ڕێکەوتنەی لە نێوانماندا بوو لەگەڵ سەرکردەکانی ئێران، پێشوازیان لە یەك سەنگەری بەرەنگاربوونەوە کرد، بەڵام وەك نەریتی خۆیان غەدریان لێکردین، ئەمەش نەریتێکی فارسەکانە، لەبەر ئەوە هەمووان لەوان ئاگادار دەکەمەوە، من ئەمڕۆ لەهەر کاتێکی تر لە سوریا دەترسم لەوەی ئێران غەدری لێبکاتو سوریا بە جەنگی ئیسرائیلەوە بگلێنێتو پاشان خۆی لێ بدزێتەوە، کە سوریا لە ئێستادا ئامانجی ئیسرائیلە، وەك چۆن حاڵەتی نەتەوەی عەرەب هەمووی وایە، لەوە دەچێت کینەی دڵیان بە عێراق بڕێژن لە دژی شارستانیو خەڵکەکەی دوژمنکاری بکەن، وەك ئەوەی بۆ تۆڵە سەندنەوە کاولکاری دەکات، پیلانیان لە دژی ڕژێمی شەرعی نیشتمانی لە عێراق دارشت، لە ڕێگەی دوژمنکاری ڕاستەوخۆوە دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت، ئەویش پاش ئەوەی بە هەموو ڕێگاکان نەیانتوانی ئەم کارە بکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن بۆچی تاکو ئێستا لە عێراق ماونەتەوە، پاش ئەوەی بەکرێگیراوەکانیان لە عێراق دامەزراند پاشەکشێیان نەکرد، ئەوکات بارودۆخەکە جیاوازتر دەبوو، بەڵام ئامانجی ئەوان لەوە گەورەتر بوو پلان لە دژی صەدام حسێنو ڕژێمەکەی دابڕێژن.

## پڕ چەك كردنی سوپای عێراقی

پرسیارم لە سەرۆك صەدام حسێن كرد كە گوایە وا بڵاوە لە كاتی جەنگی هەشت ساڵەدا زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی خۆرئاوا چەكیداوە بە عێراق، ئەویش وتی:

((پێشتر زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێو لە نێوانیاندا عێراق بۆ پڕ چەككردنی سوپاكانیان پشتیان بە یەك سەرچاوە دەبەست، ئەویش چەكی یەكێتی سۆڤیەتی جاران بوو، لەگەڵ هەندێك وڵاتانی بلۆكی خۆرهەڵات، بەڵام پاش ئەو نسكۆیانەی عەرەب لە بەرامبەر ئیسرائیل بەسەریدا هات، بڕیاماندا سەرچاوەی چەكداركردنی سوپاكانمان هەمەجۆر بكەین، ئەمیش هەقێكی سروشتی خۆمانە، وەك چۆن هەقی مەشروعی هەمووانە بە تایبەتی عێراق لەبەر ئەوەی سنورێكی درێژی لەگەڵ دراوسێیەكی خراپدا هەیە، كە ڕقو كینەو تۆڵەو تەماعی فراوانخوازیو هەوڵی ورووژاندنی كینەی مەزهەبی ناچیزەی لەگەڵمان هەیە، پاش قادسیەی دووەم، لە جەنگی ئێرانو عێراق چەند گرێبەستێكمان لەگەڵ فەرەنسا هەبوو ئەویش بۆ كرینی فڕۆكەی جەنگی بۆ پتەوكردنی هێزی ئاسمانیمان، بەهۆی جەنگەوە جێبەجێ كردنی ئەو گرێبەستانە دواكەوت، هەروەها بە هۆی ئەو دابڕانەی ئەمریكا لەو كاتەدا سەپاندی.

لە ساڵی ١٩٨٠ وە عێراق سەرچاوەكانی چەكی بەهۆی گرێبەستی پاساییەوە فراوانكرد، لەگەڵ چەندەها دەوڵەتدا گرێبەستی ئەنجامدا، بەشێوەیەكی ڕاستەخۆ چەكمان كڕیو دواتر بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ بەهۆی وەكیلەكانەوە چەكمان بەپێی پێداویستی سوپا كڕی، چ زیانێكی تێدایە ئەگەر عێراق چەك لە بەرازیل یان فەرەنسا یان نەمسا یان چین یان یەكێتی سۆڤیەت یان دەوڵەتانی ئەورووپای خۆرهەڵات بكڕێ، وەك چۆن ئەمریكا هاوپەیمانەكانیو ئەوانی تر پڕ چەك دەكات ؟ لەماوەی جەنگدا پیاوانی پیشەسازی سەربازی توانیان پێویستی ناوخۆی عێراق پڕ بكەنەوە، ئەم كارە ئەمریكاو ئیسرائیلی توورەكرد، بە هەموو نیەتێكی شەڕانگێزیِ خۆیان جەختیان لە وێرانكردنی ئەم كەرتە گرنگو زیندووە كردەوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا پەیوەندی بازرگانیمان لەگەڵ وڵاتانی بلۆكی خۆرهەڵات هەر باش بوو، جا بەكڕینی چەك یان پێداویستی لۆجێستی، برا عەرەبەكانمان بۆ بەرەنگاربوونەوەی فارسەكان پشتیان گرتینو بۆ پوچەڵكردنەوەی نیەتی بۆگەنیان، ئەمیشیان عەیبە نییە، بەڵام ئەوە عەیبە یەكێك بڵێت ئەمریكا شەیتانی گەورەیە، بەڵام هەموو چەكو لۆجەستیەكانی بۆ ئەو شەیتانە گەورەیە بگەڕێتەوەو لە ئیسرائیلو كۆریا چەك بكڕێت.

ئەمریکا بۆ بابەتیانە تەماشای ئەم کارە ناکات، لە کۆمپانیا گەورەکانی بپێچێتەوە، کە چەك لە دژی عەرەب بە ئێران دەفرۆشن، ئەو دەزانێ کێ هەڵەبجەی بەو چەکە بۆردومان کرد کە ئەڵمانیا دروستی کردبوو، CIA ئەمریکی ئەمە باش دەزانێتو بەبەڵگەوە هەمووی هەیە، ئەمریکا بۆ لەسەر ئەمە لە ئێران ناپێچێتەوە.

کەواتە ئەمریکا لێپرسینەوە لەگەڵ ئەمیان دەکاتو چاو لەویان دەپۆشێت، تەنانەت لە جەنگی فاو لە ساڵی ١٩٨٦، ئەمریکا بە خۆی ڕێگەیدا بە ئێران هێرش بۆ فاو بکات، هەروەها یارمەتیدان کە ئەو بەشە گرنگە لە خاکمان داگیر بکەن، لەبەر ئەوەی دەیویست ئێران هەڕەشە لە دەوڵەتانی کەنداوی عەرەب بکاتو بڵێت: ئەوە ئێرانە هەمووتان قوت دەدات، کە تەنها چەند مەترێك لێتەوانەوە دوورە، تاکو ئاماژەیەکیان پێبداتو بڵێت ئەوە عێراقە بەرگەی زۆرداری ئێرانی نەگرت، تاکو ئەمریکا بتوانێت وڵاتانی ئەو ناوچەیە لە خشتەبەرێتو پارەیان لێبکێشێتەوە، کە ووردەکاری تەواوی کەرتە سەربازیەکانمانو چری کەرتەکانو زانیاری تەواوی بە ئێران دا، پاشان زانیاری ناڕاستەوخۆی بۆ ئێمە نارد.

ئەمریکا دەیویست ماوەی جەنگی عێراقو ئێران درێژە بکێشێت بۆ لاواز کردنی عێراقو عەرەب، عەرەب بخاتە نێوان دوو مەترسیەوە، لەلایەك کیانی سەهوێنی لە خۆرئاواوە، لەلایەکی ترەوە فارسەکانو تەماعیان لە خۆرهەڵاتەوە، لەبەر ئەوە چەکی بە ئێران دەبەخشی، زانیاریەکانی بەهۆی مانگی دەستکردەوە بە ڕاستەوخۆ دەبەخشی بە ئێران.

بەڵام ئێمە، هەندێك زانیاریمان لە برا عەرەبەکانمانەوە پێگەیشت لەوانەیە سەرچاوەکەی ئەمریکاو بەریتانیا بێت، بەڵام بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، زۆریان درۆبوونو لەبەرژەوەندی ئێران بوون، بەم شێوەیە هەندێك لە زانیاریەکان بوونە هۆی داگیرکردنی فاو.

با جیهان بزانێت ئێران چۆن یاری بە پەتەکان دەکات، لە باکورەوە بەهۆی تاڵەبانیەوەو لە باشوریشەوە بەهۆی ئەمریکاو بەریتانیەکانەوە، با ببینن عێراق چۆن شمشێری لە ڕووی تەماعی ئێراندا ڕاگرتبوو.

# بەشی سێیەم

لاپەڕەی یەکەم لەجەنگی یەکلاکەرەوە (الحواسم)

لە میتۆدو حسابی ئێمەدا نەبوو، کەڕۆژێك لەڕۆژان تووشی شەڕێکی دەرەکی بین، وە بە بیانییەك خۆمان بەهێز بکەین، لەبەرئەوەی خۆبەهێزکردن بەبیانی

بەتایبەتی لەدژی یەکتری، هیچ و پووچ و ڤێزەونی یە

صەدام حسێن لە زینداندا

بومەلەرزەیەکی تۆقێنەر لە ٩ ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٣ دا ڕوویدا، شاری بەغدادی خۆشەویست لەسەر دەستی مەغۆلێکی تر داگیرکرا، هەموو شتێك ببووە جێگەی سەرسوڕمان، شەقامەکانی بەغدادو شارەکانی تر تانکی ئەمریکی پێدا تێدەپەڕیو قەلەڕەشەکانیان بە چری بەسەر ئاسمانی بەغدادەوە دەسوڕانەوە، کاولکاریو کینەی خۆیان بەسەر عێراقدا دەباراند.

لە ژێر ئەم سەرسوڕمانو شۆکە چاوەڕواننەکراوەدا، داگیرکەران جێگەی سوپای عێراقیان گرتەوە، دەزگاکانی دەوڵەتیان هەڵوەشاندەوە، یاسایەکیان بۆ پاکتاوکردنی حیزبی بەعس دەرکردو سەرکردەکانیان دەستگیرکرد ....و ....، ئازارەکە بەسۆ بوو، کاتێك هەموو ئەوانەی بەسەر عێراقدا هات لە دوژمنکاریو پیلانگێڕی نابەهانە، تەنها لە هزری دوژمندا نەبێت، سەرۆك وتی: پێویستە بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا، تا ساتەکانی کۆتایی ببینین، ئەویش پاش دوژمنکاری بۆ سەر عێراق لە شەڕی ٢١ ی ئازار، کە ئەمیان لاپەڕەی یەکەمی جەنگە.

لەوکاتەی خۆمو هەڤاڵانی سەرکردایەتی لەوە دڵنیا بووین، کە هەموو گەلی عێراقی بەسەبرو موجاهیدمان لەگەڵە، دوژمنکاری شەڕانگێزی ئەمریکا بێگومان ڕوودەدات، ئامانجی هەموو عێراقو پێکهاتەو بوونو پاشەڕۆژییەتی، کە بۆ چەندەها دەیە بۆ دواوەی دەگەڕێنێتەوە، نەخشەی پێویستمان بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنکاری دانا، کە دواتر بەناچاری لە بری ئەلتەرناتیڤی سەربازی ڕاستەوخۆ دەبێت بەرەنگاربوونەوەو مقاوەمە هەڵبژێرین، کە لەو کاتەدا ئەمریکا سواری خولیای شەیتان بووە، لەبەر ئەوە گەلی عێراقو هێزە چەکدارەکانمان خستە حاڵەتی بەرگری گشتگیریەوە، بە بەشداری هەموو وزەکانی دەوڵەتو گەل، ئامادەکاری لە ڕووی دەروونیو فکریو مەعنەویەوە، تاکو حاڵەتی بەرگری زامن بکەین، جەنگێکی درێژخایەن دەکەین کە بگاتە چەند مانگێك، کە کرانەوەی گشتی بۆ هێزە چەکدارەکان (هێزەکانمان) لەسەر بنەمای نەخشەی بەرگری سەرەکی لە عێراق دامەزرابوو، هەروەها گریمانەی ئەوەمان کرد کە عێراق لە هەموو لایەکەوە تووشی دوژمنکاری دەبێت.

لەسەر ئەم بنەمایەو چەندینی تر گرنگترین چارەسەرەکانمان دانا، ئەویش زامنکردنی سەرکردایەتیو کۆنترۆڵکردنە، بۆ ئەوە نەخشەمان دارشتو تواناکانمان دیاریکرد، عێراقمان کرد بە چوار ناوچەی سەرەکیەوە، سەرکردایەتیو هەڤاڵانمان دابەشکرد بەسەر کەرتەکاندا، سەرۆك فرقەو فەیلەقەکانو هێزە چەکدارەکان هاوکاریان دەکرد.

دابەشکردنەکە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:-

**کەرتی عەمەلیاتی باکور:**

بەسەرۆکایەتی ئەبو ئەحمەد (عیزەت دوری)، سەرکردەی فەیلەقو فیرقەکان هاوکاریان دەکرد، کە دەکەوتە ئەو کەرتەوە، ئەم کەرتە هەموو پارێزگاکانی موسڵو کەرکوكو هەندێك لە ناوچەکانی دیالەو بەشێك لە پارێزگای سەلاحەدینی دەگرتەوە.

**کەرتی مەرکەزی:**

ناوچەکانی بەغداد، ئەنبار، سەلاحەدین، دیالەو بەشێك لەهەردوو پارێزگای واستو کەربەلا، قوسەی سەرکردایەتی ئەم ناوچەیەی دەکردو هەڤاڵانی سەربازی کە هێزەکانیان لەو ناوچەیە هاوکاریان دەکرد.

**کەرتی ناوچەی فوراتی ناوەڕاست:**

پارێزگاکانی بابلو نەجەفو قادسیەو مثنی لەخۆدەگرێت، سەرکردایەتی ئەم کەرتەمان سپارد بە هەڤاڵ مزبان خزر هادی، هەڤاڵ فازل محمود غەریب هاوکاری دەکرد، ئەرکی بەرگریکردن لەو ناوچانە درابووە جەنگاوەرانی سوپای قودسو ڕێکخستنەکانی هەڤاڵانی حیزب.

**کەرتی باشور:**

پارێزگاکانی بەسرەو میسانو زیقار لەخۆدەگرێت، هەڤاڵ عەلی حەسەن مجید کرا بەسەرکردەی ئەم ناوچەیە، برایانی سەرۆك فەیلەقەکانو فرقەی ئەو کەرتە هاوکاریان

دەکرد.

ئەم کەرتانە بە سەرکردایەتی هەڤاڵانی سەرکردە سیاسیەکان بوو، لەگەڵ هاوتاکانیان لە هێزی چەکداری موجاهید، هەروەها گرنگترین نەخشەی بەر لە دوژمنکاری، کە نەخشەی کۆتایی بریتیە لە بەرگریکردن لە بەغداد، لەبەر ئەوە دەستمان کرد بە دابەشکردنی بەغداد بۆ چەند ناوچەیەك، کە هەڤاڵانی سەرکردایەتی سەرۆکایەتیان دەکرد، گرنگیدان بە بەغداد لە گرنگیترین شتەکان بوو کە هەڤاڵانی هەردوو سەرکردایەتی سیاسیو سەربازی گرنگیان پێدەدا، لەبەر ئەوەی گرەو لەسەر دەرئەنجامی جەنگی کۆتاییو سەرنجی دوژمن لەسەر ئەمە وەستاوە.

بەر لە ڕوودانی دوژمنکاری، بە هەڤاڵانم وت کە تفەنگێك ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی لە جەنگی کۆتایدا هەیە، ئەمە جگە لە چەکەکانی تر، پاشان بە پاسەوانانی دەووری خۆم وت پشتێنی تەقینەوە ئامادە بکەن لەو کاتەی لەگەڵ دوژمن دەجەنگێنو خۆمان لە دۆخێکدا بینیەوە ناچاربووین بەکاری دەهێنین تاکو بتوانین زۆرترین زیان بە ریزەکانی دوژمن بگەیەنین، کە بەدیلگرتنمان لە حسابی خۆماندا دانەنابوو، بەڵام پاش تێڕامان لەم بڕیارەم پاشگەزبوومەوەو بەخۆمم وت چی بەگەلو هەڤاڵانی سەرکردایەتی بڵێمو چیم پێدەڵێن، ئایا من سەرکردەمو جەنگ بەڕێوەدەبەم یان جەنگاوەرم ؟ ئەم هەڵوێستەم وا لێکدەدرایەوە کە ئەمە دەستبەردانە لە سەرکردایەتی، لەبەر ئەوە فکرەکەم ڕەتکردەوە.

کاتێك لە شەوی ٢٠ لەسەر ٢١ ی ئازاری ٢٠٠٣ دا، دوژمنکاری ڕوویدا، هێزە موجاهیدەکانمان ئەرکی بەرگریو بەرەوڕووبوونەوەیان خستە ئەستۆی خۆیان، هەمووان بەپێی ڕیزو کەرتەکانیان وەك پاڵەوان کاریان دەکرد، لەگەڵیشیاندا گەلی عێراقی موجاهید بە هەموو باوەڕو خۆڕاگریەوە بەشداریان دەکرد، سوپای ئازامان بە تایبەتی لیوای ٤٥ ی پاڵەوان، کە دوژمنی بەو خۆڕاگریەی لە ئوم قەسر سەرسام کرد، لەگەڵ دڕندەییو توندی دوژمنکاریدا، هەروەها گەورەترین کاریگەری لەسەر گەلەکەمان داناو دوژمنی ناچارکرد زیاتر لە جارێك چاو بە نەخشەکانیدا بخشێنێتەوە.

پاش توندبوونەوەی جەنگو لەکاتی جەنگی فرۆکەخانەدا لە ٢٠٠٣/٤/٥، لەگەڵ براکانم لە هەندێك قۆناغەکانی جەنگدا بە خۆم بەشداریم کرد، کە پاڵەوانانی گاردی کۆماریو پاڵەوانانی جەنگاوەرە عەرەبیەکانو فیداییە بەڕێزەکانم لەگەڵدا بوو، ڕۆژێك کە ڕێنمایم بە

هەندێك لە هەڤاڵانم لە سەرکردایەتی سوپاو گارد لە نزیك مزگەوتی (ئوم ئەلتبوڵ) دەدا، ئەبو نەدا (تەها یاسین رەمەزان) م پێگەیشت، لەو کاتەدا دوژمن توانیبووی لە هەندێك ڕێگا سەرەکییەکانەوە بێنە ناو بەغدادەوەو بە تانكو زرێپۆشەکانی هێڵەکانی پێشەوە ببڕێت، منو هەڤاڵان لە ژێر پردێدا بووین، هێرشمان کردە سەر کەرتەکانی دوژمن، خوا یارمەتیدام بە ئاڕ بی جی سێڤن تانکێك یان دووانی دوژمن بشکێنم، ئەبو نادیە زۆر بەتوندی ئەمەی ڕەتکردەوەو وتی: تکایە کاری وامەکە، تۆ سەرکردەیتو سەرکردایەتی دەکەیتو ڕێنمای دەدەیت، تۆ سەرباز نیت بەخۆت بجەنگیت، ئەگەر بریندار بکرێیت یان خوانەخواستە شەهید بکرێیت، ئەمە کاریگەری لەسەر ورەی سەربازەکان دادەنێت، بەڵکو تەنانەت لەسەر هەڤاڵانی سەرکردایەتی، ئەمەش وەك دەسبەردان لە ئەرکی سەرکردایەتی تەماشا دەکەین، پاشان ئەبو نادیە ڕۆیشت لەگەڵ هەڤاڵانی سەربازو ئەندامانی دەستەی پاسەوان مامەوە، کە جەنگاوەرە عەرەبو فیداییەکان ڕۆڵێکی پاڵەوانو مێژوویی پڕ شەرەفیان هەبوو، کە دەبێتە وانەیەك بۆ نەوەکانی داهاتوو، عێراقی چەند بەهێز بێت، بە قوڵبوونەوەی نەتەوەیی هێزی زیاتر دەبێت.

لە جەنگی فرۆکەخانەدا، سەرکەوتمە سەر یەکێك لە تانکەکان، ساتێکی زۆر قورس بوو، ئەو تانکەم لە نێو ڕتڵێك زرێپۆشدا بەرەو فرۆکەخانە لێخوڕی، فڕۆکەکانی دوژمنو قەلەڕەشەکانیان لە ئاسمانی جەنگدا دەسوڕانەوە، لەو کاتەدا ڕەشەبایەکی لماوی ئاسمانی جەنگی گرتەوە، وایکرد دوژمن نەتوانێت بۆمبارانی هێزەکانمان بکات.

پاشان دوژمن پاڵی بەهێزەکانیەوە ناو نەخشەو تەکتیکەکانی گۆڕی، سوپاکەی کۆکردەوەو پانتاییەکی گەورەی فرۆکەخانەی داگیرکرد، بەڵام هێزی پاڵەوانی موشەکیو راجیمەکانو تۆپەکانو کەرتەکانی تر، دەستیان بە لە ناوبردنی دوژمن کرد، بە نیمچە لەناوبردن لەناویان بردن، دوژمن لەوێدا زیاتر لە دوو هەزار کەسی تیاچوو، زۆر لەوە زیاتر بریندارو ئامێری تێکشکاو، ئەویش لە جەنگێکدا کە بەڕێز (محەمەد سەعید ئەلصەحاف) ئەوکات ئاماژەی پێدا، ئەمە بوو بە شۆکێکی بەهێز بۆ دوژمن، هێزەکانمان توانی ئەوکات ئەو پێگەیە بگرێتەوەو دوژمن بێدەنگ بکات، تاکو ئێستاش دەرئەنجامی ئەو جەنگە کپکراوە، تاکو ئێستاش باس لە زیانەکانی ئەو جەنگە کارەساتبارە ناکەن.

پاش ئەوە دوژمن ئەقلی لە دەستدا، سەر لە نوێ هێزەکانی کۆکردەوە، هێرشی

ئاسمانی وەحشیانەو موشەکی توندتری کردە سەر بەغداد کە پێشتر وێنەی نەبوو، بەشێوەیەکی شێتانە بە چەکی ئەتۆمی لە فرۆکەخانە بۆمبارانی هێزەکانی کردین، کە لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی قەدەغەیە، بەڵام ئەمان بەکینەو هەمەجیانە بەکاریانهێنا، بەم شێوەیە باشترین کوڕانو هێزمان لە دەستدا، ئەمەش بووە گەورەترین کاریگەری کەوایکرد دوژمن بێتە ناو بەغدادەوە، ئەو بۆمبارانە دڕندانەیەی فرۆکەخانە وایکرد هەندێك سەرکردەی سەربازی کۆنترۆڵی هێزەکانیان نەکەن، کە ئەم بۆمبارانە کاری لە وورەی سەربازەکانو هەندێك ئەفسەران کرد، ئەوانەی پلەی نزمو مامناوەندیان هەبوو، کە شوێنی بەرگریکردنیان جێهێشتو هاتنە ناوەوەی دوژمنی بۆ بەغداد ئاسان کرد.

نامەوێت باس لە رۆڵی خۆم لەو هەڵوێستەدا بکەم، بەڵام کۆمەڵێك ڕاستین پێویستیان بە دیکۆمێنت کردن هەیە، تاکو ناحەزان نەڵێن صەدام حسێن لەو جەنگانەدا لەکوێ بوو، من لە کاتی ئاشتیشدا لە ناو گەلدا بووم، لەناو جەنگاوەرەکانم لە کاتی جەنگو کاتە قورسەکاندا.

جەنگاوەرانی عەرەبی پاڵەوان لەگەڵ فیداییە ئازاکان، قورسترین جەنگیان لە دژی کەرتەکانی دوژمن لە نەفەقی شورتەدا ئەنجامدا، لەگەڵیاندا بووم هەوڵماندەدا پێشڤەچوونی دوژمنو ئامێرو زرێپۆشەکانی ڕاگرین کە بەرەو بەغداد دەهاتن، هەندێك لە ئامێرەکانیانمان تێکشکاند، لەوێدا داوام لە جەنگاوەرە پاڵەوانەکان کرد کە برا عەرەبەکانیان بپارێزن، پاشان بەرەو گەڕەکی مەنسور بەڕێکەوتم، لەگەڵ برا جەنگاوەرەکانمو برا عەرەبەکانم بەشداری جەنگم کرد، کە لەوکاتەدا بەتوندی لە دژی دوژمنو ئامێرەکانی دەجەنگاین، توانیمان بە پشتی خوا چەند تانکێك بشکێنین، کە لە شەقامی ١٤ ی ڕەمەزان هەڵهاتن، لە پێگەیەکەوە بۆ یەکێکی تر دەجولاین، لەناو جەنگاوەرەکاندا بووینو مەعنەویاتمان بەرز دەکردنەوە.

لە ٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ دا جەماوەر بەشێوەیەکی عەفەوی لە گەڕەکی مەنسور کۆبووەنەوە، پاشان چووم بۆ باب ئەلشەرقی، زۆر لە گۆڕەپانی فیردەوس دوور نەبووم، ئەویش لەو کاتەی شانۆگەریەکەی تێدا ڕوویدا، کە لەوێدا دوژمن دەیویست مەعنەویاتی سوپاکەی بەرزبکاتەوە، پاشان لە نێو خەڵکدا لە شاری صەدام پیاسەم کرد، بەڵام لەو کاتەدا وێنەگرەکەمان لە دەستدا تاکو بتوانێت ئەوەی ڕوودەدات دیکۆمێنتی بکان.

لەدوای ئەو ڕۆژەو ڕۆژانی دواتر، چاوم بە هەندێك لە هەڤاڵانی سەرکردایەتیو سەرکردایەتی سوپا کەوت، لەلایەکی ترەوە جەنگێکی توند لە ناوچەی ئەعزەمیەو گۆڕەپانی عەنتەر ڕوویدا، جەنگاوەرە عەرەبەکان زۆر بەتوندی دەجەنگان، هێزەکانی دوژمنو بە کرێگیراوەکانیان لە خائینان توانیان دزەبەکەنە ناو بەغدادو بێنە ناوەوەو بەهەموو لایەکدا بڵاوببنەوە.

پاشان بەرەو ئەعزەمیە کەوتمەڕێ، لەگەڵ پاسەوانەکانم نانی نیوەڕۆمان خوارد، ئەویش لەوکاتەی یەکێك لە پاسەوانەکان لە چێشتخانەیەکی ئەو ناوە خواردنی بۆ هێنایین، پاش ئەوەی نوێژی عەسرمکرد لە مزگەوتی ئیمام ئەبی حەنیفە، سەدەها کەس لە خەڵکی ئەعزەمیەی پاڵەوان کۆبوونەوە، جەنگاوەرە عەرەبەکانو فیدائییەکانم لەگەڵدا بوو، سڵاوم لەجەماوەر کردو ماڵئاوایم لێکردن، پاشان قسەم بۆ جەنگاوەرە عەرەبەکان کردو داوای بەرگری زیاترم لێکردن، دەرفەت نەدەن بە دوژمن هەناسە بدات، ئەمڕۆ جەنگی ڕاستەقینەی ئێمە دەست پێدەکات، هەر ئێمەش ڕێڕەوەکەی دیاری دەکەین، دەبێت وانەیەك فێری داگیرکەر بکەین هەرگیز بیری نەچێتەوە، پەلەکردن لە ئەنجامدانی کردەی پاڵەوانی، تاکو دوژمنو بەکرێگیراوەکانیان چێژی سەرکەوتن نەکەن، دوژمن بە چەندین شێوەو هەواڵی درۆ دەیویست کاریگەری سلبی لەسەر ورەمان دابنێت، بەڵام بەهۆی باوەڕمان بەخواو ڕەوایی کێشەکەمانو بەرگریو خۆڕاگریمان هەموو ئومێدەکانیان تێکشکا، هەوڵیاندا کاریگەری لەسەر مەعنەویاتی عێراقیەکان دابنێن بەوەی دەیانووت صەدام حسێن کوژراوە، داوام لە هەڤاڵانم کرد هەواڵەکە بەدرۆ نەخەنەوە.

هەڤاڵانو سەرکردەکانو ئەندامانی سەرکردایەتی لە ئاستێکی بەرزی خۆڕاگریو ئازایەتیو هەڵوێستیان هەبوو، ئەگەرچی جەنگەکە زۆر دڕندانەو توند بوو، لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتی بە درێژایی ڕۆژانی جەنگ پەیوەندیمان هەبوو، بەتایبەتی تەها یاسین ڕەمەزانو تاریق عەزیزو قوسەیو فەریق سوڵتان هاشمو سەحاف، ئەمەجگە لە سەرکردە مەیدانیەکان، بەڵام چاوم بە ئەبو ئەحمەد (عیزەت دوری) نەکەوت، لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی کەرتی باکوری دەکردو لە بەغدادەوە دووربوو، لەناو شاری بەغداد دەگەڕاینو لەنێو ڕیزەکانی گەلدا بووین، بەشداری ڕۆڵی کەرتەکانمان لە جەنگدا دەکرد، هەندێکجار بە ئۆتۆمبێلی خەڵەتێنەرانەو هەمەجۆر هاتووچۆمان دەکرد، هەندێکیان کۆنو

هەندێکی تریان ئۆتۆمبێلی گشتی بوون، پاشان چاوم بە هەندێك لە هەڤاڵان کەوت، بڕیارماندا خۆمان حەشار بدەین‌و بۆ بەشی دووەمی خەبات بگوازینەوە، بەشی مقاوەمەت‌و خەباتی نهێنی، ڕۆژی ٢٠٠٣/٤/١١ لە بەغداد دەرچووین‌و ڕوومان کردە بارەگا بەدیلەکان.

## ڕۆژی داگیرکاری سەرۆك لەکوێ بوو؟

لە ڕۆژی یەکەمەوە کە دوژمن هاتە ناو شاری بەغداد، لە ڕووی دەروونیەوە خۆم بۆ ئەمە ئامادەکرد، گەڕامەوە بۆ ساڵانی یەکەمی خەبات لە ساڵی ١٩٥٩، کارەکە لەگەڵ خۆم‌و هەڤاڵان وا بەڕێوە دەچوو، وەك ئەوەی ڕوویدا لامان کت‌وپڕی نەبوو، لەو کاتەی شەڕانگێزەکان دەهۆڵی جەنگ دەکوتن‌و باس لە دەرفەتی ئاڵتونی دەکەن، هەوڵماندەدا ئەو دەرفەتەیان بۆ فەراهەم نەکەین، کە لەوانەیە ببێتە کارەساتێك بەسەر هێزە چەکدارەکانمانەوە، ئەمیان لای من بۆ خۆشەویستی ژیان نەبوو، ژیان لای من هیچ مانایەکی نەبوو لە بەرامبەر ئەوەی عێراق بە ئازادی‌و کەرامەت بژی.

بۆ لەدەستدانی دەرفەت لە دوژمن، دەبوایە پێگەی بەدیل وەربگرین، لەو شەوەی بۆش دوژمنکاری بۆ سەر بەغداد دەستپێکرد، لە ماڵێکی هاکەزایی بووم لەگەڕەکی تەشریع کە زۆر لە کۆشکی کۆماریەوە دوور نەبوو، دوژمن کۆشك‌و ئەو ئامانجانەی دیاریکردبوو بۆمبارانی کرد.

لەیەکێك لە ڕۆژنامەکانی بەرەنگاربوونەوە، سەرکردایەتیم بۆ کۆبوونەوە لە چێشتخانەی (الساعه) داوەتکرد لەگەڕەکی مەنسور، داوام لە ئەندامانی سەرکردایەتی کرد لە دەرگای پێشەوەو پشتەوە بێنە ژوورێ، ئەویش بۆ لە خشتەبردن، کاتێك من چووم بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە، بینیم یەکێك لە کەسایەتیە گرنگەکان لە کۆبوونەوەکە ئامادە نەبووە، بەخۆم وت کاری خۆی کرد، یەکسەر داوام لە ئامادەبووان کرد ئەو شوێنە بەجێبهێڵن‌و بچنە شوێنێکی تر لە مەنسور لە خانویەکی ئاسایی، پاش ئەوەی چووینە ژوورێ‌و بۆ ماوەیەکی کەم کۆبووینەوە، فەرمانم پێکردن بچنەدەرێ، پاش چەند خولەکێك لە چوونە دەرەوەمان ئەو شوێنە بەخەستی بۆردومان کرا، ئەوکات دوژمن بڵاوی کردەوە کە صەدام لەو شوێنەدا مردووە.

پاش ئەوەی دوژمن داگیرکاری بەغدادی تەواو کرد، بڕیارمدا لە بەغداد بچمەدەرێ، چووم بۆ پارێزگای ئەنبار، بە دیاریکراوەیی بۆ شاری رومادی، کە بوومە میوانی خێزانێکی عێراقی ناسراو بە کەرامەت و وەفای نیشتمانی، ئەوانیش خێزانی (ئال خربیتە)، لەوێ چاوم بە عودەی و قوسەی و هەندێك لە پاسەوانەکانیان بەرزان کەوت، گەنجان بەهۆی ئامێری سورەیاوە پەیوەندیان دەکرد، کەوا دانراوە زۆر بەخێرایی چاودێری دەکرێت لەلایەن مانگە دەستکردەکانەوە، کە دەتوانێت ئامانجەکە بەووردی دیاری بکات، لەو کاتەدا خۆم بۆ خەو ئامادە دەکرد، داوام لە خێزانەکەم کرد لە بەغداد دەربچن، لەو کاتەدا فرۆکە ئەمریکیەکان ئەو شوێنەیان بۆردومان کردو لەوێدا رۆکان عەبدول غەفور شەهید بوو، لەگەڵ ژمارەیەك لە پاسەوانەکانی، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی خاوەن ماڵ شەهید بوون، بەهۆی ئەم کارەساتە پڕئازارەوە، کە تاکو ئێستا هەست بە شەرمەزاری لەبەردەم خێزانی ئال خربیت دەکەم، یەکسەر لەگەڵ دووان لە پاسەوانەکانم بە ئۆتۆمبێل دەرچووین، رووم کردە قەزای هیت، وەك لە بیرم بێت لەگەڵ قایمقامی قەزا چاومان بەیەك کەوت، ئۆتۆمبێلەکانمان گۆڕیەوە، پاشان وازی لێهێنام و لە دەوروبەری شاری رومادی دەسوڕامەوەو خۆم حەشاردابوو، لە نزیك عەشیرەتەکەی تۆ مامۆستا خەلیل، لە ڕاستیدا ویستم نەبم بەبار بەسەر عەشیرەتەکەتەوە.

سەرۆك بۆ چەند ساتێك بێدەنگ بوو، وامزانی سەدەیەکە ... دەمویست گوێم لە شتی زیاتر بێت، لەو زەمەنەی پاسەوانە ئەمریکیەکان بۆیان دیاری کردبووین کە تەنها چوار کاتژوێرو نیو بوو، پرسیارم لێکرد: گەورەم هەست دەکەیت نەخشەی بەغداد کەلێنی تێدا بووبێت ؟ وەڵامی دایەوە:

((بەڵێ هەندێك کەلێنی گرنگ هەبوون، ماجەرای کارەکان و ڕەوتی جەنگو باڵادەستی دوژمن توانی ئەو کەلێنانە لە بنەبڕکردنی جەنگ بە خێرایی بەکاربهێنێت، لەگەڵ ئەمانەشدا، جەنگاوەرەکان و پیاوانی هێزی چەکداری پاڵەوان و سەرکردەو فەرماندەو جەنگاوەران، لەگەڵیاندا فیدایییە پاڵەوانەکان و خۆبەخشە عەرەبەکان کارێکی باشیان کردو لە پشتیانەوە گەلی عێراقی پاڵەوان هەبوو .. بەڵام ئیرادەی خوایەو کەس ناتوانێت بەرەوڕووی بێتەوە.

# بەشی چوارەم

لاپەڕەی دووەمی یەکلاکەرەوە (ئەلحەواسم)

مقاوەمەت

ئەوەی یەکجار چەکی کردبێتە ڕووی ئیمپریالیزم، ناتوانێت لە دەستی بیخاتە خوارێ ئەگەر ئەمەشی کرد ئەوا ئیمپریالیزم گۆڕی بۆ هەڵدەکەنێت

ڕائول کاسترۆ

قسەکردن لەگەڵ صەدام حسێن، قسەکردنە لەگەڵ مێژووداو بۆ مێژوو، کاتێك باسی لاپەڕەی دووەمی جەنگی عێراق و نەتەوەی کرد، لایەنی مقاوەمەی ئازا، کە هەموو جیهانی بە خێرایی و هێزەکەی سەرسامکرد، وتی:

لاپەڕەی دووەمی جەنگی (مقاوەمەی داگیرکەر)، خەلیلی کوڕم لە ڕۆژی ٢٠٠٣/٤/١١ واتە پاش داگیرکردن بەدوو ڕۆژ ڕوویدا، لەو ڕۆژەدا چاوم بە سەرکردە سەربازییەکان کەوت پێم وتن چیان هەیە پێم بڵێن، یەك بەیەك وەڵامیاندایەوە، وەڵامەکانیان هەمەجۆر بوو، تاکو دوا کەسیان وتی: تەنها دوو فەوجم ماوە، وتم: بڕۆن و پشت بەخوا، لاپەڕەی دووەمی جەنگەکەتان دەستپێبکەن.

لەبەر ئەوە ئەوەی ئەمڕۆ ڕوودەدات بە ڕێکەوت نییەو کارێکی عەفەوی نییە، بەڵکو کارێکە بەر لەماوەیەکی درێژ نەخشەی بۆ کێشراوە، بەر لە ڕوودانی دوژمنکاری، هەموو ڕێ و شوێنە پێویستەکانمان گرتەبەر، چەك و تەقەمەنیمان ئەنبارکردو پێداویستیەکانی جەنگی درێژخایەنمان دەست پێکردو قۆناغی جەنگی پارتیزانی دەستی پێکرد، کە دوژمن نایدۆزێتەوە.

لە ٢٠٠٣/٤/٩ دا سەردانی مەدینە سەورەم کرد، خەڵکی شارەکەم بەسەرکردەوە، بە ژمارەیەکی زۆر کۆبوونەوە، ئەم سەردانە وێنەی گیرا، لەبەر ئەوەی ئێمە ڕێگەیەکمان گرت جیاوازتر لە ڕێگای تیمی وێنەگرتن، کە بەهۆی توندی بۆمبارانەوە نەیانتوانی بگەنە ئێمە، پاشان چووم بۆ ئەعزەمیە لەوێ چاوم بە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکەکە کەوت لە نزیك زرێپۆشەکانی ئەمریکاوە، کە یەکێکیان دەستی کرد بە دەسترێژ شانی چەپم بریندار بوو، بەڵام برینەکە سووك بوو.

ڕۆژی ٢٠٠٣/٤/١١ پاش کۆبوونەوە لەگەڵ سەرکردەکان، بڕیارماندا لە بەغداد بچینەدەرێ و دەستەی بۆدی گاردی خۆمم لەگەڵ بوو، بەڵام داواملێکردن بچنەوە بۆ ماڵەوەو بۆ ناو خێزانەکانیان، چەند ژمارەیەکی کەمی پاسەوانم هێشتەوەو بەڕووباری دیجلەدا بەدوو بەلەم پەڕینەوە، وەك بیرم بێت لە بەغداد دەرچووین و بڕیارماندا خۆمان بشارینەوە، وەك ساڵی ١٩٥٩، کە ئەو ساڵە پڕ بوو لە خەبات بەپێی پەتی دەڕۆیشتین و

چیمان ڕاوبکردایە ئەوەمان دەخوارد یان ئەوەی لە کێڵگەکان دەستمان دەکەوت، ئەمە جگە لە هیلاکیو شەونخونیو نەخشەدانان.

دواتر سەرپەرشتی کەرتەکانی مقاوەمەم دەکرد، ئەویش بە هاوکاری هەڤاڵان بەرلەوەی هەندێکیان بەدیل بگیرێن، لەگەڵ کەرتەکان پەیوەندیمان هەبوو، لە هەندێك لە پارێزگاکان چاودێری بارودۆخیانمان دەکرد، بەڵام پاش دزەکردنی دوژمنو دەزگا سیخوڕیەکانیانو دەزگای ئیستخباراتیان، بەتایبەتی ئێرانو هاتنە ناوەوەیان بۆ ناو پارێزگاکانی باشوری ئازیز، بەباشمان زانی نەچین بۆ ئەو پارێزگایانە، لە سەردانی شاری بەغداد بەردەوامبووم، پەیوەندی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆم لەگەڵ پیاوانی مقاوەمەت هەبوو، پاشان چوومە پارێزگای دیالەو نەینەواو دەوروبەری موسڵو پارێزگای کەرکوكو حەویجەو سەرجەم ناوچەکانی سەلاحەدینو زۆربەی ناوچەکانی ئەنبار، لەو شوێنانەی سەردانم دەکردن زیاتر لە سێ کاتژمێر نەدەمامەوە، ئەویش لەبەر زۆر هۆکار، نەمدەویست ببم بەبارگرانی بەسەر خەڵکەکەیەوە بەتایبەتی کە دوژمن هەمیشە لە بۆسەدا بوو بۆمان، نەمانویست زیان بەگەلەکەمان بگەیەنێت.

پەیوەندیم بە مقاوەمەوە هەبوو، چاودێریم دەکردنو سەرکردایەتیم دەکردن، ئەویش یان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە بواری سەردانی هەندێك لەکەرتەکان بۆ بەرزکردنەوەی مەعنەویاتیان، یان ناڕاستەکردنیان بە هۆی نامەی نوسراوەوە، کە ئەمەیان لەبەر هۆکاری ئەمنی کەمبوون، یان بەهۆی نامەی زارەکییەوە، بەهۆی پێداویستی ئەمنی دەبوایە بە جلی شوان یان عەرەبیەوە هاتووچۆمان بکردایە، هەروەها بەهەمەجۆر ئۆتۆمبێل هاتووچۆمان دەکرد، لەوانە ئۆتۆمبێلی باری گەورەو مامناوەند، لەوانە بە تەکسیو ئۆتۆمبێلی تایبەتی.

ڕۆژێکیان لە ئۆتۆمبێلێکی تەکسیدا بوومو دەمانچەو کلاشینکۆفو نارنجۆکمان پێبوو، بەڕێکەوت لە خاڵی پشکنینی هێزەکانی داگیرکەر نزیك کەوتینەوە، کە خاڵێکی گەڕۆك بوو، کەوتینە ناو خاڵەکە شۆفێرەکە کە یەکێك بوو لە دەستەی پاراستنم ویستی ڕێڕەوی ئۆتۆمبێلەکە بگۆڕێتو بۆ دواوە بگەڕێتەوە، پێم وت پشت بەخوا برۆ، لەوێدا سەربازە ئەمریکیەکان ڕایانگرتین، بەڵام تەماشای دەموچاویان نەکردین، داوایان لێکردین برۆین، ئەوکات چەکەکانمان لە ژێر قاچمان شاردبووەوە.

بە زۆر ڕووداوی هاوشێوەدا تێپەڕین، زۆرجار لەو شوێنانەی پێیدا تێپەڕ دەبووین

لەدەرگای ماڵی عێراقیەکانمان دەدا، پاش ئەوەی ڕێگەیان دەدایـن دەچووینە ژووری. بەهەڤاڵانم دەووت ئەگەر لە دەرگای ماڵێکی عێراقیمداو دەرگای نەکردەوە واتە ئەوا هەڵەیەک هەیە کە لەوانەیە هونەری بێت.

لەو ماوەیەدا کە سەردانی خەڵکم دەکرد، لەماوەی خۆشاردنەوەدا، هەوڵمدەدا نەبمە بەبار بەسەریانەوە یان تووشی مەترسیان بکەم، بەبێ ئەوەی خاوەن ماڵ بەئاگابێنم دەردەچووم.

هەوڵمدەدا پارە بنێرم بۆ مقاوەمە، ئەویش بەپێی ئەو پارەیەی لە سەردانەکانمدا دەمانبرد، تاکو مقاوەمە بەشێوەیەکی ئاسایی بەردەوام بێت، لەبەر ئەوە یەکەم پرسیار کە ئەمریکیەکان ئاراستەیان کردم لە پاش دەستگیرکردنم، دەربارەی مقاوەمە بوون هەروەها دەربارەی ئەبو ئەحمەد (عیزەت دوری) پێم وتن کاتێك دەستدرێژی دەکەنە سەر گەلان‌و کەرامەتی پێشێل دەکەن‌و سامانی دەدزن، لەوێدا بەرگری پێویستە، جگە لە مقاوەمە هیچ ڕێگەیەکی تر نییە، پێم وتن: ئەگەر عیزەت دوری لە برژانگەکانمدا بووایە ئەوا دەمخستە ناو چاوەکانم‌و دامدەخست.

زۆر پرسیاریان لە مقاوەمە دەکرد، وەڵامی من هەر ئەوەندە بوو کە دەبێت گەلی عێراقی بەتەواوەتی زیندان بکەن، لەبەر ئەوەی هەموو عێراقیەکی شەریف لەڕیزی مقاوەمەدایە، کە زۆر لەوە گەورەترە کە ئێوە بیرتان لێکردووەتەوە، کە هەموو ئازادی خوازانی عروبەو ئیسلام‌و نیشتمانیەکان‌و هاوڵاتی ئاسایی‌و ژن‌و منداڵ لەخۆدەگرێت. گەورەو بچوك بەشدارن، پێم وتن لەبەر ئەوە دارەمەیتی زۆر ئامادە بکەن، وەك چۆن بەر لە داگیرکاریش هەمان قسەم پێوتن، کە ئێوە لەدەوری شورای بەغداد تێکدەشکێن[٢]

نووسەرو شیکەرەوەی سیاسی (دکتۆر فەیسەڵ فەهد) لە وتارێکدا بەناونیشانی (ڕاستگۆیی صەدام حسێن‌و ڕاستگۆیی سەحاف) ..(دەرکەوتنی درۆزنی بوش‌و هاوکارانی)، (تۆری بەسرە، لە ڕۆژی ١٢ی ئاياری ٢٠٠٥ دا دەڵێت (ئەمریکیەکان لە

---

[٢] نووسەرو ئەکادیمی مامۆستا سەلاح موختار دەڵێت. ئەویش لە بواری چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کەناڵی جزیرە لە ڕۆژی ٢٥/٨/٢٠٠٨ دەڵێت سەرۆك ڕاستی وت کە دوژمنان لە شورای بەغداد تێکدەشکێن. ئەوەتا هێزەکانی داگیرکەر لەدەوروبەری بەغداد تێکدەشکێن. واتە لە فەلوجەو لەتیفیەو مەدائن‌و سامەڕاو زلوعیەو بەلەدو یوسفیەو مەحمودیەو سەقلاویەو چەندەها شاری تری عێراقی خەباتگێر

زیانەکانیان لە ڤیتنامدا خۆشدەبن، ئەویش بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی لەسەر دەستی عێراقیە ئازاکان پێیان دەگات، یەکێك لە سەرکردەکانی بەرگریکاری ڤیتنامی بەبۆنەی ساڵیادی ڕزگاربوونی گەلی ڤیتنامەوە ئەم قسەیەی کرد، کە لەدژی داگیرکەری ئەمریکی بوون، کە بەوردی باسی لە مقاوەمەی عێراقی کرد،

ئەوەی دەموت مەبەستم بوو، ئەو شارانە هەموویان دەوری بەغدادیانداوەو دوژمنی بە جوامێری مقاوەمە سەرسامکردووە، من مەعدەنو ئەساڵەتی گەلەکەم دەناسم، ئەوەتا ئێوە خۆتان دەکوژنو دەکوژرێنو لەمەیدانی جەنگ هەڵدێنو زیانێکتان پێدەگات هەرگیز بیرتان لێنەکردووەتەوە، لەکاتی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵم هەستم کرد لە چ تەنگەژەیەکی گەورەدان، بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕێن ئاوی دەموچاویان بپارێزێت.

کەمێك سەرنجی گواستەوە، ئەم پیاوە مەزنە کە قەدەر وایکرد لە سەرۆکی وڵاتێکی مەزنەوە ببێتە سەرکردەی مقاوەمەو بە خاكو خۆڵی عێراقەوە بلکێت، دووبارە دەستی بە قسەکردن کرد.

((بە ئەمریکیەکانم وت گەلی ئەمریکی دوژمنی ئێمە نین، بەڵکو دوژمنی ڕاستەقینەی ئێمە حکومەتەکەتانە کە ئێوەی گلاندووەتە جەنگی داگیرکردنی عێراقەوە، لەبەر ئەوە دەبێت نرخی گرانی ئەمە بدەن)).

باس لە فەلوجەی پاڵەوان کرا، سەرۆك وتی کە چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد دوژمن دووبارە هێرشی بکاتەوە سەر (هەموو هەستەکانم پێیان دەوتم کە دەنگی ئەو فرۆکانەی لەکاتی هاتنە دەرەوەم لە هۆڵەکە دەمبیست، دەبێت بەرەو فەلوجە بچنو لە دژی خەڵکە پاڵەوانەکەی بن، کە هەرگیز مل کەچ ناکەن، من قەبارەی مقاوەمە لەوێدا دەزانم، توانای پیاوەکانی بۆ بەرەنگاربوونەوەو بەرەنگاری، زۆربەی کادرەکانی مقاوەمە لە ئەفسەرو سەربازانی عێراقینو لەگەڵ کادیرانی حیزبو نیشتمانپەروەرەکانو سوپای قودس، ئەوان خاوەن مەشقی بەرزن، شارەزایی شەڕی بەرفراوانیان هەیە، هەستم دەکرد بە ڕاستی جوڵەی فرۆکەکان بەرەو فەلوجە دەچێت، داوام لەخوا کرد کە سەریان بخاتو زیانی مرۆیی کەمیان لێبکەوێت.

((بە ئەمریکیەکانم وت ژمارەی دانیشتوانی عێراق حەوت ملیۆن کەسە دوو ملیۆنیان چەکیان پێیە، ئێستاش باوەڕم وایە نەتەوەیەکی بێ چەكو بێ هێز نەتەوەیەکی ملکەچە، بەسەرکردە سەربازیو هەڤاڵەکانم وت تفەنگ بۆ جەنگ لە دژی ئەمریکا ئامادە بکەن، پاش

ئەوەی سوپاکەمان بۆ مقاوەمە گۆڕا زۆر لە سوپای ئەمریکی بەهێزتر بوو، بەر ئەوەی دەستگیر بکرێمو ئەو ماوەیەی لەناو هەڤاڵەکانمدا بووم، پێم وتن: ئێمە بە مردن شیرخوارد کراوین)).

کاتێك ساڵی ٢٠٠٣ لە دیجلە پەڕیمەوە بەر لەوەی بە ماوەیەك بگیرێم، ئەو پەرینەوەیە بۆ من پێویست بوو، کاتێك گەیشتمە ناو ئاو بەلەمێکی بچوکی لێبوو، خانەخوێ وتی بەلەمەکە تەنها بەشی منو تفەنگەکان دەکات، وەڵامم دایەوەو وتم تۆ لەگەڵ تفەنگەکان برۆ، من بەمەلە دەپەڕمەوە، هێزی پیاو تەنها لە ماسولکەکانیدا نییە، بەڵکو هێزی دڕندە لە کەڵبەو ماسولکەکانیدایە، هێزی پیاو لە ئیمانو دڵیدایە، ئەمەش عەزمو ئازایەتی دەداتێ، کە ماسولکە ناتوانێت بیخولقێنێت، بەڵێ کوڕم خەلیل .. هەر سوپایەك بیەوێت خاکەکەی بپارێزێت لە دوژمنان دەبێت بەسەر زەویدا بڕوات، تەکنەلوژیای سوپا کەمدەکات یان لەناو دەچێت، کاتێك ڕۆڵی چەکەکانی تر تەواو دەبێت ڕۆڵی بەرگریکار دەست پێدەکات.

سەرسامی خۆی دەربڕی، جەختی لەوە کردەوە کە سەرکەوتنی هێزی مقاوەمەی عێراقی لە پاڵپشتی گەورەی گەلی عێراقیەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەو سەرکردە ڤێتنامیە بڕوای بەسەرکەوتنی نزیکی مقاوەمەی عێراقیو تێکشکاندنی ئەمریکا هەبوو، کە لە عێراق دەدۆڕێت).

هەمیشە بە ئاگاییەوەو بە بەردەوامی پەیوەندیم بە هەڤاڵانو برایانی سەرکردایەتیو بکەم، کە دەکرێت سوودی لێوەربگرین، هەروەها لە هەمان کاتدا زۆر حەزم دەکرد بیانبینمو هەواڵیان بزانم، بە چڕی لە بیرکردنەوەیان ئەوەی دوژمن زەفەر نەباتو ئەندامانی سەرکردایەتی دەستگیر بکات.

ڕۆژێکیان لە پێدەشتێکدا چاوم بە ئەبو ئەحمەد کەوت، وەك چاوەڕێم دەکرد لە بەرزترین ئاستی وردەیدابوو، هەروەها وەك خۆی خاوەن خولق بوو، عەباکەی خۆی داکەندو لەسەر زەویەکە ڕایخست تاکو لەسەری دانیشین، ئەوە تەنها جارێك بوو چاوم پێی کەوت، بەڵام بەهۆی لایەنی سێهەمەوە پەیوەندیمان بەردەوام بوو.

# بەشی پێنجەم

ڕووداوەکانی بەر لە دوژمنکاری ١٩٩١

ئەی خەباتکار ..

ئەگەر بەهای بیروباوەڕ لەبەردەمتدا لەرزی

بیرت لای بەهای پیاوەتی بێت.

صەدام حسێن لە زینداندا

خەڵك ڕاهاتبوو پاش ئەو هەموو كارەساتەی ڕووبەڕووی نەتەوەی عەرەب بووەوە بڵێن: بەدوای ئەمریكا بگەڕێ یان ئیسرائیل بپشكنە، ئەو پرسیارەی لە مێشكمدا دەهاتو دەچوو. بەڵكو سەرقاڵی كردبووم، ئایا كەمتەرخەمی لەلای سەركردە سیاسیەكانی عێراقەوە بووە، كە نەیانتوانیبوو بەسەر ولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا بكرێنەوەو پەیوەندیەكی باشی لەگەڵدا دروست بكەن ؟

كاتێك ئەم پرسیارەم ئاراستەی صەدام حسێن كرد، وتی:

((لە هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا پەیوەندیەكی ناجێگیرمان لەگەڵ ولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا هەبوو، ئەم پەیوەندیە بە هۆی ناسەقامگیری بارودۆخی سیاسی ئەو كاتە كاریگەر بوو، وابزانم ساڵی ١٩٨٤ بوو بانگەشەی پەیوەندی گرتنەوە كرا)).

لەماوەی جەنگی ئێران عێراقدا لەسەر ئاستی وەزارەتی دەرەوە پەیوەندیمان لەگەڵ ولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هەبوو، خوازیاری لێكتێگەیشتنی باشتربووین ئەویش بۆ بەرژەوەندی گەلی عێراقو گەلی ئەمریكی لە سەردەمی سەرۆك ڕۆناڵد ڕیگاندا، بیرمە ڕۆژێكیان پێویستمان بە گەنم هەبوو، بەشێوەیەكی خێرا گرێبەستمان لەگەڵ حكومەتی ئەمریكا بەست تاكو پەلە لەم گرێبەستەدا بكەن، مەسەلەكە هەر ئەوەندە نەبوو تەنانەت بە شاندی عێاقیان وتبوو پارە مەدەن بە كۆمپانیا ئەمریكیەكان، هەركات كەوتنە دۆخێكەوە دەتوانن پارەكەمان بدەنەوە.

ئەمانە هەندێك مەسەلەیە لە بیرمان ناچێتەوە، ئەگەر چی ڕووداوی زۆری بەسەردا هاتوودو دەیەها ساڵ تێپەڕیووە.

بیرمە هەر لەسەردەمی ڕیگاندا بوو، وەزارەتی بەرگری عێراقی پێویستی بە فڕۆكەی كوپتەر هەبوو، ئەوكات بەهۆی جەنگ لەگەڵ ئێراندا چەك فرۆشتنیان لێ قەدەغە كردبووین، بەڵام حەفتا تا هەشتا فرۆكەی بێچەكمان دەستكەوت، كە بۆ گواستنەوەی كەلو پەل بۆ بەرەكانی جەنگ سوودمان لێوەرگرت.

لە جەنگی ئێران عێراقدا پاپۆڕێكی ئەمریكی پێككراو سیو حەوت دەریاوانی ئەمریكی تێدا كوژران، ڕیگان دەیتوانی فەرمان بدات بەغداد بۆردومان بكات، وەك كلنتۆنو

بۆش کردیان، بەڵام ڕیگان ئەم کارەی نەکرد.

هەمووان دەزانن لە دەرەوەی ئاوی هەرێمی ناوچەی قەدەغەکراو هەیە لە کەنداوی عەرەبی، هەر ئامانجێك لەوێوە بێت هێزەکانی ئاسمانیمان لێیدەدەن، لەبەر ئەوەی وەك هێزی دوژمن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەنو لێیدەدەن، ئەوکات چاودێری ئەلیکترۆنی نەبوو، ئەوەی ڕوویدا فڕۆکەکانمان ئامانجێکیان بەدی کردو موشەك بارانیان کردو نوقمیان کرد، ئێمە لەلای خۆمانەوە پێمان ڕاگەیاندن کە ئەوان هەڵوێستێکی هەڵەیان نواندووە، لەبەر ئەوەی ئەوان واتە ئەمریکا هاتوون سیخوڕی گوێگرتن لەسەر عێراق یان ئێران بکەن، داوای لێبووردنمان کردو ئەوانیش قبوڵیان کرد، قەرەبووی خێزانە زیان لێکەوتووەکانمان کردەوەو ئەمریکاش هیچ لەمپەرێکی بۆ دانەنایین، ڕووداوەکە لەبیر چووەوە، بەڵام ئەم پەیوەندیە بەماوەیەکی شڵۆقدا تێپەڕی لە ساڵی ١٩٨٦ دا، بەتایبەتی لە کێشەی ئێران گێتدا لای هەمووان ئاشکرایە ئیدارەی ئەمریکی لەسەر ئەمە داوای لێبووردنی کرد، ئێمەش لێبووردنەکەمان قبوڵ کرد، کەواتە پەیوەندیمان لەگەڵ ئەمریکادا باش بوو، ئەگەرچی چاوم بە سەرۆك ڕیگان لەو ماوەیەدا نەکەوت.

لەلایەنی زانیارییەوە، ئێمە لەلایەن ئەمریکاوە هیچ زانیاریەکمان دەستنەکەوت، بەڵام برا عەرەبەکانمان زانیاریان دەدایێ، هەستمان دەکرد زانیاریەکان لە ئەمریکاوە دێت، بەڵام ڕاستەوخۆ نەبوون.

ئەو پرسیارەی لێرەدا بە مێشکمدا هات، لە پاش ڕۆیشتنی ڕیگانو هاتنی بۆش چی ڕوویدا تاکو، نەخشەمان بگۆڕین؟

پاش ساڵی ١٩٩٠ ویستمان پەنجەرەیەك بکەینەوە بەڕووی ئەمریکادا تاکو بگەینە لێکتێگەیشتن لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەشو مەشروع بۆ هەردوو وڵاتو پاراستنی ناوچەکەو هاوسەنگی، بەڵام ئەمریکا هەموو دەرگاکانی لێکتێگەیشتنی داخست، پێمان وتن ناتوانین نەوت بخۆینەوە یان بیخەینەوە ژێر زەوی، ئەمیان سامانی شەرعی عێراقە، هەقی خۆمانە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی گەل بەکاری بهێنین.

کاتێك ئامۆژگاری ئیدارەی ئەمریکامان کرد کە عێراق بە قەواڵەی ئابووریو سیاسی نەگۆڕێتەوە، ئەمەش کاردانەوەی بەسەر ئاکاری کۆمەڵگای عێراقەوە هەبێت، ئەم ئاشکرا قسەکردنە لەوانەیە وای کردبێت هەندێك لە ناحەزان لە ڕاوێژکارانی ئیدارەی ئەمریکی ئەم

ئاموژگاریانەیان وا وەرگرتبێت کە بە میتۆدی دەست تێوەردان لەبەرتەسککردنەوەی گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق و گەلەکەی کار بکەن، خۆرئاوا هاوپەیمانی بەست و پلانیان لە دژمان دارشت، ئەوەی ساڵانێکی درێژ بوونیادمان نابوو، تێکیان شکاند. ئەم هەموو رق و کینەیە لەبەرچی ..

ئێمە فێری میتۆدی سازشکاری نەبووین و دەستبەرداری بنەماکانی نەتەوە و مافەکانیان بین. تەنانەت ئەگەر ئەم بەرەو رووبەرووبوونەوەیە بگاتە ئاستی شەهیدبوون یان مردن. لەم واقعە چارەنووسسازە ملکەچ نەبووین و رامانەکرد، هەر ئەمەشە ژیاننامەی باپیران و سەلەفی سالحمان.

دەگەرێمەوە و دووبارەی دەکەمەوە، ئێمە دوژمنی گەلی ئەمریکی نین، سنورمان پێکەوە نییە تاکو لەسەر سنور ناکۆکیمان لە نێواندا دروست ببێت، ئەوان دەزانن عێراق پشتی بە هێزی نەتەوەی عەرەبە ئەستوورە، تاکو فەلەستینیش رزگار نەکات پشوو نادات. کە ئەمیان یەکێکە لە ئەولەویاتی ئێمە، ئەمەیە رقیان هەڵدەستێنێت، ئەمریکا پێشترو ئێستاش مەرجی خۆی بەسەر ئێمەدا دەسەپاند، دەبوایە ئێمەش گوێڕایەڵ و ملکەچ بووینایە، دەبا بۆگەن بکەن.

## سەرۆک و کەسایەتییە راگەیاندن و سیاسیەکان

سەرۆک صەدام حسێن بە قوڵی لە رۆڵی راگەیاندن لە جەنگ و رزگاریدا دەزانێت چەند گرنگە، ساختەکاری دوژمن بانگەشە بەتاڵەکانی ئاشکرا کرد، کە بانگەشەی بۆ داگیرکردنی عێراق دەکرد.

سەرۆک باسی لە هەندێك کەسانی راگەیاندنی عێراقی و عەرەبی کرد، کە پەیوەندیان لەگەڵ ئێمەدا هەبوو، هەروەها لەگەڵ دەستەکەماندا وەك مامۆستا مستەفا بەکری و عبدول باری عەتوان و فەهەد ئەلریماوی، سیمای گەشایەوە و وتی:

(ئەوانە هەموو پیاوانی ئازان، مستەفا بەکری پیاوێکی عەرەبی ئەسیلە، هەڵوێستەکانی نەگۆڕن، سڵاوی منی پێبگەیەنە، لەوەوە سڵاوم بگەیەنە بەگەلی میسر، بەڵام عەبدولباری عەتوان ئەو مرۆڤێکی ئازایە و متمانەم زۆر پێیەتی، کاتی خۆی زۆر

تەرخان کرد بۆ خزمەتکردنی مەسەلەی نەتەوەکەی، هەروەها برام فەهەد ئەلریماوی سڵاوی تەواوی منیان لێبێت، بۆ هەموو پیاوانی ڕاگەیاندنی عێراقی نیشتمانپەروەرو عەرەبە ڕەسەنەکان، هەموو ئەوانەی بۆ وتنی هەقیقەت جیهاد دەکەن، لەوانە جۆرج گالۆری کە بەرگەی زۆری گرتو بەرگری لە عێراق کرد، هەروەها بەرێز ڕەمزی کلارك، ئەمە جگە لە سەرکردەکانی وەك مەهاتیر محەمەدو نیلسۆن ماندێلاو هەموو ئازادیخوازان .. پێیان بڵێ وورەی صەدام حسێن بەرلەم چاوپێکەوتنە ٩٠٪ بووە، بەڵام ئێستا ١٠٠٪ بگرە ١٢٠٪، پێیان بڵێ من لە زیندان خۆڕاگرمو گەشبینم، هیچ چرکەیەك گومانم لە بەدەستهێنانی سەرکەوتن نییەو ئێستا سەرکەوتن لە هەموو کاتێکی تر نزیکترە.

## ئەی سەبارەت بە کوێت

پاش ئەو جەنگە درندەیەی هەشت ساڵی خایاند، کە بەسەرکەوتنێکی گەورە بەسەر ئێراندا کۆتایی هات، کە دوژمنی سەرسەختی عەرەب بوو، عێراق لەو جەنگەدا لە ١٩٨٨/٨/٨ دا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، عێراقو سوپاو سەرکردە مەزنەکەی هەموو هونەرەکانی جەنگو جەنگاندنیان دەزانیو هێزو شارەزایی جەنگیان هەبوو، ئەمە جگە لەوەی عێراق خاوەنی دەسکەوتی گەورەیە لە هەموو بوارەکاندا کە لە بواری جەنگی درێژخایەندا بەدەستی هێناون، هەموو ئەمانە لای ئەمریکاو ئیسرائیل جێگەی قبوڵ نەبوو چاویان پێدا هەڵنەدەهات، عێراق بەفعلی بیری لە ڕزگارکردنی فەلەستین دەکردەوە، ئەمەش سەرۆك صەدام حسێن لەکاتی سەردانی بۆ یەکێك لە شارەکان جەختی لێکردەوە، بەو هاوڵاتیانەی دەوریان دابوو وت (تەنها یەك جەنگی بچووکمان لەبەردەمدا ماوە)، زایۆنیزمەکان لەم ئاماژەیە تێگەیشتن، لەبەر ئەوە دەستیان کرد بە بیرکردنەوە لە دانانی نەخشەیەك بۆ تێکشکاندنی ئەم هێزە زەبەلاحە، ئەگەر ڕووبکاتە فەلەستین، هیچ هێزێك ناتوانێت ڕایبگرێت، لەبەر ئەوە ئیسرائیلیەکان هەرەشەی ئەوەیان کرد کە ئۆردن دەکەنە گۆڕەپانی شەر، کاردانەوەی عێراق ئامادەبوو، کاتێك سەرۆك وتی ئەگەر ئیسرائیل بیەوێت ئۆردن بکاتە گۆڕەپانی جەنگ، ئەوا عێراق خۆی دەکاتە گۆڕەپانی جەنگ، وە درێژەیدا بە قسەکانی وتی ((ئەگەر ئیسرائیل چەکی ئەتۆمی لە دژمان بەکاربهێنێت ئەوا نیوەی ئیسرائیل بە چەکی کیمیایی مزدەوج دەسووتێنین))، ئەم لێدوانانە پاش کێشەی لە

سێدارەدانی بازۆفت ئەو سیخورە ئێرانیە خاوەن رەگەزنامەی بەریتانی سەرپەلدا، کە پەیوەندی بە نووسینگەکانی بەریتانیاوە هەبوو لە بەرژەوەندی موساد کاریان دەکرد.

عێراق بە رۆڵی پێشرەوانەی‌و بیری نەتەوەیی، کێشمەکێشی عەرەب‌و زایۆنیزمی کرد بە کێشمەکێشی نێوان عێراق‌و زایۆنیزم، لەبەر ئەوەی عێراق ئەوەی بینی هەندێك حکومەتی عەرەبی خۆی لەبەرپرسیارێتی نەتەوەیی لە بەرامبەر کێشە عەرەبیەکان دەدزێتەوە کە سەنتەرەکەی فەلەستینە.

لێرەوە زایۆنیزم بیری لە چۆنیەتی خۆرزگارکردن لەو هێزەی سوپای عێراقی‌و تێکشکاندنی عێراق دەکردەوەو گۆڕینی رووکاری کێشمە کێشەکە، درکیان بەوە کردبوو لە رووی پراکتیکەوە عێراق بەو سەرکردایەتیە نیشتمانیەوەو بەو هێزە نەتەوەییەوە بزوێنەری سەرەکی‌و پاڵپشتی کێشمە کێشی عەرەبی‌و زایۆنیزمە، ئەو یاریزانێکی کارامەیە لەو کێشمەکێشەدا، ئەو لۆبیە زایۆنیزمەی لە ولایەتە یەکگرتووەکان هەیە لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ئەنجامدا بۆ دانانی نەخشەیەکی نهێنی‌و هەمەجۆر بۆ لەناوبردنی عێراق.

بەر لە تەواوبوونی دەیەی هەشتاکانی سەدەی بیست، ئەویش بە هۆی پلانگێران لەسەر ئابووری عێراق‌و دەستدرێژی بۆ سەر سنوورەکەی، کۆمپانیایەکی ئەمریکی گرێبەستی لەگەڵ کوێت کرد کە بە شێوەیەکی رووکەش بەدوای نەوتدا دەگەڕێت، ئەمجارەیان زەوییەکیان هەڵبژارد کە بۆ عێراق دەگەڕێتەوە، هەستان بە لێدانی بیری لار، پاشان عێراق دادەنا، ئەویش بە لێواری ئەو ناوچەیەی عێراق خاوەنیەتی، هەمان کۆمپانیا نەوتە دەرهێنراوەکەی هەناردەی ناو بازار کردو بەنرخێکی هەرزان بە ئێرانی فرۆشت، هەروەها بازاڕیان پڕ لەنەوت کردو ئابووری عێراقیان دارماند، ئەم ڕێ‌و شوێنانە بەووردی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرا.

هەر بەم سوودە ماددیانەوە نەوەستان کە لەنەوتی عێراقی دەستیان دەکەوت، بەڵکو هەوڵیاندەدا لەڕێی کوێتەوە دزە بەزانیاری بکەن، هەڵوێستەکە لە ساڵی ١٩٩٠ دا زۆر پەرەی سەند، ئەویش پاش هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت‌و یەك جەمسەری ئەمریکی، لەو کاتەوە گەمەی زایۆنیزم دژی عێراق دەستی پێکرد.

لەو کاتەدا زۆر شەرمم دەکرد کە پرسیارێك هەیە لە بیرو دەروونی زۆر کەسدا هەیە لە

سەرۆك صەدامی بکەین، سوێندم خوارد هەرچی لەناخمدایە لەو پرسیارانەی لای عێراقیو عەرەبو ڕای گشتی هەیە بە ڕاشکاوی لێی بکەم، بەبێ هیچ موجامەلەیەك، هەموو ئەوانەی لە شەقامدا باسی لێوەدەکرێت پێی بڵێم، لەبەر ئەوە پرسیارەکەم دەربارەی بڕیاری چوونە ناو کوێت بوو: ئایا بڕیارێکی بەپەلەبوو یان تەڵەیەك بوو بۆ عێراق نێنرابێتەوە ؟

زۆر بەهێمنی وەڵامی دامەوە:

((کوڕم، ئەو خوێنەی هەشت ساڵ لەبەر عێراقیەکان ڕۆیشت لە دژی فارسەکان، بەرگری بوو لە کوێتو ئەوانی تر، عێراق لە پێناو نەتەوەی عەرەبیدا زۆری چەشت، ئەویان کۆمەڵێك بنەمان لەگەڵ خۆمان هەڵمانگرتووەو لە پێناویدا دەژین، بەڵام کوێت بازاڕی بەنەوت نوقم کرد، بەشێوەیەك بە نایاسایی نەوتی عێراقی دەدزی، عێراق لەجەنگدا بەقەرزێکی زۆرەوە هاتەدەرێ کە باری شانی بە ٤٠ بلیۆن دۆلار قەرز قورس بوو، ئەمە جگە لەو یارمەتیانەی وڵاتانی عەرەبی پێشکەشیان دەکرد، کە هەندێکیان قەرزبوون بەسەرمانەوە، میزانیەی عێراق قورس بوو، لەبری ئەوەی کوێت هاوکاریمان بکاتو یارمەتیمان بدات، کە لە جەنگ هاتبووینە دەرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە لەبری ئەوە ئازاری دەداین.

چەند جارێك ئاگادارمان کردنەوە بە تایبەتی لە کۆنگرەی ترۆپکی نائاسایی لە بەغداد لە ١٩٩٠/٥/٣٠و پێشتریش، کە دەوڵەتی کوێتو ئیماراتی یەکگرتوو چ ڕۆڵێك بۆ تێکشکاندنی ئابووری عێراق دەگێڕن، ئەویش پاش ئەوەی لە جەنگدا بەسەرکەوتووی هاتووەتەدەرێ.

لە ساڵی ١٩٩٠، لە مانگی تەموزدا وەك بیرم بێت، پاش قوڵبوونەوەی قەیرانی نێوان عێراقو کوێت، کە وایلێهات چارەسەری ئەم مەسەلەیە بە گفتوگۆ مەحاڵ بوو، هەستام باڵوێزی ئەمریکیم لە عێراق بانگکرد، بە ئامادەبوونی هەڤاڵ تاریق عەزیز دانیشتین تاکو گفتوگۆیەکی سیاسی گشتگیری لەگەڵدا بکەین، بەو سیفەتەی نوێنەری وڵاتەکەیەتی، سەبارەت بە پەیوەندی عێراقو ئەمریکا هەروەها گفتوگۆمان لەسەر پەرەسەندنە هەنوکەییەکان کرد، تاکو نامەیەك بۆ سەرۆك بۆشی باوك بنێرین.

## هەڵوێستی هەندێک وڵاتانی عەرەب لە قەیرانی کوێت

یارمەتیەکانی دەوڵەتانی ناوچەکە لەوانە وڵاتانی کەنداو بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئێران لە چاکەیان نەبوو بەرامبەر بە عێراق، بەڵکو لە ترسی ئەوە بوو شۆڕشی خومەینی ئەوانیش راماڵێت، کە ئێران دەیوویست بۆ عێراقو وڵاتانی ناوچەکە هەناردەی بکاتو پاشان گەردرلول دەست پێبکات، بەڵام وەستانەوەی عێراق بەرووی ئەم ڕەوتە توندو شەڕانگێزەدا کە نەدەکرا تێگەیشتنی لەگەڵدا بکرێت، تەنها بە زمانی هێز نەبێت، ئەویش بەپێی بنەمای کارو کاردانەوە، کە ببێتە هۆی هەناردەنەکردنی ئەو شۆڕشە، جگە لەو هۆکارانەی پێشتر باسمان کردکە سەبارەت بە داگیرکردنی کوێت وتمان، مامۆستا خەلیل خوت دەزانیت مەسەلەی شەرەف لای ئێمە هێڵی سوورە، ئەوەی وروژاندنیو توڕەی کردینو بووە هۆکاری ئەوەی بڕیار بدەین بچینە ناو کوێتەوە، ئەو قسە ناشرینانە بوو کە شەرەفی ژنانی عێراقی لەکەدار دەکرد، قسەی بریندارکەرمان لەبەرپرسیارە کوێتیەکانەوە گوێ لێدەبوو، کە لەرووی ژنانی سەربەرزی عێراقەوە دەکرا، ئەم قسانەش پێچەوانەی بەهای ڕەسەنی عەرەبیمانە، خۆتانو هەموو جیهان گوێی لەو قسە ناشرینانە بوو کە لەسەر بەرزترین ئاستی بەرپرسیارێتیان دەکرا، ئەوەندەیان تێپەڕاند کە چیدی نەماندەتوانی بێدەنگی لێبکەین، بڕیارماندا بچینە ناو کوێتەوەو مافی زەوتکراوی خۆمان وەربگرینەوە، ئەویش پاش هەموو ئەو هەوڵانە بۆ چارەسەری ئاشتیانەی قەیرانەکەدرا.

زۆر هەوڵماندا ناکۆکیە کۆنەکانمان بە ئاشتیانە چارەسەر بکەین، کە بەڕادەیەک هەموو لایەنەکان بۆ دانووسان بۆ سعودیە بانگکران، مەلیک فەهد خوا لێی خۆش بێت هەرچی لە توانایدا بوو بۆ چارەسەری مەسەلەکە خستەگەڕ، هەروەها جێنشین مەلیک عەبدوڵا هەمان کاری کرد، بەڵام لە کوێتەوە فەرمان هات کە دانووسان کورت بکەنەوە، مەلیک زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی تارمایی جەنگ لەناوچەکە دوور بخاتەوە، هەروەها دەستێوەردانی بیانی نەهێڵێت، بەڵام ئەمریکا توانی مەملەکەو ڕای گشتی بخەڵەتێنێت، کە گواسیە عێراق بە نیازە هێرش بکاتە سەر سعودیە، ئەویش پاش ئەوەی ناچارکراین بچینە ناو کوێتەوە[٢]

[٢] لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە فەرماندەی لیوای کوێتی زرێپۆش، فەرمانی دا بەلیواکەی بچێتە ناو خاکی سعودیەوە.

ئەمریکا توانی ڕای گشتیمان لێهانبدات، تەنانەت هەندێك وڵاتی عەرەبیو ئیسلامیش، ئەم دەوڵەتانە هەڵخەڵەتێنران، کە بە بەهانەی پاراستنی پیرۆزیەکانی سعودیە چوونە پاڵپشتی هێزی دوژمن.

زۆر سەرزەنشتی براکانی ناو مەملەکەتو کەنداوی عەرەبیمان کرد، دەبوایە ئەوەیان لەبیر نەچووایە کە خومەینیو هێزەکانی ئەگەر عێراق نەبووایە ڕیازو کوێتو دۆحەو مەنامەو مەسقەتیشی دەگرت، کە لەوانەیە لافاویان بگاتە میسرو مەغریبیش.

کەواتە دەڵێم هەموو هەوڵو نێوەندکاریەکان شکستیان هێنا، لەو دەمەدا بووین چارەسەری کێشەکە بکەینو ئەو هەوڵانە بکەینە پاڵنەرێك بۆ پاشەکشەیەکی شەرەفمەندانە، کێشەکەمان بە شێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر بکرێت، بەڵام سەرۆك موبارەك کاروبارەکانی بەو لایەدا برد وەك ئەوەی ڕوویدا، جا ئەمە لەوانەیە بۆ حەزێکی خۆی بگەڕێتەوە، یان وەك تۆڵەیەك لەوەی لە ڕۆژگاری ساداتدا ڕوویدا، کە عێراق هەڵوێستێکی پێشڕەوی هەبوو بەوەی ڕژێمی سادات لە کۆمکاری عەرەبی دەربکرێت، ئەویش پاش سەردانەکەی سادات بۆ ئیسرائیل، لەوانەیە سەرۆك موبارەك لەبەر بەرژەوەندی ماددی خۆی مەسەلەکانی بەو ڕێگەیەدا بردبێت، ئەمەش بەئاشکرا دیاربوو کە ملیارەها دۆلار بەسەر ڕژێمەکەیدا باری، عێراق لەگەڵ میسر کەمتەرخەم نەبوو، بەتایبەتی لەگەڵ خودی حوسنی موبارەك، نامەوێت بچمەناو ئەو وردەکاریانەوە خۆی هەموو شتێك دەزانێت، موبارەك هەوڵی زۆریدا کە ئاراستەکان بەرەو دوژمنکاری بۆ سەر عێراق بەرێت، بەتایبەتی لە کۆنگرەی ترۆپکی قاهیرە، کە پاش چوونە ناوەوەی عێراق بۆ کوێت بەسترا، ڕای جیهان ببینی کە دانیشتنی ترۆپك چۆن بوو، شەرەکەی لەگەڵ موعەمەر قەزافی کە دەیویست قەیرانەکە بەبێ دەستێوەردانی دەرەکی چارەسەر بکات، سەرۆك موبارەك دەیتوانی زۆر شت بکات، ئەوەی بۆ گەلی میسری مەزن بە جێبهێشتایە، کە نۆکەندی

---

مانگەدەستکردو ئامێرە ئەمریکیەکانو دەزگا سیخوڕیەکانی ئەمریکا وا وێنەی ئەو لیوایەیان گرتبوو، وەك ئەوەی تانکی عێراقی بنو لەو هێزانەن دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر سعودیە، پاشان ئەم وێنانەی نارد بۆ سعودیەو ڕای گشتی جیهانی لە دژی عێراق بەلاڕێدا برد، بە ڕاستی ئەمەش سەریگرت، ئەگەر چی سعودیە زۆر هەوڵیدا ئەم کارەساتە نەقەومێت تەنانەت بڕیاریدا سی ملیار دۆلار ببەخشێت بە عێراق بەو مەرجەی لە کوێت بکشێتەوە، بەڵام ئەم هەوڵانەو چەندەها هەوڵی تر کە وڵاتانی عەرەبی دایان شکستی هێنا، ئەمە جگە لەو ڕاوێژانەی هەندێك لەوانەی لە سەرۆکەوە نزیك بوون کە زۆربەی لە هەقیقەتو واقعەوە دوور بون، وای کرد سەرۆك ئەوە بەتوندی ڕەتبکاتەوە کە پاشەکشە بکات.

سوپس دابخەن و ئەو شەرمەزارییە تووشی خۆی نەکات.

بەلام ئەوانەی مەلیك حسێن بەوە تۆمەتبار دەکەن کەوا پاڵی بەمەسەلەکەوە دەنا ئێمە بچینە ناو کوێت، ئەم قسەیە زۆر دوورە لە ڕاستیەوە، کە مەلیك حسێن هەوڵی زۆریدا تاکو قەیرانەکە چارەسەربکات، هەمیشە ئاگایی لە هێزی ئەمریکی و توانای کاولکاری دەدا. ئەوەی دەربارەی سعودیە وترا گوایە لاری نەبوود لەوەی ئێمە بچینە ناو کوێتەوە، ئەم قسانە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە، کە هەلوێستی مەلیك فەیسەڵ لەم مەسەلەیەدا تەواو ڕوشن بوو.

کەواتە مامۆستا خەلیل پاش دوو هەفتە لە چوونە ناوەوەی کوێت، ئێمە ئامادە بووین پاشەکشێ بکەین، چەند داواکاریمان هەبوو، کەهەر هەموو کێشەکانی ناوچەکە چارەسەر بکرێت، بەلام لەسەر بنەمای پالاوتن و بەشبەشکردن، بەلام پاش بلاوبوونەوەی هێزی ئەمریکی و هاوپەیمانەکانی لە سعودیە، ئەویش پاش ئەوەی ئەو هەموو زەریایەی بڕی، گەیشتینە ئەو بڕوایەی کە بە هۆی ڕووبەڕووبوونەوە چەند شتێك بەسەرماندا دەسەپێنرێت. لەبەر ئەوە هەلوێستێکی تەواو ئاگاییانەمان وەرگرت، سوپایان لە زیاتر لە بیست و هەشت دەولەتەوە هێنا کە ولایەتە یەکگرتووەکان بۆ شەڕانگێزی ڕابەرایەتیان دەکات، هەرچی توانای ماددی و سەربازیان هەیە کۆیانکردەوە، هەروەها ئامێرێکی ڕاگەیاندنی زەبەلاحیان خستەگەڕ تاکو دەهۆڵ بۆ جەنگ بکوتن، ڕاگەیاندنێکی ئامادەکراوو توانای بانگەشەی زۆر گەورە بە هەموو لایەکدا، قەناعەتیان بە هەموو دنیاکرد کە عێراق ولاتێکی دەستدرێژیکەرە، کە کارەکەیان تەنها نەشتەرگەرییەکە بو دەرکردنی عێراق لە کوێت. بەلام بەداخەوە هەندێك لەگەڵیان بڕوایان پێکردن، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا پێشتر بانگەشەی ئەوەیان دەکرد بۆ پاراستنی سعودیە هاتوون لە داگیرکاری عێراقیەکان. بەرهەڵستکاریەکی گەورە بۆ ڕوونەدانی جەنگ هەبوو.

من بەوانە دەڵێم کە باس لە یاسای نێودەولەتی و مافی مرۆڤ و پەیوەندی نێودەولەتی و ڕێزگرتنی نێوان دەولەتان دەکەن، ئەوا ئەمریکاو بەریتانیا گالتەیان بە مافی گەلان دەهات، ئەویش لەو کاتەی ئێمە دەمانووست چارەسەرێکی شەرەفمەندانە بۆ کێشەی کوێت بدۆزینەوە، پاش ئەوەی چووینە ناو کوێت، ئەمریکا نامەی ئیستفزازی ڕاستەخۆو ناڕاستەوخۆی بۆ دەناردین و دەیانوویست بە شێوەیەکی ناچیزە دەست لە کاروبارمان

وەربدەن، داوایان لێکردم پێگەی سەرکردایەتی گەل بەجێبهێڵم، لە ژنێف داوایان لەبەرزان کردبوو، ئەم نامەیەم بۆ بگوازێتەوە: بە براکەت بڵێ دەبێت ئەوە بزانێت ئێمە شەیتانی سپین، دەبێت لە کوێت پاشەکشە بکاتو دەست لە عێراق هەڵگرێت، تەنانەت بۆشی کوڕ بەر لە دوژمنکاری نامەیەکی بۆ ناردم بە هەموو وەقاحەتێکەوە دەڵێت: ئەگەر دەسەڵاتی عێراق جێنەهێڵیت، خۆتو خێزانەکەت تەفروتونا دەکەم.

لەو کاتەدا، لێکهەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێتیان بە دەرفەتزانی، لەگەڵ مەلیك حسێن لەو بارەیەوە قسەمکرد، ترسی خۆی لە داڕمانی یەکێتی سۆڤیەت دەربڕی، کە جیهان چی لێبەسەردێت ئەگەر هاتوو ئەمریکا بوو بە تاکە جەمسەری جیهان، ئەگەر چی ئۆردن پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا باش بوو، هەندێك لە برا عەرەبەکانمان ئامۆژگاریان دەکردین کەنەرمی لەگەڵ ئەمریکا بنوێنین، ئەمریکا وا نەرمی لێکدەداتەوە کە ئەمە سازش بێت، کە ئێمە لەسەر شتەجێگرەکان سازش ناکەین، لەبەر ئەوە دەڵێین ئەمریکا وەك هێزێکی گەورە تاکڕەوانە کار دەکات، بە ئەمریکاییەکانم وت ئەگەر بڕوایان بە نیەتمان هەیە دەتوانین کێشەکان چارەسەر بکەین، ئەویش بە کۆتایهێنان بە کێشەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لە ناو ئەوانەدا چارەسەری کێشەی فەلەستین، کە کێشەی سەنتەری عەرەبە هەروەها بۆ ئەوەی ناوچەکە لە ئاشتی هەمیشەیدا بژی دەبێت گەلی فەلەستینی مافی تەواوی خۆی وەربگرێت، وتمان ئەوەی فەلەستینیەکان پێی ڕازین ئێمەو سەرجەم گەلانی عەرەبی پێی ڕازی دەبین، بەڵام لەسەر کاولکردنی عێراقو بوونیادی ژێر خانی عێراق سوور بوون، هیچ هەڵبژاردنێکیان بۆ نەهێشتینەوە، یان ملکەچیو ملدان بە هەموو مەرجو ئەجنداکانیان یان بەرەنگاربوونەوە بە کەرامەتەوە، ئەویش پاش تەوەکەل کردن بەخوا.

ئێمە لەو کاتەی چووینە ناو کوێت گاڵتەمان بە توانای کەس نەدەهات، کە هەندێك ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەندێك کەرتی کوێتی ڕوویدا، ئەوکات وتمان سەربازە برا کوێتیەکانمان ئازانو بەرگریەکی هەقیقیان کردو جێگەی هەموو ڕێزێکن، بەم شێوەیە ئومێدمان بە سوپای عەرەبی هەبوو، بەڵام مەسەلەکە تەنها ئەم پێکدادانە نەبوو، دەبوایە بە شێوەیەکی تر لەگەڵ کوێت مامەڵەمان بکردایە، بەڵام بەداخەوە ئەوەی ڕوویدا کە بوو، خوا لەسەبەبکار خۆش بێت، (چەند جارێك دووبارەی کردەوە)، خوا لە شەهیدانی هەردوولا خۆش بێت.

کاتێك پرسیارم لەو شتانە لێکرد کە ئاماژەی پێدا، هەر ئەوەندەی وت دەبووایە بە شێوەیەکی تر مامەڵەم لەگەڵ بکردنایە.

کاتێك هێزەکانمان لە کوێت پاشەکشەی کرد، ژەنەراڵ شوارسکوف داوای لە بۆش کرد بەرەو پێشچوون تا بەغداد بەردەوام بێت، بەڵام ئەو رەتی کردەوەو وتی: کێ بەرپرسیاریتی ئەو گێرەشێوێنیە هەڵدەگرێت کە لە عێراق روودەدات، ئەگەر بێتو دەسەلاتی حوکم لە عێراق لابەرین ناوچەکە چی لێدێت، هەروەها ئەمە ئەرکی خەڵکانی ترە. بەڵام کاتێك کاری غەدرو خیانەت دەستی پێکرد، بۆش نەخشەی شتێکی تری دادەرشت، لەبەر ئەوە فرۆکەکانی هێرشی نەکردە سەر کۆپتەرەکانمان کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم مەسەلەیە بەکارمان هێنا.

پرسیاری دانووساتی جدەم لێکرد کە لە نێوان شاندی عێراقی بە سەرۆکایەتی عیزەت دوریو شاندی کوێتی بە سەرۆکایەتی سەرەك وەزیران وەلی عەهد بوو، پێم وت وا باس دەکرێت کە عیزەت دوری لەو دانووسانەدا زۆر توند بووە. وەڵامی دامەوە:

((ئەبو ئەحمەدی برام ئەو هەڵوێستە توندەی کە ئاماژەی پێدەدرێت بەپێی ئاراستەکردنەکانی من بوو، مەبەست لەو توندییە ئەوە بوو پاڵ بە کوێتیەکانەوە بنێین کێشەکە بە ئاشتیانە چارەسەر بکەین، کەنەبێتە هۆی قوڵبوونەوەی قەیرانەکە، کە ئەبو ئەحمەد تەنها لەبەر توورەبوون توند نەبوو، بەخوا ئەو لەو بابەتەدا هەرگیز توند نەبووە، هەرگیز پاڵنەرو هاندەری چارەسەری سەربازی نەبووە.

## ● رۆڵی ئێران لە قوڵکردنەوەی قەیرانی کوێت

کاتێك شاندەکانمان سەردانی ئێرانی دەکرد، ئەویش وەك نییەت پاکی بۆ چارەسەری کێشەکانی نێوانمان دەچووین، بەرپرسە ئێرانیەکان لەسەر بەرزترین ئاست هانیان دەداین لە کوێت بمێنینەوەو پاشەکشە نەکەین، جەختیان لە رەتکردنەوەی هەر دەستێوەردانێکی دەرەکی دەکردەوە، بەڵام دەیانوت لە بەرژەوەندی ئێران نییە شان بە شانی عێراق لە دژی ئەمریکا بجەنگێت، بەڵام ئەگەر ئەمریکا ئێران ئیستفزاز بکات، ئەوا لەوانەیە دواتر لەگەڵ عێراق بین، بەڵام دەبێت عێراق بەرووی ئەمریکا خۆراگر بێت، کە ئێران ئامادەیە فرۆکە جەنگیەکانی عێراق لەخۆبگرێت بۆ خۆدەربازکردن لەهەر لێدانێکی کتوپری

گریمانەکراوی پێشوەخت، کە لەوانەیە ئەمریکا دژی عێراق ئەنجامی بدات، بەپێی پەیمانەکانی بەرپرسانی ئێران ڕێگەمان دەدەن لە قۆناغی دووەمدا ئەو فرۆکانە بەکاربهێنین، وەك نیازپاکی چەندەها بەڵێنی تریاندا.

ئەمە ئەوەبوو ڕوویدا، بەڵام فارس ناکرێت متمانەی پێبکەیت، لەکاتی جەنگی ١٩٩١، بەوەندە نەوەستان کە لە دژمان بووەستنەوە، بەڵکو ڕێگریان لە سوپای عێراق لە کاتی پاشەکشەدا کرد بەهۆی (پاسەوانی شۆڕش) ەوە لە سوپاکەمانیاندا، ڕێگەیان بەچەتەکانی گێرەشێوێنیدا بێنە ناو خاکمانەوەو پارێزگاکانی باشوورو ناوەڕاستیان سووتاند، بەشدارییەکی کارایان لە تێکشکاندنی عێراقدا کرد، لە کاتی دوژمنکاری کە داوامان لێکردن فرۆکەکانمان بدەنەوە بۆ لێدانی ئەمریکا ڕەتیان کردەوە، تاکو ئێستا دەستیان بەسەردا گرتووە، لەبەر ئەوە ئەو لاپەڕەیەمان ناونا لاپەڕەی غەدرو خیانەت، واتە غەدری ئێران‌و خیانەتی هەندێك لەوانەی لە خشتەی بردبوون.

پرسیارێکم لە سەرۆك کرد کە مەبەستی لە گوزارشتی (غەددارەکان غەدریان کرد) چی بوو کە لە وتاری ڕۆژی سەرەتای دوژمنکاری لە ١٩٩١/١/١٧ دا دای، وتی:

لەگەڵ ئەو هەراو زەنایەی ڕاگەیاندن لە دژمانکرا، بەڵام ئەمریکا نامەی زارەکی بەشێوەی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ بۆ دەناردین لە ڕێگەی ئەوانەی لە نێوانماندا بوون کە دەیانوویست قەیرانی نێوان عێراق‌و ئەمریکا چارەسەر بکەن، بەر لەوەی بچینە ناو کوێتەوە، جەخت لەوە دەکەنەوە ئەوان دەست لە کاروباری عەرەبیمان وەرنادەن، بەڵام بەڵێنەکەی شکاندو غەدری لێکردین، ئەمەیە ئایینی ئەوان لەگەڵ گەلان لەبەر ئەوە لە بەیاننامەی یەکەمدا وتمان (غەددارەکان غەدریان کرد).

لەسەر قسەکانی بەردەوام بووو وتی:

لە جەنگی بەرگریمان لەگەڵ ئێران، ئێران هێڵی بەرەنگاری یەکەم بوو لەبری ئیمپریالیزمی ئەمریکی، دروشمە ئایینیە ساختەکانی خومەینی کە دەیوویست خەڵکی پێهەڵبخەڵەتێنێت، نەیتوانی ئێمەی پێهەڵبخەڵەتێنێت، ئەمریکا دەیوویست لاوازمان بکات‌و تێکمانبشکێنێت، بەڵکو زانیاری بەهەردوو لادەدا تاکو جەنگەکە درێژبێتەوە، ئەمە جگە لەوەی ئەوان‌و هەندێك دەزگای سیخوڕی خۆرئاوایی خومەینیان گەیاندە سەرکووسی دەسەڵات لە ئێراندا، بەپارەو چەك پشتگیریان کرد، تەنانەت قەوارەی زایۆنی بەهەرچی شارەزایی‌و چەکیەوە هەیە لەگەڵ ئێران وەستا.

لەبیرمە هێنری کیسنجەر لە یاداشتەکانی دەربارەی جەنگی عێراق – ئێران چی وت، ئەمە یەکەم جەنگە لە مێژوودا کە ویستوومانە درێژترین ماوە بخایێنێتو کەسیش بە سەرکەوتوویی لێیدەرنەچێت.

**راپەڕینی فەلەستینی**

لە گەرمەی قسەمان دەربارەی ڕاگەیاندنی ئەمریکیو پلانی وڵاتان لە دژی عێراق لە ساڵی ١٩٩١، سەرۆك بەپرسیارکردن دەربارەی ڕاپەڕینی فەلەستینی تووشی سەرسامی کردم.

هەواڵی برا فەلەستینیەکان چییە؟

دەستم کرد بە قسە کردن لەسەر بارودۆخی فەلەستینیو پێم ڕاگەیاند کە فەلەستینیەکان هێشتا خەبات دەکەن، بەڵام باسی کۆچی دوایی یاسر عەرەفاتم بۆ نەکرد، وتی:

من گەلی فەلەستینی باش ئەناسم، هەرگیز هەست بەپشووناکەم تا ئەو ڕۆژەی فەلەستینیەکان بە هەموو مافە ڕەواکانی خۆیان دەگەن، کە ئەمیان مەسەلەی هەموو عەرەبە ئەوەی دەستبەرداری بێت وەك ئەوە وایە دەستبەرداری شەرەفی خۆی بێت، وویستیان لەسەر ئەو مەسەلەیە سازشم لەگەڵ بکەن، لە ڕێگەی سەرکردەو کەسایەتیە عەرەبیو نێودەوڵەتیەکانەوە نامەیان بۆ دەناردمو دەیانووت ئێستا یەك وشەی تۆمان دەوێتو ڕێکەوتنمان ناوێت.

دەیانوویست ئامادەیی خۆم نیشان بدەمو دان بەو دەوڵەتەیاندا بنێم، ئەو قەوارە مەسخەی ئیسرائیل، بەڵام بە هەموو توانامەوە ڕتمکردەوە، لەگەڵ ئەوەی وتیان داننان بە قەوارەی ئیسرائیل مانای لابردنی گەمارۆی ئابووریە لەسەر عێراقو پەیوەندیەکان لەگەڵ ولایەتە یەکگرتووەکان دەگەڕێتەوە دۆخی خۆی.

درك بەوە دەکەم ئەوەی واز لە خاکی نیشتمانەکەی بێنێت، دەستبەرداری شەرەفو کەرامەتی خۆی دەبێتو هێڵی سووری نامێنێت، ئەمە زنجیرەیەکی قێزەونەو پێویستی بە خاڵی سەرەتایە، تاکو ڕێگای سازش تا ناکۆتا بەردەوام بێت، بەڵێ ڕاپەڕین هەر بەردەوام دەبێت، من پشت بەشەقامی عەرەبی دەبەستم ئەوان کلیلی سەرکەوتنن، ئەمریکا لەهەر جوڵەیەکدا بێت تل دەخوات، لەبەر ئەوەی دەزانێت ئەگەر شۆڕشی شەقامی عەرەبی دەست پێبکات ئەوا کەس ناتوانێت لە ڕیشەوە بیکوژێنێتەوە.

## ئایا زیاد لەصەدام حسێنێك هەیە؟

لەهەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا نوکتەیەك لەعێراقدا بڵاوبووەوە، بەتایبەتی سەبارەت بەئەندامانی سەرکردایەتی عێراق، ئەم نوکتانە دەگەیشتە گوێی سەرکردایەتی و سەرۆك صەدام حسێن، ئەم دیاردەیە لەزۆربەی کۆمەڵگا عەرەبیەکاندا هەیەو لەزۆرێك لەوڵاتانی جیهان، لەوانەیە نوکتە هۆکارێك بێت بۆ ڕەخنەگرتن لەدیاردەیەك کە بەسەر کۆمەڵگادا دێت، جا ئەگەر سیاسی یان ئابووری یان هەر دیاردەیەکی تر بێت، کە بەشێوەیەکی سلبی کار لەتاك و گرۆپ و دەوڵەت و هەمووان دەکات، لەبەرئەوە خەڵك پەنا بۆ نوکتە دەبەن بۆ ڕەخنەگرتن لەو سلبیاتانەی لەو ماوەیەدا بڵاو بووەتەوە، زۆرجار ئەو نوکتەیە لە هەستی میللیەوە دەردەچێت وەك گوزارشتێك یان هەناسەدانێك بێت بۆ ئەوەی بەخەیاڵیدا دێت.

لەماوەی ئەو دوو دەیەیەی ڕابردوو باس لەوە دەکەن سەرۆك صەدام حسێن چەندەها هاوشێوەی هەیە، واتە چەند هاوشێوەیەکی سەرۆك هەن و دەوری ئەو دەبینن، نوکتەکان لەم بارەیەوە بوون.

پاش داگیرکردنی عێراق، نوکتەچیەکان نوکتەیەکیان بڵاوکردەوە دەڵێن ئەو پەیکەرەی لە گۆڕەپانی فیردەوس داگیرا پەیکەری هاوشێوەکەی صەدام حسێن بوو، لەبەرئەوە فکرەی هاوشێوە بڵاوبووەوە بەبێ ئەوەی کەس بزانێت لەکوێوە هاتووە، خەڵکی ناوی هاوشێوەیان بەکاردەهێناو دەیانووت زیاتر لەهاوشێوەیەك هەیە، لەو ناوانە میخائیل ڕەمەزان، جاسم ئەلعەلی، تەنانەت هەندێك پەیوەندیان پێوە دەکردم و دەیانپرسی: تەندروستی جاسم ئەلعەلی چۆنە، مامۆستا خەلیل سوێندیان دەخوارد ئەوەی لەزینداندایە جاسم ئەلعەلییە، هەندێك ئەو حوکمەیان دەهێنایەوە کەپاش داگیرکردنی عێراق و خۆشاردنەوەی صەدام حسێن بەماوەیەك لەشوێنی جیاجیا بینراوەو لەکاتی نزیکدا، لەوانەیە ئەمە بۆ خۆشەویستیان بۆ سەرۆك بگەڕێتەوە، خوازیاری ئەوە بن ئەوە سەرۆك نەبێت دیل کراوە.

لەگەڵ سەرۆك دەربارەی چیرۆکی هاوشێوەو ڕای شەقامی عێراقی پرسیارم لێکرد، وەڵامی دامەوە:

لەناوچەی جیاجیا لەبەر هۆکاری ئەمنی دەجوڵامەوە، بۆ بەسەرکردنەوەی بارودۆخی گەلو کەرتەکانی مقاوەمە، بۆ لەدەستدانی دەرفەت لەدوژمن، لەهیچ شوێنێك لەسێ کاتژمێر نەماومەتەوە جگە لەو شوێنەی تیایدا دەستگیرکرام، بۆ نمونە کاتژمێر ١٠ی بەیانی لە فەلوجە دەردەکەوتم، پاش کاتژمێرێك دەچووم بۆ رومادی، پاشان دوای دوو کاتژمێر لەسەلاحەدین بووم، خەڵك بەووردی باس لەکات ناکەن، لەوانەیە کاتەکان لەیەکەوە نزیك بن، ئەمە جگە لەوەی خەڵك وا دەزانن من هاوشێوەیەکم هەیە، بەمەش بڕوا بەچیرۆکی هاوشێوە دەکەن، پاشان سەرۆك بەگاڵتەوە وتی:

بەڕێز خەلیل من ئێستا صەدامم یان هاوشێوەکەی؟

بەڕاستی ئەم پرسیارە بۆ من کتوپڕ بوو، دووبارە گومانم لا دروست بووەوە، جارێکیان لەپاسەوانەکانی سەرۆکم پرسی ئایا هاوشێوەی هەیە، هەموویان ئەمەیان ڕەتکردەوە، تەنها یەکێکیان نەبێت وتی: بەڵێ یەك هاوشێوەی هەیە، وەك پەندەکە دەڵێت (باسی ئەوە بۆ ئاقڵ بکە کەئەقڵ نایبڕێت، ئەگەر باوەڕی کرد ئەوا ئەقڵی نییە).

ویستم گومانەکەم بۆ یەقین بگۆڕم، پێم وت پارێزەر مامۆستا زیاد ئەلخەصاونە سڵاوی لێدەکات، باسی عەشیرەتی ئەلخەصاونەی عەرەبی ڕەسەنی بۆ کردم، وتم مەبەستم زیادە، نەك پارێزەر دکتۆر هانی ئەلخەصاونە، باسی پارێزەر هانی ئەلخەصاونەی بۆ کردم، کە لەزانکۆی قاهیرە لەکۆلیژی یاسا هاوڕێی بووە، لەکاتی خوێندندا کێشەیەك کەوتە نێوانیانەوە، وەك مرۆڤێکی شەریف و خەباتگێڕێکی نەتەوەیی ڕەسەن باسی کرد

تاکو ئەم ساتە هەر بەگومانم ..

لەسەردانی دووەمدا پرسیارم لەسەرۆکی دیلکرد دەربارەی ڕووداوێکی دیاریکراو، بەنامەیەکی نووسراو بۆ کەسێکی نزیکی باسی لێوەکرد، لەدێڕی یەکەمدا گوزارەیەك نووسرابوو لەگەڵ ئەو کەسەدا لەسەری ڕێکەوتبوون وەك وشەی نهێنی وابوو، نامەکەمدا بەوکەسەی لەنێوانماندا بوو تا بیگەێنێتە ئەو کەسە نزیکە، نامەکە بەنیوە دێڕی ئەو گوزارەیەوە هاتەوە کە ئەویش وەك وشەی نهێنی وابوون ئەمیش بەڵگەی بنەبڕەو هەموو گومانەکانمی ڕەواندەوە، چیرۆکی بوونی هاوشێوە تەنها درۆیەکە دوژمنانی نەتەوە بڵاوی

دەكەنەوە، بەتایبەتی ئەو هەڵوێستەی سەرۆك لەدادگا دەینواند، كەبەشكۆو سەر بڵندیەوە دەوەستا، كەقینی دوژمنانی زیاد دەكردو دڵی ڕۆڵەی نەتەوەیی دەتەزاند، یەكێك لەپاسەوانانی سەرۆك پێی وتم بۆ مەبەستی ئەمنی زۆرجار زیاد لەمەوكبێكمان بەكاردەهێنا بۆ شاردنەوەی سەردانەكانی سەرۆك، بەبێ بوونی هیچ هاوشێوەیەك، مەبەست لەمەش ئەوەیە تامانگە دەستكردەكان مەوكیبەكەی دەستنیشان نەكەن، هەروەها لەترسی دوژمنانی ناوخۆی عێراقیش.

ئەوەی صەدام حسێن بناسێت، دەزانێت بەچ شكۆو ئازایەتی و ئیمانو تواناوە لەبەردەمی سێدارەدا وەستا، دوژمنەكانی كە شانۆگەری لەسێدارەدانیان ئەنجامداو سەمایان دەكرد، دەیانزانی جگە لەصەدام حسێن كەسێكی تر نییە بەو شێوە ئازاییە دەگمەنە بووەستێتەوە، زۆرجار وێستگەكانی تەلەفزیۆن داوایان لێدەكردم باسی هاوشێوەی صەدام حسێن بكەم، بەڵام من ڕەتم دەكردەوە.

پرسیارێکی قورسە، بەڵام زۆری تووشی سەرسوڕمان کرد، وەك ئەوەی هەورە بروسکەیەك لێیدابن، ئازار هەمووان دەهاڕێت، هەمووان دەبینن بەغدادی ئازیز دەکەوێتە نێو کلپەی دڕندەکانەوە، کەهیچ یاساو ئەخلاقێکی نییە، ئامانجی کاولکاری و دزین و تۆڵەیە، شارستانیەتێك بکوژێننەوە کەئەوکات خۆرئاوا لەژێر تاریکستاندا بوو لەناو نەزانی و دواکەوتوویدا دەژیان، ئەوان بەڕووتی مێژووی عێراقی هاوچەرخ دەبینن بوونیادنان لەچ ئاستێکی بەرزدایەو شکۆی نەتەوە شانازی بەدەستکەوتەکانیەوە دەکات لەزەمەنێکدا دوژمن لەهەموو لایەکەوە دەوریان لێداوە، خەڵك بەسەرسوڕمانەوە دەپرسن چۆن ئوم قەسر نۆزدە ڕۆژ خۆی ڕاگرت، بەڵام بەغداد لەماوەی چەند ڕۆژێکدا کەوت ...؟

بەغدادی ڕەشیدو موعتەسەم .. بەغدادی عەرەب .. بەغدادی شاعیران و زانایان و هونەرمەندان و داهێنەران .. بەغدادی ژیان .. بەغدادی مێژوو لەگەڵ یادەوەرییە جوانەکاندا، گەورەم بەڕاستی بەغداد کەوت!

سەرۆك وتی: ئازارێك لەناخیدا بوو دەیویست بیشارێتەوە: کوڕی خۆم، بەغداد نەکەوت، بەغداد داگیرکراو بەبازوو بەهێزی پاڵەوانەکانی ڕزگار دەکرێتەوە، داگیرکردن شتێکەو کەوتن شتێکی ترە، ئەمە یەکەمجار نییە بەغداد داگیر دەکرێت، بەر لەئەمریکیەکان و بەدرێژایی مێژوو بەرەوڕووی داگیرکاری بووەتەوە دوژمنان لەهەموو لایەکەوە هەلا هەلایان کردووە، فارس داگیریکردووە لەئەڵقەیەکی بەردەوامدا داگیرکاری بەردەوام بووە، مەغۆلی هۆلاکۆ داگیری کرد، سووتاو کاولکراو کوژراو گەندەڵی تێدا بڵاوکرایەوە، پاشان چاکەکارانی عێراق ڕزگاریان کردەوە، هۆلاکۆیان دەرکرد، خەوش نییە وڵاتان داگیر بکرێت، بەڵام خەوش ئەوەیە مقاوەمە نەکات و ئازاد نەکرێت.

صەدام حسێن چاوەڕێی ئەم پرسیارە بوو، هێندەی نەبرد کەوتە قسەکردن، زۆر بەپەلە دەمنووسییەوە، تاکو یەك وشەم لەدەست دەرنەچێت.

ئەمڕۆش هەمان حاڵەت، بۆش سوپاو بەکرێگیراوەکانی کۆکردووەتەوەو زەریای بڕیوە، ئێمە دەستدرێژیمان نەکردووەتە سەر کەس، بەڵام ئەوان لەگەڵ ئێمەدا شەڕیان

دەویست و ئەیانویست سامانی وڵاتەکەمان بۆ خۆیان بەرن و وڵاتەکەمان کاول بکەن، بەهەموو شێوەیەك هەوڵماندا خۆمان لەشەڕیان بپارێزین.

سەرۆك بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبێت و پاشان دەست پێدەکاتەوە:

لەڕاستای سەربازیدا ناتوانیت هۆکار لەدەرئەنجام جیابکەیتەوە هەردووکیان یەك حاڵەتن و یەك جەنگ زنجیرەیەك ئەڵقەیە بۆ گەیشتن بەئامانج، ئەی چۆن لە ساڵی ١٩٩٠ وە جەنگەکان هەر بەردەوام بوون، هەروەها گەمارۆی زاڵمانەی بەدوای خۆیدا هێنا کەسیانزە ساڵی خایاند، بەو هۆیەوە یەك ملیۆن‌و نیو عێراقیمان لەمنداڵ و پیرو ژن و تەنانەت لاوان لەدەستدا، لەبەرئەوە ناتوانم بەش بەشیان بکەم و دەربارەی یەك جەنگ قسە بکەم، کەخۆی ئامانج و دەرئەنجامی زنجیرەیەکی درێژ بوو، ئایا بۆمبارانی ئەمریکا بۆ عێراق لەوکاتەوە هەر بەردەوام بوو یان نا، ئایا ئەمریکا هێڵی درێژی و پانی دانەناو ناوی هێڵی دژەفڕینی لێنا؟

کاتێك هێزێکی سەربازی دێت جا کەرتێك بێت یان فیرقەیەك یان زیاتر دەیانەوێت ئامانجێکی دیاریکراو داگیربکەن، دەبێت هێزەکانی تۆپهاوێژ دەست بکەن بەبۆمبارانی بەرایی و موشەك و ڕاجیمەباران بکرێن، ئەویش بۆ لەرزاندنی ئامانجەکە، پاشان هێزەکە هەستێت بەئەرکەکەیی و بگاتە ئامانج، ئایا مەبەستت ئەوەیە هێزی هێرشبەر ئامانجی داگیر کردووە، بەبێ ئەوەی باس لەڕۆڵی بۆمبارانی ئاسمانی و هێزی تۆپهاوێژ بکەین؟ لێرەدا یەك جەنگ هەیە بریتییە لەزنجیرەیەك کردە، بەم شێوەیە ئەوەی بەسەر بەغدادا هات کەبوو.

کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستی بەدوژمنکاری کرد وەك جێبەجێ کردنی خواست و گەمژەیی بۆش، موشەکەکان بەسەر بەغدادا دەبارین، توانای سەربازی دوژمنکاری بەسەر جەنگ بەشێوەیەکی گشتی لەبەرەکانی کردەکانداو سەرنج گرتن لەبەغداد دابەش ببوو، هەروەها بەسەر هێرشی ئەمریکاو بەریتانیا لەبەشی دووەمی جەنگ لەئوم قەسردا لەبەرئەوەی بەشی یەکەم داگیرکەران ئەنجامیاندابوو، دابوویانە دەست کوێت و پانتایی ئەوی پێ زیاد بکەن و لەسەر حسابی عێراق ببێتە دەوڵەتێك و ببێتە خەنجەرێکی ژەهراوی لەپشتی عێراقدا.

سەرۆك بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبێت و پاشان بەردەوام بوو وتی:

کەکێشەیەك لەنێوان دوو وڵاتدا دروست دەبێت، هەر لایەك خۆی دەخاتە حاڵەتی ئامادەباشییەوەو سوپا ئامادە دەکاتو لەڕووی ئابووری و دامودەزگاکانیەوە خۆی ئامادە دەکات هەر لایەك پۆلێنی سوپاکەی بەلایەنی بەرامبەری دەکات، تاکو قەرەبووی هەندێك بکاتەوە جا لەهێزی ئاسمانی یان دەریایی یان تۆپهاوێژدا بێت یان هێزی موشەکی، هەروەها ئەمەش بۆ حاڵی هێزی پیادەو زرێپۆش و پۆلەکانی تریش پاشان هەر لایەك دەست بەئامادەکاری دەکات، تاکو دەرفەت بەرکەبەرەکەی نەدات دەستدرێژی بکات.

کاتێك عێراق بەرەنگاری لەسنووری نیشتمان دەکرد لەدژی تەماعی ئێرانی، هێزی ئاسمانیمان زۆر لەهێزی ئاسمانی ئەوان بەهێزتر بوو، بەڕاستیش هێزی قوڵی درێژی عێراق بوو، فڕۆکەوانەکانمان ئەوەندە پاڵەوان بوون، کاتێك موشەك یان زەخیرەی لێدەبڕا بەفڕۆکەکەی خۆی دەکێشا بەفڕۆکەی دوژمندا،ئەمەش ترۆپکی ئازایەتیو جوامێرییە، باشترین نمونەش بۆ ئەم شەهیدی پاڵەوانییە فڕۆکەوان عەبدوڵا لعێبی کوڕی باشوری عێراق بوو، لەبەرامبەردا ئێران ژمارەی لەئێمە زیاتر بوو، بەم شێوەیە.

بەڵام ئەوەی لەدوژمنکاری دوایی ئەمریکادا ڕوویدا، لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان کارێکی جیاوازتر بوو، هەروەها لە دوژمنکاری ساڵی ١٩٩١ جیاوازتر بوو، هەر لەتەکتیکی کردەکانەوە بۆ شێوەو تەنانەت دەرئەنجامیش پاش گەمارۆی زاڵم و تێکشکاندنی هێزی موشەکیمان بەپێی چەند بڕیارێکی نارەوا، پاش هەموو ئەوانەی لەساڵی ١٩٩١ دا ڕوویدا کەدواتر هێڵی درێژی و پانی دیاریکراو بۆمبارانی بەردەوامی هێزە موشەکیەکانمان لەلایەن دوژمنەوەو هێزی بەرگری ئاسمانی و  بۆمبارانی بەردەوامی بەغداد، هەروەها ئەوەی سیخوڕەکانی (پشکنەرانی) ئەمریکا تێکیان شکاند، وڵاتمان بۆ کردنەوە تا بزانن عێراق لەوەی ئەوان باسی دەکەن خاڵیە، هەروەها بۆ ئەوەی بۆ جیهانی بسەلمێنین کەعێراق تەواو هاوکارە لەگەڵ ئەوانەی ناویان ناون پشکنەر، لێرەدا حاڵەتی بەراوردکاری دەکەوێت، کەس ناتوانێت بەراوردی نێوان دەوڵەتێکی گەورەی ستەمکاری وەك ئەمریکا کەهەموو هۆکارەکانی کوشتن و وێرانکاری و خوێنڕێژی هەیە، کەدەتوانێت چەند جارێك هەموو جیهان کاول بکات، هەروەها خاوەنی موشەکی دوورهاوێژو زەریا بەزێنو زیرەکە، خاوەنی فڕۆکەی زۆر پەرەسەندووی بەهێزە، هێزێکی دەریایی بێوێنەی هەیە کە بەهەموو دەریاو زەریاکانی جیهاندا دێن و دەچن، ئەمە جگە لەسوپایەکی مەشق پێکراو لەسەر دوژمنکاری

و بەیاسا لەهەموو تاوانێك کەئەنجامی دەدات پارێزراوە، لە نێوان واقعی عێراقێکی خاوەن وڵاتێکی بچوك و ناسراو بەتواناکانی، ئەویش پاش گەمارۆی چەند ساڵەو باری ئابووری قورس.. کەواتە جیاوازی نێوان ئەم دوو هێزە گەورەیە، لەبنەڕەتدا ناکرێت بەراورد بکرێن، ئیدی چی لەبەردەم عێراقدا ماوە جگە لەبەرگریکردن لەکەرامەتی خۆی، کەلەبەردەم دوژمنێکی دەستدرێژیکەردایەو شەڕی پێیە، کەس ناتوانێت ڕایگرێت یان لە نییەتی پیسی دووری بخاتەوە.

لەوشتانەی کەدەبێت باسی بکەین، لەبەرئەوەی دەکەوێتە دەرەوەی ڕاستای سەربازی و جەنگاندن کەکاری پێدەکرێت، تەنانەت برایانی سەرکردایەتی درکیان پێنەکرد، کەکاتێك نەخشەی سەربازی و نەخشەی بەدیلیان دادەنا، ئەویش ئەوە بوو دوژمن هەر لەسەرەتاوە دەستبکات بەهێرشی زەمینی بەرفراوان، هاوکات یان کەمێك پێش ئەوە بۆمباران دەستی پێکرد، ئەویش بۆ لەرزاندنی ئامانجەکان، وەك پێشتر باسمان کرد، لەباری ئاساییدا چەند ڕۆژێك هەندێکجار مانگ یان زیاتر دەخایەنێت، پاشان هێرشی سەرزەمینی دەست پێدەکات.

لەکاروبارەکانی تر، کەئێمە لەحساباتی خۆماندا دامناننابوو، دوژمن لەدوو بەرەوە یان زیاتر لەگەڵ دابەزینی پەڕەشووت لێرەو لەوێ هێرش دەکات، یەکێك لەبەرەکان ناسراوە کەزۆرترین ژمارەی سوپای لێیە، ئەویش کوێتە، بەرەی دووەم لەخۆرئاواوەیەو حسابی ئەمەش کرا.

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بەخۆڕاگری ئازایانەی ناو ئوم قەسر بوو لەپاڵەوانانی لیوای پیادەی (٤٥)، ئەم لیوایە جەنگێکی لەگەڵ دوژمن کرد، هەموو جیهانی سەرسامکرد، بەو خۆڕاگرییە ئەفسانەییەی متمانەی ئەمریکی و بەریتانیەکانی لەرزاندو وورەی ڕووخاندن، هەروەها خۆڕاگری هێزە ئازاکانمان لەزوبێرو بەرەنگاربوونەوەی توندی، ئەمەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی مەعنەویاتی ئەو لیوا پاڵەوانە خۆڕاگری هێزە چەکدارەکانمان و لەپشتیانەوە گەلی عێراقی پاڵەوان هەبوو، بووە پاڵنەرێکی بەهێز بۆ ئەم لیوا ئازایە، ئەگەرچی سەرنجی دوژمن لەم جەنگە توندەدا لەسەر ئوم قەسر نەبوو کەبەرامبەر ئەو لیوایە ئەنجامدرا، دوژمن لەهەندێك بەرە سەرقاڵ دەکراو لەهەندێکی تر دەهاتە پێشەوە تەنانەت لەسەر ئاستی مەعنەویات و کردەی سەربازی، لەوکاتەدا پاڵەوانانی لیوای ٤٥ بەئازایانە دەجەنگان،

سەرنجیان لەهەڤاڵەکانیان لەکەرتەکانی تر گرتبوو، کەعەزیمەو خۆڕاگرییان لێوەرگرن، کاتێك دوژمن بەرەو بەغداد هەنگاوی ناو بەڕێگەی بیاباندا هات و بارودۆخێکی دیاریکراوی بەکارهێنا، ئەو ئەرکەی لەئەوەلیاتو حساباتی خۆیدا دانابوو، ئەویش نەبوونی پاڵپشتی ئاسمانی بوو، کەهەر بوونی نەبوو لەوناوچە بیابانیەدا، ئاماژەکانمان بۆ سەرکردەو سەرکردە سەربازییەکان ڕۆشن بوو، کەهیچ هێزێك لەخۆرئاوای ڕووباری فورات دانەنێن، جا ئەگەر لەبیابانی سەماوە یان ناسریە یان بیابانی ئەنبار چونکە بەتەواوەتی تێکدەشکێت.

پاش ئەوەی دوژمن توانی چەند شارێکی عێراق بگرێت، ئەیانوویست نامەیەکی ڕۆشن بدەن کەگوایە هەموو شتێك کۆتای هاتووە، دواتر مەعنەویاتی عێراقیەکان وەك سوپاو گەل دەڕوخێت، ئەمە جگە لەبەکارهێنانی چەکی قەدەغە کراو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەدەوروبەری بەغداد، ئەو چەکەی لە ئەوم قەسر بەکارنەهێنا، ئەمەش وای کرد هێزەکانی دەوروبەرو چڕبوونەوەی ناو بەغداد بەتەنها بجەنگێن بەبێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ پاڵپشتیەك بکەن.

کەواتە دەڵێین بەراورد کردنی ئەوەی لە ئوم قەسر ڕوویداو ئەو خۆڕاگرییە گەورەیەی لەگەڵ ئەوەی بەخێرایی لەبەغداد ڕوویدا بەراوردێکی نادروستە لەلایەنی سەربازییەوە، لانی کەم دوژمن بەخەستی بەغدادو ناوچەکانی دەوروبەری بۆمباران کرد کە بۆ ماوەی سەدەها کاتژمێر وەحشیانە بۆمبارانی کردو چەندەها کەرت و یەکەی بەتەواوەتی لەناوبرد ئەوانی تریش پەرشو بڵاوبوونەوە، بەمەش بوونە ئامانجێکی ئاسانی هێزی ئاسمانی ئەمریکیو موشەکەکانی کەئەمان ڕووپۆشی ئاسمانیان نەبوو، هەروەها ئەم کەرتانە لەکاتی گەڕانەوەو دووبارە خەندەق لێداندابوون، زۆربەیان کە لەشوێنی بەرگریاندا بوون تێکشکێنران، ئەمەش بووە هۆی نەمانی بەدیل، هەروەها بارودۆخی هەندێك دەوروبەری پارێزگاکان لەکەرتی کردەکانی بەغداد هەڵبوون، یان لانی کەم خراپ پێوانە کرابوون، لەگەڵ هەندێك پێوەری تر کە لەگەڵ گۆڕانکارییە جەوهەرییەکاندا نەدەگونجا کەلەسەر مەیدان ڕوویدا ئەویش بەهۆی هەوڵو تەکنیکی گەورەی دوژمنەوە ... ئەم بڵاوبوونەوە بەرفراوانەی کەرتی عەمەلیاتی بەغداد وای کرد ئەرکی گاردی کۆماری پەرش بێتەوە لەگەڵ کەرتە پاڵپشتەکانی.

سەرۆك بەردەوامبوو لە قسە کردن:

دوژمنکاری زۆر دڕندانەو بەرفراوان بوو، دوژمن لەڕۆژانی کۆتایدا توانایەکی زۆری بەکارهێنا، ئەویش بەچڕکردنەوەی بۆمبارانی ئاسمانیو موشەکی لەسەر بەغدادو دەوروبەری، کەئامانجی سەرەکی دوژمن بەغداد بوو.

کەواتە کاتێك باس لەوە دەکەین دوژمن بەخێرایی بەغدادی داگیرکرد مانای وانییە ئێمە تەنها قسە لەسەر بەغداد دەکەینو لەوانی تری دادەبڕین، لەبەرئەوەی جەنگەکە یەك جەنگەو بریتیە لەزنجیرەیەك ئەلقەی تەواوکراوو پێکەوە گرێدراو.

کاتێك دوژمنکاری ڕوویدا، لەگەڵ برا سەرکردە سەربازییەکانم کۆبوومەوە، پێم وتن ئاگاتان لەخۆتان بێت ئەمجارە جەنگەکەمان لەگەڵ دوژمن بەپەنای خوا جەنگی چارەنووسە، ئەگەر خوا سەرکەوتنی لەچارە نووسیبێتین، ئەوا ئەم سەرکەوتنە بۆ عێراقو ئومەی عەرەبیو مرۆڤایەتییە، ئەگەر خوای گەورە ئەمەی نەویستو دوژمن توانی بگاتە بەغداد، ئەوا گەل بێدەنگ نابێت، ئەوە بەتفەنگو قازیفە لەجەنگ بەردەوام دەبێت، ئەوا چاوەڕێی ئەوەیەك لەسەرکردە لە دیالەو سەلاحەدینو ئەنبارو نەینەواو بەسرە دەکات، ئەوان عێراق ڕزگار دەکەنو ئەمریکا دەردەکەنو تێکیان دەشکێنن، ئابڕووی ئەمریکا لەکەدارتر دەبێتو زیاتر هەیبەتی دەشکێت، ئەوەی ڕوویدا تازە ڕوویداو سوپاسگوزاری بۆ خوا، پەنا بەخوا عێراقیەکان برا عەرەبەکانیان بێئومێد ناکەن.

## نێردراوی عەرەبی

سەرۆك ئەوەی بەسەر عێراقدا هات لەبیری ماوە، دەڵێت:

بەر لەچەند مانگێك لەهێرشی دوژمنکاری، نێردراوی سەرکردەیەکی عەرەبی کەزۆر ڕێزی دەگرم هاتەلام، پێشنیارێکی دیاریکراوی هەبوو، ئەگەرچی ئەو پێشنیارە پەیوەست بوو بەکەرامەتەوە، ناکرێت قبوڵ بکرێت، بەڵام تاکو کۆتایی گوێمان لێگرت، وتمان: گریمان ئێمە ئەو پێشنیارەمان قبوڵ کرد ئایا ئێوە یان برا عەرەبەکان دەتوانن هێرشی دوژمنکاری نەهێڵن ڕووبدات ؟ وەڵامیدایەوە: کەس ناتوانێت نییەتی ئەمریکا زامن بکات، بەڵام دەمانەوێت بەهانەی ببڕینو ئەوکات کار بۆ ڕوونەدانی دوژمنکاری دەکەین ... پێم وت: بۆ ئەوەی ئێمە بەهانەیەك لەسەر ئەمریکا دروست بکەین؟! سڵاوم بەفڵان بگەیەنە (سەرکردەکەت) پێی بڵێ فڵان دەڵێت پەیوەندی بەئەمریکاوە بکەن لێی بپرسن

بەتەواوەتی چی دەوێت ئەگەر پارەی دەوێت یان نەوت پارە دەدرێتەوە، ئەگەر ئەیانەوێت چارەسەری هەموو کێشە هەڵواسراوەکان لەناوچەکەدا بکەن، ئێمە بەڕووی کەسدا ناوەستین کەبیەوێت بەئینسافەوە مامەڵە لەگەڵ گەلان بکەن، ئەگەر بیانەوێت مەرجی خۆیان بسەپێنن‌و دەست بۆ کەرامەتمان بەرن لەگەڵ کەرامەتی گەلی عێراق، ئەوا ئێمە ئامادەنین گوێ لەسەخافاتی ئەوان بگرین، پاش ئەوەی تێگەیشتین داواکاری ئەمریکا هیچ‌و پوچ‌و ئابڕووبەرە.

## سەردانی دووەمی بریماکۆف

پاش ئەوەی ئەمریکاو بەریتانیا سوپایان کۆکردەوە، هیچ هەڵبژاردنێکی ترمان لەبەردەمدا نەماوەتەوە، یان خۆبەدەستەوەدان‌و ملکەچی مێژوو قبوڵ بکەین، یان بەدڵی پڕ لەباوەڕ بەخواوە بەرەنگاریان ببینەوە، تەنانەت بریماکۆف لەسەردانی دووەمی بۆ بەغداد، وتی نامەیەکم بۆ ئێوە پێیە، لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی نامەکەم دەزانی لەبەرئەوە داوام لێکرد چاوی بەبەڕێز تاریق عەزیز بکەوێت، دواتر من چاوم پێکەوت وتمان یا ئەڵا، کاتێك داوای مەسەلەیەکی کرد، دەست بۆ باڵادەستی‌و کەرامەتی عێراق درێژ دەکات، پێمان وت هەگبەکەت چیتری تێدایە، گریمان ئێمە وەڵامی ئەم داواکارییە هیچەمان دایەوە (کەوازم لەدەسەڵات هێناو لەگەڵ خێزانەکەم وڵاتم بەجێهێشت)، ئایا گەلەکەمان لەشەڕی ئەوان ڕزگاری دەبێت؟ وتی: نەخێر ئەمریکا بەبێ ئەوەو لەگەڵ بوونی ئێوەش هەر دێتە ناو عێراقەوە، پێم وت: بابێن‌و خوا سەرشۆڕیان بکات، ئێمە لێرە دەمێنین، با ئەوان بێن، بەخێربێن، ماڵ بە ماڵ لەگەڵیان دەجەنگین، بەڵام ئامۆژگاریان دەکەین با مێژووی عێراق بناسن، ئەگەر نەیانزانیوە ئەوا مقاوەمەی عێراقی‌و گەلی عێراق پێیان دەڵێن ئێمە کێین، بەم شێوەیە هیچ دەرفەتێکیان بۆ نەهێشتینەوە تاکو گەل‌و وڵاتەکەمان لەکاولکاری بپارێزین، سوپای عێراق کەمتەرخەمی ناکات وانەیەکی وایان دادەدات کەبیریان نەچێتەوە، تاکو ئێستا پیاوانی حیزب هەموو کەرتەکانی تر لەدژیان دەجەنگن، ئێمە هەرگیز خۆمان نادەین بەدەستەوە، ئەمە دۆخی جەنگە، دەبێت لایەنێك سەربکەوێت، بەڵام ئەمریکا لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە خێرایەی، ئەوا بەخراپترین شێوە دەبەزێن، کەدەگاتە چەندەها ئەوەندەی

لەڤێتنام بەسەریاندا هات، لەبەرئەوەی دەوڵەتێکی شەڕانگێزە، ناچار دەبێت پاشەکشە بکاتو لەعێراق هەڵبێتو نیوەی ئامێرەکانی بەجێبهێڵێت.

هێزە سەربازییەکانمان هەرگیز کەمتەرخەمییان نەنواند، بەڵام ئەمە ئیرادەی خوایە، وەك ئەوەی ڕقتان لەشتێك بێتو ئەو باشترین شت بێت بۆتان، یان حەزتان لەشتێك بێتو ئەو خراپترین شت بێت بۆ ئێوە، بەڵێ ئەمە ئیرادەی خوایە.

دەتوانین بڵێین گرنگترین هۆکارەکانی کەوایکرد ئەمریکا بەغدادی خۆشەویست داگیر بکات پایتەختی ڕەشید، بەبێ ئەوەی بچینە ناو ووردەکارییەوە، چونکە کاتی چاوپێکەوتن دیاریکراوە، بریتین لەمانە:

**یەکەم:** ئەو گەمارۆیەی سیانزە ساڵی خایاند، هەروەها ئەو جەنگانەی هاوتای ئەم حاڵەتە بوون.

**دووەم:** ئەمریکا پشتی بەسیاسەتی هەڵخەڵەتێنەرو وێڵکەر دەبەست بۆ قسەکانی، کەوایکرد هەندێك لە هاوڕێیانو برا عەرەبەکان بڕوا بەچیرۆکەکانی بکەن، بەڵکو هەندێك باوەڕیان بەبەڵێنەکانی کرد.

**سێیەم:** جیاوازی گەورەی نێوان هەردوو هێزەکە، بەتایبەتی هێزی ئاسمانی، کە بۆ یەکلایکردنەوەی هەر جەنگێك پێویستە، هەروەها هێزی موشەکی دوورهاوێژو نەبوونی ڕوپۆشێکی ئاسمانی عێراقی، ئەمەش وایکرد ناهاوسەنگی لەتەرازوی جەنگدا ڕووبداتو بە بەرژەوەندی دوژمن بێت.

**چوارەم:** دوژمن شارەزایی تەواوی دەربارەی شوێنی دامەزراوە سەربازییەکانمان هەبوو، هەموو ئامانجە سەربازیو مەدەنیەکانی لەبواری تیمی پشکنینەوە بۆ ئاشکرابوو، هەروەها بەهۆی هۆکاری ئاسمانی سیخوڕیو مانگی دەستکرد، تۆ کاتێك ئامانجێك دەستنیشان دەکەیت، ئاسانە بیپێکیت.

**پێنجەم:** بەکارهێنانی بۆمبارانی ئاسمانی زاڵمانە، کە لەمێژووی جەنگەکاندا وێنەی نییە، کە بەدرێژایی کات هەر بەردەوام بوو، ئەمەش یارمەتی کۆتکردنی هێزەکانی ئێمەیدا جا ئەگەر زرێپۆش یان بۆمب یان پیادە بێت.

**شەشەم:** دوژمن چەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی بەکارهێنا، هەندێکیان بۆ یەکەمجارو بەتایبەتی لەفرۆکەخانەی بەغداد، ئەویش پاش ئەو جەنگە بەناوبانگەی دوژمن سەدەها

سەربازی لەدەستداو دەیەها لە زرێپۆشەکانی تێکشکا، ئەمەش وایکرد ئەقڵیان لەدەست بدەنو لەگاردی کۆماریو هێزەکانی تر بەبۆمبی ئەتۆمی تەکنیکیو هەندێکی تری گەرمایی لێیان بدەن، کەدەبێتە هۆی تواندنەوەی ئاسنو جەستە، ئەمەش کاریگەری لەسەر وورەی جەنگاوەرەکان دانا، ئەم هۆکارە بەگرنگترین هۆکاری داگیرکردنی خێرای بەغداد ئەژمار دەکرێت.

**حەوتەم:** بەردەوامی بۆمباران لەسەر بەغداد بەشێوەیەکی وەحشیانەو لێدانی خەڵکی مەدەنی، تاکو حاڵەتێك لە تۆقین دروست بکەن، هەروەها لێدانی هێزەکانو مەرکەزی سەرکردایەتیو بڕینی هەموو جۆرە پەیوەندییەك.

**هەشتەم:** دوژمن ڕێگای بیابانی بەکارهێناو بەتەنیشت شارەکاندا تێپەڕی، هەروەها لەجۆری چەکدا زۆر پێشکەتوو بوو، ڕووپۆشێکی ئاسمانی چڕی هەبوو، هەموو ئەمانە وایکرد هێزەکانمان لەڕۆژدا نەتوانن جوڵە بکەن ئەویش لەبەر نەبوونی ڕووپۆشێکی ئاسمانیو پاڵپشتی تۆپخانە، هەروەها سەرنجی لەوە گرتبوو زوو بگاتە بەغداد، لەگەڵ ئەوەی سوپای ئازامان تووانی تا ئاستێکی باش پێشکەوتنی دوژمن دوابخات، هەروەها زیانی گەورەی لە ڕیزەکانیدا، بەڵام دوژمن ڕاستی ئەم زیانانەی باس نەکرد.

**نۆیەم:** دابەزینی پەڕەشوتی زۆر لێرەو لەوێو لەپشت کەرتەکانمانەوەو لەسەر ڕێگا سەرەکیەکانو تۆقاندنی خەڵكو گرتنی ڕێگاکان، ئەمە جگە لەوەی دوژمن زۆر بەخێرایی هەندێك لەئامێرەکانی ناردە پشتەوەی هێزەکانمان، ئاشکرایە هەر دابەزینێك یان پشتلێکردن لەپشتەوەی هێزەکان دەبێتە هۆی شڵەژان.

**دەیەم:** جەنگی دەروونی، بەکارهێنانی هۆکاری ڕیکلامی، کەدوژمن توانی بیخاتە نێو ڕیزی هێزە چەکدارەکانمان لە بواری تابوری پێنجو بەکرێگیراوەکانیان، ئەمە جگە لەوەی هەندێك لەبەکرێگیراوانو دزەکەران ووردەکاریان دەدا بەفڕۆکەکانی دوژمن تاکو ئەو پێگەو ئامانجە سەربازیەکان تێك بشکێنێت.

**یانزەیەم:** بڕینی هۆکارەکانی پەیوەندیگرتن لەنێو فەرماندەی سەربازیو فەرماندەی کەرتەکانو بۆ خوارتر، نەگەیەشتنی فەرمان وایکرد هەندێك کەرتی سەربازی هەست بکەن هەموو شتێك کۆتایی هاتووە.

**دوانزەیەم:** لەجەنگی عێراق – ئێراندا، سەرکردەو فەرماندەکان بەپێی بارودۆخەکەو

لەسەر بنەمای ئەو هەڵوێستە هەڵسوکەوتیان دەکرد، لەبەرئەوەی قوتابخانەی سەربازی عێراقی لەباشترین قوتابخانەکانی جیهانە کەخاوەنی باشترین ئەفسەرو سەرکردەو سەربازی ئازا بێت، ناچار نەبووین فیرقەو فەیلەقەکانمان بخەینە ژێر ڕکێفی فەرمانی سیاسیەوە، هەڵسوکەوتی سەرکردە یان فەرمانده تەواو بوو، جگە لەسەرکردایەتی گشتی، بڕیاری سیاسی هەندێکجار ڕۆڵی خۆی هەیە، ئەویش بەپێی دۆخەکە، بەڵام بەشێوەیەکی لاواز، تەنانەت کاتێك سەرکردە سیاسیەکانمان دەنارد بۆ چاودێری بەرەکانی جەنگ، دەمانخستنە ژێر ڕکێفی سەربازەوە، لەوانە عودەی‌و قوسەی.

## سوپا بخرێتە ژێر ڕکێفی سەرکردە سیاسیەکانەوە

لێرەدا لە سەرۆکم پرسی، کەزۆرێك وایاندانابوو لەسەربازی‌و سیاسیەکانی عێراق، هەڵەی گەورە لەوەدا بووە سەرکردەو فەرماندەکان لەسەرکردایەتی ناوچەکاندا لەژێر ڕکێفی سەرکردە سیاسیەکاندا بوون، سەرۆك هۆکاری وەرگرتنی ئەم ڕێ‌و شوێنەو دۆخەکەی ڕوونکردەوە، بەناچاری وەسفی کرد، بەڵام زۆر ئازایانەو ڕاشکاوانە ددانی بەوەدانا، بڕیاری ئەوەی سەرکردە سەربازی‌و مەیدانیەکانی فەیلەقەکان‌و فیرقەکان بخرێنە ژێر ڕکێفی سیاسیەکان هۆکارێك بوو بۆ لاوازکردنی توانای کەرتەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێرشی سەختی هێزەکانی دوژمن‌و وتی ئەوەی لەم جەنگە چارەنووسسازەدا ڕوویدا دەگەڕێتەوە بۆ هەستیاری دۆخەکە، لەبەرئەوەی ئەمجارە بەمانای وشەکە چارەنووسساز بوو، ئێمە بڕیاری سەربازیمان خستە ژێر دەستی سەرکردە سیاسیەکان، جا ئەگەر سەرکردەی فیرقەکان بێت یان سەرکردەی فەیلەقەکان کە لەژێر بڕیاری سیاسیەکاندا بن، بەڵام بەڕاوێژ لەگەڵ سەرکردە سەربازییەکان، ئەمە بەناچاری ڕوویدا، ئەمیان چەکێکی دوو سەرە، هەندێکجار پێویستی بەدەستپێشخەری‌و بڕیاری خێرا هەیە، کاتێك بڕیاری سەربازی دەکەوێتە ژێر ڕکێفی بڕیاری سیاسیەوە، ئەوا کارەکە هەندێك کاتی دەوێت لەوانەیە بگاتە چەند کاتژمێرێك، بەتایبەتی ئەویش بەهۆی پچڕانی هۆکارەکانی پەیوەندی خێراوە، ئەمەش دەبێتە هۆی لەکارخستنی توانای سەرکردە کە لەسەر بنەمای حاڵەت هەڵوێستی پێویست وەربگرێت، کەئەمیان پێویستی بەخێرایی هەیە، ئەمە جگە لەوەی هەندێك سەرکردەی سەربازی بەبڕیاری سیاسی پەست دەبن یان فەرمانیان بەسەدا بکرێت، کە

لەسەر بنەمای کەمی شارەزایی بۆیان دەربکرێت، بەتایبەتی ئەوانەی خاوەن شارەزایی سەربازی زۆرن، هەموو ئەمانە کاریگەریان هەبوو لەبەرەو پێشهاتنی دوژمن بەرەو بەغدادو لە ژێر جیاوازی هێزدا، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا، پێکهاتەکانی سوپای ئازاو گاردی کۆماریو هەموو پێکهاتەکانی تر بەشێوەیەکی بێ نمونە لەجەنگێکی تەقلیدیدا جەنگان.

**سیانزەیەم:** هێرشی دوژمن لەهەموو لایەکەوە، بەداخەوە هەندێك وڵاتانی برا ئاسانکاریان بۆ کەرتە سەربازییەکانی دوژمن کرد کەزرپیپۆشو هێزەکانیان لەخاکی ئەوانەوە بێنە ناوەوە، هەروەها دوژمن زەویو بنکەی هەندێکی تری بەکارهێنا بۆ بۆمبارانی ئێمە.

**چواردەیەم:** دوژمن بەکرێگیراوەکانی خۆی لەتێکدەرانو بەکرێگیراوانی ئێران بەکارهێنا لەو هێرشەدا، هەروەها هەندێك میلیشیای لایەنگری ئێران کە بەساختە بانگەشەی ئیسلام دەکەن.

### ڕۆڵی ئێران لەئاسانکردنی داگیرکردن

**پانزەیەم:** غەدری ئێران لە گرنگترین هۆکارە یارمەتیدەرەکان بوو بۆ هاتنە ناوەوەی هێزی ئەمریکیو بەریتانی بۆ ناو عێراق.[٤]

هەموو ئەم هۆکارانە لەگەڵ دڕندەیی دوژمن، هەموو توانای سەربازیو هەموو پۆلەکانی هێزی سەربازی بەشێوەیەکی شێتانە سەرنجیان لەبەغداد گرتبوو، ئەمریکیەکان ئاماژەیان بەوەدەدا، ئەگەر شکستیان هێنا بەئەتۆمی لەبەغداد دەدەن، وەك کارەساتی هێرۆشیما، هەموو ئەمانە بوونە هۆی بارگرژی دەروونی لای سەربازەکان، ئەمیش کارێکی سروشتیە، کاتێك کارەکان دەگاتە ئەو قۆناغە، فەرماندەکان ناتوانن کۆنترۆڵی یەکەکانیان بکەن، ئەمەش حاڵەتێکی گێرەشێوێنانەی لەناو کەرتە زۆرەکانی هێزی سەربازیدا دروستکرد،

---

[٤] لەکۆتای کارەکانی کۆنگرەی (کەنداوو بەرەنگاربوونەوەکانی ئایندە) کە سەنتەری ئیمارات بۆ لێکۆڵینەوە سازی کردبوو لە
ئەبو زەبی لە ناوەڕاستی کانوونی ٢٠٠٥، محەمەد عەلی ئەبقەحی جێگری سەرۆکی پێشووی ئێران وتی (ئەگەر هاوکاری ئێران
نەبووایە کابولو بەغداد بەو ئاسانییە نەدەکەوتن)، هەروەها سەرۆکەکەی محەمەد خاتەمی پاش چەند مانگێك جەختی
لەم قسەیە کردەوەو سەرزەنشتی ئەمریکای کرد کە دانی نەناوە بەو ڕۆڵە پۆزەتیڤەی ئێران لە جەنگی عێراقو ئەفغانستاندا
گێراویەتی.

بەشێوەیەك دەکەوتە دەرەوەی کۆنترۆڵەوە، سەربازەکان بەبێ فەرمانی فەرماندە پاشەکشێیان دەکرد.

کەواتە دەڵێین ئەمریکا توانای زۆرداریو کاولکاری هەیە، بەڵام جیاوازی لەنێوان زۆرداریو ئەقڵدا هەیە، ئەو دەتوانێت زۆرداری بکاتو کاولکاری ئەنجام بدات، بەڵام لەڕووی پراکتیکەوە زیانی ئێجگار زۆرە کە ئەو زیانانەی لەڕووی خولقیو مێژوویییەوە چاك نابێتەوە، هەر کاریگەری دەمێنێت یان بەکەوتنی ئەو پارتەی پاڵپشتی بۆشی کردووە لەجەنگدا تەواو دەبێت، بەڵام بابپرسین کێ دۆڕا؟ ئەوەی دۆڕا گەلی ئەمریکی بوو لەبەردەم جیهاندا، هەموو توخمەکانی هێزی دۆڕاند، بەمانایەکی تر ئەگەر گەلی ئەمریکی ناڕەزایەتی دەربڕیایە لەدژی ئەوەی کەڕوویدا ئەوا ئەمە ئەوە چاکدەکاتەوە کە حکومەت تێکیداوە، لێرە لە بەندیخانە بە ئەمریکیەکانم وت: پاش عێراق دەستدرێژی ناکەنە سەر هیچ وڵاتێکی تر، ئەمیان لەبەرژەوەندی مرۆڤایەتیە، نەك تەنها لە بەرژەوەندی عێراق بێت، عێراق بە ئیزنی خوا سەردەکەوێتو ئەمریکاو بەکرێگیراوەکانی شکست دەخۆن.

ئایا هیچ خیانەتێك لەناو سەرکردەکانی سوپادا هەبوو؟ پرسیارم لە سەرۆك کرد، دەربارەی ئەو پڕوپاکەندانەی لە ڕۆژانی یەکەمی داگیرکارییەوە هەبوون، کە لە ڕیزی سەرکردە سەربازییەکاندا خیانەت هەبووبێت، سەرۆك ئەمەی ڕەتکردەوە، هەرگیز، وتی: بیستم کە لەکاتی جەنگدا خیانەت ڕوویداوە، کوڕم حەز دەکەم ئەوەت پێبڵێم سوپای ئێمە بە ئازایەتیو پاڵەوانێتی ناسراوە، جوانترین داستانی پاڵەوانێتی بە درێژایی مێژوو تۆمارکردووە، لە سوپاکانی جیهاندا لەو کاتەی جەنگ توند دەبێتەوە خیانەت ڕوودەدات، ئەگەر لە سوپای ئێمەدا ڕوویدابێت ئەوا زۆر دیاریکراوبوونو لە ئاستە نزمەکاندا بووە، کە کارگەری نەبووەو کاریگەری لەسەر دەرەنجامی جەنگەکە نەبووە، بەڵام ئەو پڕوپاکەندانەی لەسەر ئاستی سەرکردە باڵاکان کراون، ئەویان بەشێکە لەو جەنگە دەروونیەی کە هەموو سوپایەك لە دژی بەرامبەرەکەی لە جەنگدا بەکاری دەهێنێت، کاتێك لایەنێك دەکەوێتە پێگەیەکی شلۆقەوە، سوپاکەمان بە پیاوانو سەرکردەکانی پاڵەوانو کارێکی بێوێنەیان ئەنجامداوە، بەشێوەیەك بەرەوڕووی دوژمن بوونەوە کەدوژمنی تووشی شۆك کرد، سنگی ئێمەو عەرەبی کردە سەهۆڵ، من گرەوم لەسەر شەری بەغداد دەکرد، کاتێك ئەمریکا دێتە ناو بەغداد ماڵ بە ماڵ شەڕیان لەگەڵ دەکەین، جادە بە جادە

دەجەنگین، ئەوان بەم شێوەیە هێزی هۆکارە تەکنەلۆژیەکانیان لەدەست دەدەن، ئەوکات ئەو مارە درێژە کەرتو پەرت دەکەین، خۆمان بۆ ئەمە ئامادە کردبوو، بەڵام داگیر کردنی خێرای بەغدادو بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی تەکنیکیو لێکپچڕانی پێکهاتەکانی سوپاو گاردی کۆماری بەهۆی دڕندەیی جەنگەکەوە، هەروەها نەبوونی ڕووپۆشی ئاسمانیو لەدەستدانی کۆنترۆڵ هەموو بوونە هۆی ئەوەی ئەم هەڵبژردنەی ئێمە سەرنەگرێت، ئەگەر ڕوویبدایە ئەوا یارمەتی دەداینو کاریگەری چەکە قورسەکانیان گۆت بکەین، بەتایبەتی هێزی ئاسمانی.

کەواتە دەڵێین گرنگترین هۆکارەکانی داگیرکردنی بەغداد ناهاوسەنگی هەردوو هێز بوو، هەروەها ئەمریکا چەکی ئەتۆمی تەکنیکی لە فرۆکەخانە بەکارهێنا، کە بووە هۆی شڵەژانی سوپای عێراقی، کە لەگەڵ چەکی ناتەقلیدیدا ڕانەهاتوون، کە بۆش لە تاوانەکەیدا بەکاری هێنا. ئەوەی لە سەرکردایەتی جێگەی سەرنجمان بوو دوژمن ئامانجەکانی زۆر بەووردی دەپێکا، بەداخەوە پاشگەڕانو پشکنین دەرکەوت هەندێك خائینو بەکرێگیراو کە دوژمن ناردبوونیو لە ناوچەی جیاجیا دینابوون لە بەغداد، تەلەفۆنی سورەیایان بەکاردەهێنا کە بە مانگی دەستکردەوە بەسترابوو بە سەنتەری سەرکردایەتی ئەمریکیو ئیسرائیلی تاکو ئامانجە عێراقیەکان دیاری بکەن، ئەمە بووە هۆی ئاسانکردنی تێکدانی زۆربەی ئامانجە مەدەنیو سەربازیو دامەزراوە گرنگەکان.

هەروەها ئەوەی داگیرکردنی بەغدادی ئاسان کرد، خائینانو بەکرێگیراوان دیسكو ئامێری دیاریکردنی ئامانجەکانیان بەکار دەهێنا، دواتر دەرکەوت هەندێك دەروونزمو خائین دزەیان کردووەتە ناو دەزگا ئەمنیەکانی عێراقەوە.

## ئەو زانیاریانەی نەگەیشتنە سەرۆك

ئێمە لەبەردەم هەر پێشنیارێك یان ڕایەك کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پێشکەشمان دەکرێت کراوە بووین، بۆ ئەوانەی نەیانتوانی قسەبکەن بە هۆی نەبوونی ئازایەتی لە ڕگەیاندن یان وتنی هەقیقەت، یان بەهەر هۆکارێکی تر، بەڕۆحێکی ئیجابی داوام لەبراکانم لە سەرکردایەتی دەکرد، ئەوەی دەیانەوێت بڵێین، ڕێنماییەکانم دەدا بەدەستەی هاوەڵو سکرتێر بە گەیاندنی هەر زانیارییەك یان پێشنیارێك بە ڕاستەخۆ بۆ

خۆم، بەڵام ئەو قەناعەتەم لادروست بوو هەموو ئەوانەی کە دەبوایە بمگاتێ یان ئەو هەقیقەتانەی گوێمان لێدەبێت، لەبەر ئەوەی ئێمە زۆرمان زانیاری پێدەگەیشت، ئەمەش لەکاتی جەنگو پاش جەنگ سەرنجی ڕاکێشام ..((ئەمە دادوەر عەبدوڵا ئەلعامری لە یەکێك لە دانیشتنەکانی دادگادا باسی لێوەکرد، کاتێك بە سەرەۆکی وت: تۆ دیکتاتۆر نیت بەڵام ئەوانەی چواردەورت تۆیان کردە دیکتاتۆر)).

یەکێك لەبەرپرسە گەورەکانی عەرەب ساڵی ٢٠٠٦ کاتێك لە وڵاتەکەی چاوم پێی کەوت وتی: بەخوا هەر زانیاریەکمان دەستبکەوتایە دەمانگەیاندە سەرۆك صەدام حسێن، تاکو ئەوەی ڕوویدا ڕووینەدایە، ناوچەکە لەو ڕووداوەی ڕوویدا دووربخەینەوە، بەڵام لەوە دڵنیابووین کە دوو کەسی گەورەی نزیکی سەرۆك، بە ئەنقەست ئەو زانیاریانەیان نەدەگەیاندو نەمانزانی هۆکاری چییە.

ئاشکرایە داگیرکردنی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣، درێژکراوەی پیلانێکی گەورەتر لەلایەن وڵاتانی ئیمپریالیزموزایۆنیزمەوە هەر لە ساڵی ١٩٦٨ وە دارێژرابوو، ئەو کاتەی دەوڵەتی نیشتمانی بە سەرکردایەتی حیزبی بەعس دامەزرا، پشت شکێنەری ئەم دەوڵەتانە خۆماڵیکردنی نەوتە لە ساڵی ١٩٧٢ داو ئەو دەسکەوتە گەورانەی عێراق دواتر بەدەستیهێنا، پاش ئەو پیلانگێڕیە ڕیکخراوەی لەدژی گێڕدرا، نەخشە دانان بۆ کورتکردنەوەی خواستەکانی، ئەو جەنگەی ئێران لەدژی عێراق لە ساڵی ١٩٨٠ دا هەڵیگیرساند یەکەم قینی ئەو دەوڵەتانە بوو، کە پاڵپشتی ئێرانیان بە چەك دەکرد، ئەویش بۆ درێژبوونەوەی جەنگ، کاتێك جەنگ بە سەرکەوتنی عێراق کۆتای هات بەسەر ئێرانی دەستدرێژکاردا، پیلانگێڕی لە دژی بەردەوام بوو بۆ هەڵگیرسانی جەنگێکی تر، تاکو توانا بەرزەکانی داهێنانی بکوژنو خولیاکانی بکوژن کە ببێتە دەوڵەتێکی گەورەو کێبڕکێ لەگەڵ دەوڵەتە مەزنەکاندا بکات، هاوپەیمانی لە نێوان ئەو دەوڵەتانەو هەندێك لەو وڵاتانەی ناوچەکە بۆ ئیستفزازکردنی عێراق دروست بوو، بەتایبەتی پاش ئەوەی بەسەرکەوتوویی لە جەنگ دەرچوو، دەوڵەتانی پلانگێڕ توانیان لە کێشەی کوێتدا بگەنە مورادی خۆیان، پاشان نەخشەو پلان دارێژراو بەووردیو تۆکمەیی لەلایەن ولایەتە یەککگرتووەکانو زایۆنیزمی جیهانیەوە، تاکو بەدوای بەهانەیەکدا بگەڕێنو لە عێراق بدەن، ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر کە ئەمریکا هەموو دەزگا سیخوڕیو هەواڵگریەکانی بەکارهێنا تاکو

تۆمەتەکە بلکێنێت بە عێراقەوە، پاشان خۆی بۆ هەڵگیرسانی جەنگێکی نوێ ئامادەبکاتو ئایندەی لەناوبەرێتو خێروبێری کاول بکاتو دەستی بەسەردا بگرێتو دەست بەسەر نەوتەکەیدا بگرێتو پاراستنی تەواو بۆ ئیسرائیل مسۆگەر بکات، پاشان کۆنترۆڵی جیهان بکات، عێراق بریتیە لەوکلیلە بەگوێرەی بەدەستهێنانی ئامانجی ئەو دەوڵەتە دەستدرێژیکەرانەوە.

ئەمریکا هەر لەو ڕۆژەی عێراق نەوتەکەی خۆماڵی کرد بڕیاری جەنگی لەدژی دەرکرد، ڕووداوەکانی ١١ی سێبتەمبەری دروستکراو هاتو بووە سەرەتایەك بۆ لەناوبردنی عێراق.

لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٢ دا ئەمریکا بە چوار پایتەختی عەرەبی ڕاگەیاندبوو، کە داگیرکردنی عێراق کارێکی بڕاوەیە، یەکێك لەو پایتەختانەی بەشێوەیەکی کارا هانی لێدانی عێراقیدەدا، بەڵکو ملیارەها دۆلاریدەدا، وەك قەواڵەیەکی چێژبەخش بۆ هاندانی ئەمریکا تا عێراق داگیربکاتو کاولی بکاتو لەو دێوەزمە قورسە ڕزگاری بێت، یەکێك لە سەرکردەکان زۆر ئەوەی پێناخۆش بوو، کە لە ئاسۆوە دەرکەوتووە، ئەو دەیزانی عێراق شورای ئەو دەوڵەتانەیەو پارێزەرو پاسەوانی دەروازەی خۆرهەڵاتی ئومەی عەرەبە، داڕمانی عێراق مانای داڕمانی دەوڵەت لەدوای دەوڵەت، بەتایبەتی کە بۆش هەڕەشەی لێکردبوون کە عێراقیەکان زۆرخراپ دەبێت، ئەگەر هاتوو ئەم بڕیارەی ئەمریکا بگەیێنە عێراق بۆ داگیرکردنی، ئەوا چارەنووسیان وەك چارەنووسی چاوەڕوانکراوی صەدام حسێن دەبێت.

لە کۆتایی مانگی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا، بەرپرسێکی گرنگ لە یەکێك لەو پایتەختە عەرەبیانەوە سەردانی عێراقی کردبوو، هیلاکی سەفەری بەهۆی ئابڵوقەی زاڵمەوە چەشتبوو، موجازەفەی بە ئایندەی وڵاتەکەیو سەرکردەکەیەوە کردبوو، بەڕێگای وشکانیدا هاتوو بەو ئومێدەی چاوی بە صەدام حسێن بکەوێتو هەقیقەتی ئەوەی ڕوودەدات بۆی باس بکات، پیاوەکە لە یەکێك لە ئوتێلەکانی بەغدادا چاوەڕوانی دەکرد تاکو بەخۆی ئەو زانیاریانە بداتە سەرۆك کەلای خۆی هەڵیگرتبوو، ئەگەرچی ئەو دەوڵەتە پێشتر زانیاری بۆ سەرۆك صەدام حسێن ناردبوو، بەڵام نەگەیشتبوو بەسەرۆك، چەندین کەس هەبوون بە دیاریکراوەیی کەسایەتی گرنگ لەناو عێراق، لە پشتی شاردنەوەی زانیاری بوون لە صەدام حسێن، ئەویش بە ئەنقەست.

سەرۆك صەدام حسێن بەهاتنی ئەم نێردراوەی نەزانیبوو، ئەم میوانە لە کەسایەتیە

نزیکەکانی صەدام حسێن بوو، ئەویش بەدەوری خۆی پەیوەندی بە قوسەیەوە کرد، ئەویش نێردراوێکی نارد تاکو گوێ لە میوان بگرێت، بەڵام میوان ڕەتی کردەوەو وتی تەنها دەیەوێت چاوی بە سەرۆك بکەوێت، قوسەی پەیوەندی بە یەکێك لەو دووکەسەوە کرد کە دەیانوویست ئەو زانیاریانە نەگاتە لای سەرۆك، بۆ میوانو ئەو کەسەی نزیکەی سەرۆك ئۆتۆمبێلێکی بۆ ناردن، لەو باوەڕەدا بوون کە چاویان بە سەرۆك دەکەوێت، ئەو کەسە چاوی پێیان کەوتو وتی: چیتان پێیە بیدەن بەمن .. بەڵام میوان ڕەتی کردەوەو سووربوو لەسەر ئەوەی سەرۆك ببینێت، لە ڕۆژی ٢٠٠٢/١٢/٢٤ دا لە هەمان سەرداندا دووبارە میوانو ئەو کەسایەتیە عێراقیە پەیوەندیان بەهەمان کەسەوە کردەوە، ئەویش پێی وتن خۆتان بۆ دیداری سەرۆك ئامادە بکەن، هەمان ئۆتۆمبێل هاتەوە بۆ بینایەکی گەورەی تابیەت بردنی، لەوێدا خۆیان لەبەردەم ئەو دوو کەسە گەورەیەدا بینییەوە، داوایان لە میوان کرد چی زانیاری پێیە بیانداتێ، ئاماژەیان بە ئامێرێکی ریکۆردەر کردو وتیان هەموو زانیاریەکان لە ڕێگەی ئەم ڕیکۆردەرەوە دەگاتەوە سەرۆك، میوانەکە زۆر بێزار بوو، لەبەردەم ئەم موعاناتەدا ناچاربوو هەموو زانیاریەکان بداتە ئەوان، پاشان ئەو دووکەسە ماڵئاواییان لێکردو جەختیان لەوە کردەوە زانیاریەکان دەگاتە سەرۆك، بەر لەوەی میوان شوێنی میوانداری جێبهێڵێت زەرفێکی پێگەیشت پەنجا هەزار دۆلاری تێدابوو، ڕەتی کردەوەو سوپاسی کردو وتی وڵاتەکەم هێشتا خێری تێداماوە، پاشان کارەساتەکە ڕوویدا، پاش ئەوەی سەرۆك دیل کرا نامەیەکی ئەوم لە بەندیخانەوە گەیاندە ئەو سەرکردەیەی نوێنەری خۆی بۆ عێراق ناردبوو، کە زۆر بەئاگاییەوە لەگەڵ مەسەلەی کوێتدا مامەڵەی دەکرد، هەروەها عێراق لەم کارەساتەی دوایی دووربخاتەوە، زۆر لایەن ویستیان وێنەی ئەو دەوڵەتە ناشرین بکەنو پەیوەندی نێوان ئەو وڵاتەو عێراق تێکبدەن، لەوانەش هەندێك لایەنی ناو ئەو دەوڵەتەو دەرەوەی عێراق، ئەویش بۆ تێکدانو ئاڵۆزکردنی پەیوەندی برایانەی نێوان ئەم دوو وڵاتە، کە ڕقوکینە بچێنن یان ئەوەتە لەسەر حسابی ڕقی کەسی یان بۆ تێکشکاندنی پەیوەندی عەرەبی.

پاش ئەوەی سەرکردەی ئەو وڵاتەم بینی، بینیم زۆری پێناخۆشە ئەوەی بەسەر عێراقدا هاتووەو سەرۆك صەدام حسێن تووشی ئەو بارە بووە، لە بواری چاوپێکەوتنم لەگەڵ هەندێك کەسایەتی گرنگی ئەو وڵاتە برایە، زۆرم بیست لەوەی ئەو دەوڵەتە

هەوڵیداوە هەموو زانیاریەك بدات بە صەدام حسێن بۆ ئەوەی خۆی لە زۆرێك لە نەهامەتیەکان بپارێزێت، بەڵام هەموو ئەمانە نەگەیشتنە سەرۆك.

# جەنگی فرۆکەخانە

## بەشی یەکەم

بەپێنووسی: فەریق رۆکنی یەکەم سەیفەدین راوی
سەرکردەی هێزی گاردی کۆماری

**یەکەم:** گرنگی پێگەی فرۆکەخانەی صەدامی نێودەوڵەتی.

فرۆکەخانەی صەدامی نێودەوڵەتی، کەصەدام حسێن دروستی کرد، گرنگی ستراتیژی خۆی هەیە، وەك لای خوارەوە باسی دەکەین:

- فرۆکەخانەی صەدام یەکێکە لە کلیلە گرنگەکانی دەروازەکانی بەغداد ئەویش بەهۆی رووبەرەکەیەوە، کە یارمەتیدەرە بۆ بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی هێزی پیادەو دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای بەغداد بە ٢٠کم.

- دەکرێت زۆرترین ژمارەی هێزی دوژمن لەئاسمانەوە دابەزنە ناو فرۆکەخانەوە، بەتایبەتی فرۆکەی گەورەی باڵ جێگیر، ئەمەش دەبێتە بنکەیەکی ئەمین بۆ دەرچوون بۆ سەنتەری بەغدادو ئابلۆقەدانی.

- فرۆکەخانە کۆمەڵێك پێگەی سەرەکی دەرویداوە (پێگەی رەزوانیە)ی گەورە کە بیناو باخی زۆری لێیە، ئەم پێگەیە بۆ (بارەگای هێزی ئەمریکی بۆ ئیدارەی کردە سەربازییەکان شیاون.

- داگیرکردنی فرۆکەخانەی صەدام کاریگەری دەروونی گەورە لەسەر گەل دادەنێت، مانای گرتنی (پێگەی سەرۆکایەتیە لە رەزوانیە).

- فرۆکەخانەی صەدامی نێودەوڵەتی بەچەند رێگەیەکی ستراتیژی (رێگای خێرا) وە بەستراوەتەوە کەراستەوخۆو بەخێرایی بەرەو کۆشکی کۆماریو سەرۆکایەتی نەتەوەییو نیشتمانی دەچێت، رێگایەکی تری ستراتیژی لەتەنیشت فرۆکەخانەوە کەبۆ خۆرئاوای بەغداد تاکو باشوری درێژ دەبێتەوەو خۆی لەکۆمەڵگا خانووە نشیتەجێکان لادەدات، کەکاریگەری لەسەر بەرەو پێشچوونی هێزی پیادە دادەنێت، هەروەها ئەم رێگایە شیاوە بۆ نیشتنەوەی هەزارەها کۆپتەر لەهەموو بەشەکانیدا، دوژمن دەتوانێت بەڵکو توانای دابەزینی پەرەشوتی فراوان لەچەند جێگایەکی هەڵبژێردراو ئەنجام بدات (کە رێڕەوی رۆیشتنی هێزی زەمینیو زرێپۆشی زامن کرد.

- دوژمن خاوەنی بنکەیەکی زانیاری گەورەیە دەربارەی ئەوەی چی لەفرۆکەخانەی

صەدام هەیە، لەهێڵی بەرگریو پێگەی سەرۆکایەتی، ئەویش بەهۆی هاتنە ناوەوەی پشکێنەرانی چەکی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان بۆ هەموو ئەو شوێنانە، ئەمەش گرنگی بیرکردنەوە لە بەکارهێنانی زیادی کرد.

– فرۆکەخانەی صەدامی نێودەوڵەتی ئەوە بۆ دوژمن زامن دەکات هێزەکانی بەرگری عێراقی لە دەوری بەغداد شلۆقی تێبخات، ئەویش بۆ دەستبەسەراگرتنی دەروازەکانی تر (دووڕیانی یوسفیە – تاجی)، ئەمەش زامنی گەمارۆدانی بەغدادو دابڕانی لەپاریزگاکانی تر دەکات.

**دووەم:** بیرۆکەیەکی گشتی بۆ بەرگری لە فرۆکەخانەی صەدامی نێودەوڵەتی:

فکرەی بەرگریکردن لە فرۆکەخانەی صەدامی نێودەوڵەتی لەلایەن (قوسەی صەدام حسێنەوە) کرا، ئەویش بەچەند ساڵێك بەر لەجەنگ، کە زانیاری هەبوو دوژمن لە ڕێگەی ئاسمانەوە دزە بکاتە ناوەوەو هێزی تایبەت دابمەزرێنێتو سەرۆك صەدام حسێن بکەنە ئامانج، هەموو حساباتێك بۆ هەرپێشبینیەك کرابوو لەهەڕەشەی ئاسمانیو زەمینی، ڕادارو نیشانگەو خاڵی چاودێری لەدەوری فرۆکەخانە دانرابوو، هەروەها لە دەوری پێگەی سەرۆکایەتی لەرەزوانیە، وەنەخشەی بەرگریکردن لەفرۆکەخانەی صەدام دانرابوو کە ڕێڕەوی فرۆکەکان ببن (زەوی کوشتن)، بە چەکی ڕاستەوخۆ ڕووپۆش کرابوو، زۆر بەووردی دانرابوون، هەروەها سەرچاوەی بەرگری ئاسمانی لە دەوری فرۆکەخانە دانرابوو کە زەحمەت بوو هیچ هێزێك بتوانێت لە ئاسمانەوە دابەزێتە ناو فرۆکەخانە، مەگەر پاش تێکشکاندنی هەموو ئەو هێڵانەی بەرگری، کەفەوجی مەشقپێکراوی بەرزو مەعنەویاتی تەواوی لێبوو، هەروەها باش چەککرابوون لە (گاردی کۆماری تایبەت)، کەبریتی بوون لە فەوجەکانی پیادەی پرچەكو ئامرازو کەرتی زرێپۆشو هێزی تایبەت، هەروەها پاراستنی پێگەی سەرۆکایەتی لەرەزوانیە، هێزی بەرگری بەشداربوو چەندەها مەشقو گەمەی جەنگی لەلایەن قوسەی صەدام حسێنەوە ئەنجامدا لەجەنگدا، نەخشەمان داناو چاکسازیمان تێداکرد، ئەویش پاش ئەوەی زانیاری تەواومان بۆ هات کە لەئاسمانەوە بۆ ناو فرۆکەخانە دابەزین دەکرێت، فرۆکەخانە بە ئاگری (بۆمبو موشەك) داپۆشرا.

**سێیەم:** نەخشەی ئەمریکای دوژمن بۆ کۆنترۆڵکردنی فرۆکەخانەی صەدامی نێودەوڵەتی:

بۆمبارانی بەرایی ٣٠٠ کاتژمێری خایاند بەبێ بڕانەوە بە شەو ڕۆژ، بۆ سەر چواردەوری فرۆکەخانە (پێگەی بەرگری)، هەروەها بۆ کۆمەڵگای سەرۆکایەتی لە رەزوانیە، کە ئەمە

ڕێی بۆ هێزی پیادە خۆشکرد پاش لاوازبوونو تێکشکانی بەرگری کۆنترۆڵی بکەن، لەبۆمبارانەکاندا فڕۆکەی B٥٢ بەشداری کرد، بە هەزارەها ئەرکی شەڕی ئاسمانیو موشەکی کرۆزو بۆمبی نیترۆنی کە زۆربەی یەکەکانی کاولکرد (بەشێوازی سووتاندنو لێدان)، لە هەموو نەخشە سەربازییە جیهانیەکاندا، بۆمبارانی بەر لەهێرشی زەمینی یان دابەزین لەئاسمانەوە، کەکاتژمێرێك دەخایەنێت، وەك ئەوەی لەپەڕینەوەی کەنداوی سوێسدا لە جەنگی ١٩٧٣ دا ڕوویدا، کەکەمتر لەکاتژمێرێکی خایاند، کاتێك فاو ڕزگارکرا لەلایەن هێزە چەکدارەکانی عێراقەوە، کەمتر لەکاتژمێرێك بۆمباران بەردەوام بوو، بەڵام لێرەدا بۆمبارانی بەرایی زۆر نامەئلوف بوو نەك لەلایەنی کاتەوە، نەك لەلایەنی پاڵپشتی بۆمبارانەوە، بەڵکو چەکی قەدەغە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی تێدا بەکارهات (چەکی کاولکاری گشتگیر، بۆمبی نیترۆنی) بۆمبی سووتێنەر هۆکاری کۆتکردنی توانا، پاش لاوازکردنو تێکشکانی بەرگریەکانمان دوژمن دەستی بە دابەزین لەئاسمانەوە کرد (لەسەر ڕێگای ستراتیژی خێرا) لەنزیك فڕۆکەخانە، ئەمەش ڕێی خۆشکرد بۆ ئەو هێزەی لەپردی (جرف ئەلصەخر) لەڕۆژی ٢ی نیسان هاتو ڕاستەوخۆ بەرەو فڕۆکەخانەی صەدام هاتن، لەم کردەیەدا فیرقەی ١٠١ کە لەئاسمانەوە هاتنە خوارێ بەشداریان کرد، لەگەڵ فیرقەی ٨٢ ئەوانیش بەهەمان شێوە لەئاسمانەوە هاتنە خوارێ ئەمانە بنەڕەتی هێزی دابەزینی دوژمنی ئەمریکین، لەگەڵ فەیلەقێکی زرێپۆش بەپاڵپشتی هەزارەها فرۆکەی جەنگیو کۆپتەر.

## دەتوانین بە پێی نەخشەی دوژمن جەنگەکە بەم شێوەیە کورت بکەینەوە

- بۆمبارانی بەرایی بەهێزی ئاسمانیو موشەكو چەکی قەدەغەکراو ٣٠٠ کاتژمێری خایاند بۆ لاوازکردنو تێکشکاندنی هێزی بەرگری عێراقی لەدەوروبەری فڕۆکەخانەی صەدام.
- دابەزین لەئاسمانەوە کەفیرقەی ١٠١و فیرقەی ٨٢ لەئاسمانەوە بەشداریان تێداکرد.
- هاتنە پێشەوەی فەیلەقی زرێپۆش (لە ڕێگەی بیابانی نەجەف – کەربەلا – فڕۆکەخانە) خۆی لەشارەکان بواردو لەبیابانەوە هاتن.
- جەنگی سەرزەمینی لەگەڵ دوژمن لەڕۆژی ٣ نیسانی ٢٠٠٣ بەردەوام بوو لەدەوروبەری فڕۆکەخانەی صەدامی نێودەوڵەتیو لەناو کۆمەڵگای سەرۆکایەتی لەڕەزوانیە تاکو ٨ی نیسانی ٢٠٠٣.
- جەنگێکی دڕندانەو توند لەنێوان گاردی کۆماری تایبەتو فەوجەکانی هێزی تایبەتی گاردی کۆمارییو فیدائییەکانی صەدامو تۆپو موشەکی گاردی کۆماری، لەگەڵ هێزە

داگیرکەرەکەی ئەمریکا کە چەند ڕەتڵێکی زەمینیو دابەزیووی ئاسمانیان بەتەواوەتی لەناو بران، دوژمن شێوازی پاشەکشەی بەکارهێنا پاش ئەوەی لەگەڵ کەرتەکان بەرەو ڕووبوونەوە بۆ ئەوەی بوار بۆ فڕۆکەکانی دوژمن بکاتەوە ڕۆڵی خۆیان لە کاولکاری ببینن، ئێمەش شێوازی گەڕانەوەمان بۆ پەناگەو ژێرزەمینەکانمان بەکارهێنا بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری فڕۆکەکانی دوژمن.

– سروشتی جەنگەکە شێوازی ( ڕاونانو ڕاکردن) بوو، هەردوولا هێرشیان دەکرد، بەڵام هێزی ئاگری دوژمن گەورەتر بوو، بەکارهێنانی هێزی نوێی فراوانتر بوو.

– دوژمن شێوازی سووتاندنی تەواوی ئامانجەکانی بەکار دەهێنا، ستراتیژیەتی (کاولکردنو پشکنین) بۆ ئەمە بۆمبی نۆ تەنی بەکاردەهێنا، لەگەڵ بۆمبی بەتاڵکردنەوە.

– سەرۆك صەدام حسێن ڕاستەوخۆ خۆی جەنگەکەی بەڕێوە دەبرد لەگەڵ قوسەی کوڕی، سەرۆك خۆی هێزی تایبەتی گاردی کۆماری بەڕێوەدەبردو لە شێوەی جەنگو ئیدارەی کردەکان ڕێنمایی دەدانێ، جەنگی سەرەکی لەناو کۆمەڵگای ڕەزوانیە ڕوویدا، کەجەنگێکی زۆر توند بوو لەنێوان هێزی تایبەتی گاردی کۆماری لەلایەكو فیداییەکانی صەدام لەلایەکی ترەوە لەگەڵ هێزەکانی دوژمن، لەوێدا دوژمن زیانی گەورەی بەرکەوت کە ناچاری کرد بۆمبی نیترۆنی بەکار بهێنێت.

– زۆربەی پیاوانی تۆپخانە لە فرۆکەخانە شەهید بوونو کەسیان لێنەگەڕایەوە لەبەر ئەوە دوژمن تا هەموو هێزی بەرگری تۆپخانەی تێکنەشکاند هێزی زەمینی نەیتوانی سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، ئەویش بە بەکارهێنانی هۆکاری نامەئلوف کەپێشتر لەهیچ جەنگێکدا بەکار نەهاتووە.

– هۆکاری سەرکەوتنی دوژمن بۆ گرتنی فڕۆکەخانە، بەهۆی مەعنەویاتەوە نەبوو، بەڵکو بەهۆی ئەو توانا زەبەلاحەوە بوو کەهەیبوو، هەروەها ئەو هەموو ئاگرەی بەکاریهێنا.

– ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی دووەمدا لەماوەی دە ڕۆژدا فەرەنسای گرت، کەخاوەنی ملیۆنان سەرباز بوو، لەماوەی چەند مانگێکدا دەیەها وڵاتی گرتو گەیشتە دەوروبەری مۆسکۆ، ئەوەی بوو، بەڵام ئێمە لەم جەنگەدا تەنها خۆمان بووین، ئەو دەوڵەتانەی دژی ئەڵمانیا جەنگانو ئەوانەشی لەگەڵ ئەڵمانیا بوون (هاوپەیمانانو میحوەر) جگە لە ڕووسیا لە جەنگ لەدژی ئێمە بەشداربوو (ئەمەیە هاوکێشەکە)، بەڵام جەنگ هەر بەردەوامەو یەکلایش دەبێتەوە وەك ئەوەی سەرۆك صەدام حسێن دیاریکردووە (سەرکەوتن، هیچی ترنا).

# جەنگی فڕۆکەخانە

## بەشی دووەم

### ئەو جەنگەی ئەمریکا بیری ناچێتەوە

ئەو جەنگەی بەڕێز محەمەد سەعید سەحاف باسی کردو ڕاگەیاندن بێدەنگی لێکرد، لەسەرەتای مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٣، بەڕێز ئەلسەحاف لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان دەرکەوت، کەبەدواچوونی بۆ ماجەرای جەنگ لەعێراق دەکرد وتی: ئەمڕۆ جەنگێکی ناتەقلیدی ڕوودەدات، ئەم لێدوانە کاریگەری لەسەر گۆڕەپانی جەنگ دانا، لەسەر کاردانەوەی سیاسیو سەرکردە سەربازیەکانی ئەمریکاو گەورە نەخشەدانەری وردەکاری جەنگ، لەو جەنگەی ڕاگەیاندن بێدەنگی لێکرد (چی ڕوویدا)، ئەو جەنگەی ئەمریکا بێدەنگی لێکردووو صەدام حسێن بەرەنگاریان بووەوە، ئەو لەگرتووخانە زیانەکانی ئەوانی ئاشکراکرد ؟.

١- هێزی هاوبەشی پەلاماردانی فڕۆکەخانەی صەدام .. تیمی زرێپۆشی یەکەم.

٢- ئەو هۆکارانەی لێکۆڵینەوەی لێکرا بۆ نەخشەدانانی بەرگریکردن لە فڕۆکەخانە.

- لێکۆڵینەوە لەخاڵە لاوازو بەهێزەکانی دوژمن: خاڵی بەهێزی لەکۆنترۆڵکردنی ئاسمانو توانای بەرزی دابەزین بە پەڕەشوتو پێکانی ئامانجو وردی پێکهانی ئامانجەکان بەڕۆژو بەشەو، تەکنەلۆژیای بەرزی تەشویشی ئەلەکترۆنیو بەکارهێنانی دوکەڵی شاردنەوەی ئامانجەکانو موشەکی لێزەرىو هاوکاری گەورەو وردی نێوان هەمەجۆری ڕیزەکانو ئازادی بەرفراوانی کارکردن لە وڵاتانی جیهانو زەریاکان.

بەڵام خاڵی لاوازی دوژمن ئەوەیە هێزی عێراقی گروپی تایبەت (پیادە) بەکاردەهێنێت

کەدەتوانن شەوو ڕۆژ کاربکەن ئەویش بە شێوازی دزەکردن‌و پاشان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

- لێکۆڵینەوە لەکارو کاردانەوە: واتە ئەو کاتەی دوژمن دادەبەزێتە خوارێ چ جۆرە چەکێك بەکاردەهێنێت، کاردانەوەی لەسەر هێرشی بەرامبەر چۆنە، چۆن ئاگرەکانی بەکاردەهێنێت واتە ئەوەی (بە وێنەگرتنی جەنگ) ناسراوە.

- هۆکاری دەروونی: بریتیە لەوەی هێزی دوژمن لەو کاتەی بەرەو فرۆکەخانە دەچێت (چەکی تێکشکاندنی گشتگیر) بەکار بهێنێت، بۆ ئەم مەبەستە (ئەمریکای داگیرکەر) جگە لەهۆکاری پشکنینی ئامێری (ئاژەڵ)ی بەکارهێنا وەك کەروێشك کەهەستیارترین ئاژەڵە بۆ هۆکارە کیمیاویە ژەهراویەکان، هەروەها باڵندەی وەك کۆترو مریشکی بەکارهێنا، بەم شێوەیە شڵەژان ڕوویکردە هێزی داگیرکەر لە ترسی بەکارهێنانی هۆکاری کیمیاوی، وا لەناو سەربازە ئەمریکیەکان بڵاوکرایەوە کەعێراق لەجەنگی فرۆکەخانەدا سەگی بەکارهێناوە، لەئاستێکی دیاریکراودا، بە تەقاندنەوەی کە لەسەر پشتی سەگەکان (ئامێری هەستیار) دادەنرێت هەر بەو ئامانجە کە بکەوێت دەتەقێتەوە، یان لە دوورەوە دەیتەقێننەوە، ئەمەش وایکرد هێزەکانی دوژمن‌و فرۆکەکانی هەر شتێك لە مرۆڤ یان ئاژەڵ بجولێتەوە لێیبدەن، هەروەها سەرکردە عێراقیەکان لە ڕێی وەزیری ڕاگەیاندنەوە شێوازی هەڵخەڵەتاندنی ڕاگەیاندنیان بەکارهێنا، کە باوەڕیان بە دوژمن هێنا کە چەکی کیمیاوی بەکار دەهێنن، بەڵام ئەمریکیەکان لە شیکردنەوەیاندا گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی ئەگەر عێراقیەکان چەکی کیمیاوی بەکاربهێنن، ئەمە ئەو کاردانەوەیان دەداتێ لە بەرامبەردا چەکی کۆکوژی بەکاربهێنن، کە ئەوان بەهەزارەها تەنیان لەو چەکانە هەیەو دوانزە هەزار سەری ئەتۆمیان هەیە یان بۆمبی تەکنیکی (نیترۆنی) بەکاردەهێنن، کە بە فیعلی لە فرۆکەخانە بەکاریانهێنا، ئەگەرچی عێراقیەکان هیچ چەکێکی کۆکوژیان نەبوو.

- بۆمبڕێژکردنی دەوروبەرو دامەزراوەکانی فرۆکەخانە: ئەمیان هۆکارێکی چاوەڕوانکراوەو لەلایەن داگیرکەرانەوە بەوردی چاودێری کراوە، دوژمنی ئەمریکی هەستا بە پشکنینی دامەزراوەکان‌و پێگەکان لەلایەن هێزی ئەندازیارانەوە جا بەهۆی پشکنینی ئەلیکترۆنی بێت یان لە ئاسمانەوە زەوی بپشکنن، بەڵام عێراقیەکان دامەزراوەکانی فرۆکەخانەیان بۆمبڕێژ نەکرد یان کۆمەڵگای ڕەزوانیە، بەڵام وەك ئامانج

دایاننابوو لەناو نەخشەی ئاگریندا.

- هێزی داگیرکەر گریمانەی بوونی تونێلی لێکدابووەوەو لەناو فرۆکەخانەدا تاکو هێزی پیادە بۆ هێرشی بەرامبەر بەکاربهێنێت، پاشان وەك پاراستن‌و شوێنی خۆحەشاردان بەکاریبهێنن، کە لەکاتی بۆمبارانی فرۆکەو موشەکدا خۆیانی تێدا بشارنەوە، بەڵام عێراقیەکان ژێرزەمینی زۆریان هەبوو، هەروەها خەندەق لە نێوان حەشارگەکاندا کە بەشێوەیەکی تۆکمە دروستکرابوو.

- بەکارهێنانی کوتلەی مرۆیی بۆ هێرش: ئەو گریمانەیە بوو دوژمن لێکدانەوەی بۆ کردبوو، کە سەرکردایەتی عێراق پەنا بۆ هێرشی (کوتلەی مرۆیی) بەرێت بۆ ئەوەی زۆرترین ژمارە زیان بە دوژمن بگەیێنێت، ئەم شێوازە لە جەنگی (کۆریاو ڤێتنام) دا روویدا بوو.

- بەکارهێنانی چەکی شۆکی ناتەقلیدی بۆ وەبەرهێنانی ترس لای دوژمن پاش ئەوەی زیانی زۆریان لە جەنگەکانی (ئەلکەفەل)و (زیراع دیجلە)و (جرف ئەلصەخەر) بەرکەوت، نەخشەدانەرانی عێراق لە جەنگدا ئاوپرژێن بەکاربهێنن لەگەڵ کیرۆسینی خێرا گرگرتوو تێکەڵی بکەن تاکو ئاگر لە فرۆکەخانە بەربدەن‌و دوژمن بتۆقێنن، بەڵام بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە سەرنجی هێرشبەران بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت، هەروەها دووەم کاریگەری لەسەر هێزی بەرگری دادەنێت.

- بەکارهێنانی هاوەنی ٨٢ملم چاڵێك لەبەردەم خۆی دروست دەکات‌و لەکاتی گرژبووندا وزەیەکی بەهێز دەردەکات ئەم وزەیە دەبێتە هۆی بڵاوکردنەوەی تۆزێکی زۆر وورد لە پلاستیکی تایبەت ئەمەش دەبێتە گەواڵە هەورێکی بەرز لە هاوشێوەی گازی (سۆرین) یان (زومان) ە، کە ئەمانە هۆکاری کیمیاوین (گازی مێشك) ئەمەش وایکرد هێزی داگیرکەر دەمامك بپۆشن، ئەوەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی توانای بەکارهێنانی چەك‌و کاریگەری دەروونیشی هەیە، ئەم کردەیە لە چەند چرکەیەکدا جێبەجێ کرد، بووە هۆی بڵاوبوونەوەی گازی کیرۆسین‌و هەموو فرۆکەخانەکەی گرتەوە، پاشان هاوەنی ٨٢ملم هاوێژرا، ئەم بەکارهێنانە بووە هۆی ئاگرێکی گەورە پانتاییەکی زۆری فرۆکەخانەی گرتەوە تۆزی پلاستیکەکە بووە هۆکاری بەرزکردنەوەی گەرمایی، پاشان ئەمە کاریگەری لەسەر هەموو هۆکارەکانی پەیوەندی سەر زەوی دانا، لەگەڵ هەموو ئەو سستەمەی لە دەوروبەری فرۆکەخانە بەکارهێنرابوو، هەروەها کاری لە ئامێری جیاکردنەوەی دۆست لە دوژمن کردبوو، هەروەها کاری لە (GBS) دیاریکەری

پێگەی گەردوونیو بێتەل کردبوو، بووە هۆی داخستنی کونی بزوێنەرەکانو فلتەرو هەوا گۆڕەکان، ئەوەی ویستی بێتەدەرێ خنکاو ئەوەی دەیەوێت نەخنکێ هاتەدەرێ، تۆڕی پەیوەندی لەکارکەوت، زەوی فرۆکەخانە وەك ماددەیەکی نیمچە قیری ڕێگر لە جوڵەی لێهات کە لەسەری هەڵدەخزایت، ئەو تەقینەوە گەورەیەی بەهۆی گەمارۆی پلەی گەرماوە بوو، هەروەها ئەو فشارە گەورەیە زیانێکی گەورەی بە دوژمن گەیاندو



بغداد العزّ والكبرياء



# بەشی هەشتەم

# چیرۆکی دیلکردن

ئێمە دوژمنمان بەر لەدۆست دەناسی، هەر لە گەنجیمانەوە پاش ساڵی ١٩٥٩ خەباتکار بووین بەهۆی خەباتمانەوە هاتووینەتە دەسەڵات، گەل بۆ ئەوە هەڵیبژاردووین تاکو لەپێشەوەبین، فەرمانگەکانی ئیمپریالیزم ئێمەی نەهێناوە، ئەوەی جگە لەمە شتێکی تر دەڵێت با بگەنێت.

ئەگەر ئەمریکا یان زایۆنیزم ئێمەی بهێنایە، ئەوا حاڵمان بەم شێوەیە نەدەبوو کە شانازی پێوە دەکەین،

بە دڵێکی پاك‌و دەستی پاکەوە دەچینە ڕووی خوا .. ئەگەر ئەمریکاو فەرمانگەکانی ئێمەی بۆ دەسەڵات هێنابێت، ئەوا لە یەکەم ڕۆژی بەرەنگاربوونەوەمان ئابڕووی دەبردین، بەڵام سوپاس بۆ خوا بەرەوڕووی دەبینەوە، ئەگەر شتێك بڵێت مێژوومان خراپ بکات.

صەدام حسێن لە زینداندا

شانۆیی گرتنی سەرۆك وەك كەناڵە ئاسمانیەكان، بەشێوەیەكی بەردەوام پیشانیاندا، بووە جێگەی گفتوگۆو پرسیارو قسەو باس لەسەر ئەوەی ئەم وێنەیە تاچەندێك راستە، لەنێوان ئەوانەی باوەڕیان نەدەكردو دەیانوت: ئەمە خیانەتە یان ئەوەی گێراوە هاوشێوەكەیەتی، لەنێوان ئەوانەی ئەم دەرهێنانەی هۆلیودیان بۆ ئەم شانۆ هیچ و پووچە پێخۆشبوو، ئایا ئەوەی بەسەر عێراقدا هات لەبەرهەمهێنان و دەرهێنانی فیلمسازانی فیلمی كاوبۆی ئەمریكی نەبوو؟

بەسەرۆكم وت: گەورەم ئەتەوێت گوێت لەچیرۆكێكی ئەمریكی بێت سەبارەت بەدەستگیركردنت و ناوی ((بەرەبەیانی سور))ی لێنراوە؟ پێكەنی و وتی: چیت پێیە بیڵێ، وتم چیرۆكە ئەمریكیەكە وادەست پێدەكات.

**چیرۆكە ئەمریكیەكە:-**

پۆل بریمەر فەرمانی بۆ ئەندامانی ئەنجومەنی دەسەڵات دەركرد نوسینگەكانی كەناڵی ئەلعەرەبیە دابخەن لەبەغداد بەهۆی ئەوەی لەمانگی رەمەزانی ساڵی (٢٠٠٣)دا دوانامەی صەدام حسێنی (بەرلەگیران) بلاْوكردەوە، ئەویش وەك سزایەك لەسەر پەخشكردنی ئەو ریكۆردە كەصەدام حسێن هاتەوە ناو بازنەی رۆشنایی، چیرۆكە ئەمریكیەكە دەڵێت پاش كوشتنی عودەی و قوسەی و مستەفا بووە شۆكێك بۆ صەدام حسێن كەبڕوای بەوە نەدەكرد كەروویداوە، وای هەست دەكرد ئەگەر لەخۆی دووریان بخاتەوە ژیانی پارێزراو دەبێت، بەلاْم ئەو پیاوەی صەدام هەستی كرد دەیانپارێزێت خەبەری لێدان، سیان لەجەنگێكدا كوژران كەزۆر پتەو خۆیان نیشاندا.

نەخشەكە راستەوخۆ لەژێر دەستی ژەنەڕاڵ ریكاردۆ سانچێزدا بوو، لەوەدا ژەنەڕاڵ رای ئاودیرنۆ هاوكاری دەكات، سەركردەی تیمی پیادەی چوار، كەبەمشێوەیەیە: صەدام حسێن هەوڵدەدات پەنا بۆ عەشیرەتەكەی بەرێت و رووبكاتە شارەكەی لەتكریت و لەوێ خۆی حەشار بدات، بەتایبەتی زۆرێك لەئەندامانی دەستەی پارێزگاری لەو شوێنەی دووردەكەونەوە ئەویش پاش كوشتنی هەردوو كوڕەكەی، لەوە دڵنیا بوون كەسوورە لەسەر جەنگان لەگەڵ ئەمریكییەكان جانرخەكەی هەرچیەك بێت ئەمریكییەكان گرنگییەكی تایبەتیان بەگرێ كوێرەی حەشارگە نهێنیەكانی دەدا، كەلەو باوەڕەدان لەژێر كۆشەكەكانی

سەرۆکایەتیدایە، هەوڵی زۆریاندا ئەو حەشارگانە ئاشکرا بکەن، بەڵام شکستیان هێنا، سەربازەکانی تیمی چوار سەرقاڵی پشکنینی ئەو کۆشکانە بوون بۆ چەند جارێك لەرۆژێکدا لەترسی ئەوەی نەکا صەدام حسێن لەکاتێکی دیاریکراودا بگاتە ئەویٚ، کەژمارەی کۆشکەکانی نزیکەی بیست کۆشك دەبێت، لەهەموویان گرنگتر ئەوەی نزیك رووباری دیجلە بوو.

بەڵام ئاستەنگی تووشی ئەمریکیەکان هات، سیمۆن دارایز، یەکێك بوو لەگرنگترین سەرکردەکانی سی ئای ئەی لەعێراق هەستا بەدانانی نەخشەیەکی نویٚ بۆ گرتنی صەدام حسێن، کەبڕوای وابوو لەپەناگە نهێنیەکانی نێوان کۆشکەکاندا هاتووچۆ دەکات، کەدەیزانی هێزە ئەمریکییەکان گەمارۆی دیواری دەرەوەیان داوەو هێزێکی ئەمنیان لەدەرەوە بەدەوری کۆشکدا کێشاوە، ئەندامانی پاسەوانی تایبەت کەگیرابوون، زانیاری تەوایان لەبارەی ئەو حەشارگانە دابوو، بەڵام صەدام حسێن ئەوەندە گەمژە نییە جارێکی تر ئەو حەشارگانە بەکاربهێنێت، بەتایبەتی ئەو بەو زیرەکییە ناسراوە کەدەتوانێت خۆی حەشاربدات و جوڵەکانی خۆی ون بکات، هەروەها زۆر شارەزایی لەسروشتی خاکی عێراق هەبوو.

سیمون دارایز لەراپۆرتەکەی کەلەمانگی ئابی (٢٠٠٣)دا ئامادەی کردبوو باسی لەو شوێنانە کردبوو کەدەکرێت صەدام حسێنی لێبێت، کەیەکێك لەم دوو شوێنەیە: یان لەماڵی خێزانێکە دوور لەشاری بەغدادو زۆر متمانەی پێیانەو دەتوانن بیپارێزن، یان لەناوچەیەکی چۆڵەوانیە. یان لەوانەیە لەحەشارگەیەکدا بێت لەنزیك عەشیرەتەکەی لەناوچەی تکریت بۆ خۆی دروستی کردبێت.

دارایز رای وابوو صەدام حسێن ناتوانێت عێراق بەجیٚ بهێڵێت ئەویش لەبواری ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەکەسایەتی صەدام کردبوو کەهەڵهاتن قبولٚ ناکات، وایدەبینیٚ جەخت لەپاسەوانەکانی بکرێتەوە کەئاگایان لەهەموو جوڵەکانی بووە لەماوەی رابردوودا، نەخشەی یەکەمی گرتنی شکستی هێنا، ئەویش لەبواری وەرگرتنی قسەی گەورە هاریکارەکانی پاش دەستگیرکردنیان. هەروەها لەبواری هەندێك لەشێخەکانی عەشیرەتەکانی تکریتەوە، لەگەڵ شێخی عەشیرەتی پارێزگاکانی تر. کەزۆرینە شوێنی ئەوی نەدەزانی هەروەها هەندێکیان مەسەلەی هەواڵدان بەشەرمەزاری دەزانێت و دەیانخاتە بەردەم گرفتی گەورە، نەخشەی پێشوو ئەوەیە بگەڕێن بەدوای گەورەکانداو بیانگرن بەوەی کەشوێنی دەزانن و دەیدەن بەدەستەوە، ئەمەیان نەخشەیەکی شکستخواردووە، بەڵام نەخشەکە باس لە((راوی

قەڵەو)) دەکات، کەلەپاسەوانە تایبەتیەکانەوە دێن ئەوانەی پاش داگیرکردنی بەغداد لەگەڵی بوون. ئاماژە سەرەتاییەکان باس لەوە دەکەن کەلەئابی (٢٠٠٣)دا چەند شتێك کۆکراوەتەوە، کەکەسانێك هەن دەڵێن لەباکوری بەغداد بینراوە، تاوێکی تر لەتکریت و تاوێکی تر لەناوچەیەکی تر.

بەمشێوەیە تیمێکی نوێ لە سی ئای ئەی لەعێراق بەسەرکردایەتی سوارز کیڤان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەو کەسانەی صەدامیان بینیووە پێك هات. ووردەکاری بینینی صەدام و چۆنیەتی بینینی ئەو کەسانەی پاسەوانیان دەکرد، سی ئای ئەی سەد وێنەی بۆ سەدکەس لەپاسەوانان و کەسە نزیکەکانی کۆکردبۆوە، ئەو وێنانە نیشانی ئەوانە دەدرا کەئەوان چەندێك ئەمانە دەناسن و چەندێك لێوەی نزیك بووە، ئەو پرسیارەی لێیان دەکرا ئەوە بوو کەی صەدامت بینیوە؟ زۆرترین پرسیار کەجەختی لێدەکرایەوە کێ بوون ئەوانەی پاسەوانیان دەکرد سیفەتیان و ئەو شوێنانەی بۆی دەچن.

تیمێکی مۆسادی ئیسرائیلی هاوکاری سی ئای ئەی دەکرد کەلە (١٠) کەس پێکهاتبوون، لەناویاندا سەرۆکی بەشی کردەکان و ئیستتلاعە لەدەزگای مۆساد.

بەمشێوەیە پاش لێکۆڵینەوەی وردو نیشاندانی وێنەی ئەو پاسەوانانەی گیرابوون سی ئای ئەی و مۆساد گەیشتنە ئەوەی کەتەنها دووان لەپاسەوانەکانی نەگیراون، وەسفی ئەوانەی بینیوویانە لەگەڵ وێنەی ئەواندا دەگونجا کەلەتکریت بینیوویانە یان لەروملە لەکەرکوك، ئەوانی تر باسیان لەوە دەکرد صەدام حسێن لەهەموو کەس زیاتر متمانەی بەم دوو پاسەوانە بووە، لێکۆڵینەوەکان دواتر لەسەر زانینی وردەکاری جوڵەی ئەم دوو کەسە بوو، هەوڵی زۆردرا بۆ ئەوەی دەستگیر بکرێن.

ئەو زانیاریانەی کۆکرانەوە هەروەها ئەندامانی موخابەراتی عێراقی و تیمێکی ئەمریکی و ئیسرائیلی توانیان لەکۆتایی ئابی (٢٠٠٣)دا یەکێك لەنزیکترین کەسەکانی دەوری صەدام بگرن، هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەکیان لەگەڵدا بەکارهێنا تاکو شوێنی سەرۆك بزانن، بەڵام سەرەتا شکستیان هێنا، بەڵام پاش فشارێکی زۆری دەروونی و جەستەسی توند بۆ ماوەی هەژدە رۆژی بەردەوام، دانینا بەیەکێك لەحەشارگەکانی باشووری بەغدادا، دۆزینەوەی ئەم حەشارگەیە بووە خاڵێکی جەوهەری لەرێڕەوی نەخشەی ئەمریکی کەزۆر بەنهێنی مایەوە، ئەو حەشارگەیە لەناوچەیەکی چۆڵدا بوو، لەهەمان حەشارگە دەچوو کەدواتر تێیدا دۆزرایەوە، ئەو حەشارگەیە لەناو ژوورێکدا بوو. دەچووە ناو چاڵێکی قوڵ و تەسك وەك وتیان لەوێدا دەستگیرمان کردووە.

پاش لێکۆڵینەوە لەو شوێنە کەزۆر بەنهێنی مایەوە چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوە بەبێ ئەوەی دەستکاری هیچ شتێکی سادەی بکەن، تیمە ئەمریکی و ئیسرائیلییەکە درکیان بەوەکرد لەصەدام حسێن نزیك بوونەتەوە، هەستیان کرد زۆر زیرەکانە لەنێوان سەردانی بۆ ئەم حەشارگایانە دەجولێت، ئەوەیان ئاشکرا کرد کەنیشانەی زۆر وردی نهێنی دادەنێت بۆ ئەوەی لەوە دڵنیابێت کەکەسێك چووەتە ناو حەشارگەکەیەوە، ئەو کەسەی کەگیرا ئەو تەنها زانیاری لەسەر سێ حەشارگە هەیە ئەوانیش روملە لەکەرکوك و باشوری بەغداد، ئەو ئاگای لەحەشارگەی دۆری نزیك تکریت نییە، کەئەوان دواتر وتیان لەوێدا دۆزیومانەتەوە.

هەردوو تیمەکە بەوردی چاودێری ئەو سێ حەشارگەیان کرد کەکەسە نزیکەکەی صەدام ئاماژەی پێدا بوون، پاش بەدواداچوون بۆیان دەرکەوت کەهەرگیز سەردانی ئەم شوێنانە ناکات، هێزی ئەمریکی لەوە دڵنیا بوون ئەم شوێنانە فەرامۆش کراون، ئەو زانیاریەی ئەو کەسە نزیکە داویەتی ورد نەبووە.

لەبەرامبەر ئەمەدا تێڕوانینێکی تر هەبوو، کەباسی لەبوونی حەشارگەی تر ئەکرد لەشوێنە جیاجیاکانی عێراقدا بەکاری دەهێنێت تاکو حەشارگەکانی کۆشکی کۆماری یان حەشارگە بەناوبانگەکانی بەرگەی لێدانی موشەکی قورس دەگرێت بەکاری نەهێنێت.

ژەنەراڵ ئارۆس بیکۆمان، یەکێك لەدیارترین پیاوەکانی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی و سەرکردایەتی تیمی سەربازی چوار کەتەرخان کراوە بۆ گەڕان بەدوای سەرۆکدا، ئەم تیمە چەند توخمێکی کۆماندۆی ئەمریکی تێدایە، چوار لەفرۆکەوانی کۆماندۆ پاڵپشتیان دەکات کەئیسرائیلین، کەفرۆکەی ئەمریکی بۆ لێدانی ئۆتۆمبیل لەکاتی هەڵهاتندا بەکاری دەهێنن، ئەویش لەکاتی ڕوودانی جەنگی درێژ خایەندا، ئەم کارانە وەك ئەو کارانەی لێدانی سەرکردە فەلەستینیەکان وایە کاتێك بەئوتومبیل هاتوچۆ دەکەن.

ئارۆس لەراپۆرتەکەیدا باسی ئەوەی کردبوو لەشوێنێکدا صەدام خۆی حەشار دەدات کەجێگەی گومان نیە، پاراستنی ئەمنیانە لەکەسانی نزیکی خۆیەتی.

بەپێی ئەم راپۆرتە ئەمریکیەکان هەستان بەگرتنی هەموو خزمان و زاواکانی و پاسەوانە نزیکەکانی، ئاشکرابوو ئەم نەخشە نوێیەی ئەمریکا بەرەو دەرئەنجامێکی باش دەیانبات، لەبەرئەوە تەنها لەنێوانی پۆل بریمەرو ریکاردۆ سانچێزدا بوو، سەرکردەی تیمی چوار، ئەو تیمەی کارەکە ئەنجام دەدات.

هێزی ئەمریکی دەستیان بەگرتنی خزمان و پاسەوانەکانی سەرۆك کرد و زۆر بەنهێنی

ئەم کارەیان دەکرد، ئەوانەی دەگیران هەمەجۆر ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونی دەدران، زۆرێك لەوانەی بەرگەی ئەشکەنجەیان نەگرت هاوکاری ئەمریکییەکانیان کرد، ئەوانە پێنج کەس بوون، سیانیان لەخزمانی بوون، یەکێکی تریان لەپاسەوانان و ئەوی تریان زاوای بوو.

کەسێك خزمی راستەوخۆی صەدام بوو، لەوماوەیەدا یەکێك لەخاڵەکانی صەدام بەتوندی نەخۆش کەوت، ئێوارەیەکی درەنگ وەختێ دووجار سەردانی ئەو خاڵە نەخۆشەی کرد، بەمتمانەوە دەگەڕا، تەنانەت جارێك کوڕە خاڵەکەی کەتەمەنی (٣٥) ساڵ بوو لەگەڵ خۆی برد بۆ یەکێك لەحەشارگەکانی و پێنج هەزار دۆلاری بۆ چارەسەری باوکی پێدا. رۆژی دواتر دەگیرێت و توندترین جۆری ئەشکەنجەی دەدرێت، رۆژی دواتر ئیعتراف دەکات و دەیانبات بۆ شوێنێکی دیاریکراو، پاشان ئاماژە بۆ خانوویەکی دوونهۆمی دەکات، دەڵێت من ئەو پارەیەم لەسەرۆك لەدەرەوەی ئەم ماڵە لێوەرگرت.

هێزی ئەمریکا خانووەکەی گرت و زۆر بەوردی پشکنینیان بۆ کرد، ماوەی سێ رۆژی خایاند. لەرۆژێکی تشرینی یەکەمی (٢٠٠٣)، دواجار حەشارگەیەکیان دۆزیەوە لەوماڵەدا حەشارگەیەك دەچێتە چاڵێکەوە تەنها جێگەی یەك کەسی تێدا دەبێتەوە، ئەم چاڵەش بەگژوگیا داپۆشرابوو، پیاوانی تیمی چوار پاشماوەی خواردنی نوێیان لەوناوەدا دۆزییەوە، کەئاماژە بوو بۆ ئەوەی صەدام زۆرجار هاتووتە ناو ئەم خانووە.

ئەمریکی و ئیسرائیلییەکان دڵنیابوون کە((راوی قەڵەو)) نزیك بووتەوە، لەبەرئەوە چەند بۆسەیەك نرایەوەو بۆ ماوەی هەفتەیەك چاودێری بەردەوام بوو بەڵام بێ سوود بوو، ئەم چاوەڕوانییە گومانی ئەوەی لاپەیدا کردن کەلەوانەیە صەدام لەرێگەی پیاوەکانیەوە بەم مەسەلەیەی زانیبێت، ئەو بۆ شوێنێك ناگەڕێتەوە ئەمریکییەکان ئاشکرایان کردبێت.

لەرۆژی هەشتەمدا، کتوپڕییەك روویدا یەکێك لەپاسەوانەکانی کەخزمی خۆی بوو هاتە ئەو ناوەو لەخانووەکە نزیك کەوتەوە، پێدەچوو ڕایسپاردبێت بۆ ئەوەی بچێت دەوروبەری خانووەکە بپشکنێت، ئەو کەسە چووە ناو خانووەکە پاش پشکنینی هاتە دەرێ، لەمکاتەدا دووڕا لای تیمی چوار دروست بوو، یان ئەوەتا ئەو کەسە بگرن و ناچاری بکەن دان بەشوێنی صەدام حسێندا بنێت، یان دوای بکەون تاشوینەکەی دەدۆزنەوە.

کارەکە بڕیاری لێدراو ئەو کەسە گیرا، بەشێوەیەکی زۆر توند ئەشکەنجە درا، پاشان داڕماو ئیعترافی کرد کەسەرۆك پاش کەمێکی تر دێتە ئەو شوێنە، ئەوەی یارمەتی ئەمریکییەکانیدا ناوچەکە دیاری بکەن، ئەو ئامێرو تەکنەلۆژیا نوێیانەی پەیوەندی تەل و

بێتەلی لای تیمی چوار بوو، ئەو ئامێرانە بەپانتایی چوار کیلۆمەتر بڵاوە پێکران، کەدەکرێت سەرۆکی تێدا بێت، ئەم ئامێرانە پێشتر لەئەفغانستان بەکارهاتبوو، سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنابوو وەکاریگەری لەسەر تۆڕی پەیوەندی رێکخراوی قاعیدە هەبوو، کەناچاری کرد واز لەپەیوەندیکردن بهێنێت چ بەمۆبایل چ بەتەلەفونی جێگیر، ئەو ئامێرانە پەیوەندییەکی دەرەکی رەسم کرد، کەبڕوایان وابوو صەدام حسێن لەگەڵ سمیرە شابندەری ژنی کردبێتی لەو شوێنەدا، بەڵام مەسەلەکە وایەکلای کرایەوە کەئەو تەلەفونە لەنێوان صەدام حسێن و تاریق عەزیزدا بووە لەهەوڵدان بۆ زانینی شوێنی (تاریق عەزیز) ئەو کەسەی قسەی لەگەڵدا دەکرد دەیزانی کێیە.

ئەو پەیوەندییە (١٠)خولەکی خایاند، سەرۆك لەو ناوچەیە زۆر نزیك بووە، پێدەچێت هەستی بەمەترسی کردبێت، یان هەندێك لەهێزەکانی ئەمریکی بینیبێت و بەشێوەیەکی زیرەکانە لەو ناوچەیە دوورکەوتبێتەوە، ئەویش لەوکاتەی هێزەکانی ئەمریکا خەریك بووە بیگرن، وەزیری بەرگری ئەمریکی دۆناڵد رامسفێڵد پێشتر رایگەیاند بوو کەگەڕان بەدوای صەدامدا وەك گەران وایە بۆ دەرزیەك لەناو شارایەك پوشدا، هەرجارێك لەم ڕاوە قەڵەوە نزیك دەبنەوە. صەدام حسێن بەشێوەیەکی سەیر خۆی رزگار دەکات.

رۆژی هەینی (١٢)ی کانونی یەکەمی (٢٠٠٣) لەبەغدادو بەدیاریکراوەیی لەناوچەی ئەلعەرەساتی لەکەرادە هێزەکانی ئەمریکا جوڵەیەکی نائاسایی لەیەکێك لەماڵەکاندا بەدی دەکەن، پەلاماری ئەو خانووە دەدەن کەماڵێکە کاری لەشفرۆشی تێدا دەکرێت، هەرچی لەوماڵەدا بووە دەیگرن، هیچ گولەیەك لەو کردەیەدا نەتەقاوە، لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەموویان دەستپێدەکەن، ئەویش پاش ئەوەی دەبرێن بۆ یەکێك لەبنکە سەربازییەکانی ئەمریکا، پیاوانی دەزگای هەواڵگری پیاوێك دێننە گیروگاز ناوی محمد ئیبراهیم موسەلەتە. ئەو دەڵێت عەقیدی سوپا بووە، پاش ئەوەی لەکۆمپیوتەرەکانیان لەناوەکەی دەکۆڵنەوە، دەبینن ناوەکەی هاوشێوەی ناوێکە لای ئەوان هەیە، بەڵام تەنها ناونیشانی شوێنی کارەکەی تێدانیە، ئەمریکییەکان بەدوای ئەم عەقیدەدا دەگەڕان تابگەنە (ڕاوی قەڵەو). لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیان لەگەڵ کرد، بەڵام بەبێ ئەوەی باس لەجۆری لێکۆڵینەوەو تایبەتمەندیەکانی بکەن، جەختی لەوە کردەوە کەصەدام لەشوێنێکی شاراوەیە لەناوچەی دۆرە کە(١٨٠)کم لەبەغدادەوە دوورە، یەکسەر پەیوەندی بەسەرکردەی ئەو فیرقەیەوە دەکەن، کەئەرکی گەڕانی بۆ صەدام پێسپێردراوە، کۆلۆنێل جیمس هیکلی هەموو رێوشوێنێکی تەواو دەگرێتەبەر، ئەویش بۆ ئامادەیی بۆ هەر بەرگریەك کەبکرێت، ئەو

عەقیدە بەفرۆکە بۆ تکریت دەگوازرێتەوە، کەبەشی موخابەراتی ئەمریکی و ئیسرائیلی دەیخەنە ژێر لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتەوە، کەدواتر دان بەهەموو ئەو زانیاریانەدا دەنێت کەدەیزانێت.

دوانیوەڕۆی رۆژی هەینی ٢٠٠٣/١٢/١٢ لەکاتژمێر سێ ی پاش نیوەڕۆ نزیکەی (٥٠) ئامێری سەربازی ئەمریکی دەکەونە گەڕ، هێزێکی ئاسمانی چڕ هاوەڵیان دەکەن، لەگەڵ فەوجی سوارچاکی و هێزی تایبەتی ئەمریکی و هێزی مارێنز، لەگەڵ رێنیشاندەری عێراقی و وەرگێڕەکان و ژمارەیەك لەپێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان سەر بەجەلال تاڵەبانی، لەگەڵ ئەو عەقیدەی لەبەغداد گیرا.

ناوچەکە گەمارۆ دەدرێت و بەتوندی تەوق دەدرێت، عەقیدەکە یەکەم خانوویان نیشان دەدات، بەووردی دەیپشکنن، بەڵام ئامانجەکەیان نادۆزنەوە، بەڵام لەوێدا ئۆتۆمبیلێکی تەکسی بەرەنگی سپی و زەرد دەدۆزنەوە، کەمۆدێلەکەی کۆنە، لەگەڵ ماتۆڕسکیلێك و ئەسپێك پاشان عەقیدەکە دەست بۆ خانوویەکی کۆن لەناو باخەکەدا درێژ دەکات و دەڵێت سەرۆك لەو خانووەدایە، یەکسەر دوو کەس دەگرن و خانووەکە دەپشکنن، خواردنی کۆن دەدۆزنەوە لەگەڵ (٧٠٠) هەزار دۆلار، بەپێی بانگەوازە ئەمریکیەکە.

بەپێی هەندێك زانیاری ئەو خواردنی قوتوانەی لەوناوە دۆزراونەتەوە تەنها سوپای ئەمریکی بەکاری دەهێنێت.

لەوکاتەی خەریك بوو دەچوونە دەرێ، سەربازێك هەستی کرد بەردێك لەژێر راخەرەکەدا دەجوڵێت، پاش ئەوەی هەندێك خۆڵ و پوش و پەلاشیان لابرد لەسەر بەردەکە بەهۆی ئۆتومبێلەوە لابرا، کەئەو کونەی دەچوونە ناوی لەچاڵی جاڵجاڵۆکەوە تەنها یەك کەسی پێدا دەچێت. کەسێك لەناویدا پاڵ کەوتووە، بەزمانی ئینگلیزی بەسەربازەکانی وت: ((من سەرۆك صەدام حسێنم)). سەربازەکان دەریان هێنا، تەنها دەمانچەیەکی پێبوو، سەربازەکان گواستیانەوە بۆ بنکەیەکی ئەمریکی لەتکریت. پاشان بەهیلیکۆپتەرێك بۆ زیندانی نزیك فرۆکەخانەی بەغدادی نێودەوڵەتی گواسترایەوە.

بەهۆی هەندێك لەیارمەتیدەرانی سەرۆکەوە ناسرایەوەو وتیان خۆیەتی، هەر یەکسەر، دۆناڵد رامسفێڵدی وەزیری بەرگری لێ ئاگادارکرایەوە لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکاو ژەنەڕاڵ ئەبی زێد سەرکردەی کردە سەربازییەکانی ئەمریکا.

هەندێك سەرچاوە دەڵێن سەرۆك بۆش وتوویەتی بەهاوەڵی برێمەر بیهێنن بۆ کۆشکی سپی و هەواڵەکەش بلاومەکەنەوە.

بەپێی چیرۆکە ئەمریکیەکە زۆر بەنهێنی بۆ شوێنێکی پایتەختی ئەمریکا گواستراوەتەوە، لەکاتی گواستنەوەیدا دەرزی بێهۆشیان لێداوە، کەدروستکراوی ئیسرائیل بووە.

بۆش دەیویست صەدام حسێن بەکۆت و بەندکراوی ببینێت، هەروەها دەیویست وتارێك بۆ جیهان بدات و پاش ئەوەی خرایە ناو قەفەزێکەوەو دەرگایەکی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەکرێتەوە، هەر ئەوەندەی وتارەکەی دەست پێدەکات لەناکاو دەڵێت ئەمە ئەو پیاوەیە جیهانی سەرسام کردبوو، پاشان دەرگاکە دەکاتەوەو صەدام حسێن دەردەکەوێت و لەبارێکی خراپدایەو لەناو قەفەزێکدا. بەڵام کۆڵن پاوڵ و زۆربەی پیاوانی پنتاگۆن ئەمە ڕەتدەکەنەوە و ئەڵێن ئەمە نامەیەکی ئیستفزازییە بۆ هەموو گەلانی عەرەبی. پاشان صەدام بۆ فرۆکەخانەی بەغداد دەگەڕێننەوە. پاشان هەواڵی گرتنەکەی بڵاو دەکەنەوە.

هەواڵی گواستنەوەی سەرۆك بۆ ئەمریکا کەس ڕەتی ناکاتەوە و کەس جەختی لێناکاتەوە.

ئەمەیان چیرۆکی ئەمریکییە بۆ چۆنیەتی دیلکردنی سەرۆك؟

## سەرۆك چیرۆکی بەدیلگیرانی خۆی دەگێڕێتەوە:

کاتێك لەم چیرۆکە بوومەوە، پێکەنی و ووتی:

((ئەمریکییەکان مامۆستای مۆنتاژ کردنن، لەوە دڵنیا بووم ڕاستییەکان بەلاڕێدا دەبەن ئەیانویست وا پێشکەشی جیهانم بکەن بەشێوەیەکی نەشیاو بەعێراقییەکان بڵێن ئەوەیە سەرۆکەکەتان و بەعەرەبەکانیش بڵێن ئەوە پاڵەوانی نەتەوەکەتانە. ئەمە شێوازی ئەوانە، شێوازی فیلمی کابۆی سەخیف کەبەوە ناوبانگیان هەیە. ئەوان لەم کارەدا پسپۆڕن. بینیمان ئەو کاتەی هێزەکانیان لەپەناما دابەزی و ژەنەراڵ نۆریگایان فڕاند. ویستیان ئابڕوی ببەن. شێوازی کارکردنیان لای هەموو جیهان ئاشکرایە. ئەوەتا من ئێستا چیرۆکە ڕاستەقینەکەت بۆ دەگێڕمەوە. زۆربەی زۆری ئەوەی لەچیرۆکە ئەمریکییەکەدا هاتووە، ڕەتدەکەمەوە بەتایبەت ناوی ئەو کەسەی وەك ناو هێنەر، باسیان کرد. من زۆر متمانەم بەو کەسە هەیە. ئەمریکییەکان دەیانەوێت مەسەلەکان تێکەڵاو بکەن و خائینە ڕاستەقینەکان بشارنەوە کەمنیاندا بەدەست داگیرکەرانەوە.

پاشان سەرۆك وردەکاری بەدیلکیرانی دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

سەردانی ماڵی هاورێیەکم لەناوچەی دۆرەی سەر بەپارێزگای سەلاحەدین دەکرد. ئەو شوێنەم بۆیە دەستنیشان کرد چونکە ئەو شوێنە بوو لەساڵی ١٩٥٩ پەنام بۆ برد. لەرووبارەکە پەڕیمەوە ئەو کاتەی لەهێرش کردنەکەی سەر کەژاوەکەی سەرۆک عەبدولکەریم قاسم بەشداریم کرد کەدەکەوێتە سەر رووباری دیجلە لەنزیک یەکێك لەکۆشکەکانی کۆماری لەو بەری رووبارەکە.

خاوەن ماڵەکە کەسێکە زۆر متمانەم پێیەتی. ئەویش قەیس نامیقە. ئەو کات تەنیا دوو کەس لەدەستەی پارێزکارانم لەگەڵ خۆم دەبرد تاکو نەبێن بەئەرك بەسەر خاوەن ماڵەکەوە هەروەها بۆ ئەوەی ئەو ماڵە نەبێتە ئامانجێکی دیاریکراوی هێزەکانی ئەمریکاو بۆ بەرەنگار بوونەوەی هەر کتووپڕییەك، ماتۆر سکیلێك و ئەسپێك و بەلەمێکیان لەسەر رووباری دیجلە ئامادە کرد. بۆ ئەوەی هەمووومان لەکاتی پێویستدا بەکاری بهێنین. ئەگەر ئەمریکا لەبیابانەوە بێت ئەوا بەلەمەکە بەکار دەهێنین و ئەگەر لەلای رووبارەکەوە هاتن، ئەسپەکە بەکار دەهێنین و رێگەی کشتوکاڵ دەگرینەبەر. ئەگەر لەناو زەوییە کشتوکاڵییەکانەوە هاتن، دەتوانین لەناو بیابانەوە بەماتۆڕ خۆمان دەرباز بکەین. ئامرازمان بۆ هەموو حاڵەتەکان تەرخانکردبوو تاکو لەکاتی کتوپڕدا بەکاری بهێنین. لەو ژێر زەمینانە دەچوو لەکاتی جەنگی ئێران عێراقدا ئامۆژگاری خەڵکمان دەکرد دروستی بکەن.

لەو ماڵەدا لەهەموو شوێنەکانی تر زیاتر کاتم بەسەر دەبرد. رۆژێکیان لەناوچەیەکی دوور بۆ چەند رۆژێك هەندێك لەکەرتەکانی مقاوەم بەسەر دەکردەوە لەگەڵ هەندێك ماڵی هاولاتیان، گەڕامەوە بۆ ئەو خانووە. زۆر هیلاك بووم. کات دوا نیوەڕۆ بوو، قورئانەکەم گرت بەدەستمەوە، چەند ئایەتێکی پیرۆزم خوێندەوەو تاکو خۆرئاوا مامەوە، ژنی ئەو هاورێیە خواردنی بۆ ئامادە دەکردین. کاتێك کاتی نوێژ دەهات قورئانەکەم دادەخست و دەچوومە شوێنی نوێژ کردن. ئەوەندەم زانی هاورێکەم بەهەڵە داوان لەدەرەوە هاتەوەو هاواری دەکرد: ئەوا هاتن. زوو زوو ئەم قسانەی دووبارە دەکردەوە. پرسیم کێ؟ وتی: ئەمریکییەکان. یەکسەر دابەزیمە ناو حەشارگەکە. پاش چەند خولەکێك ئەمریکییەکان شوێنەکەیان ئاشکرا کردم. بێ هیچ بەرگری کردنێك دیلیان کردم. بەرگری کردنم لەحسابی خۆمدا دانەنابوو. هۆکارەکانی ئەوەیە: من سەرکردەم، ئەوانەی هاتبوون سەرباز بوون. ماقووڵ نییە من لەگەڵ ئەوان بجەنگم و کەسێك یا زیاتریان لێ بکوژم و ئەوانیش من بکوژنەوە. ئەمەیان دەستبەردار بوونە لەسەر کردایەتی و گەل کەمتمانەی خۆیان وەك سەرۆك وسەرکردە بەمن بەخشیوە نەك وەك سەرباز. بەڵام ئەگەر بۆشیان لەگەڵدا بوایە

دەجەنگام یان ئەوەتا سەردەکەوتم یا دەمردم.

بەر لەوەی دەستگیر بکرێم هەندێك تێبینم لەسەر هاورێکەم و خاوەن ماڵ لا دروست بوو [٥] بەهەفتەیەك بەر لەگرتن هەمیشە دالغەی ڕۆشتبوو، سیمای دەگۆڕاو هەڵسوکەوتی ناسروشتی بوو، لەو هەموو متمانەی پێم بوو هیچ گومانم لەوە نەبوو خیانەتم لێ بکات و بمدات بەدەستەوە. هەندێ کات ترساو و شڵەژاو دیار بوو.

بەداخەوە دوای حەزەکانی کەوت و دوای شەیتان کەوت. لەوانەیە ئەو دەستکەوتەی ئەمریکییەکان بەڵێنیان پێدابوو، لای من نەبوو. من پارەیەکی زۆرم پێ نەبوو تاکو حساب بۆ خیانەت بکەم. ئەوەی پێم بوو تەنیا یەك ملیۆن و دووسەد و هەشتا هەزار دینار (لەوانەیە هەڵەی چاپ بێت، پارەکە دۆلار بوو) ئەوەیش بۆ ئیدارەدانی هەندێ کردەی مقاومە. لەبەر ئەمە دەبێت بەعێراقییەکان ڕابگەیەنین کەقەیسی نامیق و براکانی منیان داوە بەدەستەوە.

هەروەها ئەوە بەتەواوەتی ڕەتدەکەمەوە کە لەهۆشی خۆمیان بردبێت. ئەمەیان بەشێکە لەفیلمی کاوبۆی ئەمریکی. لەڕاستیدا من بێهۆش نەکرابووم. من لەیەکەم ڕۆژی گرتنم و ڕۆژانی دواتریش هیچ خواردن وخواردنەوەیەکەم نەخواردووە. هەروەها سەبارەت بەپرسیاری خەڵك ئایا من بۆ ئەمریکا گواستراببێتمەوە، من هیچم نەخواردووە تا لەهۆش خۆم بچم یان ماددەی خەولێخەر وەربگرم. شوێنەکەم نەگۆڕدرا تەنیا ئەوەندە نەبێت دووجار گواسترامەوە بۆ شوێنێك لەکاتژمێرێك لەشوێنی یەکەم لەبەغداد دوورە. هەروەها ئەوە ڕەتدەکەمەوە بۆ دوورگەی سانتیاگۆ گواستراببێتمەوە. ئەو شوێنەی منیان بۆ برد تەنیا نەخۆشخانەی ئیبن سینا بوو کەنەشتەرگەری فیتقم بۆ کرا ئەویش بێ بەنج تاکو ئازاری زۆر بچێژم. بەڵام زۆر باش خۆم ڕاگرت. دەیانویست لاوازم بکەن. بەڵام نەشتەرگەرییەکم کردو بەشێوەیەکی ئاسایی ڕۆشتم و بەرەو ڕووی زوڵم و زۆریان بوومەوە. پێم وتن ئەوە مرۆڤایەتی و دیموکراسییەکەتانە.... پاشان ئەگەر باری تەندروستیم پێویستی بوایە دەیانبردم بۆ نەخۆشخانە... دووبارەی دەکەمەوە من لەعێراق لەدایك بووم

---

[٥] سەرۆك سەدام حسێن لەیەکێك لەوتەکانی دەڵێت: لەم ماوەی دواییدا گومانی لەسەر قەیس نامیق زیادی کرد ئەوەیش بەماوەیەك بەر لەگرتنی، لەو گومانانە، ئەو داوای لەنامیق کردبوو لەمپەرو دیواری بەرد لەسەر ڕێگەی کێلگە دابنێ، چەند جارێك ئەم داوایەی لێ کردەوە، داواکەی جێبەجێ نەکرد. ئەمە جگە لەوەی لەڕۆژانی دواییدا نامیق پرۆجێکتەرێکی لەسەر بان دانابوو. سەرۆك تێبینی ئەوەی کردبوو ئەوەی پارەی لەناو کێلگەکەدا شاردبوویەوە کە ١٢٨٠٠٠٠ دۆلار بوو و بۆ متمانە تەرخان کرابوو، دیار نەمابوو

و لێرەش دەمێنمەوەو لەنێو گەلەکەمدا دەمرم و لەم زیندانەدا نایەمەدەرێ مەگەر خوا هەڵمبژێرێتەوە.

ڕۆژی گرتنەکەم هەر ئەو ڕۆژە بوو گەڕامەوە بۆ ماڵی هاوڕێکەم لە ٢٠٠٣/١٢/١٢ پێش نوێژی ئێوارە دەستگیر کرام بەڵام وێنەی ئەو دارخورماو خورمایانەی کەئەمریکییەکان نیشانیان دەداو زۆرێك نکوڵییان لێکرد کەگوایە ئەو کارە لەزستاندا بووە، ڕاست بوو ئەمەیان کارێکی عەجیب نییە، ڕاست بوو عێراق زۆر جۆری خورمای تێدایە کەهەندێکیان بەری دوا دەکەوێت و هەندێکی دیکەی وەك زینە بەدارەکانەوە دەمێنێتەوەو لێناکرێتەوە ئەویش لەبەرئەوەی خاوەنەکەی پێویستی پێی نییە.

تۆمارکراوێکی سەلمێنراویان پێیە بەدەنگی سەرۆك صەدام حسین، لەیەکێك لەدانیشتنەکاندا ناوی ئەو کەسانە دەهێنێت کەبەدەستیانەوە داوە. ئێمەش بەدەوری خۆمان دەپرسین ئایا کەسانی دیکە لەدەرەوەی ئەوانەی سەرۆك دەیانناسێت لەگەڵ ئەو کەسانەدا پەیوەندییان هەیە و لەگەڵ ئەمریکییەکاندا هاوئاهەنگییان هەبێت؟

((گرتن و ئەشکەنجەدانی یەکەم میوان))

هەر کەگیرام گوێم لێ بوو یەکێك پێی وتم: سەرۆك بۆش سڵاوت لێدەکات. وەرگێڕێکی ئەمریکی کەبەزمانی عەرەبی عێراقی قسەی دەکرد، بەربووە لێدانم، قسەی ناشیرینی پێدەوتم. هەندێك سەربازی ئەمریکی بەقۆناغە تفەنگ کەوتنە لێدانم. پاشان بەکۆپتەرێك ڕەوانەی بەغدادیان کردم. ڕیشم درێژ بوو هەروەها قژە سەرم. کاتێك دکتۆریان بانگ کرد دەستی کرد بەپشکنینم. ئاماژەم بۆ شەویلکەم کرد چونکە وام هەست دەکرد شەویلکەم شکاوە بەهۆی توندی لێدانەوە. لەقژە سەرمدا بەدوای شکاویدا دەگەڕا. زۆر هیلاك بووم دۆخەکە ئاسان نەبوو. پاشان سەرو ریشیان تاشیم. سێ کەس هاتن بۆ سەردانم لەناویاندا عەدنان پاچەچیم ناسییەوە. لەبەرئەوەی پێشتر وەزیری دەرەوە بوو. ئەو پیاوە سیاسییە پرسیاری لێکردم صەدام چیت لەعێراق کرد؟ منیش لێم پرسی تۆ چی بۆ ئێرەی هێناوی لەگەڵ ئەمانەدا. تۆ پیاوێکی سیاسیت و مێژوویەکت هەیە. پاشان کەسێکی دیکە هاتە پێشەوە. ئەوەی لەبیرم بێت قسەی نەکرد وتیان ئەمە ئەحمەد چەلەبییە.

بەڵام کەسی سێیەم ئەویان موفق ئەلروبیەعی بوو کە لەدەرەوەی تەلەکانەوە بوون واتە لەدەرەوەی تەلە دڕکاوییەکان. ئەهات و ئەچوو، دەیووت: صەدام بەنەعلەت بێت ئەمە جگە لەوەی قسەی ناشیرینی دەکرد.

لەشوێنی خۆم هەستام تا دەرسی دا بدەم بەڵام ئەمریکییەکان گرتمیان، پێم وت:

ئەوەهاولاتیانی ولاتەکەمن ، ئەتوانم بچمە دەرەوە بۆ لایان و لەهەر کاتێك بمەوێت ئەتوانم رووبەروویان ببم، بەلام تەحەدای تۆ دەکەم بچیتە سەر شەقام. پاشان وەك تێبینیتان کرد دادوەر جوحی چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردم. کەسی دیکە نەهاتە سەردانم جگە لەپاسەوان و ئەفسەرە ئەمریکییەکان. خاچی سوور سێ جار هاتە سەردانم بەلام حەز بەچاوپێکەوتنیان ناکەم لەبەرئەوەی سەردانەکەیان هیچ سوودێکی نییە. دوو نامەیان دامێ، یەکیان لەمانگی ئابی ٢٠٠٤ بۆم هاتووە وەك ئەوانەی دیکە لە ٧٠٪ ناوەرۆکەکەیان کوژاندۆتەوە. هەروەها بۆ وەلامی پرسیارەکەت ئایا یەکێك لەهەڤالانی خۆم بینیوە، ئەوا پێت دەڵێم یەك کەسیانم نەبینیوە هەروەها ناشزانم لەکوێ دەستبەسەرن.

ماوەیەك ئەفسەرێکی ئەمریکی پێی وتم کەگوایە عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزام پێی گوتووم من ئازا نەبووم. ئەم رستەیەی چەند جارێك دووبارە کردەوە. من بەتەواوی فەرامۆشم کردبوو. ئەم قسەیەم وەك فیتنە بازی وەرگرت کە ئەبێت خۆمی لێ بپارێزم یان بەشێوەیەك لەشێوەکان راکێشانمە بۆ لێکۆڵینەوە.

لەبواری ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەمریکییەکان لەگەڵیان کردم، پرسیاری شوێنی چەکە کۆکۆژەکانیان لێکردم. پێم وتن پرسیار لەخۆتان بکەن ئەگەر چەکی کۆکوژمان هەبوایە ئەوا نەتاندەتوانی عێراق داگیر بکەن. پاشان پێی وتم پارە زۆرەکانم لەکوێ شاردۆتەوە. پێم وتن بچن هەموو بانکەکانی دنیا بگەرێن یەك بەیەك. گوایە من ٣٦٠ ملیۆن دۆلارم هەیە، بۆناچن زەوی ژێر پێتان هەڵکەنن. ئەوا هیچ نادۆزنەوە لەبەرئەوەی دەزانن صەدام حسێن نەحساباتی هەقیقی نەوەهمی نییە. ئێوە بارودۆخی خێزانەکەم دەزانن. خوا جەزای ئەوانە بداتەوە کەشوێنی کردوونەتەوەو بەخێویان دەکات.

زۆر پرسیاری هیچیان لێ کردم. هەستم دەکرد لەلێکۆڵینەوەکەدا تووشی تێکچوون هاتوون و کەوتوونەتە ناو گێژاوێکی هەقیقییەوە. دەبینم بەدوای شتێکدا دەگەرێن تاکو رووی خۆیانی پێ سوور بێت.

### (زیندانی سەرۆك)

پاش ئەوەی سەرۆك باسی لەچیرۆکی دیلکردنی کرد، ئەوکاتەی لەناو خانوویەکی ناو باخدا بووە، پاشان چوونەتە ناو ژێرزەمین یاحەشارگەکە وەك خۆی ناوی دەنا، گومانی ئەوەم لا دروست بوو ئەڵقەیەکی ون لەم کارەدا هەیەو سەرۆك نایزانێت. ئەویش ئەوەیە لەدەرەوەیماڵەکە روویداوە لەبەرئەوەی ئەو ماوەی پێیان وت ئەوا ئەمریکییەکان هاتن و

دابەزین بۆ ژێرزەمینەکە، کاتێکی پێویستە کە لەدە خولەك کەمتر نییە. دەرهاتنی لەحەشارگەکە دەبێت کەسێك یارمەتی بدات. هەروەها ئەو چاڵەی ئەمریکییەکان سەرۆکیان لێ دەرهێنا (جا ئەگەر بەدانەیەکی دیکە نەگۆڕدرابێت) ئەمیان تەنها دەروازەیەکە دەچێت بۆ ژێرزەمینەکە، تەنیا بۆ سووکایەتی کردن سەرۆکیان لەو کونە داناوە نەك ئەو ژێر زەمینەی باسی دەکات، دواتر بەوەحشییانە لێیانداوەو جوێنیان پێداوە، بەتایبەتی ئەو لەتەمەنی ٧٠ساڵی نزیك بۆتەوە،پاشان بردوویانە بۆ بنکەی سەربازی ئەمریکی لەتکریت و دواتر بەخێرایی بەکۆپتەر گوازراوەتەوە بۆ بەغداد، پاشان بەشەکانی شانۆییەکە بەوە تەواو کرا کە بەو شێوەیە دەریدەخەن کەجیهان بینی. پاشان دکتۆرەکە شەویلکەی دەپشکنێت، ئەویش پاش ئەوەی سەرۆك دەستی بۆ دەبات تاکو دڵنیا بێت لەسەلامەتی شەویلکەی، ئەویش پاش ئەوەی بەجۆرەها شێوە لێیان داوە، هەروەها دکتۆرەکە پێستی سەری دەپشکنێت نەکا شکاوی یا برینداری پێوە بێت، کاتێك لێم پرسی پێش یا پاش ئەوەی بشکێت، بێهۆش نەکراوە، بەنەرێ وەڵامی دامەوە بەشێوەیەکی بنەبڕ وتی(( تووشی ئەشکەنجە هاتم و هۆشم لەخۆم چوو)) هەروەها باس کردنی بابەتی بەدەستەوەدانی زۆر ئازاری دەدات.

صەدام حسین شوێنی گرتنەکەی دەزانێت و وردەکاری ئەو شوێنە دەزانیت وەك خۆی دەڵێت (( بریتیە لەژوورێکی ٣ بە ٥ مەتر، پەنجەرەکانی بەرزەو وا لەبنمیچەکەدا، لەگۆشەیەکی ژوورەکەدا حەمامێك و توالێتێك هەیە، رۆژانە بۆ ماوەی یەك کاتژمێر دەمخەنە ناو هۆڵێکەوە پانتاییەکەی ١٠ بە ٥ مەترەو سەقفەکەی شیش رێژە، لەوێوە ئاسمان دەبینم، بەڵام دواتر چادرێکیان پێدادا، تەنیا کونێکیان تیا هێشتەوە کەتەنیا دوو مەتر دەبوو، لەوێوە گوێم لەتەقینەوەو زیرەی فرۆکەیە، رۆژانە بەیانیان دەمبەنە شوێنێك لەبیرەکەی یوسف دەچێت، پاشکۆی خانوویەکەیە، بریتیە لەدیواری بەرز، زەوییەکەی ٢٥ لە ١٠ مەترە، بەشیشی ئاسن سەری گیراوە، لەسەریەوە خێمەیەك هەیە بەشێکی دانەپۆشراوە، لەوێوە ئاسمان لەناو شیشەکانەوە دەبینم، لەدوای چوار دەرگای ئاسنین دەگەمە ئەو شوێنە.

(( دەپرسم ئایا زیندانی لای گرنگە، زیندانەکەی پەنجەرەی هەبێت یان نا، یا ئەو دەرگایانەی دەیبڕێت پێنجە یا دە یا دەرگایەك، ئێوە دەزانن سەبری من تا چەندە، ئەم چاکانە بۆ چاکەکانم و خراپەکانیش بۆ کارە خراپەکانم، سوپاس بۆ خوا بۆ بەڵێنەکانی. زەمەن خێرا تێدەپەڕێ، من دەترسم تەماشای کاتژمێر بکەم، دەترسم ئەفسەرەکە بێت

و پێم بڵێ کاتی چاوپێکەوتن تەواو بوو، ئومێدم دەخواست لەوکاتەدا میلی کاتژمێرەکان بوەستێت بەڵام زەمەن تێدەپەرێت و بەخێرایی تێدەپەرێت، جا چەند رۆژو شەو لەناخمدا بێت.... جا چۆن ئەبێت ئەو زەمەنە دیاریکراوە لەگەڵ سەرۆک صەدام حسێندا بم.

## لەنێوان قورئان خێزاندا:

قورئانێکم لەماڵەوە بۆ سەرۆک هێنا، سوپاسی کردم، بینیم ئەو قورئانەی پێیەتی لەگۆشەکەیەوە سووتاوە، پرسیاری ئەو قورئانەم لەسەرۆک کرد، وتی:

پاش ئەوەی بەچەند رۆژێك گیرام، چاویلکە پزیشکییەکەیان بردم، چارەنووسی نازانم. ئەم قورئانە بەسەرهاتی خۆی هەیە، کەسەردانی خەڵکم لەزۆر شوێن و پارێزگا دەکرد، پاش دروست کردنی میوانخانە فەرمانم دەدا قورئانێك لەهەموو ژورێکدا دابنێن، پاش گیرانم هێنامیان بۆ یەکێك لەو شوێنانەی تەوالێتی تێدا نییە، داوام لێکرد بچم دەست بەئاو بگەیەنم، وەك هەموو جارێك چاویان بەپارچەیەك قوماش گرتم، بەڵام شتم لەقوماشەکەوە دەبینی، بردمیانە شوێنێکی وێرانە، پاشکۆی ئەو خانووە بوو کەئێستا منی تێدام کەبەهۆی بۆمبارانەوە رووخا بوو. ئەو قورئانەم بینی لەسەر زەوی فرێدرابوو، ئاگر بەشێکی سووتاندبوو، زۆر دڵم پێی خۆش بوو، رێگەیان دام لەگەڵ خۆم بیبەم لەژوورەکەم بینیم لاپەڕەی یەکەمی کەسورەتی (الحمد)ی تێدایە بەهۆی بۆمبارانەوە دڕا بوو، پارچەیەك شیرینیشم هەڵگرت بەلیك تەڕم کرد لەبری پەڕە کەمەکان لەسەریم نووسی بسم الله و سوورەتی الفاتحە، ئێستا بەو کتێبە قورئان دەخوێنمەوە، زۆر شانازی پێوە دەکەم لەبەرئەوەی یەکێکە لەقورئانە کۆنەکانم، هەروەها بیری ئەوەم دەکەوێتەوە لەعێراق چۆن بووین سوپاس بۆ خوا سوپاس بۆ خوا بۆ هەموو شتێك.

لێرەدا ئەفسەرە ئەمریکییەکە ئاگاداری کردین تەنیا یەك چارەك کاتی چاوپێکەوتنەکە ماوە، پرسیارم لەسەرۆك کرد حەز دەکات نامەیەك بۆ خێزانەکەی بنێرێت. وەڵامی دامەوە:

ئەگەر مەبەستت لەخێزانەکەم ئەو چوار پێنج کەسەیە، من پێت دەڵێم خێزانی من هەموو عێراقە، نەتەوەی عەرەبە، سڵاوی من بەگەلی فەلەستین و عێراق بگەیەنە، هەروەها نوردن و هەموو نەتەوەو هەموو ئەو کەسانی فێری کاری نامرۆڤانەتی خراپ نییە ئەگەر سڵاو لەخێزانە بچووکەکەم بکەیت، سڵاو بگەیەنە بەهەموو هاوڕێ پارێزەرەکانت، بۆ عەشیرەت و ئەو دایکەی تۆی لێبوویت، لەبری من سەری ماچ بکە و ئاگات لەخۆت بێت.

کاغەزەکانم کۆکردەوەو باوەشم پیا کرد، ماڵئاواییم لێکردو دەستیم ماچ کرد، هەستم

بەئازار کرد کاتێك بەجێم هێشت...... هەستم کرد نیوەی ژیانی پیشەییم بەجێی دەهێڵێت و نیوەی مرۆییم دەبێتە شاخێك لەخۆڵ و خۆشەویستی سەرۆکەکەی و دەیەوێت بمێنێتەوە، پرسیم چۆن لەدەستی داگیرکەراندا جێت بهێڵم بەخۆم دەڵێم ئەو بەئیرادە ئازادەو بەپێتەوی، بەهەموو ئەو دەستکەوتانەی بۆ عێراق بەدەستی هێناوە، ئەو عێراقەی سەرۆك عاشقی بوو، جگە لەخۆشەویستی هیچی دیکە لەژیانیدا نەبوو، عێراق لەخوێنیدایە، سەرکردەی مەزن لەمەیدان هەڵنەهات، لەسەر پارەی بانکەکان نەیاندۆزییەوە.... راستی پێوتن کەچەکی کۆکوژ لەعێراقدا نەماوە، ئەو راستی کردو ئەوان درۆزن دەرچوون....

لەو کاتەی ماڵئاواییم لێدەکرد بەدەنگێکی باوکانە وتی:

سوپاس بۆ خوا کوڕی سێیەمی پێبەخشیم، بۆ جاری دووەم پێت دەڵێم سڵاوم بگەیەنە بەخێزان و منداڵەکانت و سەری دایکت ماچ دەکەم، پێی بڵێ تۆ پیاوێکی ئازات هێناوەتە دنیاوە، لەبەرئەوەی ئەرکی خۆت و براکانت زۆر قورس و مەترسیدارە.... خوا بتپارێزێت کوڕم.... لەئەمانەتی خوادا بیت....

خۆم بۆ نەگیرا فرمێسك بەچاومدا هاتەخوار.. هەستم بەپاکیەتی ئاوی دیجلەو فورات کرد تیایدا، بەخۆم وت: ئەمیان هەندێك وەفایە بۆ تۆ، پڕم لەفەخری تۆ، لەبەرگری کردنت بەردەوام دەبم جا ئەگەر ژیانیشم دانابێت.

کاتێك سەرۆکم جێهێشت، ئەفسەرە ئەمریکییەکە داوای لێکردم بچمەوە ناو هەمان ئۆتۆمبێل، لەنێو ئۆتۆمبێلی پاراستنی سەربازیدا، لەرێگەی گەڕانەوەم ئۆتۆمبیلەکە وەستا، ئەفسەرێکی ئەمریکی باڵابەرز پرسیاری سەردانەکەی سەرۆکی لێکردم، پاش ئەوەی خۆی ناساندو پلەی خۆی پێ وتم کە ئەو سەرکردەی بەندیخانەکە بوو، حەزم کرد دابەزم. بۆ چەند هۆکارێك پەیوەست بوو بەسەرۆك، بەڵام رەتی کردەوە تا شوێنی گرتنەکەی دیاری نەکەم، وتی: لەسەردانەکاندا کارەکانت بۆ ئاسان دەکەین، ئەگەر شوێنەکەی بەکەس نەڵێیت، چونکە ئاسمانی عێراق پڕە لەمانگی دەستکرد، دەترسین هەندێ وڵات زانیاری لەسەر شوێنەکەی بدەن بەوڵاتانی دیکە، لەوانەیە شوێنی گرتنەکەی بۆمباران بکرێت، ئەو کات تۆ بەرپرسیاریەتییەکەی هەڵدەگریت، پێم وت ژیانی ئەو پیاوەم لا گرنگە، لای گەلی عێراق گرنگترەو لەلای ئێوە من بەوریاییەوە ئاگام لەوە دەبێت، سکاڵای ئەو هەموو لەمپەرو خاڵی پشکنینە ئەمریکییەی کرد کەدەبێتە هۆی ئەوەی درەنگ بگەمە سەردانی سەرۆك و لەکاتی دیاریکراودا نەگەم. ژمارەی تایبەتی خۆی دامێ تا لەکاتی پێویستدا پێوەندی پێوە بکەم.

ئەمریکییەکان پاش ئەو سەردانەم بۆ لای سەرۆک ئەوەیان راگەیاند کەئەو خانووەی تێیدا گیراوە تەقاندۆتەوەو شوێنەکەیان گۆڕیوە، پاشان هێلی ئەو ئەفسەرەیش بڕا، پاشان دەرکەوت ئەمریکییەکان ئەو خانووەیان نەتەقاندۆتەوە و شوێنی گرتنی سەرۆکیان نەگۆڕیووە بەڵکو کۆمەڵێك گۆڕانکاریان لەخانووەکەدا دروست کردووە، وەك دەزانین ئامرازو شێوەی جیا بۆ وێڵکردنو شاردنەوەی سیمای شوێنەکە وەك سەرۆك پێی وتم(( هەمان شوێنە، دەریاچەی رووناکی بۆ وێڵکردنی هەندێك شتیان داوە سەریدا))

## (( سەرۆك و بەکار هێنانی تەلەفۆن ))

لەو ساڵانەی کەلەسەرۆك نزیك بووم و ئەو لەگرتووخانە بوو، دەیوت: حەزی لەبەکارهێنانی تەلەفون نیە لەبەر هۆکاری ئەمنی، بەتایبەتی پاش ساڵی (١٩٩٠) کەئاسمانی عێراق بەمانگی دەستکرد داگیرکرابوو، ئامرازەکانی سیخوری ئەمریکی و دوژمنان بلاّوکرابوونەوە، پێیان وتین دەبێت زۆر بەئاگاییەوە مامەڵە لەگەڵ تەلەفون بکەن، وتی لەبیرم نایەت پاش ساڵی ١٩٩٠ تەلەفونم بەکارهێنا بێت، مەگەر بەناچاری ئەویش بۆ کورتکردنەوەی ماوە یان بۆ کێشەیەکی مرۆیی، بەلاّم مەسەلە گرنگەکان بەزارەکی پێم دەوتن یان بەنووسین ئەویش لەگەڵ هەڤاڵانم لەسەرکردایەتی یان لەگەڵ سکرتێرەکەم.

سەرۆك جەختی لەمەترسی بەکارهێنانی تەلەفون دەکردەوە بەتایبەتی بێتەل لەکاتی کتوپڕی و جەنگدا ((لەبەرئەوەی ئامادەکاری دوژمن پشت بەزانیاری سیخوڕی دەبەستێت کەلەگۆڕەپانی جەنگدا دەستی دەکەوێت، یان لەقولاّی رکابەریدا لەرێگەی بەکارهێنانی هۆکارەکانی پەیوەندیگرتن، لەبەرئەوەیە سوپا پشت بەزمانی کۆد دەبەستێت بۆ بەهەڵەدا بردنی گوێگرتنی دوژمن یان ئەوەی دەتوانێت دزە بکاتە ناوی، تەنانەت لەکۆبوونەوەی سەرکردایەتی. بیرم نایەت تەلەفونم بۆ دیاریکردنی کاتی کۆبوونەوە بەکارهێنا بێت یان داوای ئامادەبوونی برایانی سەرکردایەتیم کردبێت، ئەمە یان بەنووسین یان بەدەمی لەلایەن سکرتێرەکەمەوە ئەنجام دەدرا...

من اثنين عبر بابين متقابلين وفي كل باب منهما فتحة تسمح بكيا حل
النظر مع جلستنا داخل الغرفة بالإضافة الى الرقابة الالكترونية
داخل الغرفة ، على أية حال
يضغط على نفسي لو هذا ولو غيره .. وأنا ليس مقتنع ولو عن
ولو يضغط [illegible] سجننا من أذى جاوز أسوء التوقعات
أما السجن فليس جديداً علي كما .. ولم أشعر
بثقل الجولات التي عرضتها لك وهي بوجه عام أخف من جولات
خط البداية .. أيضاً إن صبر المؤمن إيمانه ويقينه بأنه
على نحو وتعالى له بالله بأن النتيجة الحتمية انتصار العراق وهزيمة المعتدين
ولقد بانت طلائعها حتى! وهم يعيشون حيرة الأمر وتشوش الطريق
وهبوط الهمة وتدهور العزيمة وغياب التفاؤل صار واضحاً عندهم
بشأن حصار العراق ومن يدعو الى السلام معه إنما هو صاحبه
القدح المعلى ، حتى إن قائداً لعدوان دعا من يسمونهم بالحكومة
هنا الى إطلاق سراح المعتقلين جميعاً بلا قيد أو شرط وأعطوا
لذويهم هنا مهلة شهرين لانجاح ما يسمونه بالأمن بالمصالحة —
والسيطرة على أمن البلاد ، ولكن كل هذا هراء فالقتال وحتى مع
كل يوم يمر يشتد ويشتد ساعدها ورصيدها وأصوات الانفجارات
والقصف المرعبي [illegible] يومياً وفي الليل والنهار [illegible]
وهو [illegible] غريق يتعلق بالقشة .. على أية حال وبغض النظر
عن التفاصيل الأخرى فأنا أرى أن الفرج قريب بإذن الله ، وما
. . . .

**ئەمە بەشێکە لەو نامەیەی کە سەدام حسەین لە ٢٠٠٦/١٠/٢٤ دا کە باس لە شێوازی گیران و بارو دۆخی ژیانی و بەرگری لەزینداندا.**

بسم الله الرحمن الرحيم



رئاسة الجمهورية

السكرتير

يحضر إلينا الرفاق والفريق عابد

قصي ووزير الدفاع الساعة الرابعة

مساءً

ويحضر بعدهم بساعة أي الساعة

الخامسة مساء هذا اليوم

الرفاق طه .. طارق .. لطيف

وزير الإعلام ..

٢٢/٣/٢٠٠٣

وینەی ئەو نامە دەستنوسەی سەدام حسەین بۆ کاتی کۆبونەوە بۆ هاوڕێکانی ئەنارد

# بەشی نۆیەم

## صەدام حسێن و
## ڕووداوی (١١)ی سێپتەمبەری (٢٠٠١)

زۆرجار لەخۆم پرسی بۆ پرسەمان بۆ بۆش نەنارد بەهۆی ئەوکارەساتەوە واتە ٩/١١ !؟ وەلأمەکەم ئەم تاوانە بەهەقی عێراق و عێراقیەکان کەفرۆکەکانی بۆش بۆمباران دەکات، ئابلۆقەمان بەسەردا دەسەپێنێت کەقوربانیەکانی نزیکەی یەك ملیۆن و نیو عێراقی دەبن. مندالأنی لەشیر مەحروم کردووە، قەرتاسیەو قەلّەم رەساسی لەقوتابیان قەدەغە کردووە، بەبرایانی سەرکردایەتیم وت چی صەدام ناچار دەکات بروسکەی سەرەخۆشی بنێرێت ئایا ئەمە تۆلّەی عێراقییەکان و مرۆڤایەتی نییە؟

ئێمە لاوازنین و مونافیقیش نین لەبری ئەوە ڕازی بووم بەرێز تاریق عەزیز جێگری سەرۆك وەزیران بروسکەیەك بۆ ڕەمزی کلارکی هاورێمان بکات کەدلّنەوایی بەناوی حکومەتی عێراقییەوە تێدایە لەوەوە بۆ خێزانە کارەساتبارەکان.

لەیادداشتەکانی صەدام حسێن لەبەندیخانەدا.

چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ سەرۆك بەردەوام بوو، لەهەموو جارێکدا خۆزیاری چاوپێکەوتنێکی دیکەمان دەخواست، پرسیارەکان لەسەرمدا کەڵەکە دەبوون، بەتایبەتی ئەو ڕووداوانەی بەسەر عێراقدا هاتن زۆرن و پیلانگێڕییەکانیش لەزیاد بووندا بوون.

پرسیارم لەسەرۆك کرد: بومەلەرزەی ئەیلول یان ئەوەی بەکارەساتی یانزەی سێپتەمبەر ناسراوەو بەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هاتووە، ئەو وڵاتە نابەزێت، لەناخیدا لێی دەدرێت هەستمان دەکرد مێرولەیەك چییە ناتوانێت سنوورەکانی ببڕێت. ئایا بوومەلەرزەی ئەیلول ئەوەی بینرا پەردەیەك نەبوو بۆ ئەوانەی دواتر ڕوویاندا لەدەستدرێژی بۆ سەر ئەفغانستان و عێراق.

سەرۆك زۆر دوور ڕووانی وەك ئەوەی ڕووداوەکانی بەردەمی بخوێنێتەوە:

ئێوارەی ئەو ڕۆژە لەیەکێك لەشوێنە تایبەتیەکانی خۆم بووم بەدیاریکراوی لەمەلەوانگە، ناوچەکە بەدارێکی زۆر داپۆشرابوو، حەزم لەشوێنێکی وا دەکرد، کەمن خۆم حەزم لەوە نییە لەژێر سەقفی کۆنکرێتیدا زۆر دانیشم یان لەنووسینگە. بانگی یەکێك لەخزمەکانم دەکرد بۆ مەلەکردن بەلام حەزی دەکرد لەو شوێنەی بۆ دانیشتن تەرخان کرابوو، دابنیشێت. من خەریکی مەلە کردن بووم، گوێم لەدەنگی تەلەفزیۆنەکە بوو، کەمێك بەرز بووەوە، یەکێك لەوانەی لەوێدا دانیشتبوو، وتی شتێك قەوما. لەناکاو یەکێك لەنوێنەرەکان هات وەك ئەوەی بیەوێت پرسیارێکی لێ بکەم. کاتژمێر نزیکەی شەش و نیو بوو، لێم پرسی چیت دەوێت. وتی: گەورەم گوێمان لەهەواڵەکان بوو. دەڵێن بەفرۆکە هێرش کراوەتە سەر ئەمریکا. ئێستاش دیمەنەکە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەوە لێدەدرێت. لەمەلە کردن بەردەوام بووم. پاش نیو کاتژمێر هاتمەدەرێ و جلەکانم لەبەر کردو چام خواردەوە. لەو کاتەدا هەندێك لەهاورێیان هاتن. بینیم هەر هەموویان باس لەڕووداوێکی سەرنجمدا. گوێم لەیەکێکیان بوو وتی: ئەمە گەمەیەکی نەخشە بۆ کێشراوە. ئەو دوو فرۆکانەی خۆیان بەدوو تاوەرەکەدادا ئاراستە کرابوون، یەکێکی دیکە وتی: فرۆکەکان

بازرگانی بوون. هەندێك ئەمەو ئەوەی دەوێت. من بێ قسە کردن گوێم گرتبوو، لەو کاتەی تەماشای تەلەفزیۆنم دەکرد خەڵك ڕایان دەکردو بەخۆم وت تاوانی ئەو خەڵکە بێ تاوانە چییە.

بە هاوڕێیانم وت یانزەی سێپتەمبەر کارێکی ناڕاست و بێ بەهانەیە.

نانی ئێوارەم لەگەڵ میوانەکان خوارد. ئێمە هەر تەماشای ئەو دیمەنانەمان دەکرد کە لەتەلەفزیۆنەوە دووبارە دەبوونەوە. وتم کارەساتێکی سەیرە بۆتە هۆی کەوتنەوەی قوربانی زۆر. هەر لایەنێك ئەم کارە دەستدرێژییەی کردبێت ئەوا کارێکی ناڕاستەو بێ بەهانەیە. تاوانی ئەو خەڵکە بێ تاوانە چییە با کەسانێك هەبێت لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکاش ناکۆك بن ئەو کات وتم: چاوەڕێم دەکرد ویلایەتە یەکگرتووەکان لێك هەڵوەشێتەوە وەك سۆڤیەت لەوانەیە تووشی قەیران بێت. ماوەیەك بوو چاوەڕێی قەیرانی وام دەکرد. وتم لەوانەیە دارمانەکە بەهۆی ئابوورییەوە بێت. ویلایەتە یەکگرتووەکان لەڕووی ئابوورییەوە زۆر فراوان بووە ئەویش بەرگەی ئەم بەرفراوان بوونە ناگرێت لەبەرئەوەی خۆی خستۆتە گێژاوێکی ئابووری واوە کەخۆی کەمی نییە. لەوانەیە ئەو دارمانە لەوە بکەوێتەوە. هەندێك لەویلایەتەکانی لەسەنتەر دابڕێن. من چاوەڕێی ئەوە بووم ڕووبدات بەڵام ئەوەی ئەمریکا بەم شێوە تۆقێنەرە لێی بدرێت لەناوخۆدا ئەوا ئەم کارە قورسە بیری لێ بکەیتەوە ڕوو بدات یان ئەو دەرئەنجامانەی دواتر لێی دەکەونەوە.

خاوەن حەق کاتێك شەرعییەتی مەسەلەکەی دەدۆڕێنێت. هەندێ لەگەلان پشتگیری لەمجۆرە کارە تیرۆریستیانە دەکەن ئەویش لەدژی ئەو، ئەم کارە نەخشەدانەرانی ناگەیەنێتە مەبەستیان. بەڵکو هەمیشە بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە ئەوکات وتم قورسە لەشیکردنەوە بەرایییەکاندا بگەنە ئەنجامدەران و ناسنامەی ئەوانە ئاشکرا بکەن کە لەپشت ئەم کارەوەن. هەروەها ئاسان نییە دەزگا ئەمنییەکانی ئەمریکا تەنیا بەسەیر کردنی کارەساتەکە بگاتە دەرئەنجامێك لەگەڵ ئەو هەموو ئامێرە ئەمنییە پەرەسەندووەی هەیانە. هەستم کرد زۆر بەزوویی ئەنجامدەرانی دەدۆزنەوە بەڵام ئەوەی بۆتە هاندەری ڕاستەقینە پشتی کارەساتەکە نەدۆزنەوە. لەوانەیە لایەنێکی دیاریکراو دان بەبەرپرسیارەتی ڕووداوەکەدا بنێت. وەك چۆن هەموو جارێك ئەمە ڕوودەدات لەبەرئەوە ئەم دانپێدانانە سەختی لێکۆڵینەوەیان بۆ ئاسان دەکات. بەڵام وای لێهات ئەمریکاو ئیسرائیل دەیانەوێت

بەکەسانی بەرگریکار کەدەیەوێت مافی خۆی وەربگرێتەوە بەتیرۆریست ناوی بەرن. لەگەڵ بوونی یاسایەکی نێو دەوڵەتی کەدەڵێت هەموو کردەیەکیان مەشروعەو بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکان و نەتەوە یەك گرتووەکان دەتوانن بەرهەڵستکاری داگیرکار بکەن. بەڵام ئەمڕۆ تێکەڵییە لەنێوان ئەوانەی بەرەنگاری داگیرکەر دەبنەوە، لەگەڵ ئەوانەی کارەسات دەخولقێنن، بۆ هەموویان وشەی تیرۆریست بەکاردەهێنێت، ئەمەیان تیکەڵی و خراپەکاری بەهەقی بەرگری شەرعی تێدایە.

بەئامادەبووانم وت: بینیم هەموویان پرسیاریان هەیەو ڕای منیان لەسەر ئەو کارەساتە دەوێت، تەنها باس لەهەڵوێستی خۆم بۆ ئەوانەی خۆیان کوشت دەکەم. ئەو فرۆکانەیان فڕاندو خۆیان پێکوشت، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت ئەوان کەسانێکن زوڵمی زۆریان چەشتووە. کەتووشی خۆیان و دەوروبەریان بووە، ئەویش بەهۆی هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئەگەر پارە پاڵنەریان بوایە ئەوا قەرەبووی گیان لەدەستدانی ناکاتەوە، چونکە پارە پاش مردنیان سوودی نییە، کەواتە دەڵێم ئەوانە بەکرێ گیراونین، وەك دەڵێن زوڵمی زۆر تاکە پاڵنەری تۆڵەکردنەوەیە، بەڵام بەداخەوە بۆ ئەو هەموو بێتاوانەی لەم کارەساتەدا رۆحی لەدەستداوە، ئەپرسم، ئایا ئەمریکا هەست بەوە دەکات سیاسەتەکانی زوڵمی لەزۆر کردووە تاوایان لێبکات خۆیان بکوژن.

((حەزم دەکرد دەزگای سی ئای ئەی ئەمریکی بەرلەوەی وەك تیرۆرست ناوی ئەوکەسانە بهێنێت، گرنگی بەولایەنانە بدایە کەلەپشت ئەم کارەوەن یان ئەوانەی گەیاندووەتە ئەو بڕیارە کەبتوانن لایەنی ئەمنیان ببڕن، من گومانم هەیە کەبتوانێت هەموو ڕاستیەکان بزانێت. لەوانەیە چاوی لێ بپۆشێت و پەنجەی تۆمەت بۆ یەکێك لەڕێکخراوە تیرۆریستیەکان ڕابکێشێت.

بەهەرحاڵ، دەبێت ڕۆژانی دوایی هەقیقەتی تەواو ئاشکرا بێت. لەبەرئەوە ڕێی تێناچێت لەماوەی چەند سەعاتێکدا پەنجەی تۆمەت بۆ کەس ڕابکێشرێت و لایەنی پشتی ئەم کارە ترسناکە ئاشکرا بکرێت، کەئامانجی گەلی ئەمریکی بوو، ئەو گەلەی بەهەڵسوکەوتی ئیدارە سەرشێتەکەی ڕازی نییە.

کردەی لەوجۆرە هەمیشە دەستی شاراوەی لەپشتەوەیە، هەموو ئەوانە لەسەر بەرژەوەندیەکی هاوبەش کۆدەبنەوە، ئاسان نییە دەزگا هەواڵگرییەکان سەرەداوی

تاوانێکی واگەورە بەئاسانی ئاشکرا بکەن.

گرنگ ئەوەیە ئیدارەی ئەمەریکی ئەوەی ڕوویدا دەربکرێت و سیاسەتی خۆی بگۆڕێت و فشاری لەسەر مرۆڤایەتی کەم بکاتەوە، وزەی مرۆڤ سنووری هەیەو کاری خۆکوژیش زەحمەتە کۆنترۆڵ بکرێت، دوا ئەلقەی زوڵمی بەردەکەوێت کەزوڵم تۆڵە لەزالمەکەی بکاتەوە، ئەمریکاش سوود لەهەڵەشەی و پەلەپەل و تۆمەتبارکردن و کاردانەوە نابینێت، لەبەرئەوەی ئەگەر بیر لەتۆڵەکردن بکاتەوە، ئەوا ئەمە گەلان ناچار دەکات زیاتر بیر لەتۆڵە بکەنەوە، بەهەرحاڵ باپەلە نەکەین ڕۆژانی داهاتوو هەقیقەتەکان ئاشکرا دەکات.

زۆر کاریگەری تێکردم و ئازارم چەشت بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی چ کاولکاریەکی بەسەردا دێت و ئەو هەموو بێتاوانە دەکوژرێن.

هەموو ئەمانە لەئێوارەی کارەساتەکاندا وتمان، بەلام ئەمڕۆش جگە لەمە جیاوازتر ناڵێم، کەزوڵم و ستەمکاری ئیدارەی ئەمریکی پاڵ بەخەڵکەوە دەنێت کەتۆڵە بکاتەوە جابەمشێوەیە یان شێوەی تر، ئێمە دژی هەرکارێکی تیرۆرستین جادەوڵەتان یان تاکە کەس ئەنجامی بدات... بەلام بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئەوەی ڕوویدا گەمەیەکی موخابەراتی ئەمریکییە، لەوانەیە زایۆنیزمی لەپشتەوە بێت، تاکو پاڵ بەئەمریکاو گەلی ئەمریکییەوە بنێت کەتۆڵە لەولاتانی تازە پێ گەیشتوو بکاتەوە کەهیچ تاوانێکی نییە، ئەویش بۆ دەرفەتی سیاسەتی بالا دەستی و دزینی سامان، ئەمیان زۆر بەوردی نەخشەی بۆ کێشرابوو، ئەو خۆی قاعیدەی لەئەفغانستان بۆ جەنگ لەدژی سۆڤیەت درووست کرد، ئەمە لای هەمووان ئاشکرایە، ئەم کارەساتەی (١١)ی سێپتەمبەری وەك بەهانەیەك بەکارهێنا بۆ داگیرکردنی ئەفغانستان و عێراق.

پاشان سەرۆك بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو، لەوکاتەدا چاوم هەڵبڕی، تەماشای دەکردم، هەستم کرد هزری لەوێیە، لەعێراق بەخەمباریەوە کەبەچاوەکانیەوە دیاربوو، وتی: کوشتن و تێکشکاندنی بەکۆمەڵ لەگەڵ سووربوونی پێش وەخت چۆن دەبێت لەدژی گەلێکی دێرینی وەك عێراق بەبێ هیچ تاوانێك ئایا ئەمە تیرۆری دەوڵەت و تیرۆری ڕێکخراو نییە ئەمریکا دژی ئێمەو هەموو گەلانی تینووی ئازادین بەکاری دێنێت؟!!!

ئەوەی لەقسەکانی سەرۆك صەدام حسێن هەڵهێنجا ئەوەیە کەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵەکانی ڕووداوی (١١)ی سێپتەمبەرەوە بەدوای بەڵگەیەکدا دەگەڕا صەدام

حسێن بەرێکخراوی قاعیدەوە ببەستێتەوە، هەر ئەمەش بوو ریچارد کلارک بەرپرسێکی پێشووی ئەمریکی لەئیدارەی بنەبڕکردنی تیرۆر لەکۆشکی سپی باسی لێوەکرد. ئەویش لەمیانەی چاوپێکەوتنێك لەگەڵ تەلەفزیۆنی (CBSNEWS) لە٢٠٠٤/٣/٢١ لەگەڵیدا ئەنجامیدا، ئەویش بەبۆنەی دەرچوونی کتێبەکەی بەناونیشانی (لەبەرەنگاربوونەوەی دوژمناندا)، باسی ئەوەی کرد بۆش پاش ڕووداوی (١١)ی سێپتەمبەر داوای لێکردووە بەدوای پەیوەندییەکدا بگەڕێت لەنێوان ئەم ڕووداوەو صەدام حسێندا. ئەگەرچی ئەم پێی ووتبوو لەنێوان ئەم دووانەدا هیچ پەیوەندیەك نیە، کەڕامسفێڵد دوای کارەساتەکە دەیوویست گورز لەعێراق بدات. ((وەك ئەوەی بۆش داوام لێبکات ڕاپۆرتێکی بۆ بهێنم و بڵێم عێراق ئەوکارەی کردووە)).

# بەشی دەیەم

## دەوڵەت و ئۆپۆزسیۆن

ئەوەم لەخۆم حەرام کردبوو رقم لەیەکێك بێت تەنانەت دوژمنەکانیشم
بەڵکو رقم لەکارەکانیان بوو

رق لای من لەساڵی (١٩٥٩)وە نەمابوو
بەڵکو لەوانەیە هەر لەناخمدا نەڕوا بێت

صەدام حسێن لەبەندیخانە

ئاشکرایە سەرۆکی دەوڵەت، جاھەر دەوڵەتێك بێت، دەسەڵات و ئەرکی ھەیە، ئەویش بەپێی یاساو سستەم و دەستوور دیاریکراوە، ئەم دەسەڵاتانە واناکات سەرۆك لەھەموو کارێکی گەورەو بچوك بەرپرس بێت دەسەڵاتی سەرۆك لەدەستووردا ئاشکرایە، کەنایکاتە قایمقام یان بەڕێوبەری ناحیە یان پۆلیسی ھاتوچۆ، تاکو ئاگای لەھەموو وردەکارییەکان بێت و ھەموو ئەو ھەڵانەی دێتە بەردەمی چارەسەری بکات.

لەچاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەرۆك لەسەر بازگەکەی زۆر بەدوورودرێژی باسی ئۆپۆزسیۆنی دەکرد، ھەروەھا ھەموو ئەو ھەڵانەی ڕوویانداوەو بووەتە ھۆی ئازاردانی زۆرێك کەس کەکێشەکانیان نەگەیشتووەتە سەرۆك، زۆر ڕاشکاوانە دەربارەی ئەم بابەتانە قسەی دەکرد سەرۆك وتی:

ھەموو ڕژێمێکی سیاسی کەسانێك ھەن بەرھەڵستکاری بیروڕای دەکەن، کەلەوانەیە پەیوەندی بەسستەمەوە ھەبێت، کەلەوانەیە درێژ ببێتەوە بۆ سیاسەتی دەرەوەی وڵات، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەسیاسەتی دەوڵەت و پەیوەندی بەگەلەوە ھەیە، ئێمە زۆر ڕێز لەم ئۆپۆزسیۆنە دەگرین، مادام جیاوازی بیروڕا لەچوارچێوەی سستمی دەوڵەت و دەستوردایە، لەگەڵ زۆر لەکەسایەتیە نیشتمانیە عێراقیەکاندا ئاڵوگۆڕی بیروڕامان کردووە، لەگەڵ ئەوەی تێڕوانینمان زۆر جیاواز بووەو دژی یەك بووین، بەڵام ئامانجی ئەم ئۆپۆزسیۆنە ئامانجێکی نەتەوەیی و شکۆمەند بووە، ئەوانە عێراقی شەریفی ڕەسەنن، لەبەرئەوەی ئەوانە پاڵ نادەن بەبێگانەوە.

لەگەڵ سەرۆك باسمان لەزۆر ناوکرد، لەوانە ئەو ئۆپۆزسیۆنەی نیشتمانیەی دکتۆر عبدالجبار ئەکوبەیسی بەڕێوەی دەبات ((بەری ھاوپەیمانی نیشتیمانی)) کەدژی داگیرکاری ئەمریکی بوو بۆ عێراق و دژی بەھێزکردنی بیانی بوو لەعێراق. لێرەدا سەرۆك وتی: ((سڵاوی من بگەیەنە ھەمووان)) بۆ پاڵەوانانی عەونی قەلمچی و نوری ئەلمورادی و ھارون محمد.

لەوانە بوو لەگەڵ ھەندێك ڕەمزی ئۆپۆزسیۆنی عێراق دەگەیشتینە ھەڵوێستی ھاوبەش بۆ خزمەتی عێراق، ئەگەر دوژمنکاری ئەمریکا ڕووی نەدایە، ئەم پرۆژەی ئۆپۆزسیۆنە،

پرۆژەی نیشتمانیە کەوابەستە نییە بەهێزو ئەجندای بیانی و دەرەکیەوە، ئەوان بەئاشکرا کار دەکەن و پەیوەست بەئەجندای بیانیەوە، بەنهێنی و لەودیوو سنورەوە کار دەکەن، هەندێکیان لەژێر ئەجندایەك بەناوی ئاینەوە، کەبەتوندی بەدوژمنانی عێراق و عەرەبەوە پەیوەستن و کار بۆ ئێران و ئەوانی تر دەکەن، ئەمانە لەنێو ئێمەدا جێگەیان نابێتەوە، بەلاّم ئەگەر خۆیان چاك بکەن و پرۆژەکەیان بەبەرژەوەندی نیشتیمانەوە پەیوەست بکەن و بەئاشکرا کاربکەن، هەموو پەیوەندیەکانیان بەدەرەوە پچڕاند، ئەوا باوەشی عێراق جێگەی هەموانی تێدا دەبێتەوە، بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەوا ئێمە لەدژیان دەجەنگین، ئەوان لەسەر پشتی تانکی خاوەنەکانیانەوە هاتوون... ئەوانە دوژمنی عێراق و گەلی عێراقن..

قسەو باسم لەگەڵ سەرۆك لەسەر ئۆپۆزسیۆن دوورو درێژ بوون بۆ هەوڵدانی شێواندنی وێنەی هەندێك کەسانی نیشتیمانی، وتی: ڕۆژێکیان ڕاپۆرتێکم بۆ هات تێیدا هاتبوو، کەتاریق عەزیز لەوکاتەی وەزیری دەرەوە بوو، چاوی بەهەندێك کەسی ئیسرائیلی کەوتبوو لەنیویۆرك، ئەویش لەپەراوێزی کارەکانی ئەنجومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان.

بەو کەسەی ڕاپۆرتەکەی بۆ هێنام وت: هەروەها بەڕاپۆرت نووسەکەش کەمتمانەی من بەتاریق عەزیز سنووری نییە، داوام کرد تاریق عەزیز بێت، تەنها بانگم کردە لاوەو لێم پرسی، وەلاّمی دامەوە: کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیم هەبوو، پێدەچوو هەندێك ڕۆژنامەنووسی جولەکە لەولاّتانی جیهان و ئەمریکا لەو کۆنگرەیەدا بوون، ئیسرائیلی نەبوون، ئایا دەکرێت خۆم بچومایە داوای ناسنامەم لێبکردنایە پاشان کۆنگرەکەم بکردایە؟

سەرۆك درێژەی بەقسەکانی دا: ((داوام لێکرد ڕاپۆرتەکە لەت و پەت بکەن و کارەکە بەنهێنی بهێڵنەوە تاکو نەبێتە هۆی زۆر بڵێی و گومان لەکەسانی دڵسۆزی عێراق پەیدا ببێت)) پاشان وتی: ((ناشرینە باسی خۆم بکەم، بەلاّم مادام ناو زڕاندن گەیشتە ئەو ئاستە، پاش ئەوەی مشت لەسەر مشت عێراقمان دروست کرد، ئیدی من لەوبارەیەوە قسە دەکەم تاکو ڕاستیەکان دەربخەم کەخەریکە لای عێراقیەکان دەشێوێن.

هەموومان تاریق عەزیزو هەڵوێستە نیشتمانیە شەرەفمەندەکانی پێش داگیرکاری دەزانین، هەروەها لەناو زیندانیش، ئەو داوای لێکردم کەبیکەمە شاهیدی بەرگری لەصەدام حسێن، کاتێك من هاوڕێی شەهیدم مامۆستا خمیس ئەلعوبەیدی چاومان بەدیلەکان کەوت،

مامۆستا تاریق عەزیز پێی وتم: ئەویش لەبەرچاوی دیلەکانی ترو ئەمریکیەکان: ((مامۆستا خەلیل تکایە ڕێگەم بدەن قسەیەکی هەق بۆ سەرۆك لەکێشەی دوجەیلدا بکەم)).

نمونە زۆرن کەدەروون نزمەکان هەوڵیانداوە کەسانی نیشتیمانی و دڵسۆز پاڵپێوەنێن و بیخەنە سەنگەری دوژمنەوە، بیانخەنە خانەی ئۆپۆزسیۆنی پیلانگێڕ لەدژی عێراق[٦]، ئەگەر کاتی خۆی هات وردەکاری ئەوەی پەیوەستە بەئۆپۆزسیۆنەوە دەیخەینە ڕوو دەڵێم (...من کێم؟) لەبەشێکی تری وتارەکەی سرافدا: دیکتاتۆریەتی تۆ گرفت نەبوو، هەروەها پێشێلکاری رژێمەکەت بۆ مافی مرۆڤ، بەڵکو چەکە کۆکوژیەکانت، دەتویست نیشتیمانێکی بەهێزو نەتەوەیەکی ئازاد دروست بکەیت، داوای ملکەچی کوێرانەت لێدەکردین، لەبەرئەوەی تۆ واتەماشات دەکردین، نەك لەو شوێنەی ئێمە وەستاوین، بەڵکو کەخۆت لەبەرزترین خاڵدا دەبینیەوە... ئێمە نەمانبینی بەلاّم دەیانبینی، ڕکەبەرەکانتان لەئایندە دەترسان کەبۆ باڵادەستیان پێشنیاری دەکەیت ئێستا من و تۆ درك دەکەین بۆچی دزیان هێناوە بۆ ئەوەی حکومڕانی عێراق بکات بۆچی کتێبخانەی نیشتیمانیان سوتاند؟ مۆزەخانەی نیشتیمانیان دزی، بۆچی ژێرخانی وڵاتیان کاولکردو ئاوەدانیان نەکردەوە،

---

[٦] دکتور صالح محمد سفر مامۆستای زانستە سیاسیەکانی زانکۆی قەتەر لەچاوپێکەوتنێکی لەگەڵ سەرۆکدا دەڵێت، ئەم وتانە لەقودسی عەرەبی لە٢٠٠٢/٧/١٧ بڵاوبووەتەوە. پرسیار لەسەرۆك دەکات: سەرۆکی بەڕێز هەموو رژێمێکی حەکیم ئۆپۆزسیۆنی هەیە، ئەی دەربارەی ئۆپۆزسیۆنی عێراق؟ سەرۆك وەلاّم دەداتەوە: ((ڕاستە لەزۆربەی وڵاتانی دنیادا ئۆپۆزسیۆن لەناوخۆدا هەیە، ئۆپۆزسیۆنیش لەدەرەوەی رژێم هەیە، یەکەم یاساو سستم و سیاسەتی گشتی هەیە، بەلاّم لەناو سستمدا، دووەمیان رادەی سلبیاتی مومارەسەی جیبەجێکردنی سیاسەت دەکات، هەردوو ئۆپۆزسیۆن ئاشکران و بەنهێنی کار ناکەن و بەهێزی دەرەکی لەدەرەوەی سنورەوە پەیوەست نیە. دکتور سەفەر دەڵێت: لەکاتی بەرهەڵستکاری بەرپرسێکی گەورەی عێراق وتوویەتی ئێمە دەزانین خەڵکان هەن ڕای خۆیان لەسیاسەتی عێراق هەیە، بەلاّم ئەمانە بەکرێگیراونین، هەروەها هاوکاری دوژمنانی عێراق نین. ئەوان بەشێوازی خۆیان بەرگری لەعێراق دەکەن. ئەمانە زۆر ڕێزیان لێدەگرن. ئێمە ئامادەیی تەواومان هەیە گوێیان لێدەگرین لەبەرئەوەی عێراقین و دوژمنکاری بۆ سەر عێراق رەتدەکەنەوە...

سەرۆك وتەکانی بۆ دکتور تەواو دەکات:

بەلاّم ئەوانەی لەوێنەدا یەك ڕیز لەگەڵ دوژمنی عێراقدا وەستاون، ئەوانەی لەنێوان کەناڵە ئاسمانیە عەرەبیەکاندا دێن و دەچن، لەنێو پایتەختی دەوڵەتانی خۆرئاوادا خۆیان بۆ عێراق مەلاسداوە و دێن و دەچن و هانی دوژمنان دەدەن عێراق بدات بەزەویداو دوژمنکاری بەرامبەر بکرێت بۆ کاولکارکردنی هەموو دەستکەوتەکانی. ئایا ئەمانە شایەنی ڕێزن؟ ئەمانە بەکرێگیراوی هێزی دوژمنن، ئەوان ئەیانەوێت عێراق وەك حکومەت و گەل تێکبشکێنن و بەئامانجیان گەیشتنە بە دەسەلاّت، ئەویش بەسەر دەنگەکانی چۆن هانی زۆرێك لەنیشتمانپەروەرەکانیان دەدا بەناچاری دژی دەوڵەت و رژێمەکەی بووستنەوە، ئەو لایەنانەی پاڵیان پێوە دەنان، هەموو ئەمانە بەبەڵگەو دیکۆمێنتیش ڕاست کراونەتەوە. سەرۆك بزەیەك دەیگرێت و بەردەوام دەبێت ((کوڕم، خۆ من نابم بەهەزار سەدام حسێن)).

بۆچی عێراقیان لەسەر بنەمای تایەفەگەری و ڕەگەزپەرستی لەت و پەت کرد، لەبەرچی کشانەوە ڕەتدەکەنەوە بەرلەوەی (ئەرکەکەیان تەواو بکەن)؟ سەرۆکی بەڕێز من هەڵەی گەورەم کردو تۆش زۆر ڕاستت کرد، بەڵام تۆ دکتاتۆرێکی جوان بوویت، بەڵام من هەمیشە هەڵە بووم))۔

لەوانەیە هەندێك بووبێتنە قوربانی خەبەرلێدان یان زوڵمی کەسانی نزیك و خزمانی سەرۆك؟

سەرۆك وەڵامی دایەوە:

((بەڵێ شتی وا ڕوودەدات، بەڵام مەزلومێك نەهاتووەتە لای من و سەرم نەخستبێت، یان پرسیاری هەبێت و وەڵامیم نەدابێتەوە، یان کەسێك بێت و پێویستییەکی هەبێت و ئەو پێویستیەمان بۆ پڕ نەکردبێتەوە، تاکو ئێستاش بەیەك چاو سەیری هەموو عێراقیەکانم دەکرد، هەڵە زۆر ڕوویداوە، بەڵام ئەوەندەی بتوانین هەوڵماندەدا نەکەوینە ناوی، لەبیرم نایەت زوڵممان لەکەس کردبێت، ئەگەرچی ئێمەش لەهەڵە مەعسوم نین، بەڵام هەموو ئەو شتانەی کەدەبووایە بگاتە دەستم، کەناگات، ئەوەیان تاوانی من نییە، کاتێك هەڵسوکەوتێکی خراپم دەبیست لەلایەن کەسانی نزیکی منەوە بەرامبەر عێراقیەك کراوە، جالەدیوان بێت یان ئەندامانی دەستەی پارێزەرم یان کەسانی تر، سزام دەدا، لەشوێنێکەوە دەمگواستەوە بۆ شوێنێکی تر یان خانەنشینم دەکرد، یان ئەو سزایەی وەردەگرت کەشایستەی بوایە، لەکەسم قبوڵ نەدەکرد خراپە بەرامبەر بەگەلی عێراق بکات و وێنەی کاروانەکەمان بشێوێنێت بەدڵنیایی ناڵێم ئەوانەی لەدەورم بوون لەکەسە نزیك و خزمەکانم خراپی تێدا نەبووە.

سەرۆك زیاتر دەڵێت...

ئەوەی ڕژێمی نیشتیمانی ئێمەیان ئێستاو ئەوساش بەدیکتاتۆری ناودەبرد، ئەوکات بەرهەڵستکارمان بوون، گوێمان لەتێڕوانینەکانیان دەگرت، لەگەڵیان کۆك یان ناکۆك دەبووین لەسەر زۆرکاروبار، پاڵپشتمان دەکردن و لەرووی ماددیەوە هاوکاریمان دەکردن، ئەویش بەپارەیەك خۆیان دەیزانن منەتیان بەسەردا ناکەین، وەك هەقێکی خۆیان دەماندانێ بەوەی بەشێکن لەم گەلە، بەڕێز جەلال تاڵەبانیش زۆرێك لەوشتانەی دەزانی گەر بیوتایە هەروەها هەمان شتیش بۆ بەڕێز مەسعود بارزانی، لەوانەیە یادەوەری یارمەتی

بدات هەندێك شت بڵێن کەئێمە ئێستا نامانەوێت بیڵێین، نەکا واتێبگات ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی لەم کاتی محنەتەدا پێویستمان پێیەتی، ئەمیان ئیرادەی خوایە، سوپاسی دەکەین، ئێمە بۆ وەڵامی فەرمانی ئەو باشین)).

من لەوماوەیەی لەسەرۆك نزیك بووم لەو چەند ساڵە کەمە لەگەڵ پەیوەندیکردنم بەو کەسانەی لەنزیکی بوون، زۆر بەڕاستگۆی و ئەمانەتەوە دەڵێم هەندێکیان بۆ نیشتیمان و سەرۆك دڵسۆز بوون، بەڵام هەندێکی تریان شایەنی ئەو متمانەیە نەبوون، بەڵکو هەندێك نکوڵی لەباشەیی سەرۆك کرد، لەوەی پێیدا بوو ئەمین نەبوو، ئەمەش وایکرد سەرۆك زۆر لەهەڵسوکەوتیان تورە بێت، بەڵام ژمارەیەکی بەرچاوی ئەوانەی دڵسۆزی سەرۆك بوون، هەندێکیان موجازەفەیان کرد، ئەگەرچی لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە داواکراوە، کەچی هات شاهیدی لەبەرژەوەندی سەرۆك لەبەردەم دادگادادا. سەرۆك باسی ئەوەی کرد، زۆرێك لەدڵسۆزان لێی دوورخرابوونەوە، تەنانەت هەندێك لەخزمە شەهیدەکانی، بوونە قوربانی ئەڵقەیەکی تەسك دەووری سەرۆکیان دابوو، کەبوونە هۆی ئەوەی بە خراپ لە سەرۆك بڕوانن و ئەوانەی دڵسۆز بوون لەرۆڵەکانی گەل، وتی:

((بەڕاستی ئەوانە پەڕاوێز خرابوون و کەمتەرخەمیمان لەبەرامبەرکردن، نامەوێت لەبەرهۆکاری ئەمنی ناوی ئەو خاوەن هەڵوێستانە بهێنم، وەك ئەوەی یەکێکم لەڕۆڵەی گەلی عێراقی مەزن، بۆ مێژوو دەڵێم صەدام حسێن هەوڵی دامەزراندنی دادپەروەری داوە، مەزڵومێك لەدەرگای دابێت ئەو یارمەتی داوەو لەجەللادەکەی رزگاری کردووە، هەندێك هەقیقەتیان لێشاردووەتەوە، بەڵام ئەو زۆر توند بوو تەنانەت لەگەڵ مندالْ و خزمەکانی .

## ( سەرۆك و هەڵەی هەندێك لەخزمانی )

لەیەکێك لەدانیشتنەکانم لەگەڵ سەرۆك، پرسیارم لێکرد چۆن لەگەڵ هەڵەی کوڕەکانی و خزمانیدا مامەڵەی دەکرد، وتی: رۆژێك یەکێك لەئەفسەرەکان هات و سکاڵای لەعودەی و خاڵێکی کرد گوایە لێیانداوە، یەکسەر داوام کرد بیانهێنن، داوام لەئەفسەرەکە کرد لێیانبدات، ڕەتی کردەوە، هەڕەشەم لێکرد سزای دەدەم و پلەکەی دادەبەزێنم ئەگەر بەدارلێیان نەدات، بەهێواشی لێی دەدان، دارەکەم لێ وەرگرت و لەعودەیمدا.

ڕۆژێکی تر قوسەی هەڵەیەکی کرد، فەرمانم بەپاسەوانی تایبەتیمدا لەبەندیخانەی

نایبەت زیندانی بکەن.

((کاتێك عودەی یەکێك لەدەستەی هاوەڵم خوالێی خۆشبێت کامل حەنای کوشت، فەرمانی گرتنیم دەرکرد، داوام لەدادوەرکرد بڕیاری دادپەروەرانە بدات، بینیم وەزیری دادو دادگای عێراق لەبەردەممدا شەرم گرتیان، بڕیارمدا لەسێدارەی بدەم، بەلآم دایکی عودەی نوێنەرێکی نارد بۆ لای مەلیك حسێن (خوا لێی خۆش بێت)، ئەوەندەی نەبرد فڕۆکەکەی مەلیك حسێن نیشتەوە، وام بەخەیاڵدا هات سەردانەکەی بۆ ڕاوێژی ئاسایی نێوان برا عەرەبەکان بێت، بەلآم زۆر کتوپڕ بوو داوای لێکردم لەعودەی خۆشبم، مەلیك حسێن سوێندی خوارد ئەگەر داواکەی قبوڵ نەکات ئەوا جارێکی تر سەردانی عێراق ناکاتەوە، ئەوکات بەپێی نەریتی عەرەبی ناچاربووم لەعودەی خۆشبم، بەو مەرجەی خزمانی قوربانی لێی خۆشبن.

ڕۆژێکیان بیستم وەتبانی برام کەوەزیری ناوخۆ بوو، بەشێوەیەکی نابەرپرسانەو نەشیاو هەڵسوکەوتی کردووە، کەلەئوتومبیلەکەی دابەزی بوو، ئەویش لەوکاتەی شۆفێرەکەی لەنیشانەی سووردا وەستاوە، ئەویش دەمانچەی دەرهێناوەو ترافیك لایتەکەی داوەتە بەرگولەو هەمووی شکاندووە، ئەویش لەبەرچاوی ئەو هەموو خەڵکەی لەوێدا بوون، کەلەحاڵەتێکی دەروونی توندابووە، پاش ئەوەی هەواڵەکەم بیست پەیوەندیم پێوەکردو لەو هەڵسوکەوتەی لێم پرسی، وەلآمی دامەوە کەکۆنترۆڵی تووڕەیی خۆی نەکردووە، زۆر بەتوندی داوای لێبوردنی لێکردم، پێم وت(( منیش داوای لێبوردن دەکەم، لەناو سەرکردایەتی ئێمە جێگەی شێت و هەڵەشەی تێدا نابێتەوە، لەم ساتەوە خۆت وابێتە پێشچاو لەشوێنەکەت دەرکراویت، بەمشێوەیە بڕیارم دەرکرد وەتبانی برام لەوەزیری ناوخۆ لاببرێت.

چیرۆکی زۆر هەبووە کەمن لەگەڵ کوڕەکانم و خزمانم توندبووم، من جیاوازی لەنێوان عێراقیەکاندا ناکەم.

((ئەو کاتەی دەمانویست پارێزگارێك بۆ سەلاحەدین دابنێین بەحوکمی ئەوەی خزم و کەسوکارم هەمووی لەوێن، بۆ ئەوەی پارێزگاری ئەو شارە بتوانێت ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکات، دەبێت من پاڵپشتی بکەم پاشان پاڵپشتیم کرد، ڕۆژێکیان پەیوەندی پێوەکردم و پێی وتم یەکێك لەکوڕانی خزمانت ئوتومبێلێکی کەشخەی پێیەو بەهەڵەشەیی لێیدەخوڕێت،

پێم وت: خۆت بچۆرە دەرەوەو ئوتومبیلەکە بسوتێنە یان فەرمان بدە بیسوتێنن)).

کاتێك زانیاریم لەسەر عودەی پێدەگەیشت لەبۆسەدا بووم بۆی، بەئاستێك هەموو دەسەڵاتەکانیم لەزۆر کاروباردا دیاری کرد، ئەوکاتەی عێراق گەمارۆ درابوو بیستم ئوتومبیلێکی زۆری هەیە، هەندێکی دیاری بازرگانان بووە، هەندێکی تری لەهاوڕێکانیەوە، لەیەکێك لەپاسەوانەکانم پرسی شوێنی ئۆتۆمبیلەکانی عودەی لەکوێیە، کەزانیم لەژێر زەمینی هۆڵی ئەنجومەنی نیشتیمانییە، چوومە ئەوێ و هەموویانم سووتاند، ئەو پاسەوانەم وتی بۆ بەسەر گەلدا دابەشی نەکەین، وتم هەر کەسێك ئەو ئۆتۆمبیلانە وەربگرێت لەلایەن عودەیەوە تۆڵەی لێدەکرێتەوە، بەبێ زانیاری من بەڵایەکی بەسەر دێنێت.

ئەوکاتەی عودەی بەرەو ڕووی هەوڵی کوشتن بووەوە لەمەنسور بەخوا من لەڕووداوەکەم نەپرسی، نەمزانی لێکۆڵینەوە دەستی پێکردووە یان نا، کاتێك بەڕێوەبەری هەواڵگری هات هەندێك وردەکاری پێوتم، ئەمە جگە لەوەی لەگەڵ خزمان و خێزاندا لەنەخۆشخانە سەردانمان کرد.

لەبیرمە جارێکیان خزمێکم لەمامۆستایەکی زانکۆی دابوو، کاتێك زانیم هەردوو لام کۆکردەوە، داوام لەدەستەی پارێزەرم کرد سزای بدەن چی لەمامۆستاکەی کردووە واش لەو بکەن.

لێرەدا لەسەرۆکم پرسی ئایا منداڵەکانی لەبڕیاری سیاسیدا هیچ ڕۆڵێکیان هەبووە، وەڵامی دامەوە:

خێزانە بچوکەکەم و کوڕەکانم هیچ ڕۆڵێکی سیاسیان نەبوو، یان لەبڕیاری سیاسیدا بەشداربن، بەڵکو بڕیار ئێمە داماندەناو لەگەڵ هەڤاڵانم دەرمان دەکرد، ڕۆژێك لەڕۆژان ڕای من نەبووەتە بڕیارو دەنگی هەمووانی لەسەربێت، سەرکردە ئەبێت بڕیارو ڕای گشتی خۆیان هەبێت، لەبڕیار دەرکردن دوو دڵ نەبێت، من کەسی دوو دڵم خۆش ناوێت.

# بەشی یانزەیەم

## هەوڵەکانی ئەمریکا
## بۆ شێواندنی وێنەی سەرۆك صەدام حسێن

بەتوانای خواو ژیانی ئێوە تائێسك لەگەڵیان ئەجەنگم

صەدام حسێن لەبەندیخانە

## چەکی کۆکوژی

جیمی کارتەر وتی: داگیرکردنی عێراق بۆ ئەو هۆکارانە نەبوو کەدەرخرا، بەڵکو لەبەرئەوەی صەدام حسێن سی و نۆ موشەکی نا بەئیسرائیلەوە.

هانز بلێکسی پسپۆڕی سویدی لەهەفتەی سێهەمی داگیرکاریدا وتی: من ئەوەندەم بەڵگە هەیە دەیسەلمێنن ئەم جەنگە دەمێکە ڕێوشوێنی بۆ دانراوە، وەك کاردانەوەی پەرەسەندنەکان نەهات، یان بەهۆکاری گەڕانی پشکنەران، بەڵکو ئەگەر چەکی کۆکوژ دەستی لەم جەنگەدا هەبێت ئەوا تەنها بەپلەی چوار دێت لەهۆکارە ڕاستەقینەکان، ئامانجی ڕۆشن بریتییە لەگۆڕینی رژێمی حوکم جائەگەر لەعێراق چەکی کۆکوژ بدۆزرێتەوە یان نەدۆزرێتەوە.

هەروەها شەهادەی دیڤید کی پسپۆڕی ئەمریکی بۆ چەکی کۆکوژ کەبەر لەجەنگ باسی کرد، کی لەگرنگترین ئەندامانی تیمی پشکنین کە ناوی بە خراپە دەرکردبوو، ئەوەی ڕەت کردەوە لەعێراق چەکی کۆکوژی هەبێت.

بەرپرسێکی ئیداری لەلایەنێکی بەرپرسی چەکی کۆکوژ لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئەو درۆیەی ئاشکرا کرد، کەعێراق یۆرانیۆمی لەوڵاتێکی ئەفریقیەوە هاوردە کردبێت، گریگ ئیلمان دەڵێت ئیدارەی ئەمەریکی دەستکاری ڕاپۆرتەکەی سی ئای ئەی کردووە سەبارەت بەعێراق، ئەویش لەپێناو ئامانجەکانی لەعێراق، کەئیدارەکەی لێکۆڵینەوەی لەو دۆسێیەکردووە ئەوەی ئاشکرا کرد، هەموو ئەو دیکۆمێنتانەی پێشکەش بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کراون هەمووی ساختەیە، سەرۆکەکانی لەوەزارەتی دەرەوە بەئاگا هێنایەوە تانەکەونە ناو داوی ساختەکارییەوە.

ئەمریکا پاش ئەوەی صەدام حسێنی دەستگیرکرد ویستی لەڕووی ڕاگەیاندنەوە وێنەی بشێوێنێت، بۆ ئەم مەبەستە هەندێك لەڕۆژناکانی عەرەبی بەکارهێنا، بەمەندە وازی نەهێنا، بەڵکو پاش شەهیدکردنی هەوڵیاندا وێنەکەی بشێوێنن کەزیاترو زیاتر درەوشایەوە، ئەویش لەوکاتەی بەسەر پەیژەی شەهادەت و شکۆدا سەرکەوت دەیویست نامەیەك بگەیەنێتە هەموو عەرەب و پێیان بڵێت: ئائەوە صەدامەکەتانە بێ بەرگری خۆیدا بەدەستەوەو بەئاسانی گیرا، ئەویش لەسەرەتای گرتنیدا کەلەدیمەنێکدا لەناو کونێك دەریدەهێنن و ئەمریکییەکان زۆر بەوردی ئامادەیان کردبوو.

هەوڵی شێواندنی وێنەی سەرۆك بەردەوام بوو، ئەویش بۆ کوشتنی ڕۆحیەتی مەعنەوی گەلی عێراق و بەتایبەتی مقاوەمە، هەروەها گەلانی عەرەب کەصەدام حسێنیان وەك ڕەمزی سەرکردەیەکی موجاهید تەماشا دەکرد، کەهیچیان وەك ئەم نەیتوانی سی و نۆ موشەك بنێت بەئیسرائیلەوە. کەخەڵك لەسەربانیماڵەکانیانەوە تەماشایان دەکرد، بەڵام پتەوی هەڵوێستی لەکاتی دادگایکردنە گاڵتەجارەکەوە، هەروەها توانای بۆ دادگایکردنی جەللادەکانی، سەلماندی ئەم پیاوە زۆر سەرسەختەو هەموو هەوڵەکانیان شکستی خواردو وێنەی لەهەموو جیهاندا درەوشایەوە.

چیف ئارچر (مالکوم لاگوش) ڕۆژنامەنووس و شیکەرەوەی سیاسی ئەمریکی، پرسیارێك دەکات، وەك خۆی دەڵێت ئەمڕۆ گوێی لێناگیرێت بەڵام کاتێك کێشەی عێراق باس دەکرێت زۆر پێویستە، دەپرسێت بۆ کەس وەڵامی ئەو پرسیارانە ناداتەوە، کەهەموو جیهان سەرنجی لەیەك بابەت گرتووە ئەویش دیکتاتۆریەتی صەدام حسێن و مەسەلەی دوجەیلە کەزۆر گەورە کرا، ئەگەرچی بۆش لەوکاتەی حاکمی تەکساس بووە، حوکمی لەسێدارەدانی دەرکردووە، زۆر لەو حوکمانەی دادگای عێراقی لەساڵی (١٩٨٤) بەهەقی تۆمەتباران دەریکردووە، ئارتچ دەپرسێت:

بۆچی نابیستین کەسێك باسی ئەوە بکات کەعێراق ساڵی (١٩٨٢) لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە هەڵبژێردراوە، وەك وڵاتێك نەخوێنەواری تێدا نیە، کەئاستی خوێندن لەساڵی (١٩٧٣)دا لەسەدا چل کەمتر بووە؟

بۆ نابیستین نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی (١٩٨٤) ئەوەی دەرکرد کەسستمی خوێندن لەعێراقدا باشترین سستمی خوێندنە بەگوێرەی وڵاتانی جیهانی سێهەم.

بۆچی نابیستین کەنیویۆرک تایمز ساڵی (١٩٨٧) وتی: عێراق پاریسی خۆرهەلاتی ناوەڕاستە؟

بۆچی باسی سەردانەکانی صەدام حسێن ناکرێت بۆ ماڵی هاولاتیان، نابیستین کەدەچوو بۆ باشوری عێراق لەحەفتاکاندا تابزانێت هەموو ماڵێك بەفرگرەو کارەبای هەیە؟

بۆچی گوێمان لەو ملیۆنان عەرەبە نیە کەدەچوون بۆ عێراق تاکو سوود لەبەرنامەی زەوی وەربگرن، کەبەعسیەکان دایانمەزراند، کەهەر تاکێك پارچە زەویەکی دەدرێتێ بۆ ڕواندنی دانەوێڵە؟

بۆچی گوێمان لەوەنییە کەزاناو دکتۆرەکانی عێراق دەنێردران بۆ وڵاتانی عەرەب بۆ ئەوەی یارمەتی پەرەسەندنی ئەو وڵاتانە بدەن؟

بۆچی ستایشی دەوڵاتانی عەرەب بۆ عێراق نابیستین کەژمارەیەکی زۆری سەربازی لەجەنگی عێراق ئێراندا لێ بوو بەقوربانی، ئەویش بۆ بەرگری لەعەرەب کەدەترسان ئێران هەستێت بەهەناردەی ئوسولیە توندڕەوەکانی بۆ ولاتەکانیان؟

بۆچی ئەوە نابیستین چەندەها دەستپێشخەری ئەمەریکی بۆ صەدام هەبوو لەسالانی نەوەدەکاندا، تەنها ئەوەندە صەدام دان بەئیسرائیلدا بنێت و ڕێگە بەئەمریکا بدات بنکەی سەربازی لەعێراق دابنێت. ئەویش لەبەرامبەر لابردنی گەمارۆی ئابووری؟

ئەی بۆ ئەوە نابیستین کەهەموو ئەندامێکی لیژنەی پشکنینی چەکی کۆکوژی سیخوڕ بووە نەك پشکنەر؟

### هەوڵە پوچەڵەکان:

لەهەوڵێکی نزمی ڕۆژنامەی (سەن)ی بەریتانی کەملیاردێرێکی جولەکەی ئوسترالی (میردۆخ) خاوەنیەتی، دەیویست وێنەی صەدام حسێن بشێوێنێت، کەلەبەرگی یەکەمیدا وێنەیەکی صەدامی بلاوکردەوە کەتەنها جلی ژێرەوەی لەبەردایە، ئەو ڕۆژنامەیە وای هەست دەکرد بلاوکردنەوەی ئەو وێنەیە کاریگەری سلبی لەسەر مقاوەمە دەبێت، بەتایبەتی لەوجۆرە وێنانە سەیرن و پێشتر سەرکردەی هیچ وڵاتێکی جیهان بەو شێوەیە

نیشان نەدراوە.

لەگەڵ سەرۆك باسی ئەم بابەتەم کرد، داوام لێکرد داوا لەسەر ئەو رۆژنامەیە بنووسێت، وتی: چ زیانێکی تێدایە کەپیاوێکی موسوڵمان نوێژ دەکات و جلەکانم بەدەستی خۆم دەشۆم، ئەگەرچی خۆیان خزمەتکارێکی خۆیان داناوە ئەم کارەم بۆ بکات، لەبەرئەوەی من رێگە نادەم جگە لەخۆم کەس جلەکانم بۆ بشوات، تکایە داوای هیچ لەو رۆژنامەیە مەکەن، لەبەر ئەوەی بچوك کردنەوەی ئەو وێنەیە لای من هیچ نییەو هیچ خراپەکارییەکی بۆ من نابێت، ئێمە زۆر لەو خراپکردنانە گەورەترین، هەروەها ئەو بڵاوکردنەوەیە سوودی بۆ ئێمە هەیە، لەبەرئەوەی باجیهان تەماشای دیموکراتیەتی خۆرئاوا بکات چۆن پێشێلکاری بەتایبەتمەندییەکانی مرۆڤ دەکەن، کاتێك مەسەلەیەکی گرنگمان هەیە، نابێت تێروانینی خەڵك و ڕای گشتی بەشتی واوە خەریك بکەین، لەبنەمادا نابێت سەرنجەکان پەرش و بڵاوبکەینەوە، هەروەها من ئەوە ڕەتدەکەمەوە بەناوی منەوە هەر داوایەك یان سکاڵایەك پەیوەندی بەپارەوە هەبێت دەربکرێت.

هەموو ئەوانەی ویستیان خراپە بەرامبەر صەدام حسێنی سەرۆك بکەن ئەویش لەبواری شێواندنی وێنەکەی لەبەرچاوی جیهان، درك بەهەقیقەتی ئەم پیاوە ناکەن، ئەگەر سازشی لەسەر ژیانی بکردایە، ئەوا ئێستا لەپایتەختەکانی جیهاندا لەنیعمەتدا دەژیا، بەڵام ئەو ئاگای لەئامانجی دوژمنەکانیەتی کەپاش داگیرکردنی عێراق هەیانە، ئەوان عێراقیان دەوێت جائەو لەوێ بێت یان نا، جگە لەمە، ویستیان بەوە پشتی بشکێنن کاتێك جەستەی کوڕەکانیان شێواند وەك ئەوەی کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی جیهانی نیشانیدا، من پرسیارێکم لەسەرۆك کرد کەپرسیاری زۆربەی خەڵکە: بۆچی ئەمریکا پاش ناشتنی عودەی و قوسەی و مستەفا بۆ ماوەی چەند رۆژێك دەوری گۆڕستانەکەیاندا؟

وەڵامی دامەوە:

یەکێك لەپروپاگەندەکان دەڵێن ئەوانەی لەرۆژی ٢٠٠٣/٧/٢٢ دا شەهیدبوون کوڕەکانی من نین، واتە رۆحی جیهادی لەواندا ڕەتدەکەنەوە ئەویشیان هەوڵێکی تری شێواندنە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە هێزی ئەمریکی مۆمی لەسەر دەموچاوو بەشێك لەجەستەیان داناوە تاکو خەڵك گومڕا بکەن و منیش لەگەڵیاندا، ئەوانە کوڕەکانم بوون، ئەمەش بۆ ئەوەی کاریگەری سلبی لەسەر من و مقاوەمە دابنێت، بەڵام گەمارۆدانی گۆڕستانەکە بۆ

ئەوە بوو کەمن دەچمە سەر گۆڕەکەیان و لەوێ فاتیحایەك دادەدەم و ئەوکات دەتوانن بمگرن.

((پێشتر هەوڵیانداوە وێنەی زۆر سەرکردە بشێوێنن، لەوانە سەرۆك جمال عەبدول ناسر خوالێی خۆشبێت، هەوڵیاندا زۆر خراپەی بەرامبەر بەکار بێنن، بەڵام وێنەکەی هەر بەدرەوشاوەیی مایەوە، لەبەرئەوەی گەلی عەرەبی ووشیارە دەزانێت پیاوانی هەقیقی کامانەن.

کاتێك ئەوەم بۆ سەرۆك گێڕایەوە کەئەمریکییەکان ویستوویانە ئابڕووی دکتۆر ناجی سەبری ئەلحەدیسی لەکەدار بکەن، وەزیری دەرەوەی شەرعی عێراق، بەپارێزەرەکانی وت:

تەماشای مامۆستا خەلیل بکەن چۆن بۆ کوڕی پارێزگاکەی دەمارگیرە پاشان ئاوڕی بۆ دامەوەو پێی وتم ((سلاَو لەعەلی ناجی بکەو پێی بڵێ گوێ نەداتێ متمانەی ئێمە بەئەو لەترۆپکدایەو ئەو زۆر لەقسەی پڕوپوچی ئەوان گەورەترە، ئەمەیان پڕوپاگەندەیەکی دروستکراوە دژی پیاوێکی نیشتیمانی.

## درۆکانی ئەمریکا

درۆکانی ئەمریکا لەدژی سەرۆك صەدام حسێن بەردەوام بوو، لەکانونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەی ڕاگەیاند بەشێوەیەکی فەرمی گەڕان بەدوای چەکی کۆکوژیدا ڕادەگرێت لەعێراق، ئەمەش وای لەسکۆت ڕیتەر کرد کەسەرۆکی پێشووی تیمی پشکنەران بوو بۆ چەکی کۆکوژی لەعێراق ڕایبگەیێنێت کەوا بڕیارە کۆتایی بەناشرینترین کردەی خەڵەتاندنی نێودەوڵەتی لەچاخی نوێدا دانا، ڕیتەر داگیرکردنی عێراق بەقێزەونترین تاوان چواند کەتاکو ئێستا ئەنجام درابێت.

لاگوش لەوتارێکیدا باس لەوە دەکات (جار لەدوای جار ئەوە بۆ عێراقییەکان دەسەلمێن کەصەدام باشترینە (٢٥-٢٦ /شوبات/ ٢٠٠٥) درۆکانی ئەمرکا کەڕەواجی پێدا بۆ شێواندنی وێنەی سەرۆك، هەروەها بەهانە بۆ داگیرکردنی عێراق دێنێتەوە دەڵێت:

لەساڵی (٢٠٠٣)دا ئەمریکا ئەوە ڕادەگەیەنێت کەگۆڕێکی بەکۆمەڵی لەباشوری عێراق دۆزیوەتەوە جەستەی چوارسەد هەزار عێراقی تێدایە، بەڵام تۆنی بلێر دواتر ڕایگەیاند ژمارەکە دەگاتە پێنج هەزار، زۆربەیان ئەو سەربازانەن ساڵی (١٩٩١) ئەمریکا کوشتوونی

لەشەڕی گەردەلولی بیابان هەروەها لاگۆش ئەو ڕستانە دووبارە دەکاتەوە کەپێشتر وتراون، وەك (صەدام لەدژی گەلەکەی گازی ژەهراوی بەکارهێناوە)... دەڵێت کوردەکان لەهەڵەبجە بەگازی ژەهراوی ئێران کوژراون، ئەمەش هەقیقەتێکە سی نای ئەی ئەمریکی ساڵی (١٩٨٨) دۆزییەوەو ئاشکرای کرد، پاشان ساڵی (٢٠٠٤) جەخت لەوەکرایەوە کەئێران گازی ژەهراوی دژی کوردەکان بەکارهێناوە. هەروەها زیاتر دەڵێت، کەرێکخراوی مافی مرۆڤ ئەوەی باس کردووە کەهێزەکانی عێراق لەهەڵمەتی ئەنفالدا سەدو هەشتاو دووهەزار کەسی کوشتووە کەزۆربەی زۆریان کوردن، بەڵام دواتر دانی بەوەدانا ئەوان بوونە قوربانی درۆیەك ئەمریکا ڕەواجی پێدا کە ئەو ڕێکخراوە دواتر هیچ جەستەیکی نەدۆزیوەتەوە.

## زنجیرەی درۆکان بەردەوام دەبێت

((چیرۆکی گەڕان بەدوای چەکدا))

سەرۆك چیرۆکی گەڕان بەدوای چەکی کۆکوژیدا دەگێڕێتەوەو ڕۆڵی پشکنەران بۆ پێشێلکاری بەرامبەر دەوڵەتی عێراق و تێکشکاندنی هێزەکەی و توانا سەربازی و تەکنەلۆژییەکانی، دەڵێت: پاش هێرشی (٣٠) وڵاتی بۆ سەر عێراق، ئەمریکاو بەریتانیاو هاوپەیمانەکانی بەرنامەیەکی ناجۆریان بۆ کوشتنی خولیای عێراقییەکان دانا، تاکو نزمترین ئاستی زانستیان نەبێت، تاکو بوونیادی دەوڵەتێکی بەهێزی سەربەخۆ نەنێن و یارمەتی ڕاگرتنی هاوسەنگی هەرێمی و نێو دەوڵەتی بدەن، هەموو بەرنامەکانی عێراق بەدەستی هێنابوو تێکیان شکاند، هەروەها وەك خۆیان دەیانووت عێراق دەبێت خاڵی بێت لەچەکی کیمیایی و بایۆلۆژی وەك خۆیان دەڵێن چەکی کۆکوژی لەگەڵ هەموو ئەو بڕیارانەی بۆ کەرتەکانی عێراق دەرمانبڕییبوو بۆ ئاسانکاری تیمەکانی پشکنین، تابەئاسانی بگەنە هەموو ئەو شوێنانەی دەیانەوێت بیپشکنن، ئەویش بۆ سەلماندنی نیاز پاکیمان، ئەویش لەوەی کەتەواو دڵنیابووین کەهیچ چەکێکمان نییە ڕێگەی پێنەدرابێت، بەڵام لەبەرئەوەی پشکنەران سیخوڕ بوون و پیاوی موخابەراتی ئەمریکا بوون، هەستان بەدروستکردنی قەیران و گرفتی هەمەجۆر، هەوڵیاندا زۆر ئیستفزازمان بکەن، سەروەری عێراقیان پێشێلکرد، هەموو ئەمانە بۆ پێدانی بەهانەیەك تائەمریکا بۆمبارانمان بکات و دەستدرێژیمان بکاتە سەر، هەندێکیان لەگەڵ عێراق بەئینساف بوون هەقیقەتیان وت،

بەڵام لێدوانەکانی ئەویان فەرامۆش کرد، کەئەویش سکۆت ڕیتەر بوو، نیەتی ئەمریکا لێدان و کاولکردنی عێراق بوو، ئەگەر ئەمریکا بیزانیایە عێراق چەکی کۆکوژی هەیە، ئەوا هەرگیز نەیدەوێرا دەستدرێژی بکاتە سەری.

چەند ئەمریکییەك کەسەر بەموخابەراتی ئەمریکی بوون ماوەی شەش بۆ حەوت مانگ لێکۆڵینەوەیان لێکردم، ئەویش پێش یەکەم سەردانی تۆ، هەموو پرسیارەکانیان سەبارەت بەچەکی کۆکوژی بوو، چیم لێکرد بۆ کوێم برد، ئایا لەسوریا شاردوومەتەوە، پێم وتن: ئێوە دەزانن عێراق ئەو جۆرە چەکەی نییە، لەوە دڵنیام کردنەوە کەدەرفەتمان دانێ هەستان بەپشکنینی تەواو، ئەوان دەهاتن و دەچوون، هەموو ئامانجمان ئەوەبوو لەوە دڵنیایان بکەینەوە ئێمە ڕاستگۆین لەقسەو پەیمان و وابەستە بوونمانە بەکۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە، پێم وتن: دەبێت ئەمریکا لەوە تێبگات عێراق دراوسێیەکی دوژمنی دڕی هەیە، ئەویش ئێرانەو خاوەنی توانای سەربازی و بەشەری و ماددی گەورەیە، لەوکاتەی ئێوە گەمارۆی ئابووریتان لەسەر عێراق دانابوو بۆ زیاتر لەسیانزە ساڵ دەترساین ئێران هێرش بۆ عێراق بهێنێت لەژێر سایەی ئەو گەمارۆ دڕندانەیەدا. ئەمە جگە لەوەی ئاسمانی عێراقتان دابەش کردبوو بەپێی هێڵی پانی و درێژی بەزاڵمانە بەسەر عێراقدا سەپاندبووتان پاشان لێکۆڵەرەکان تانکێکی بەریتانیان نیشاندام کۆمەڵێك منداڵی عێراقی بەسەرەوە بوو، وتیان: تۆ ئەو منداڵانەت وەك لەمپەری مرۆیی بەکارهێناوە، ئەمانەش پێچەوانەی یاسایە.

کەسەرنجم لەتانکەکەدا بینیم تانکەکە بەریتانیە نەك عێراقی، هەستابوون بەساختە کردنی وێنەکە، تاکو وێنەی من لەبەرچاوی جیهان ناشرین بکەن[٧]

هەروەها بەردەوام لێیان دەپرسیم لەبەرچی سی و نۆ موشەکت بەئیسرائیلەوە نا، کەوڵاتێکە هەڕەشەی لێنەکردوون، وتم: ئیسرائیل قەوارەیەکی مەسخە، ئێوە دروستتان

[٧] لاگۆش لەو وتارەی لەسەر پێگەی خۆی (١١-١٢ /ئازاری/٢٠٠٥) بڵاوی کردەوە ئاماژە بەوە دەکات بەناونیشانی (سەدام حسێن و هەقیقەت) وێنەیەك لەسەر ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە وەك بانگەشەیەکی گەورە، کەبریتین لەکۆمەڵێك سەربازی ئەمریکی لەنزیك بینایەکی عێراقیەوە وەستاون و وێنەی تەقینەوەکەی سەنتەری بازرگانی جیهانی لەسەرە، ئامانج لێی ئەوەیە عێراقیەکان ڕووداوی (١١)ی سێپتەمبەریان پێ خۆشبووە. لاگۆش دەڵێت: تەماشام کرد سەربازەکان لەسەر بنکەی یاریگایەکی بیسبۆڵ وەستاون، لەعێراق یاریگای بیسبۆڵی لێنیە، هەروەها درەختەکان لەوجۆرانەن کەزیاتر لەناوچەکانی باشوری خۆرهەلاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان هەیە، کەلەهیچ وێنەیەکی عێراقدا نەمبینیوە، وێنەکە ساختە بوو بەڵام ئازارەکە بەرجەستەکرا.

کردووە، ئەو قەوارە پیسەش هەمیشە نەهامەتی بۆ ناوچەکە دێنێت، پاشان لێیان پرسیم لەبەرچی پاڵپشتی فەلەستینت دەکردو پارەت بۆ دەناردن، هەروەها بۆچی هەر تیرۆریستێکی فەلەستینی ئەگەر خۆی بتەقێنێتەوە پانزە هەزار دۆلارت دەدایە؟ وتم: توانا ماددی و مرۆییەکانی عێراق لەخزمەتی مەسەلەی نەتەوەدایە، لەپێشەوەی هەموویان مەسەلەی فەلەستین، ئەو پاڵەوانانەی خۆیان دەتەقێننەوە بەڕووی دوژمنی زایۆنیزمدا پاڵەوانی شەهیدن نەك خۆکوژ، پاشان پرسیاری ئەو ژمارە زۆرەی هێزی چەکدارو سوپای قودسی لێکردم، پێم وتن: ئاینی ئیسلامی پیرۆزمان فەرمانمان پێدەکات کەخۆمان بۆ دوژمنان ئامادە بکەین و هێز کۆبکەینەوەو ڕەشمەی ئەسپمان بەدەستەوە بێت.

پرسیاری زۆریان ئاراستە کردم لەماوەی ئەم چەند مانگەدا، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ دوژمنکارییان بۆ عێراق، کەئامانج و ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی هەیە لەپێناو بەرژەوەندی ئیسرائیل و بەرژەوەندی ئابووری خۆیان.

## ((هەوڵدان بۆ وێڵکردنی سەرۆك))

ئەمریکییەکان ویستیان سەرۆك بەوە وێڵ بکەن، کەزیاد لەپێویست گرنگیان پێدەدا، ئەویش پاش ئەوەی سەرپەرشتی پزیشکییان بۆ چڕ کردەوە، هەروەها لەسەفەویەکانیان پاراست لەناو زینداندا، هەندێکجاریش لەکاتی دادگایی، ئەمە جگە لەوەی ڕێگایاندا وەرزش بکات، پاسکیلێکی جێگیریان بۆ هێناو گرنگیان بەپلەی گەرمای ژوورەکەیدا. کاتێك بەتەنها دەبووین ئەم قسانەی بۆ دەکردم.

پاشان لەسەرەتای گرتنیدا، خەڵەتاندیان کەپاسەوانەکان لەدەوری هەن و جلی مارێنزیان لەبەردایە، لەڕاستیدا ئەوانە فەرماندەی دەزگای سی ئای ئەی بوون، مامەڵەیان لەگەڵ سەرۆکدا لەنێوان توندو نەرمیدا بووە، هەندێکجاریش بە ناوی ڤی ئای سی بانگیان دەکرد، کاتێك دەربارەی ئەو ناوە پرسی مەبەستت چیە لەو گوزارەیە وتیان: (importantcriminal) واتە تاوانبارێکی زۆر گرنگ، سەرۆك دەڵێت:

((پرسیاری زۆریان لێدەکردم، هەندێکیان پرسیاری زیرەکانە بوون، لەنێوان من و ئەواندا قسەو باسی چڕی لەسەر دروست دەبوو. بەهەندێك ئاگاییەوە مامەڵەم لەگەڵ دەکردن، هەستم دەکرد ئەم پرسیارانە لەلایەن سی ئای ئەیەوە داڕێژراوە لەگەڵ ئێف بی

ئای، ئەویش لەلایەن ئەو لێکۆڵەرەوانەی ماوەی حەوت مانگ بۆ لێکۆڵینەوەی بەردەوام لەگەڵ من لەزیندان مانەوە، بەڵام ئەوەیان بیرچوو ئەمجۆرە پرسیارانە لای من هیچ وەڵامێکی نییە)).

کاتێك لێم پرسی باوەڕی وابوو ئەوانە تەنها سەربازو ئەفسەری مارێنزبن، بەپێکەنینەوە وەڵامی دامەوە (ئەبو عەلا) هەقی ئەوانەت نەبێت، ئەمە ئیشی خۆمانە، من بەهەموو گەمەکانیان هۆشیارم. بەڵام ئەوەی یەکێك لەلێکۆڵەرەوە ئەمریکییەکان وتی:[٨] کەسەرۆك داوای لێکردووە لەگەڵ سستەرەکەدا قسە بکات کەسەرپەرشتی پزیشکی دەکرد. ئەم قسەیە تەواونیە، ئەوانەی لەسەرۆکەوە نزیکن، دەزانن کەسێکی خاوەن نوکتەیەو کەسێتییەکی خۆشمەحشەرەو حەزی لێیە گاڵتەوگەپ لەگەڵ هەمووان بکات، ئەمە جگە لەوەی ڕێز لەهەموو ئەوکەسانە دەگرێت، کەلەدەوروبەری دەژین، تەنانەت سەربازو ئەفسەرەکان و پاسەوانەکان، دەیوت: ((من ڕێز لەمرۆڤبوونیان دەگرم، ئەوانە ئەرکیان پێدراوە، ئەوانیش هەر ئەوەندەیان لەسەرە ئەرکی خۆیان جێبەجێ بکەن))[٩]

سەبارەت بەهەوڵی کوشتنی لەناو بەندیخانەدا، سەرۆك دەیوت ((ئەبو عەلا، کوڕم ئەگەر ئەمریکییەکان بیانویستایە بمکوژن، هەریەکەم ساتی گرتم دەیانکوشتم، بەڵام ئەوان دەیانەوێت بەزیندوویی بمهێڵنەوە، تاکو ئێران و بەکرێگیراوەکانی لەحکومەتێکی دیاریکراو پێ بترسێنن))

## (شێواندنی وێنەی سەرۆك)

---

[٨] دەبێت ئاماژە بەوە بدەین، ئەو کەسەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ سەرۆك سەدام حسێن کردووە، جۆرج بیرۆیە لێکۆڵەرە لەنوسینگەی لێکۆڵیاری فیدڕاڵی ئێف بی ئای، هەوڵیداوە وێنەی سەرۆك بشێوێنێت ئەویش لەو کتێبەی ڕۆژنامەنووس رۆناڵد کێد دەریکرد زمانی عەرەبی باش دەزانێ، لەبەرئەوەی لەبەیروت لەدایك بووە لەخێزانێکی عەرەبییە ئەویش بەرلەوەی خێزانەکەی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆچ بکات.

[٩] سەلاح موختار دەڵێت ((چاوەڕێی ئەوەمان دەکرد هەڵمەتێك بۆ بەشەیتانکردنی سەرۆك سەدام حسێن بەڕێ بخەن، بەراستیش سی ئای ئەی وتی کەشەهید یاداشتەکانی خۆی ناردووەتە دەرێ بۆ کەسێکی تر جگە لەپارێزەرەکەی، ئەمە پروپاگەندەیەو درۆیە، لەبەرئەوەی شەهید هەموو قسەکانی تەنیا بۆ پارێزەرەکانی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەشمان دەخوێنەوە کەهەندێك ئەفسەرو پاسەوانی سەرۆك باسیان لەوە دەکرد کەچیرۆکی هەڵبەستراویان دەربارەی ژن و شتی وا دەهۆنیەوە، بەخێرایی ڕۆژنامەو کەناڵە ئاسمانیەکان ئەو درۆیانەیان بڵاو دەکردەوە، کەخۆشیان هەندێکیان پێوە دەنا چۆن سی ئای ئەی مارێنزەکان بۆ ڕاگەیاندن بەکاردەهێنێت)) پێگەی (التجد العرب).

زنجیرەی شێواندنی وێنەی سەرۆك بەردەوامە، لەدووتوێی ئەم زنجیرەیەدا، هەندێك لایەن لەگەڵ هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بەکرێگیراو باسی ئەوە دەکەن گوایە صەدام حسێن لەگەڵ سی ئای ئەی پەیوەندی هەبووە !

سەرۆك زۆر پێکەنی و وتی:

((ئەم پڕوپاگەندانە پێویست بەوەلامدانەوە ناکات، وەك هەمووان دەزانن، ئێمە بەشێکین لەگەل، ئەو گەلەی لەویژدان و ناخماندا دەژی، من بەهۆی خەبات و کاری ئەوساوە خەباتکاربووم، کاتێك فەرمانی حیزبم جیبەجێ کردو لەلێدانی عەبدول کەریم قاسم بەشداریم کرد، ناچار بووم بچمە قاهیرەو بچمە کۆلێژ، ئەگەر پەیوەندیم بەئەمریکاو باڵیۆزخانەکانیەوە هەبووایە، ئەوا یەکەمجار موخابەراتی ئەو دەوڵەتە ئابرووی دەبردین کەتێیدا بووین، ئەوەی دوژمنان ئەم کارتەیان بەسە بەکاری بهێنن بۆ ئەوەی فرۆکەو تانکەکانیان بهێنن، جیهان بکەن بەگژماندا، ئەگەر پەیوەندیم بە سی ئای ئەیەوە هەبوایە ئەوەی وادەڵێت سەری بدات لەبەرد، ئەوا ماوەی جەنگی عێراق و ئێرانیان درێژ نەدەکردەوە، ئەوا ساڵی (١٩٩١)و ساڵی (١٩٩٨)و ساڵی (٢٠٠٣) هێرشیان نەدەکردە سەرمان، ئەوا ئەوکات ئێمە هەڵدەستاین بەپاراستنی بەرژەوەندییە نامەشروعەکانیان لەم ناوچەیە.

ئەمریکا کاتێك دەیەوێت سەرۆکێك یان سەرکردەیەك بڕوخێنن، تەنانەت کەسانی ئاسایی، ئەوا ڕایاندەکێشن تاکو دەست لەگەڵ دەزگا سیخوڕییەکاندا تێکەڵ بکەن، لەقۆناغێکدا هەندێك دەستکەوت بەدەست دێنن، دواتر پاش ئەوەی ئابڕووی دەبەن دەیڕوخێنن و ئەویش تەنها بەهۆی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، نەك تانك و فرۆکە، ئەگەر ئێمە پەیوەندیمان پێوەیان هەبوایە، ئەوا ئەوەی ڕوویدا، ڕووینەدەدا. سوپاس بۆ خوا بەدەستی پاکەوە دەچینە حزوری خالیق، ئەمەیان بردنەوەیە.

### مۆساد لێکۆڵینەوە لەگەڵ پارێزەری سەرۆك دەکات:

لەماوەی پێشوو، لەکاتی دانیشتنەکانی لێکۆڵینەوەو پاش ئەویش من تاکە پارێزەر بووم کەوەکالەتی بەرگریکردنم لەسەرۆك صەدام حسێن هەبوو، دانیشتنی دادگایی یەکەم ڕۆژی (٢٠٠٥/١٠/١٩) دەست پێدەکات ڕۆژی (٢٠٠٥/١٠/١٧) کاپتن مایکل ماکۆی بەرپرسی

دابینکردنی پاراستنی کەسێتی بۆ خۆم و هاوڕێ پارێزەرەکانی ترم بۆ گیراوەکانی تر پەیوەندی پێوەکردم، سەرۆکی نووسینگەی (پەیوەندیکاری ئەمریکییە) کەجوڵەی ئێمە لەفرۆکەخانەو گەڕانەوە بۆ فرۆکەخانە ڕێکدەخات. هەروەها چاوپێکەوتن لەگەڵ صەدام و دواتر بۆ دادگا، هەموو پەیوەندیەکانمان بەشێوەی پۆست بوو، نزیکەی کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ پەیوەندی پێوەکردم، ئەویش بەهۆی کچە وەرگێڕێکی ئەمریکی کەبەئەسڵ عێراقییە، داوای لێکردم لەخاڵێکی دیاریکراودا لەکاتژمێر هەشتی بەیانی ئامادەبم، داوام لێکردبوون چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆک بکەم، وامزانی هۆکاری چاوپێکەوتن بۆ ئەم کارەیە.

پاش نیوە شەو بەکەمێك، لەسەربان لەگەڵ منداڵەکانم خەوتبووین کەش و هەوا هێشتا گەرم بوو، بەتایبەتی لەئەنبار کارەباش ئەوە هەر نییە، دەنگی زرێپۆش و تانك و ئامێری ئەمریکی تر دەهات و کۆپتەر بەئاسمانەوە بوو لەجۆری (بلاك هۆك و ئاپاچی) لەئێمە نزیك دەبێتەوە، گەمارۆی ماڵەکەیاندام بەتیرەی نزیکەی پەنجا مەتر، دەوری ماڵی براو مامەکانمیاندا، دەمتوانی بەسەرسەربانەکەدا بڕۆم، لەناکاو ڕووناکی تانکەکانیان تێکردم و گوێم لەهاوارێك بوو داوای لێکردم دووربکەومەوە ئەگینا دەمکوژن، خانووەکەمیان دایە بەردەسترێژ، داوام لەماڵ و منداڵ کرد بچنە خوارێ، لەشوێنی خۆم مامەوە چاوەڕێی بارودۆخەکەم دەکرد، ئەوەی تووشی دڵەڕاوکێی کردم مەوعیدەکەی سبەینێ بوو لەگەڵ سەرۆك و ڕێگەی بەغداد بگیرێت، کەناچاربم ڕێگای (سەرسار) بگرمەبەر، کەئەوکات دەبێت لەبری (٩٠)کم زیاتر لە(٣٠٠)کم ببڕم، ئەوا دەبێت بەناچاری کاتژمێر چوارونیوی بەیانی بکەومە ڕێ، بەڵام چۆن لەم نەهامەتییە ڕزگارم بێت و لەو ئەڵقە خۆم دەربازبکەم، کەهەموویان جگە لەزمانی هێزی هیچی تر نازانن.

بۆم دەرکەوت لەم پێکدادانەدا من مەبەست نیم، بەڵکو یەکێك لەبراکانم و هەندێك لەئامۆزاکانم، ئەویش بەهۆی خەبەرلێدانیان لەلایەن بەکرێگیراوێکەوە، توانیان پیرەمێردێك و کوڕەکانی بەرن و هەرچیشیان توانی دزیان، لەچواری بەیانیدا هێزەکانیان پاشەکشە پێکرد، تائەو کاتە چاودێریمان دەکردن، خۆم پێچایەوە لەگەڵ پاسەوانەکانم لەکوڕەمام و براکانم بەڕێ کەوتین، لەماڵەوە هەندێك پیاوم بەجێ هێشت لەوانەی لەبەغداد دەمپارێزن، ئەویش لەترسی ئەوەی نەکا ئەوانیش هەواڵیان لەسەر درابێ و بگیرێن، زۆر بەهێواشی ئۆتۆمبیلەکەم لێدەخوڕی، دەبوایە چەند لەمپەرێك ببڕم، ئەویش بەهۆی بوونی دوو

ئۆتۆمبێلی هامفی کە بۆ بێزارکردنی خەڵك بەهێواشی دەڕۆیشتن، سەبرم گرت لەبەرئەوەی ئەرکەکەم پێویستی بەوە بوو، لەوکاتەدا کابتن تەلەفۆنی کردو وتی: کاتەکە بۆ دوانزەی نیوەڕۆ دواخراوە، سەرم سوڕما، ئایا ئەو هەموو ماوەیەی بڕیومە بگەڕێمەوە، یان بەرەو بەغداد بکەومە ڕێ، لەوێش دەترسم میلیشیاکان دەستەی پارێزەرانم لەپاسەوانان بفڕێنن، کەمێك خۆمان دواخست و زۆربەخاوی دەڕۆیشتین، پاشان لەناوچەی عامریە چاوەڕوان بووین لەنزیك دەوریەی ئەمریکییەکان.

لەکات و شوێنی دیاریکراودا ئۆتۆمبیلەکەم لەنێوان شەش ئۆتۆمبیلی هامفی ئەمەریکیدا بۆ هاوەڵیم دەڕۆیشتن، گەیشتینە بنکەیەکی سەربازی ئەمریکی گەورە لەفرۆکەخانە، کەتەنها ئەمریکی لێیە، ئۆتۆمبیلەکەم جێ هێشت و سواری ئامێرێکی سەربازی وێڵکەری ئەمریکی بووم لەنێو پاسەوانیەتێکی توندا، پاش چل و پێنج خولەك ئامێرەکە وەستا، زانیم کاتی سەردانی سەرۆك هاتووە.

هاتنی سەرۆك تاکاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ دواکەوت ئەویش بەهۆی ئەو هەموو کارەخەڵەتێنەرانەی ئەنجامیان دابوو، بۆ پاراستنی سەلامەتی ژیانی، سبەینێ یەکەم دانیشتنی دادگایی دەست پێدەکات.

سەرۆك زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم و پرسیاری تەندروستی لێکردم لەگەڵ عێراقییە خۆڕاگرەکان و ئەو پیاوانەی لەگەڵمدا هاتوون تاسنووری فرۆکەخانە، ئەوکات لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا بووین، ئەمریکیەکان داوایان لێکردین کاتژمێر حەوتی ئێوارە نان بخۆین، زۆر دوو دڵی تیمی پاسەوانەکانم بووم.

ئاوم خواردەوەو نان خواردنەکەم ڕەتکردەوە، بەرلەوەی بڕۆم، داوام لەئەمریکییەکان کرد سەرتاشێك بۆ سەرۆك بهێنن، لەبەرئەوەی سبەینێ دادگایکردنە، زۆر سووربووم لەسەر ئەوەی سەرۆك بەوێنەیەك دەربکەوێت شایستەی بێت، هەروەها خاتوون دایکی عودەی تەلەفونی بۆ کردم پێی ڕاگەیاندم دەبێت زۆر ئاگام لەسەرو ریش چاکردنی سەرۆك بێت، کاتێك کۆمەڵێك بەجلوبەرگی مەدەنیەوە هاتن و ڕیشی کەمیان هەبوو، هەموو باڵابەرز بوون، لەناکاو منیان برد، بەبێ ئەوەی پێشتر پێم بڵێن وتیان: فەرموو لەگەڵمان وەرە بالەهەموو لایەکەوە وێنەت بگرین، پشکنینی وردیان بۆ پەنجەو دەست و چاوم کرد کێش و درێژیان پێوام و چەندی تر، جگە لەمانە وتیان سەد پرسیارت لێدەکەین بەووردی

وەڵاممان بدەرەوە وتیان: ئەمەیان کارێکی ڕۆتینە، پاشان دەستیان کرد بەپرسیارکردن، کەلەسەد تێپەڕی کرد، دەبوایە وەڵامی هەموو پرسیارو شیکردنەوەکانیان بدەمەوە، هەر گومانێکیان لەوەڵامەکان هەبوو ئەوا ناهێڵن بچمە ناو هۆڵی دادگا.

کاتژمێر نزیکەی هەشت و نیو بوو، بیرم هەر لای دەستەی پاسەوانەکانم بوو، ئەگەرچی لەئازایەتیان دڵنیابووم و چەکیشیان پێبوو، ئەمە جگە لەدەمانچەکەی خۆم و کلاشنکۆفەکەم، کەدوو مەخزەنی لەسەرەو (٧٠)فیشەکی تێدایە کەبەشێوەی پێچەوانەوە پێکەوەم بەستوون بۆ هەر حاڵەتێکی لەناکاو، بەرلەوەی بێمە ناوچەی سورەوە لای پاسەوانەکانم دامنابوو (لای پەیکەری عەباسی کوڕی فرناس)، پاشان پشکنینی پێویستیم کرد، ئەوان کەئەندامی سی ئای ئەی بوون بردمیانە نووسینگەیەکی تر، ئەوان لەدەرەوەی نووسینگەکەمانەوە، لەوێدا دوو کەس و وەرگێڕێك پێشوازیان لێکردم، یەکێکیان کورتە باڵا بوو، بەزمانێکی ئینگلیزی خراپ قسەی دەکرد لەکنەکەی زیاتر لەعەرەبیەوە نزیك بوو، وەرگێڕەکە زانیارییەکانی نێوان ئەو دوو کەسەی دەگواستەوە، سەرەتا بەشێوەی موجامەلە پرسیاریان لێکردم، وایانزانی من دەترسم، بەڵکو لەڕاستیدا دڵەڕاوکێی ئەوەم بوو کەچۆن کتوپڕ تووشی ئەم حاڵەتە بووم، ئەوەی گومانی زیادکردم ئەمانە پیاوی شارۆن بن، هەموو ئاماژەکان ئەوەیان دەردەخست کەیەکەی ئیسرائیلی لەجەنگی عێراقدا بەشداری کردبێت، سەرەتا هەر لەفرقەی سەربازی بۆگەنەوە، کەهەر خۆی ناوەکەی وابوو، کە بۆ لەناوبردنی پیاوانی ئازای ئەنبار هێنابوویان، هەموو هەستەکانم چوونە حاڵەتی ئاگابیەوە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری ئەو ئیسرائیلیە، کەلەوە دڵنیا بووم ئەمیان سەر بەمۆسادە، بۆم دەرکەوت هەموو ئەوانەی لەم بەشەو بەشە تایبەتیەکانی وەڵام وەرگرتن کاردەکەن ئەندامی مۆسادن، پرسیارەکانیان نائاسایی بوو، دەربارەی خزمانی زۆر دوورم بوون، یەکێك لەو پرسیارانەی دەیانووسیت وەڵامی وەربگرن دەربارەی ئەو (٣٦) ملیار دۆلارەیە کەهەست دەکەن سەرۆك هەیەتی و لەبانکەکان بەناوی وەهمیەوە دایناوە.

کاتژمێر دەی شەو هاتمە دەرێ، ژنە سەرکردەی بنکەی بەندیخانە ئەمریکیەکە سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆی بمگەیەنێت، بینیم هەموو پاسەوانەکانم چاوەڕێم دەکەن، ناچاربووم ئەوشەوە لەبەغداد بمێنمەوە، بەڵام لەکوێ لەناو ئەو هەموو دڕندەیەدا، چووینە ماڵی هاوڕێی یەکێك لەوانەی لەگەڵمدا بوون، ئەویش پاش ئەوەی چەندەها لاڕێمان کرد،

ماڵەکەی لەشوێنێکدا بوو هەمیشە دەنگی کۆپتەری ئەمریکی لێوە دەهات، یەك کاتژمێر خەوتم، بەیانی هەستام پیاوەکانم بۆ ناوچەی سەوز ئامادەبوون.

## بۆ دانیشتنی یەکەمی دادگا.

## سەردانەکانی وەزیرەکانی داگیرکەر

لەساڵی (٢٠٠٥)وە، سەردانم بۆ سەرۆك زیادی کرد، قسەکانمان لەسەر عێراق و گەلی عێراق و مقاوەمەو ئەو حکومەتەی داگیرکەر دایمەزراندبوو پەلی کێشا، هەندێکجار لەقسەکانیدا بۆ وردەکاری زۆر ورد دەچوو، من ئەوکات تاکە پارێزەرێك بووم کەسەردانیم دەکرد، واتە تاکە پەیوەندی بەجیهانی دەرەوەی (لەدەرەوەی بەندیخانەیە) لەبواری ئەوەوە بوو کەمن بۆ زیندان دەمگواستەوە، لێم پرسی جگە لەمن کەس لەخاچی سوور سەردانی کردوویت، وتی:

هەندێك لەوانەی بەخۆیان دەوت وەزیر هاتن بۆ سەردانم، نایانناسم لەبەرئەوەی نازانم لەدەرەوەی بەندیخانە چی ڕوو دەدات، یەکەم جار کەسێك هات بۆ لام وتی: من وەزیری مافی مرۆڤم، لەگەڵ ئەوەی دەیوویست قسەم لەگەڵدا بکات، بەڵام شێوەی مامەڵەکردنەکەی لەگەڵم نەشیاو بوو، منیش پشتم تێکردو وێڵم کرد، ئەویش ناچار بوو بەپەلە بڕوات، لەسەرۆکم پرسی (ئایا بەختیار ئەمین بوو)؟[10] بەڵێ ناوەکەی خۆی واناساند.

سەرۆك قسەکانی تەواو دەکات.

((پاش ئەوە بەهەفتەیەك یان زیاتر دووکەس هاتنە لام و یەکێکیان لەگەلی کورد بوو، وابزانم ناوی ئیبراهیم بوو)) بەسەرۆکم وتو ناوەکەم بۆ ڕاست کردەوە، ئایا ناوی بەرهەم ساڵح بوو[11] وتی ((بەڵێ بەڵام نازانم وەزیری چی بوو، ئەوی تریان وەك وەزیرێك لەخێزانی نەقیب خۆی پێشکەش کرد، بەشێوەیەکی ئیستفزازی مامەڵەیان لەگەڵ کردم،

---

[10] بەختیار ئەمین کوردێکی سویدیە مێردی خاتوو صفیە سهیلەی سکرتێری حاکمی ئیستعماری ئەمریکی مەدەنی پۆل بریمەر بووە، ئێستا ئەندامی ئە نجومەنی نوێنەرانی داگیرکەرە.

[11] بەرهەم ئەحمەد صالح جێگری بەرێز جەلال تاڵەبانیەو یەکێکە لەسەرکردەکانی پێشمەرگەی تاڵەبانی. جێگری سەرۆکی حکومەتی داگیرکەرە.

سەردانەکەیان هەر بۆ هەمان مەبەست بوو، زۆر گرنگیم پێنەدان، تاکو ڕۆیشتن فەرامۆشم کردن پاشان جەعفەر موسەوی هاتە لام، لەڕووکەشدا ڕووی خۆشبوو، بەلام دەمزانی لەناوەوە چی هەڵگرتووە لەناو دەروونی نەخۆشیدا.

هەموو ئەوانەی دەهاتنە سەردانم دەروون نەخۆش بوون و پڕ بوون لەخراپەکاری، ئەوانە یان بۆ سەردان دەهاتن یان بۆ ئیستفزاز دەهاتن، وایاندەزانی دەتوانن صەدام حسێن ئیستفزاز بکەن، ئەبو عەلا ئەوە چی ڕوودەدات؟))

ئەم بابەتەم لەگەڵ هاوڕێکانمدا لەدەستە باسکرد، یەکێکیان وەلامی دامەوە وتی: من یەکێك لەوەزیرەکان خزممەو داگیرکەران و ئیدارەی حکومەتی داگیرکەر داوا لەوەزیرەکان دەکەن بەشێوەی ڕێکخراو بچن بۆ سەردانی سەرۆك و ئیستفزازی بکەن و ئیهانەی بکەن، ئەوەی ڕازی بوو ئەم کارە هیچە بکات کردوویەتی، بەلام ئەو وەزیرە ئەوەی ڕەتکردووەتەوە، لەبەرئەوەی سەرۆك دیلە !.

خۆم بوو، بەهۆی مەسەلەی بەرگریکردن لەسەرۆك، لەدەرەوەی شار عەشیرەت و قەبیلەکەم کاری ئەمن و پاراستنی ئەندامەکانیان دەکرد، کەتیمەکانی مردن بەزەحمەت دزەیان دەکرد، دەبوایە ڕۆژانە بچوومایە بۆ شاری ڕومادی، خەڵکی ئەویێ قەبارەی موعانات و ترسی گەیشتن بەدەرەوەو ناوەوەی شارەکە دەزانن، لەسێ لاوە شارەکە بەڕووباری فورات دەورە دراوە لەگەڵ نازم ئەلوراو کەدەڕژێتە دەریاچەی حەبانیەوە لەباکورو باکوری خۆرهەلاتی شارەکە، لەناوەوەی لەسێ لاوە دەوری شارەکەی داوە، کەلەمپەرو خاڵی کۆنترۆڵی سەربازی زۆر ئاڵۆزو هەستیاری تێدایە، ئەوانەی بەڕێوەی دەبەن بەهێزی مغاویری ناوخۆو لایەنگری تایەفی ناسراون، پاشان هێزەکانی ئەمریکی داگیرکەر.

ناچاربووم ڕۆژانە بچم بۆ شار بۆ بارەگای دەستە، بەدیاریکراوەیی بۆ وەرگرتنی پۆست کەلەعەممانەوە دەهات لەنووسینگەی سەرەکی دەستەو سەندیکاو دادگاو شوێنی تر، پاشان وەلامدانەوەی پۆستەکان.

## (بەربەستە ئەمریکیەکان)

لەڕۆژی شەمەی مانگی ئازاری (۲۰۰۵)، کاتژمێر نۆی بەیانی لەبەردەم بەربەستێکی سەرەکیدا ئۆتۆمبیلەکەم لێدەخوڕی لەباکوری شاری ڕومادی لەسەر پردی جەزیرە، سەربازێکی مارینزی ئەمریکی ڕایگرتم ئیشارەتی بۆ کردم کەدابەزم ئۆتۆمبیلەکە دەپشکنن، لەو کاتەدا یەکێك لەئەندامانی مغاویری ناوخۆ لێم نزیك کەوتەوەو بەوردی منی پشکنیی و داوای ناسنامەی لێکردم، هەر تەماشای دەکردم، لەگەڵ ئەوەی من تاکو ئەو کاتە لەگەڵ هۆکارەکانی ڕاگەیاندن هیچ مامەڵەیەکم نەکردبوو، پاشان داوای لێکردم خۆم ئاشکرا بکەم، پاش ئەوەی لەپاسپۆرتەکەی ڕوانی و فیزەی ئۆردن و سوریای پێوە بوو، وتم: (تەنیا لەبەردەم ئەفسەری ئەمریکیدا قسە دەکەم، ئەگەر نائەوا من چارەنوسی خۆم دەزانم)

بردمیانە ناو نووسینگەی ئەمریکیەوە، داوای لێکردم دانیشم لەبەردەم ئامێری پشکنیندا، پاشان لێی پرسیم من کێم، وەلامم دایەوە کەمن تائەو فەرمانبەرانەی ناوخۆ نەچنە دەرەوە قسە ناکەم، ئەفسەرەکە داوای لێکردن بچنە دەرەوە، چوونە دەرەوە تەنها ئەفسەرێك نەبێت بەپلەی نەقیب زۆر مەراقی بوو بزانێت من کێم، داوام کرد ئەو

ئەفسەرەش بچێتە دەرێ، سەربازێکی ئەمریکی بەسەریدا نەڕاندی ئەفسەرەکە ترساو چووە دەرەوە.

ناسنامەی خۆمم بۆ ئاشکرا کرد، کەنەمدەویست هیچ یەکێك لەوانە بیزانێت بەتایبەتی ئەوانەی سەر بەفەیلەقی بەدر بوون، پەیوەندی بەسەرکردە ئەمریکییەکەوە کرد داوای کرد یەکسەر بمبەن بۆ ئەوێ و پێی ڕاگەیاندن بەباشی مامەڵەم لەگەڵ بکەن، بەئۆتۆمبیلێکی ماشی بردمیان و چاویان بەستمەوە تاگەیشتمە لای سەرکردە ئەمریکیەکە.

لەو ژوورەی تەنیشت ژووری ئەفسەرەکە مامەوە، چاوم بەسترابووەوە لەبەرئەوەی بەکرێگیراوێکی لێ بوو زانیاری لەسەر هێزی مقاوەمە دەدا بەئەمریکییەکان کەبەکرێگیراوەکە چووە دەرێ ئەوان باسیان کرد، کاتێك چاویان کردمەوە ئەو بەکرێگیراوەم لەدەرەوەی نووسینگەکە بینی.

سەرکردە ئەمریکیەکە بەخێرهاتنی کردم، داوای دیکۆمێنتێکی کرد کەمن خەلیل دلێمی بم، سەرۆکی دەستەی بەرگری لەسەرۆك هیچ دیکۆمێنتێکی پێ نەبوو ئەمە بسەلمێنێت، دەکرێت پەیوەندی بەسەندیکای پارێزەرانەوە بکەن یان سەرکردەی ئەو سەربازگەیەی سەرۆکی لێگیراوە یان باڵوێزی ئەمریکیەوە، لەبەرئەوەی کاتەکە گەیشتە چواری عەسر، دەوامی سەندیکا کۆتایی هاتووە، پەیوەندی بەباڵوێزی ئەمریکیەوە کردو قسەکانی منی سەلماند، سەرکردە ئەمریکییەکە داوای لێبوردنی کردو داوای لێکردم نانی لەگەڵ بخۆم، داوای لێبووردنم لێکردو کاتی قەدەغە کردنی هاتووچۆش نزیك بووەتەوە، داوای لەیەکێك لەئەفسەرەکان کرد تاوەکو ئەو خاڵەی لێوەی هاتووم لەگەڵم بێت من ڕەتم کردەوە، دواتر چی بەو خەڵکە بڵێم کەدەمبینن لەگەڵ ئەمریکییەکانم، کەزۆربەی زۆری خەڵك ئەرکەکەی من نازانێت چییە، بەلاّم ئەوان سوور بوون هەر دەبێت تائەو خاڵە لەگەڵم بێن.

### (کاتژمێرە دەستییەکەی سەرۆك)

لەیەکێك لەچاوپێکەوتنەکاندا، سەرۆك داوای لێکردم پەیوەندی بەخزمانیەوە بکەم تاکو جلوبەرگی زستانەی بۆ بنێرن، خێزانەکەی جل و چاویلکەی خۆری و کاتژمێرێکی دەستی و سێ قوتو جگەرەی بۆ نارد، منیش هەموویم گەیاندە دەست سەرۆك، پاش ئەوەی کۆلۆنێل ستیل پشکنینی بۆ کرد، سەرۆك سوپاسی کردم، پاشان کاتژمێرە کۆنەکەی خۆی لەبەردەم سەرکردەی بەندیخانەو ئامێری چاودێری ئەلکترۆنی دامێ و داوای لێکردم بۆی

چاك بكەمەوەو بۆی بگێڕمەوە، گەڕامەوە بۆ ناوچەی سەوز بۆ لای هاوڕێكانم، كەلەیەكێك لەكۆشكەكانی سەرۆكایەتیدا بوون و خۆیان ئامادەكرد لەڕۆژی دواتردا ئامادەی دادگایی بن، كاتژمێرەكەم پشكنی لەكاركەوتبوو، پاش ئەوەی هەستم كرد كەكاتژمێرەكە بەتەواوی كاردەكات لەدوای چاوپێكەوتنی ڕۆژی دواتر لەدادگا كاتژمێرەكەم بۆ گەڕاندەوە، لێرەدا لایەنی ئەمریكی هاتە ناوەوە، كەبەشێوەیەكی ئەلكترۆنی چاودێرییان دەكردم، ئەفسەرێكی بەشی مارشال (پۆلیسی سەربازی ئەمریكی)، جلی مەدەنی لەبەردابوو، بالآبەرز، لەهاوڕێكانی لەهێزی مارشاڵ دەچوو، كەبەشێوەیەكی زۆر لەناو دادگا دەبینرێن، جاعێراقی یان خۆرهەڵاتی بن، لەوانەیە لەسەر ئەم بنەمایە هەڵبژێردرابن، تاكو لەبەردەم كامێراكانی دادگادا دەربكەون، وەك ئەوەی عێراقی بن، لەوانەیە بۆ ئەوەی ئەو سەرنجە بدەنە جیهان كەئەمانە عێراقین و دادگا عێراقی بەڕێوەی دەبات و ئەمریكییەكان دەست لەكاروبارییان وەرنادەن.

بەو ئەفسەرەم وت: دەتوانێت لەسەركردەی بەندیخانەكە بپرسێت كەمن كاتژمێرەكەم لەسەرۆك وەرگرتووە، پاشان چیرۆكی كاتژمێرەكەم بۆ گێڕایەوە من هاتوومەتە ناو ناوچەی سەوزو باش پشكنراوم، ئەمە جگە لەسێ خاڵی پشكنینی تر كەپێش چوونە ناو دادگا هەیە، ئەویش بەو هەموو ئامێرە وردو زۆرانەی لەخاڵی یەكەمدا هەیە كەئەمریكین و دووەم حكومی و سێیەم جۆرجی، كاتژمێرەكەم پێبوو ناكرێت ئەو كاتژمێرە لەو شوێنانەدا دروست بكرێت، باوەڕی هێنا، داوای لێكردم بەبێ ڕەزامەندی ئەوان هیچ شتێك نەدەم بەصەدام.

ئەفسەرەكە كاتژمێرەكەی برد، دایانە دەست دادوەرەكان ئەوانیش بەدەوری خۆیان دایان بەئەفسەرێكی ئەمریكی كە بە ڕەگەز عێراقیەو خاوەنی رەگەزنامەی ئەمریكییەو وەك ڕاوێژكاری باڵوێزخانەی ئەمریكی كار دەكات و هەموو لایەك لەدادگا پشتی پێدەبەستێت، هەر ئەو بوو زۆر هەوڵیدا لەعەممان بێتە ناو ئیمەیڵەكەمەوە.

لەڕۆژی دواتری دادگایكردن، ئەو ڕاوێژكارە هات و داوای لێكردم بەتەنیا پێكەوە قسە بكەن، چەند مەترێك لەناو بینایی دادگادا لەگەڵی ڕۆیشتم، پێی وتم: تۆ كاتژمێرێكت داوەتە صەدام و ئامێرێكی تۆماركردنی ئەلكترۆنی تێدابووە، تۆ دەزانیت ئەمە لادانێكی گەورەیە لەكارەكەت، بەڵام هەوڵدەدەم هاوكاریت بكەم ولایەنت بگرم، ئەویش ئەگەر واز لە وشەی گەورەی صەدام بهێنیت، پێم وت: كاتژمێرەكەت پێیە یان ناردت بۆ تاران تاكو ئامێری

ئەلکترۆنی ڕیکۆردی تێبکەن، من هەرگیز ناخەڵەتێم.

وازم لێهێناو بەکاپتن مایکل ماکۆیم وت، ئەویش وتی ئەوەی خراپە بەرامبەر پارێزەران بکات سەری پان دەکەمەوە، ئەمەیان بەشێکی بچوکە لەو تەنگ پێهەڵچنینەی تووشی دەبووم.

## چۆن مامەڵەیان لەگەڵ صەدامی دیلدا دەکرد

دادگای برۆکسلی میللی بەیانێکی دەرکرد پەیوەست بەکوشتنی ئەو پارێزەرانەی کەپەیوەندییان بەدادگایی سەرۆك صەدام حسێنەوە هەبوو، لەوانە خەمیس عوبەیدی و سەعدون جەنابی و عادل زوبەیدی و هەوڵی تیرۆرکردنی پارێزەر تامر خزاعی، هەروەها ژمارەیەك بەیاننامە کەبەهەقی سەرۆك صەدام حسێن لەو دادگا گاڵتەجارییە بەرامبەری کراوە، لەبەیانەکەدا هاتووە:

((دەبێت ئەو هەقیقەتە بسەلمێنین کەبەڕێز صەدام حسێن دیاری جەنگە، لەبەرئەوەی ئەو سەرۆکی گشتی هێزە چەکدارەکان بووە لەکاتی جەنگدا، کەئەمریکا لەدژی عێراق پێی هەڵسا، وەك دیلێکی جەنگ خاوەنی هەموو ئەو مافانەیە کەبەپێی رێکەوتننامەی ژنێف لەساڵی (١٩٤٩)دا هاتووە، هەروەها پرۆتۆکۆڵی یەکەم کەوەك پاشکۆنێردراوە بەرێکەوتننامەی ژنێفەوە، بۆ هەموو ئەو یاسا مرۆییانەی کەهەن کەتایبەتن بەگرتنی دیلی جەنگ، تێبینییەکی گرنگ لەڕاگرتنی بەڕێز صەدام حسێن، بەردەوامی ڕاگرتنی وەك زیندانییەك ناکۆکە لەگەڵ برگەی (٢٢)ی ڕێکەوتنی سێهەمی ژنێف، کەدەڵێت ناشێت دیل بەند بکرێت و کەنارگیر بخرێت، مەگەر ئەمە بەقازانجی دیلەکانی جەنگ خۆیان بێت، پێدەچێت بەندکردنی بەڕێز صەدام حسێن و کەنارخستنی لادانە لەبەندی (٢٢)ی ئەو رێکەوتننامەیە، جگە لەمە ئێمە دەپرسین ئایا هیچ پێشێلکارییەکی تر کراوە بەو مافانەی لەبەندەکانی (٢٥-٢٦-٢٧)ی ئەو ڕێکەوتننامەیەدا هاتوون، کەپەیوەستن بەمەرج گەلێکی ترەوە. لەبەر ڕۆشنایی ئەمە داوا لەبەرپرسانی ئەو گرتووخانانە دەکەین ڕێگەی تەواو بەلیژنەی خاچی سووری نێو دەوڵەتی و دەستەی ڕێکخراوی هاوشێوە بدەن بۆ لێکۆڵینەوەی تەواو لەبوونی مەرجی داواکراو کەفەراهەم بکرێت لەو گرتووخانەیەدا، پێدەچێت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشێوەیەکی تەواو دەسەڵاتی بەسەر ئەو گرتووخانانەدا دەشکێت کەبەندکراو صەدام حسێنی تێدایە)).

ئەو بەیاننامەیە کەلەرێگەی دادگای برۆکسل بلاوکراوەتەوە، هەموو ئەو سەرپێچیانەی دژی سەرۆك صەدام حسێن دەکرێت بەو بانگەوازە کۆتای پێدێنێت، ((تکایە دەنگی خۆتان هەڵبڕن دژی ئەو لایەنە بەردەوامانەی بۆ بنەما نێو دەوڵەتییەکان دەکرێت کەپێویستە لەدادگایکردنی صەدام حسێندا فەراهەم بکرێت. بەمشێوەیە بەپێی رێکەوتننامەی ژنێف سەرۆك صەدام حسێن بریتیە لەدیلی جەنگ، کاتێك ئەمریکییەکان دیلییان کرد ئەمەیان ڕاگەیاند، بەلاَم دوای گرتنی چۆن بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە مامەڵەی لەگەڵ کراوە؟

ئەم پرسیارەم ئاراستەی سەرۆك کردو وتی:

((من پێم سەیرە چۆن ئەوانە باس لەدیموکراتی و مافی مرۆڤ دەکەن، بەرلەوەی تۆ یەکەمجار ببێتە دیدەنیم، زۆر بەنامرۆڤانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم، لەڕۆژی یەکەمی گرتنمەوە پێم وتن ئێوە هەراو زەنایەکی گەورە لەم ناوچەیە دەخولقێنن و نەوەیەکی نوێی تیرۆریستان بەرهەم دەهێنن، ئەویش بەهۆی ئەو جەنگە نایاسایییەی دژی عێراق ئەنجامتاندا، لەبەرئەوە زۆر بەتوندی ئەشکەنجەیاندام زۆر بەتوندی لێیاندام، هەموو جەستەم بریندابوو، شین و مۆر ببوەوە، بەتایبەتی قاچەکانم، هەندێکی پاش چارەسەر چاك بوونەوە، کەماوەی زیاتر لەهەشت مانگی ویست، هەندێکی تر پاش سێ مانگ، ئەم هەمەجیانە سەر بەتوخمی مرۆڤ نین، بەزۆر شێوە هەوڵیاندا خراپەم بەرامبەر بکەن و ئازاری دەروونیم بدەن، بەلاَم هێزو عەزیمەتی خۆم و باوەڕم بەخوا سەبرێکی بێسنووری پێدام.

بەدەست ڕیش و قژی درێژەوە ئەمنالاَند، لەبەرئەوەی یەکجار بەهۆی مەکینەی سەرتاشینەوە لەڕۆژی گرتنەکەمەوە سەریان بۆ چاك کردووم، حەساسیەتم لەدەمووچاوو لاملدا بۆ دروست بووە، داوای مقەستێکی بچوکم لێکردن بۆ ڕێککردنەوەی ڕیشم، بەلاَم ڕەتیان کردەوە، دواتر گەڕانەوە وتیان لەڕووی مەبدەئیەوە گرفتمان لەگەڵ داواکەت نیە بەلاَم دەبێت ڕەزامەندی مەرجەع وەربگرین، ماوەی زیاتر لەمانگێك ئەم بێنەو بەردەیە درێژەی کێشا، دەرەنجام مەرجەع داواکەی ڕەتکردمەوە، دەترسان خۆم سەربیڕم، ئەگەر بمویستایە خۆم بکوژم پێشتر ئەو کارەم دەکرد، پێم وتن ئایینە مەزنەکەمان خۆکوشتنی لێ حەرام کردووین، هەروەها ئەوە صەدام حسێن نییە خۆی بکوژێت، جارێکیان داوای مقەستێکم کردو پێم وتن باپاسەوانێك لەنزیکمەوە بێت ئەگەر ئێوە لەژیانی من دەترسن. ڕۆتینێکی کوشندەیان هەیە، کەداوای شتێك دەکەم جێبەجێکردنی کاتێکی زۆری دەوێت.

بەلاَم پاش سەردانی یەکەمی تۆ مامەڵەیان لەگەڵم گۆڕدرا، ئەویش پاش ئەوەی

مامۆستا خەلیل تۆ هەڕەشەت لێکردن کەلەهۆکارەکانی ڕاگەیاندن ئابڕوویان دەبەیت، ئەوان نایانەوێت جیهان ئاگای لەڕاستی سیمای ناشرینیان بێت، بەشێوەیەکی باشتر مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم، دوای ئەوەی داوام لێکردن قژو ڕیشم لەئامادەیی تۆدا بۆ بتاشن، ماوە ناماوەیەك دەلاکێك دێنن، جارێکیان گاڵتەم لەگەڵ یەکێك لەئەفسەرەکاندا کرد، پێم وت: ((بۆچی مقەستەکە لای خۆم جێناهێڵن تاکو خۆم ڕێکبخەم، بەڵێنت دەدەمی خۆم ناکوژم، ئەگەر دەترسن لەیەکێك لەسەربازەکانتان بدەم، ئەمیان ناشێت، من سەرکردەم و سەرۆکێکی دیلم، دەستم بەکارناهێنم تەنها لەیەك حاڵەتدا نەبێت، ئەویش ئەگەر بۆش سەردانم بکات، دەرفەتی نادەمێ، ئەوکات دەبێت ئاگاداربن لەبەرئەوەی من لێیدەدەم، ئەو دوژمنی منە، پاشان پێم وتن: بهێڵن بابێ ترستان لێی نەبێ)).

((بەکارهێنانی تەوالێت کارەسات بوو، بەئەنقەست تەوالێتەکەیان گیراندبوو تاکو لە بەجێهێنانی ئەرکە ئایینیەکانم دوابکەوم، ئەویش بەبێ بوونی ڕووناکی، هەروەها گەرماوەکەم دەرگای نەبوو، پاسەوان لەکاتی بەکارهێنانیدا بەدیارمەوە وەستابوو هەروەها پەردەشی پێوە نەبوو، ئەمەیە شارستانیان و دیموکراتیەت و مرۆڤایەتیان کەدرۆ دەکەن و دەڵێن لەگەڵ خۆمان بۆ عێراقمان هێناوە، دەیانویست بەهەر شێوەیەك بێت جارسم بکەن.

بەلأم سەبارەت بەخواردن، دەڵێم من زۆر خۆرنیم، لەسەرەتای گرتنمدا خواردنیان بەشێوەیەکی ناشایستە پێشکەش دەکردم، واتە لەژێر دەرگاکەوە، ڕەتم کردەوەو نەمخوارد، پاشان دەیانهێناو دەیانوت ئەمەیان ژەمە خواردنی سوپای ئەمریکییە، کەمن لەگەڵیدا ڕانەهاتبووم، لەمانگی ڕەمەزاندا گرفتێکم هەبوو، خواردنیان بەئەنقەست دوادەخست تاکو کاتی پارشێو تەواو دەبوو، ناچاریان دەکردم نانی بەیانی بخۆم، هەروەها بۆ هەمان مەبەست بەربانگیان دوادەخست، لەوڵاتی خورمادا یەك دەنك خورمایان بۆ نەدەهێنام، موسڵمان سەرەتا بەربانگی بەخورما دەکاتەوە،

((پرسیاریان لێکردم ئایا ڕۆژنامەم پێ دەگات یان گوێم لەهەواڵ دەبێت، من نازانم لەدەرەوە چی ڕوو دەدات لەبەرئەوەی لەدنیای دەرەوە دابڕاوم ئەوان هەموو جۆرەکانی هۆکاری ڕاگەیاندنیان لێ قەدەغە کردوم.. تەماشا بکەن کێ باوەڕ دەکات بڵێن ئەمریکا ڕادیۆو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە لەصەدام حسێن قەدەغە دەکات؟

پاش ماوەیەکی درێژ لەگیرانم، پەیوەندیم بەپاسەوانەکانەوە باشتر بوو، کاتێك بینیم لێم نزیك دەبنەوەو پرسیاری زۆرشتم لێدەکەن، بینیم ئەمانە پیشەوەرن نەك سیاسی، کاتێك باسی وڵات و گەلەکەمم بۆ دەکردن، نیشانەی سەرسوڕمان لەسەر سیمایان دروست دەبوو،

لەبەرئەوەی سیاسیەکانی ئەوان خەڵەتاندوویانن، جارێکیان یەکێکیان پێی وتم: بۆش خەڵەتاندووینی و درۆی لەگەڵ کردووین کاتێك پەیوەندیمان کەمێك پتەو بوو، سەرکردەکانیان خێرا دەیانگۆڕین، کاتێك گروپێکی نوێ دەهات بۆ پاسەوانیم، پێم دەوتن من هیچ دوژمنکارییەکم لەگەڵ گەلی ئەمریکادا نیە، بەڵکو لەگەڵ حکومەتی ئەمریکادا، رۆژێك ئەندامێکی ئەو حکومەتە دێتە دەرێ و ڕاستیەکان دەڵێت.

((لەبیرمە ڕۆژێکیان لەنزیك دەریاچەی نور منیان هێنایە دەرێ، لەناکاو موشەکێك کەوتەوە کەپاڵەوانانی مقاوەمە بەرەو ڕووی دەریاچەکە هاویشتیان، پاسەوانەکان هاتن و بەپەلە منیا بردە ژووری، وەك خۆیان دەیانوت دەترسان، بەڵام من بەو موشەکە زۆر دڵخۆش بووم، پێم وتن لەگەڵەکەم مەترسن ئەوانە ناچارن بەفەرمانی سەرکردەکەیان بکەن، هەندێکجار گفتوگۆمان دەکرد، دەمبینی زۆر لەدرۆی حکومەتەکەیان تورەن، بەڕاشکاوانە دەیانوت ئێمە بەداگیرکردنی عێراق ڕازی نین کەهاوڕێکانیان تێیدا کوژراوە، ئەوان بیری نیشتیمان و خێزانەکانیان دەکرد.

لەڕۆژێکی تردا، من بۆ چاوپێکەوتنی تۆ هاتم، پێیان ڕاگەیاندم ئەگەر تووشی کردەیەکی تیرۆرستی ببی ئێمە بەمەستەمانە بتپارێزین، منیش پێم وتن لەگەڵەکەم مەترسن، کەعێراق ئازاردبوو، ئێوەش گەڕانەوە بۆ ئەمریکاو ژیان بۆ عێراق گەڕایەوە، پێم وتن سەردانمان بکەن، زۆر بەمە شادمان بوون وتیان داوەتەکەت قبوڵ دەکەین، بانگتان دەکەم...

کاتێك مانم لەخواردن دەگرت، بەهەر هۆکارێك بێت، هەر هەوڵیان دەدا قەناعەتم پێبکەن واز لەمانگرتن بهێنم، کەدەستەوەستان دەبوون، دەیانووت پارێزەرەکەت بانگ دەکەین، مەبەستیان تۆ بوو، ئەو تەنها کەسێکە بتوانێت قەناعەتت پێبکات، بەڕاستی کاتێك دەهاتی، داوایان لێدەکردی قەناعەتم پێ بکەیت.

((هەندێك داوای ئیمزاکەیان دەکردم تاکو لای خۆیان بیپارێزن دەمبینی هەندێکیان وێنەکەیان لەناو مۆبایلەکەیاندا هەڵدەگرت، ڕۆژێکیان ئەفسەرێکی ئەمریکی هاتە لام، هەر ئەو بوو داوای لێکردم داواکارییەك بۆ سەرکردەی هێزەکانی ئەمریکا بنووسم کەنەیگوازنەوە، منی زۆر خۆشدەویست، بەڕاستگۆی خزمەتی دەکردم، ئەو ئەفسەرە هاتە لام و فرمێسك بەچاوەکانیەوە بوو، وتی بۆ شوێنێکی ترم دەگوازنەوە، وتی نامەوێت لەتۆ دووربم، کاتێك بڕیاری گواستنەوەی دەرچوو هاتە لام و دەستی کردە ملم و دەستی کرد بەگریان بەدەنگی بەرز دەگریا بەشێوەیەك کاری تێکردم. بەمشێوەیە هەرکاتێك پەیوەندیم لەگەڵ پاسەوانەکان باش دەبوو بەگروپێکی تر دەیانگۆڕین ئەو گروپەی دوایی کەهاتن

گروپێکی خراپ بوون کاری ئیستفزازی زۆریان دەکرد، وەك گۆرانی وتن بەدەنگی بەرز، سەما، دەرکردنی دەنگی جاڕس کەر، هەروەها تەپەتەپیان بەقاچیان دەکرد، بەڵام هەموو ئەوانە نەیانتوانی بێزارم بکەن یان عەزیمەتم لاواز بکەن، ئەمڕۆ لەوکاتەی دەهاتم بۆ ئەم چاوپێکەوتنە، پاش ئەوەی چوومە ناو ئۆتۆمبیلە سەربازییەکەوە لەمپەرێکی تەلاویان لەنێوان من و ئەفسەرو شۆفێرەکەدا دانا، من بەزنجیر بەسترابوومەوە، بەهانەیان ئەوە بوو نەکا لەڕێگا بەرەو ڕووی هێرش ببینەوەو پاشان هەڵبێم... تەماشای حاڵەتی تۆقین و دارمانیان بکەن.

لەکاتی ئەم گواستنەوە کورتانەدا، چاوم بەدرەخت و دارخورما دەکەوت کەخۆم سەرپەرشتی ڕواندنیم کردووەو بەدەستی خۆم ئاوم داون، بینیم وشك بوون و فورامۆش کراون، زۆرکاری تێکردم و هەندێك بەیتی پڕ ئازارم دەربارەیان نووسی.

کاتێك دەست بەم کارە دەکەم (واتە وتنی شیعر)[١٢] ئەویش تەنها لەبەرییەك هۆبوو، کەس نەبوو قسەی لەگەڵ بکەم، بینیم تەنها شیعر دەتوانێت گوزارشت لەویژدانمان بکات.

## (مانگرتن لەخواردن)

پاش شەهیدکردنی پارێزەر خەمیس عوبێدی لەڕۆژی (٢١ـ٦ـ٢٠٠٦) مانم لەخواردن گرت، دووان لەئەمریکییەکان هاتنە لام، یەکێکیان ژەنەڕاڵ بوو، داوایان لێکردم واز لەمانگرتن بهێنم، پێیان وتم ئەندامانی سەرکردایەتی ڕۆژی هەشتی تەموز مان لەخواردن دەگرن، منیش پێم وتن نامەیەکم بۆ بهێنن ئەمە بسەلمێنن، ئەوانیش نامەیەکی تاریق عەزیزیان بۆ هێنام.

دواتر بڕیارمدا لەگەڵ هەڤاڵەکانم مانگرتن بکەم، لەڕۆژی یەکەمەوە زیاتر لەقەسیدەیەکم نووسی، ئەویش تاکو ڕۆژی بیستەم، ئەمریکییەکان بەیانی و ئێوارە چاودێری تەندروستیان دەکردم، لەنەخۆشخانە پشکنینیان بۆ دەکردم، بەخوێنبەر خواردنیان دامێ، هەروەها لەلوتیشەوە.

لەمانگرتنی یەکەمدا بەدیاریکراوەیی لەڕۆژی بیست و یەکدا، ئەفسەرەکان پێیان وتم: لەتەندروستیم دەترسن، لەتەنیشتمەوە وەستابوون، لەژوورەکەمدا سندوقێکی ئاسنی لێ

---

[١٢] لەم کتێبەدا شیعرم کورت کردوە، تاکو بەدرێژی لـەکتێبێکی تایبەتـدا دەربـچێت، مەگـەر زۆر پێویـست بکـات نمونـە بهێنمەوە.

بوو، کەلوپەلەکانمی تێدابوو، کێشی قورسبوو، سندوقەکەم لەدەسکەکەیەوە گرت و بەرزم کردەوە، ئەفسەرەکە سەری سوڕما، کۆمەڵێك ئەمریکی سەریان سوڕمابوو کەصەدام حسێن پاش مانگرتن لەخواردن بۆ ئەو ماوە درێژە، تاکو ئێستا پێدەکەنێت و شیعر دەنووسێت و موماره‌سەی ژیانی سروشتی خۆی دەکات.

لەسەردانی یەکەمەوە سیمایان بەرەو باشتر گۆڕابوو، پاسکیلێکی جێگیریان بۆ هێنام تاکو ڕۆژانە بۆ ماوەی دە تا پانزە کیلۆمەتر بەکاری بهێنم، سوپاس بۆ خوا تەندروستیم باشە، تەنانەت دێن بۆ ژوورەکەم تاکو پلەی گەرمی و ڕێژەی شێ بپێون ئەویش لەڕۆژێکدا چەندجار، تاوای لێهات خۆم هەندێکیانم ڕەت دەکردەوە، بەئینسافەوە دەڵێم سەرپەشتی تەندروستیم زۆرباش بوو، منیش وابەستەی ڕێنماییە تەندروستیەکانیان دەکەم لەبەرئەوەی لەبەندیخانە بەتەنهام، داوام لەدکتۆر کرد پشکنینی پرۆستاتم بۆ بکات، ڕەتی کردەوە لەبەرئەوەی بڕوای وابوو تەندروستیم زۆرباشە ، بەگاڵتەوە وتم: ئەگەر گەلەکەم ویستی زەماوەند بکەم ئەوا دەیکەم.

پاش شەهیدبوونی پارێزەر خەمیس عوبێدی وتم واز لەمانگرتن لەخواردن ناهێنم تاکو تاوانباران بەسزای خۆیان نەگەن و ئەمریکا پارێزگاری لەپارێزەرەکانی تر نەکات، دەبێت مامۆستا خەلیل یان ئەو کەسەی ئەو ڕایدەسپێرێت پێم بڵێن ئەمریکا داخوازییەکەی جێبەجێ کردوون.

## (سەرۆك چۆن هەواڵی شەهیدبوونی هەردوو کوڕەکەی و کوڕەزاکەی پێگەیشت؟)

دوا کۆبوونەوەی سەرۆك لەگەڵ کوڕەکانیدا لەرۆژی (٢٠٠٣/٤/١١)دا بووە، ئەوکات هێشتا جل و بەرگی سەربازی لەبەردابوو، ئەوکات بڕیاریاندا، لەوکاتەی بەغداد جێدەهێڵن ئەندامانی دەستەی پاراستن بەسەرخۆیاندا دابەش بکەن، ڕێکەوت دواتر لەمیوانداری خێزانێکدا کەیەکێك لەگرنگترین خێزانەکانی عێراق لەباشوری خۆرئاوای شاری ڕومادی بەڵام پاش بۆمبارانکردنی ئەو خانووە، هەریەك بەکاری خۆی بڵاوەی لێکرد، لەتکریت لەشوێنی لەدایك بوونی سەرۆك صەدام هەندێك لەخزمانی دڵسۆزی ئامۆژگاریان کرد، کەلەیەك شوێندا لەگەڵ هەردوو کوڕەکەی کۆنەبێتەوە تاکو نەبێ

بەراوێکی چەوری هێزی داگیرکەر، لەوانە فەریقی یەکەم روکن ماهر عەبدول رەشید کەنزیکترین کەسی صەدام حسێن بوو، ئەویش بۆ ئەوەی هیچ هەڵەیەک روونەدات، رای خۆی بەوپەڕی بوێرییەوە دەدات، بەتایبەتی کەقوسەی زاوای ئەو سەرکردەیە بوو، کەگۆڕەپانی جەنگ شاهیدی پاڵەوانی ئەو دەدەن، عێراقیەکان خۆشیان دەویست، ئەو خۆشەویستی و دڵسۆزییەی لەکچەزاکەیدا چاند کەناوی عبدالله بوو.

هەردوو کوڕەکەی سەرۆك بەرەو ناحیەی عۆجە کەوتنە ڕێ، بەڵام عودەی بڕیاریدا ئەو شەوە لەماڵی خزمێکی بمێنێتەوە، لەژوورەکانی تری خانووەکە گوێی لەتەقینەوە بوو، هەستی کرد خەبەریان لێداوە، خۆی و قوسەی برای بڕیاریاندا لەپارێزگای سەلاحەدین بچنە دەرێ، ئەویش لەگەڵ عەبد حەمودی سکرتێری تایبەتی سەرۆك کەسەرۆك داوای لێکردبوو لەگەڵ کوڕەکانی بمێنێتەوە، هەموویان ڕوویانکردە سنوری سوریا، بەرەو گوندێکی سەر سنوری سوریا ڕزگاریان بوو، ئەویش بەهاوکاری عەشیرەتە دڵسۆزەکانی عێراق.

تارمایی جەنگ بەهەموو ناوچەکەوە دیار بوو، بۆنی باروت و مردن لەهەموو سوچێکەوە دەهات، چاوی واشنتۆن و دیك چینی و ڕامسفێڵدو پۆڵ بریمەرو وَلفۆفیتز بەرەو سوریا بوون، ئەویش بەوەی سەرکەوتن لەوێش بەدەست بهێنن، وایاندەزانی ئەوەی پاش کەوتنی بەغداد هاتووە لەسوریاش بەئاسانی دەست هێزی مارینز دەکەوێت.

سوریا هەوڵیدەدا ئەو شەڕە لەخۆی دووربخاتەوە، تاکو گەلەکەی و ناوچەکە لەکاولکاری زیاتر بپارێزێت، کاتێك دەسەلاتی سوریا زانی هەردوو کوڕەکەی صەدام حسێن و عەبد حەمود هاتوونەتە ناو خاکی سوریاوە، پێشوازی لەقوسەی و عەبد حمود کرد، بەلام بەعودەی وت خاکی سوریا جێ بهێڵێت، دەبێت ئەو شوێنەش دیاری بکات کەبۆی دەچێت، هۆکارەکەشی ئەوەیە دەتوانێت قوسەی و عەبد بشارێتەوە، لەبەرئەوەی کەسایەتی قوسەی دەناسن، بەلام عودەی لەناو عێراقیەکان دوژمنی زۆرە، کەهاتوونەتە سوریا، ئەو لەوانە لێی دەترسان بەتایبەتی خزمانی خۆی کەدوژمنایەتی لەنێوانیاندا هەیە، ئەمە جگەلەوەی ئەمریکا پێدەزانێت عودەی لەناو خاکی سوریادایە،

لەبەرئەوە سوریا باجێکی گەورەی ئەم گاشێتە دەدات مەبەستی ئەمریکایە.

بەلام قوسەی ڕازی نەبوو براکەی جێبهێڵێت، پاشان هەرسێکیان گەڕانەوە بۆ عێراق، بڕیاریاندا لەموسڵ بمێننەوە، چونکە قوسەی پەیوەندی باشی لەگەڵ خەڵکی ئەوێدا هەبوو، هەروەها لەلایەن سەرکردەی پاسەوانانی تایبەت و گەورە سەرکردەکانی سەربازی خەڵکی موسڵ خۆشەویست بوو، بۆ هەماهەنگی لەگەڵ سەرکردەی کردەکانی مقاوەمە، بەلام عەبد حمود کاتێك دەگەنە سنور بڕیاری گەڕانەوە دەدات و قوسەی و عودەی بەجێ دەهێڵێت تاکو بڕیاری خۆیان بدەن، هەردووبراو مستەفای کوڕی قوسەی ماڵی کەسێك هەڵدەبژێرن تاکو ببێتە بارەگایەکی نیمچە هەمیشەیی لەوێدا ئیخباری دەکرێن.

## چیرۆکی ئیخباری کردن:

شاهیدێك دەڵێت (ص) کەکەسێکی نزیکی سەرۆك صەدام حسێنەو جێگەی ڕێزیەتی و پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ قوسەی هەیە، وردەکاری چیرۆکی شەهید بوونی عودەی و قوسەی و مستەفا دەگێڕێتەوە:

لەرۆژی (٢٠٠٣/٤/٥) جەمال مستەفا هاوسەری حەلەی کچی سەرۆکمان لەگەڵدا بوو من و کوڕەکەمی بردە کەرەڤانەکەیەوە لەنزیك مزگەوتی ئوم ئەلتبول لەوێ چاومان بەقوسەی کەوت، کەکەمال مستەفاو سکرتێرەکەی و دوو ئەفسەری لەگەڵدا بوو، واڕێکەوتین کەکوڕەکەم لای ئەوان بەجێ بهێڵم تابگەمە ئەو شوێنەی بۆمان هەڵبژاردبوون خۆیان و خێزانەکانیان لەوێدابن، ئەویش بەئاگاداری سەرۆك پاش دوو مانگ، زۆر تووشی کتوپڕی بووم کەعودەی و قوسەی چوونە لای نواف زیدان، کەپاسەوانەکانیان لەگەڵ بوو بەناوی فلان و فلان و کوڕی فلان و خوشکەزاکەیان فلان، کەدواتر توانی پارەکانی عودەی و قوسەی بدزێت و ڕابکات، کەپارەو ئالتونێکی زۆرە، کەسێك هەبوو چاوی لەو هەموو پارەیە بووە کەلەوانە بوو هەڵدەهاتن، بینیان دووکەس نواف زیدان و پاسەوانێکی عودەی و قوسەی لەسیاجی ماڵەکەوە هەڵهاتن، ئەو ماڵەی تاوانەکەی تێدا ڕوویدا، بەرزی سیاجەکە یەك مەترو نیو بوو، سێ جانتای پڕ لەپارەیان لەگەڵ ئالتوندا هەڵدایە پشتی سیاجی خانووەکەوە، ئەویش لەبەرەبەیانی ڕۆژێکدا، پاشان بەو ئۆتۆمبیلەی چاوەڕێی دەکردن

هەڵهاتن، کاتێك تاوانباری سەرەکی نەواف گەڕایەوە بۆ خانووەکە بەتەنیا بوو، هەموو ئەمانە بەرلەهاتنی ئەمریکییەکان بوو.

لەکاتژمێر دووی شەوی داهاتوودا نەواف و براکەی دەچنە لای سەرکردەی هێزەکانی ئەمریکا لەموسڵ، کەئەوکات ناوی دیڤید بتریوس بوو، پێی وتن عودەی و قوسەی لەناو خانووەکەی مندان، لەنوسینگەکەی بتریوس شێخێکی موسڵی لێبوو کەلەبتریس زۆر نزیك بوو شەوان دەهات بۆ لای ئەمە ئەو شێخە گێڕایەوە (داوای لێبوردن لەناو نەهێنانی دەکەین) ئەمیان چیرۆکی یەکێك لەشێخەکانە.

هەمووان بەئۆتۆمبیلێکی مەدەنی هاتنە دەرێ پاش پشکنینی شوێنەکە پاش کاتژمێرونیوێك پتریوس بەتەنیا گەڕایەوە، داوای لێبوردنی لەمیوانەکەی کرد، کەدواتر بەدەستی هێزی مقاوەمە دەکوژرێت، پاشان پتریوس بەڕەتلێك لەسەیاری هامفی و زرێپۆش دەردەچێت و تاوانباری سەرەکی نەواف لەپێشەوەیانە، کاتێك گەیشتنە خانووەکەی، نەواف چووە ژوورێ، بینی قوسەی و عودەی و مستەفا خەوتوون، هاتە دەرەوەو بەپەنجە ئاماژەی بۆ سەرەوە کرد بۆ ئەمریکییەکان کەدۆخەکە ئۆکەیە. پاشان لەگەڵ کوڕەکەی (ش) سواری ئۆتۆمبیلێکی هامفی بوون، خاولییەکی دابەشانیداو ماڵەکەی بۆ ئەمریکییەکان جێهێشت کەچۆنیان دەوێت واهەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن.

(ص) شاهید دەڵێت زەنگی تەلەفونەکەم لێیدا قسەکەر دراوسێکەم بوو کەڕووداوەکە لەتەنیشتییەوە ڕوویدا، داوای لێکردم دەربازیان بکەم واتە (عودەی و قوسەی و مستەفا) لەگەڵ کۆمەڵێك لەپیاوان ڕۆشتین بینیمان شەڕ دەستی پێکردووە، گوێمان لێبوو ئەمریکییەکان داوایان لەقوسەی و عودەی و مستەفا دەکرد خۆیان بدەن بەدەستەوە، بەڵام قوسەی بەئارپی جی سێڤن لەپەنجەرەیەکەوە وەڵامی دەدانەوە، لەپەنجەرەیەکی ترەوە عودەی بەقەناس لەگەڵیان دەجەنگا، بەڵام مستەفا لەسەربانەوە تەقەی لێدەکردن، بەڵام زەویەکە بە (٢٠) تانك و (٢٠) زرێپۆش و (٢٠) ئۆتۆمبیلی هامفی گیرابوو، پاشان هێزی پێشمەرگە هات بۆ پاڵپشتی ئەمریکیەکان، هەر هەوڵێك بۆ ڕزگار کردنیان مەحاڵ بوو بیستمان توانیان (١٣) ئەمریکی بکوژن. پاش ئاڵۆز بوونی دۆخەکە، هێزی ئەمریکی موشەکی گازی تێگرتن و خانووەکەیان تەقاندەوە...

ئەمدەویست برینی نوێ بکەمەوە، بەڵام برینی سەرۆك صەدام حسێن سارێژ نەببوو،

مەگەر تەنیا بەرزگارکردنی عێراق ساڕێژ بێت لەدەستەی داگیرکەرو گورگەکانی... من دڵنیابووم کەسەرۆك لەهەموو برینەکانی بەهێزترە تەنیا برینێك لەدڵیدا هەبێت عێراقە... ئەمەش هانی دام لێی بپرسم چۆن هەواڵی شەهیدبوونی هەردوو کوڕەکەت و کوڕەزاکەت پێگەیشت، وتی:

کاتێك بڕیارمدا پەنا بۆ کاری نهێنی بەرم، وەك چۆن ساڵی (١٩٥٩) دەمانکرد، ڕۆژانی خەباتی نهێنیم، لەدەرگای عێراقیەکانم دەداو سەردانی ماڵیانم دەکرد... هەموو ئەو ساڵانەی کەلەگەڵ گەلەکەمدا کارم کردووە، ئەگەر گەلەکەم نەمپارێزێت جگە لەدەستەی پاسەوانان، ئەوا بەخوا کەموکورتی هەیەو دەبێت من شتێکم کردبێت))

لەڕۆژێکی مانگی تەموزی ساڵی (٢٠٠٣) لەماڵی عێراقیەك بووم، زۆر پێشوازی لێکردم، لەدەموچاویدا تێکچوونم بینی وتی: گەورەم دوو دڵم کەئەم هەواڵەت بدەمێ، وتم: دوودڵ مەبە، وتی: عودەی خۆتان خۆش، بەبزەیەکەوە پێم وت: ئافەرین، سوپاس بۆ خوا، پاشان وتی: هەروەها قوسەیش، دووجار ئافەرین، سوپاس بۆ خوا پاشان وتی گەورەم مستەفاش شەهیدبووە، وتم: سێ جار ئافەرین و سوپاس بۆ خوا کەسەربەرزی کردم بەو پاڵەوانانە، کەلەڕێی نیشتیماندا شەهیدبوون، سازشیان نەکردو خیانەتیان نەکرد، سوپاس بۆ خوا بۆ قەزاو قەدەری، ئەوان ڕۆڵەی عێراقن حاڵیان وەك حاڵی هەموو ئەوانەیە کەبۆ عێراق شەهیدبوون.

پێش ئەوە هەندێك سەرکردەی سەربازی و خزمان و هەندێك عێراقی ئامۆژگاریان کردم کەبا عودەی و قوسەی پێکەوە نەبن تاکو بەیەکجار نەیاندۆڕێنین، ئەوکات وتم: هەرچی خوا بیەوێت خێری ئێمەی تێدایە، ئەوان خەباتکارو فیداکاری عێراقن، من هەست دەکەم هەردوو کوڕەکەم وکوڕەزاکەم لای خوان و ئەوان فیدای عێراقن، تادواسات جەنگاون و هەڵنەهاتوون.

هەرگیز بەبیرماندا نەهاتووە، کەعێراق بەجێ بهێڵین و وەك ترسنۆك ڕابکەین و بەدوای ژیانی هیچدا بگەڕێن، لەبەرئەوەی ئێمە لەدەرەوەی خاك و خۆڵی عێراقی ئازیز خۆمان ناناسین.

ئێوە کوڕو برای منن، هەموو عێراقیەکان برامن، دەبێت سەرکردە دوو دڵ نەبێت، دەبێت کوڕی خۆی پێش کوڕی خەڵك بخاتە ناو جەنگەوە، لەجەنگی عێراق ئێراندا عودەی

و قوسەی لەبەرەی جەنگ بوون، ئەوکات تەمەنیان منداڵ بوو... عەرەب بەپشتی خوا سەرکەوتوو دەبن، بەڵام زۆربەیان خێزانی خۆیان پێشکەشی نیشتیمان دەکەن، لەبەرئەوە دەبێت ژن بهێنم پاش ئەوەی بینیم کوڕەکانم بۆ خزمەتی عێراق باش بوون، لەگەڵ ئەوەی هەموو عێراقیەکان کوڕمن.

کاتێك جەنگ لەوپەڕیدا بوو لەساڵی (٢٠٠٣)، پێش بانگەشەکردنی داگیر کردن، یەکێك لەکچەکانم داوای لێکردم باخێزانەکانمان بچێتە شوێنێك لەدەرەوەی عێراق، لەبەرئەوەی ئافرەت بوون، تاکو لەگەڵ براکانیان بۆ جەنگ خۆمان ئامادە بکەین، داواکەم ڕەتکردەوە بەڵام دیسان دووباره بووەوە ئەویش پاش ئەوەی جەنگ زۆر توند بوو دوژمن ماڵەو ماڵ بەدوامانەوە بوو، وتم: نەخێر ئێوە چێژتان لەدەسەڵات و دەستکەوتەکانی بۆ ماوەی زیاتر لە(٣٠) ساڵ وەرگرتووە، دەبێت ئەمڕۆ لەئاگردا وەك گەلبن، بەتەواوەتی ڕەتم کردەوە.

لەزۆرلایەنەوە پێشنیارم بۆ دەهات بچمە دەرەوەی عێراق، دەموت چۆن بچینە دەرەوەو گەلی عێراق لەگەڵ چارەنووسی چاوەڕوانکراودا جێبهێڵین، بەڵام ئەوانە صەدام حسێن ناناسن، نازانن عێراقی شەریف تەنیا بەژیانی شەریفانە ڕازییە، ئەگەرنا باشەهید بکرێین، بەڵام بەکرێگیراوانی هەمیشە بۆ لای بیانی ڕادەکەن تابیانپارێزێت. سەیرکە قێزەونی ئەمریکا گەیشتووەتە چ ئاستێك، ئەوان بەو داواکارییە پوچەوە نەوەستان کەمن و خێزانەکەم عێراق جێبهێڵین، بەڵکو پێشتر پێیان وتم ئەویش بەهۆی ڕێگایەکی نادبلۆماسی، کەفشار دەخەنە سەر هەر دەوڵەتێك کەپەنای بۆ بەرم تاکو تەسلیمی ئەوانم بکەن، ئەگەر لەناو عێراقیش بمێنمەوە ئەوا بەهەر ڕێگایەك بووە دەمگرن، ئەگەر داواکاریەکانیان قبوڵ نەکەم، ئەمەش ئەوە دەردەخات ئەوان سووربوون لەسەر داگیرکردنی عێراق، سێ هۆکاریان دانا بۆ ئەوەی داگیرکردنی عێراق حەڵاڵ بکەن: چەکی کۆکوژی، پەیوەندی لەگەڵ قاعیدە، پاشان ڕزگاربوون لەصەدام حسێن لەبەرئەوەی دیکتاتۆرە.

بەڵام بەدڵنیاییەوە صەدام حسێن ناناسن، کەناتوانێت عێراق بەجێ بهێڵێت، کەئەوەی هەڵبژارد دەبێت لەسەر خاکی وڵاتەکەی شەهید بکرێت.

لێرەدا کاتی ئەوە بوو لێی بپرسم سەبارەت بەسەردانی خێزانەکەی دەمویست لەو گۆشەگیریە دەریبهێنم، ئەگەر ڕازی بوو داوای خێزانەکەی دەکەم کەزۆری بیردەکەن، دەمزانی ئەمیش بیریان دەکات، بەڵام وتی:

((مامۆستا خەلیل، هیچ داوایەکی تۆ ڕەت ناکەمەوە، دەزانم تۆ پیاوێکی ئازاو بەشکۆیت، بەلآم بۆ پاراستنی مێژووی خۆم و شەرەفی عێراق. ڕێگە نادەم خێزانەکەم سەردانم بکەن، لەبەرئەوەی ئەمریکاییەکان خاوەنی قسەی ڕاست نین و ناتوانم متمانەیان پێبکەم، نامەوێت پەیوەندی تەلەفونی بۆ خێزانەکەم بکەم لەبەرهۆکاری کۆمەلآیەتی و دەروونی، ئەو کچە دەست دەکات بەگریان ئەویان بەکرِوزانەوە، بەلآم دەلێم سوپاس بۆ خوا، مادام تۆ هەوالّیانم بۆ دێنیت، ئەوا تۆ کورِو برامی)).

هیچ رۆژێك جێم نەهێشتووەو خوازیاری ئەوە نەبووبم کەبەزووترین کات بێمەوە دیدەنی، کەسێکی وەك ئەم سەرکردەو مرۆڤە گەورەیە هیچ شتێك قەرەبووی ناسینی ئەو ناکاتەوە، بارودۆخ وای خواست من لەدیلدا ئەو بناسم و کاتژمێر لەدوای کاتژمێر گوێی لێبگرم، ئەوەی خەمبارم دەکات ئەوەیە دەبینم زیندانی چوار دیوارە، تەنانەت لەدیلکردنیشدا هەر مەزن بووە، شیشی زیندان تێکی نەشکاند، هەروەها جەبەروتی دوژمن چۆکی پێدانەدا، وەك ئەوەی کردەوەی پالّەوانان لەدەرەوەی دیلکردنی ببینیت و هەستی پێبکات، ئەمەش زیاتر بەهێزو پتەوی دەکرد کەڕۆژی سەرکەوتن نزیکە، عێراق بەهۆی مقاوەمەتی ئازاوە، زۆر جوانتر دەگەڕێتەوە بەدرێژایی مێژوو عێراق تووشی داگیرکاری زۆر هاتووە لەنەتەوە درِندەکانەوە، تووشی کردەی تێکدان و گێرەشێوێنی و کۆکوژی و کوشتن هاتووە، بەلآم وەك سیمرخ هەلّدەستێتەوەو داگیرکەران دەردەکات و تەپوتۆزی دارِمان و کاولکاری لادەبات تابگەڕێتەوە لای بوونیادنانی شارستانی سەرلەنوێ.

# بەشی سیانزەیەم

سەرۆک صەدام حوسێن چۆن دەڕوانێتە ئاینده ؟

ئەوە تۆڵەکردنەوەی جوولەکەیە لەسەردەمی نەبوخوزنەسر هەتا صەدام حوسێن، هەروەها تۆڵەکردنەوەی کیسرایە لە زیقارو موسەننا و قادسیەی یەکەم هەتا قادسیەی دووەم، قادسیەی صەدامی مەزن کە عێراقی لە شەڕو ڕق و کینەیان ڕزگارکرد.

(لەیاداشتەکانی سەرۆک صەدام حوسێن لە زینداندا)

ئەمرۆ گۆڕەپانی عەرەبیی وەك بارستاییەکی گەورەی مین وایە کە دابەش دەبێت لەنێوان عێراق و فەلەستین و لوبنان و سودان و سۆماڵدا، پاشان هەڕەشە لەسەر سوریا، لەهەوڵێکدا بۆ ئاگربەردان لەهەموو ناوچەکە ئەمەش وەك ڕێگەخۆشکردنێك بۆ " خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی نوێ" یان ئەوەی پێی دەوترێت سایکس بیکۆیەکی نوێ، بەپێی ئەوەی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی دەیانەوێت. لەناو ڕووداوەکانی ئێستاشدا کە ئاماژە بە تەقینەوەگەلێکی گەورە دەدات، هەڕەشەی ئەمریکا بۆ ئێران دەستیپێکردووە بۆ ئەوەی دەستبەرداری بەرنامە ئەتۆمییەکەی بێت، هەروەها هەوڵەکانی کێشمەکێشی نێوان لایەنە پەیوەندیدار بەکێشەکانەوە سەریهەڵداوە. زۆرێکیش ئەو پرسیارە دەکەن کە ئایا ئەمریکاو ئیسرائیل لەئێران دەدەن کە هاوپەیمانی ئەوانە لەڕووداوە وێرانکارییە پلانگێڕییەکاندا لەدژی عێراق..

### ئەمریکاو ئێران

لەسەرۆك صەدام حوسێنم پرسی، کە ئەو لەهەر کەسێکی تر زیاتر ئێران دەناسێت. عێراق بەدرێژایی مێژووی بەدەست بەڵاو نەهامەتیەکانی ئێران و سەفەوییەکانەوە ناڵاندویەتی، ووتی:

" ئەمریکا لەئێران نادات، هەروەها ئیسرائیلیش. ئەمریکا کە ڕێگەی بەئێران دا ڕۆڵێکی گەورە بگێڕێت لە وێرانکردنی عێراقدا، واتە دوژمنی بنەڕەتی ئەو بریتیە لە بەرهەڵستبی عێراقی نەك ئێران. لەماوەی جەنگی عێراق ئێراندا، سەردانی شوێنەکانم کردووە ناوچە بەناوچە، پەل بە پەل بەئاگابووم لەو هێزەی کە هەمانە، جۆری چەکەکانمانم لەبیرە. لێرەوە من هەموو پلانەکانی ئێران دەزانم. پاشانیش شیعەکانی عێراق پێکهاتەو هاوبەشی نیشتمان، زۆرینەی سوپا دلێرەکەمانن.

" بەڵام ئەوەی زیاتر ئازارم دەدات ئەوەیە کە عەرەب وەك سەیرکەرێك لەبەرامبەر ئەو دوژمنکارییەدا وەستاون کە کرایە سەر لوبنان لە تەمووزی ٢٠٠٦دا بەوەش هەڵێکیان

بەخشیە ئێران بۆ ئەوەی یاریی بەهەست و سۆزەکان بکات. ئێستا کوان ئەو عەرەبانە کە پێشتر هەبووین؟

" بەڵام بەنسبەت هەڕەشەکانی ئیسرائیلەوە لەدژی ئێران، ئەوا ئێمە لەوبارەیەوە ئەزموونمان هەیە. ئێرانیەکان داوایان کرد بێنە ناو عێراقەوە بۆ ئەوەی لەدژی ئیسرائیل بجەنگن، بەڵام ئەو هەلەمان لەدەستدان کاتێك پێمان ووتن دەبێت ئاشتی لەنێوانماندا هەبێت هەتا ڕێگەتان پێ بدەین بەناو خاکەکانماندا بڕۆن بۆ قودس! بەڵام ئەوان ووتیان: بەغدادو پاشان قودس. بەنسبەت مەسەلەی لوبنانیشەوە، ئەوا من پێمواية بەرگریی لوبنانی ئاسان نیە هەروەها ئەو پیاوەی کەپێشەوایەتی دەکات، ئەگەر پلانگێریی لەسەر لوبنان نەکرێت وەك کاغەزێکی قورس لەهاوکێشەی لوبنانیدا، ئەوا لووتی ئیسرائیل لەخۆڵدا دەگەوزێت و دەکەوێتە چاڵەوە هەتا ئەگەر کێڵگەکانی شەعباش نەگەڕێنەوە کە من پێم باشترە ئێستا نەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بەرگریی لە باشوری لوبنان بە تاوداروو داگیرساویی بمێنێتەوە، پێم باشە کێڵگەکانی شەعبا پێکەوە لەگەڵ کێشەی فەلەستین و جۆلاندا چارەسەر بکرێن.

" لەجەنگی عێراق ئێراندا، دڵخۆش دەبووم بەوەی کاتێك پێمدەوترا ئەو ئەفسەرە کوردە، زیاتر لەو دڵخۆشییەی کە ئەگەر عەرەب بوایە. ئێران بەدوور لەهەر ئیعتیبارێك وەك یەك لەدژی ئێمە جەنگاوە، ئەو دەیەوێت جەنگێکی تایفیی بەسەر گەلەکەماندا بسەپێنێت کە پێکهاتە نیشتمانییەکەی لەیەك هەڵوەشێنێت، (ئێران و ئیسرائیل)یش دوو سوودمەندی سەرەکین لەوێرانکردنی عێراق و شکستهێنان بەعەرەب.

" هەرکەسێك بڵێت ئەمریکا لەئێران دەدات، من پێچەوانەی ئەوە دەڵێم. ئەمریکا ئەگەر بڕیاری دا، ئەوا پێویستە لەسەری هێزێك لەسەر زەوی ئامادە بکات لەگەرووی هورمز و خۆرهەڵاتی کەنداوی عەرەب، کاتێکیش کە ئێران گەروەکە بە مووشەك و تۆپهاوێژ دادەخات. هەر لێدانێکی ئەمریکاش لەئێران نرخی بەرمیلێك نەوت لە ١٥٠ –٢٠٠ دۆلار بەرز دەکاتەوە، ئەوەش پێشبینیکراوە کەئێران گەرووەکە دابخات ئەگەر ڕووبەڕووی هەر هێرشك بووەوە.

" بەڵام بە نسبەت سوریاوە، ئەوا پێویستە لەسەری وریابێت. ئێران توانای زیاتری دەبێت بۆ ئەوەی بەرهەڵستکاریی لوبنانی درێژبکاتەوەو پەرەی پێبدات چونکە

بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندیدارە بەوەوە. سوریاش لەڕووی سیاسیەوە ووشیارو بەئاگایە، ڕاستە ئەو لە بەرهەڵستیی دەترسێت چونکە ڕەوشی ناوخۆی تایبەتمەندیی خۆیی هەیە. لەبەرژوەندی سوریاش نیە بەرەی جۆلان بکاتەوە، ئەوانیش جۆلان بە ئامانجی کۆتایی خۆیان نازانن هەتا لەسەردەمی حافز ئەسەدیشدا، بەڵام لەبەرژوەندیی ئەودایە سنوری خۆی لەگەڵ لوبنان بکاتەوەو پشتیوانیی لەبەرهەڵستی لوبنانی بکات و دەروازەکە لەبەردەم خۆبەخشاندا والأبکاتەوە. پاشان پەیوەندیی نێوان لوبنان و سوریا هەمیشە پەیوەندییەکی باش بووە، کاتێکیش کە دەستوەردانێکی دەرەکی دەبێت، ئەوا ئەم پەیوەندییە ئاڵۆز دەبێت. بۆیە پێویستە لەسەر کەسوکارەکانمان لە لوبنان لەدەرەوەی چنگ و چەپۆکی ئەمریکاوە کێشەکە لەگەڵ برا سورییەکانیاندا چارەسەر بکەن، چونکە خێراتر لەوەی هەندێك کەس پێشبینی دەکەن، بەهۆی بەرهەڵستکارانەی عێراقییەوە، ئەو چەپۆکە لەناو دەچێت و نامێنێت.

" هەروەها دەڵێم ئیسرائیل چاوەڕوانی هەڵکردنی گڵۆپ سەوز دەکات بۆ ئەوەی لە کورە ئەتۆمیەکانی ئێران بدات. بەڵام لەبری ئەمریکا ئەو ناتوانێت هەستێت بەلێدانی ئەو ناوچانەی ئێران، مادام ئێران ئەو مووشەکانەی هەیە کە دەگەنە ئیسرائیل. ئیسرائیلش سەقامگیریی بۆ عەرەب ناوێت ، بەڵکو دەیەوێت نیوەیان بەئێرانەوە سەرقاڵ بن و نیوەکەی تریشیان لەگەڵ ئیسرائیل. ئێمە تێبینی ئەوەمان دەکرد لەساڵی ١٩٨٨ وە هەتا ساڵی ١٩٩١، یەك گوللە لەلایەن ئیسرائیلەوە بەئاراستەی لوبناندا نەتەقیوە، ئەگەر عێراقیش وەك ڕەوشی پێشووی بمایەتەوە، ئەوا پێمان دەووتن پێویستە لەسەر هەموان کار بۆ سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی لوبنان بکەن.

"بەڵام تورکیا، لەدەرەوەی ئەو هێڵەوە کە ئەمریکا بۆی دیاریکردووە هیچ هەڵسوکەوتێك ناکات. ئەو ڕێگەپێدانەش لەبەرژەوەندیدا نییە کە دوژمنایەتیەك لەنێوان تورکەکان و کوردەکانی عێراقدا دروست بکات.

"بەنسبەت ئەمریکاشەوە، ئەوەندە هێزی هەیە کەبەشی ئەوە بکات چی دەوێت لەئێراندا وێرانی بکات، بەڵام لەپەرچەکردارەکە دەترسێت کە ئێران گەرووی هورمز دابخات. بۆیە، بە وورياییەکی زۆرەوە دەڕوانێتە مەسەلەکە، بەتایبەتی کە جیهان بەرگەی جەنگێکی نوێ ناگرێت. ئەگەر هەڵکوتانەسەرێکی ئەورووپیی لەدژی ئێران هاتەکایەوە، ئەوا

لەرێگەی ووشکانیەوە نابێت، بۆیە ئەو کەڵکەی نابێت، لەبەرئەوە پێویستە لەسەریان حساب بۆ پەرچەکرداری ئێرانی بکەن لەگەرووی هورمز چونکە هێزە ووشکانیەکانی ئێران لەخۆرهەڵاتی گەرووەکەدا بوونی هەیە، ئەگەر ئەو هێزانەشیان کەئێستا لەعێراقدان بەشی نەکرد، ئایا هێزێکی گەورە دەنێرن بۆ ئێران، ئەوا لەم کاتەدا تێوەگلانیان گەورەتر دەبێت لەتێوەگلانیان لەعێراق، داخستنی گەرووی هورمزیش دەبێتە کارەساتێك بۆ جیهان، ئابوزی جیهانیش لەپاش بەرزبوونەوەی نرخەکان بەهۆی جەنگی عێراقەوە هەر زیادەیەکی تری پێوەریی بۆ نەوت قەبوڵ ناکات.

" هەروەها وای دەبینم کە خۆرئاوا دەستەوسان بووە لە لێدانی ئێران چونکە ئەو لێدانە کۆشندە دەبێت بۆ خۆی، پاشانیش ئەمریکا بەپێی بەرژوەندییەکانی لێککەیشتن لەگەڵ ئێراندا دروست دەکات، گەلی عێراقیش باجی ئەو لێتێگەیشتنە لە سامان و سەربەخۆیی و یەکێتیە نیشتمانییەکەی دەدات. هەموو ئەو ژاوەژاوەش لەسەر ئێرانە بۆ سەرقاڵکردنی عەرەبە بەو کێشەیەوە، زایۆنیزمیش نایەوێت لەئێران بدات. ئەمریکا بۆ ئەوە نەهاتووە بۆ عێراق بۆ ئەوەی صەدام حوسێن لەسەر حوکم لابدات، ئەگەرچی ئەو ئامانجەش ڕانەگەیەنراو بوو، بەڵکو لەپێناو ستراتیژیەتێکی ماوە درێژدا بووە کەلەڕێگەیەوە ئامانجە زایۆنیزمیەکان بەدی دێن، ئەگەر ئەمریکا کورە ئەتۆمیەکانی ئێران بەمەترسیدار دادەنێت لەسەر قەوارەی زایۆنیی، ئەوا ئەو یان ئەم قەوارە زایۆنیە لەئێرانی دەدا پێش ئەوەی ئێران بگاتە قۆناغی پیتاندنی یۆرانیۆم، وەك چۆن زایۆنیەکان لەدژی کورە ئەتۆمیەکانی تەموزی عێراق ئەنجامیان دا. بۆیە ئەمریکا بەرهەڵستیی عێراقی بەمەترسیی دەزانێت نەك ئەو گروپانەی کەپەیوەندیان بەئێرانەوە هەیە یان دەستێوەردانی ئێرانی لەعێراق.

" ئەوپەڕی ئەوەی کە دەکرێت پێشبینی بکەیت، ئەوەیە فرۆکەکانی ئەمریکا چەند ئامانجێکی دیاریکراوی ئێران بۆ ماوەیەکی کورت بومباران بکەن، دوای ئەوە ئاگربەست ڕادەگەیەنێت. بەڵام پێویستە لەسەر ئەمریکیەکان حساب بۆ پەرچەکردارەکانی ئێران بکەن. ئەگەری ئەوەش هەیە، ئەویش ئەگەرێکی لاوازە، کە ئەو لێدانە لەلایەن دیموکراتەکانەوە ئەنجام بدرێت ئەویش بەبڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایش نەك بە بڕیارێکی ئەمریکی وەك ئەوەی لەعێراق ڕوویدا.

" مەترسی ئێرانم بۆ بەدیارخستن وەك ئەوەی لەواقیعدا دەگوزرەێت، واتە مانۆڕێکی

ڕێکوپێکو تەواوم بۆ کردن. ئێستا ئەمریکیەکان و فەرمانڕەوا عەرەبەکان زیاتر لەپێشوو لەڕادەی مەترسی ئێرانیەکان تێگەیشتوون. دەڵێم ئەگەر ئەمریکیەکان گرفتەکەیان لەعێراق چارەسەر بێت، ئەوا لەوانەیە گورزێك لەئێران بوەشێنن، لەوکاتەدا تەنها ئەمریکا ناچێتە جەنگەکەوە، بەڵکو بەهاوپەیمانێتی دەبێت لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپیدا. ئێرانیش بەنسبەت ئێمەوە وەك عەرەب، زیاتر لەئیسرائیل بۆمان مەترسیدارە، پێویستە لەسەر عەرەب ئەوە بزانن. وەك دەزانن لەمێژەوە پەیماننامەیەك لەنێوان ئێران و جوولەکەدا هەیە، کاتێك کە شا نەبوخوزنەسر هەستا بەدیلکردنی جوولەکە، ئەوەی کەبە بەدیلگرتنی بابلی ناسراوە. پاشان پەیمان بەستن لەگەڵ کۆرش کە جولەکەکانی گێڕایەوە بۆ فەلەستین... بەڵام ئەگەر ئێران بووە خاوەن بۆمبی ئەتۆمیی، ئەوا پێداکێشانی زۆر زەحمەت دەبێت"[١٢].

پاشان سەرۆك بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی...

" ئەوەی لەدەورمانە دڵخۆشمان ناکات، ئێمە بەدیمان نەهێناوە، ناشتوانین ڕێگریی لێبکەین، بەڵام دەتوانین بەرامبەری بوەستین و ڕووبەڕووی ببینەوە. ئەم جەنگە کەلەباشوری لوبنانە، ئیسرائیل دروستیکرد، بە فەرمانی ئەمریکا بەرەیەکی فراوانی دروستکرد بۆ ئەوەی نیگاو سەرەنجەکان بگوێزێتەوە لەوەی کەلەعێراقدا ڕوودەدات، بەڵام ئەوە خستیە ناو کێشەوگرفتێکی ڕاستەقینەوە، ئەنجامەکەش لەبەرژوەندیی کۆشش و خەباتی مرۆیی و عەرەبی دەبێت. ئیسرائیل بەرگەی جەنگێکی درێژ ناگرێت، ئەو هەوڵ دەدات خەڵك لەباشور کۆچ پێبکات ئەویش لەسۆنگەی ئەو قەناعەتەیەوە کە ناوچەیەکی ئاسایش لەنێوان خۆی و جەنگاوەرەکاندا دروست دەکات، قورساییەك دەخاتە سەر تۆپهاوێژەکانی بەرگریی و چەکەکەی. حزبوڵڵاش بەردەوام دەبێت لە بۆمبارانکردنی زایۆنیزم سەرەڕای نابەرابەریی ئەو دوو هێزە. بەڵام ئیسرائیل لەڕووی سیاسی و دەروونیی و ئابورییەوە ناتوانێت بەرگەی ڕەوشی ڕابوونێکی سەربازیی درێژخایەن بگرێت. بەپێی ئەم

---

[١٢] - بیرم دێت ڕۆژێکیان لەگەڵ سەرۆکدا بووم لەسەربازگەی کروبەر، هەواڵی ئەوەی پێگەیشتبوو کە ئێران یاری و سوکایەتی بەعێراق دەکات و دەست لەئاسایشی عێراق وەردەدات، جگە لە کوشتن و دەستگیرکردنی ئەو کەسانەی کە لەباشترین پیاوانی عێراقن. بەیەکێك لەئەمریکیەکانی ووت: " ئاوا لێیان گەڕان یاریی بە عێراق بکەن. چەکەکەم بۆ بگێڕنەوەو لەعێراق بچنە دەرەوە، جارێکی تر هەڵدەستم بەتەمێکردنەوەیان ئەگەر ئێوە ناتوانن ڕێگەی ئازارگەیاندن بەعێراقیان لێبگرن. بەڵام ئێوە ڕازین لەهەڵسوکەوتەکانیان. ئەگەر سەدام ئێستا ئەمە حاڵی ئەدەبوو، ئەو گێل و گەمژانە نەیاندەتوانی بەمشێوەیە وا بەعێراق و گەلەکەی بکەن.

فاکتەرانەو هی تریش، ئەوا ئیسرائیل داوای ڕاگرتنی جەنگ دەکات نەك بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەڵکو لەرێگەی هەندێك فەرمانڕەوای عەرەبەوە.

" ئێمە هەمیشە دەمانووت پێویست ناکات سوپایەکی جەنگاوەر بنێررێت بۆ جەنگان لەدژی ئیسرائیل، بەڵکو دانانی تۆپهاوێژ لەسەر سنوری ئوردنەوە بەبێ چوونە ناوەوە، بۆ هەڕەشەکردن لەئیسرائیل بۆ ئەوەی لەقۆناغی یەکەمدا بگەڕێتەوە بۆ سنوری ساڵی ١٩٦٧. ئەگەر حزبوڵڵاش ئابڕووی ئیسرائیلی بردبێت، ئەی ڕەوشەکە ئەوکاتە چۆن دەبوو ئەگەر قسەی عەرەب لەڕوویدا یەکیبگرتایە. ووتم سوپای عێراقی ئامادەیە لەسەر سنور بوەستێت و دەڵێین با موشەك و تۆپەکان بهاوێژرێن، وا دامەنێن لەپێش شەش مانگ کۆتایی بەجەنگ بێت، ئیسرائیل ناتوانێت ئەو ماوەیە بەرگەی بۆمبارانی تۆپەکان بگرێت، گرنگ ئەوەیە تۆپهاوێژەکانی عەرەب لە ووشکانی و ئاوییەوە بەبێ وەستان و بەهیمەتەوە ئیسرائیل بۆردومان بکەن هەتا ئەگەر دوو مەتریش نەچووبنە ناو ئیسرائیلەوە. ئەوکات ئیسرائیل ماندوو دەبێتو بچووکو ملکەچ دێت ئاشتی لەگەڵ عەرەبدا ئیمزا دەکات.

" بەرهەڵستی لوبنانی و عێراق وانەیەك بەئەمریکا دادەدەن لەتێگەیشتن لە کەسێتی عەرەبیو یادەوەریی خۆرئاواش سەبارەت بە ناسینی مێژووی خەباتی عەرەبی چالاك دەبێتەوە، پەنگخواردنەوە لەناوچەی عەرەبیدا زیاد دەبێت و گەشە دەکات، لەتەقینەوەیەکی گەورە دەترسم کەبەدوایدا دێت، ئەو هێزانەش کە یاری بەدەرئەنجامەکانی تەقینەوەکە دەکەن ئێستا گردو کۆن. بڕوام وایە میسر و سعودییە و پاشان مەغریب پاڵێوراون بۆ ئەم تەقینەوەیە. ئەگەر شتێکیش لەسعودییە ڕویدا، ئەوا سوود لەئاشوبی تایفیی وەردەگیرێت، بەهەمانشێوە لە میسرو لوبنانیش".

" چەند ساتێکی درێژ بەبێدەنگی گوزەریکرد. سەرۆك لەمیانەی ئەو ساتانەدا بۆ دووری دەڕوانی، وەك ئەوەی لەیادەوەریی دەوڵەمەندی شت گەلێك بخوێنێتەوە، پاشان زۆری نەبردووو وتی:

" پێشتر بەعەرەبم ووتبوو ئەگەر عێراق ڕووبەڕووی دابەشبوون بووەوە، ئەوا میسرو ولاتانی تریش ڕووبەڕووی دەبنەوە، عێراقیەکانیش بە جوامێری ناسراون، کاتێکیش هەر شمشێرێك لەڕووی حەقدا بەرزبێتەوە، ئەوا شمشێری عێراقی نزیکە بۆ وەستانەوە لەڕوویداو پشتیوانیکردن لەئوممەت و نەتەوە. پێشتریش بەعەرەبم وتبوو پێویستە

لەسەریان ئەوەیان لەبیربێت کە بەغداد لەپشتیانە لەلیبیایەوە هەتا دوایین خاڵ لەخۆرئاوا خۆرهەڵات. هەندێك لەولآتانی عەرەبیش لەوەختی خۆیدا بەشۆڕشی خومەینی هەڵخەڵەتابوون، پێیان وابوو ئەو شۆڕشە لەبەرژەوەندی عەرەب و موسڵمانەکانە. من هێشتا لەبیرم دێت لەکاتی جەنگی عێراق ئێراندا، کاتێك کە لیبیا هەستا بەپێدانی مووشەك بەئێران، ئەویش بەو مووشەکانە لەبەغدای دا. دوای ئەوە نوێنەری لیبیا سەردانی تونسی کرد، خوالێخۆش بوو بۆرقیبە هەولێدا لێیبدات و پێی ووت: ئایا بەموشەکەکانتان لەبەغدا دەدەن؟

بەلآم یەمەن، پێدەچێت ڕۆڵی گەورەتربێت بەتایبەتی دوای سەرلەنوێ هەڵبژاردنەوەی سەرۆك عەلی عەبدوللآ سالح چونکە ئەو پیاوێکی خاوەن ئەزموون و نەتەوەییەکی ڕەسەنە.

دەڵێم بەشێوەیەکی گشتیی ڕەوشەکە، مەبەستم ڕەوشی سیاسیە، خراپە بەهۆی ئەوەی ئەمریکا دەیکات و هانی زایۆنیزم دەدات لە دوژمنایەتیکردنی بەردەوامیی گەلی فەلەستینی. زایۆنیزم لەمەلآسدایە و هیواخوازە لێرەو لەوێ بلّق ڕووبدات بەتایبەتی لەناوەندی عەرەبیدا بۆ ئەوەی پەلەبکات و چرنووکەکانی بچەقێنێت. پێموایە ئەم حاڵەتە پەرچەکردارێك لای نەتەوەی عەرەبیی دروست دەکات، نەتەوەی عەرەب بەش بەشە و یەك حاڵەت نیە، یەك حاڵەت تەنها وروژاندێکی بەسە بەپلەی ٦٠٪ بۆ ئەوەی پەرچەکردارەکەی بەهێز بێت، بەلآم حاڵەتی بەش بەشیو پەراگەندەیی پێویستی بە وروژاندن و پلدانێك هەیە زیاتر لە ٩٠٪ بێت بۆ ئەوەی پەرچەکردارەکە پێگەیشتوو کاریگەربێت. بڕوام وایە ئەو پەرچەکردارە دەبێت سەرەڕای ئەوەی هاریکاریی عەرەبی ئێستا ئاسان نییە.

" کوڕەکەم گەلەکەمان گەلێکی مەزنە، مەزن بەکلتورو مێژوو توانستەکانی، زیاتریش بەهێز دەبێت بەقوڵیەکەی و پەیوەست بوونی بەنەتەوەی عەرەبەوە، هەروەها بەکاریگەریی لەناوەندە نێودەوڵەتییەکەدا. لێکۆڵەرەوەکان لێیان پرسیم" ئەم هەموو سوپاو بوونیادنان و ئاوەدانکردنەوەیە بۆچی و...و.. بێگومان مەبەستیان کۆشکەکانی سەرۆکایەتی نەبوو. چونکە ئەوان دەزانن ئەم کۆشکانە موڵکی صەدام و ئەوەی لەدوای صەدامیشەوە دێت نیە، بەڵکو لە بڵندیی و شانازییەکانی هونەری تەلارسازیی عێراقین‌و موڵکی گەلی عێراقن".

سەرۆك لەبارەی ئەوانەوە دەدوێت کەهێشتا ڕەخنە لەکاروانی مەزنی عێراق دەگرن‌و

دەڵێت:

" یان قسە لەبارەی ئەو هەڵانەوە دەكەن كەلەكاروانی تەمەنی ٣٥ ساڵەیدا ڕوویداوە، ئەوان پێیان دەڵێم: ئەوەی كار نەكات هەڵە ناكات، ئایا دەكرێت شۆڕشێك هەموو ئەم دەسكەوت و بەها مەزنانە بەدەست بهێنێت بێ ئەوەی لێرەو لەوێ هەڵە بكات. یان ئایا ئەو شۆڕشانەی لەجیهاندا ڕوویانداوە هەڵەو كەموكورتیان نەبووە، ئایا شۆڕشێكی وەك ئەمە بەهەموو بەرنامە گەشەپێدانییو ئابورییو مرۆییو زانستیەكانیەوە دەكرێت بە ڕوودانی هیچ هەڵەیەك بڕوات بەڕێوە .. ئێمە دەزانین ئەم شۆڕشە مەزنە و هەر لەوكاتەوە دەستیپێكردووە، پلانگێڕیی لەدژی بەرپا دەكرێت، دەركیش بەوە دەكەن پلانگێڕیی هەر لەكاتی خۆماڵیكردنی نەوتەوە دوای ساڵی ١٩٧٢ دەستیپێكردووە. هەتا بەنسبەت گەلی كوردمانەوە، ئەو خودموختارییەی كەهەیانە، وامان لێدەكات بپرسین: ئایا كوردەكانی وڵاتانی دراوسێ هەمان ئەو مافانەیان هەیە كەوا گەلی كوردمان لەعێراق هەیەتی بەتایبەتی كە ژمارەی ئەوان چەندین جار لەژمارەی كوردەكانی ناو عێراق زیاترن. پاشان ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دواوە و سەیری كاروانی شۆڕشمان بكەین، ئەمە وامان لێدەكات هەروەها بپرسین ئایا هیچ وڵاتێك لەوڵاتانی ناسراو بەجیهانی سێ هەبووە وەك عێراق لەماوەیەكی كورتدا بەسەر نەخوێندەوارییدا زاڵ بێت؟ هەتا ئاستی سستمی تەندروستیی لەعێراق زۆر باشترە لەزۆرێك لەوڵاتانی پێشكەوتووش، هەروەها گەشەپێدانی مرۆیی كەلەبەرنامەیەدا بوو هەزاران كادیر لەكادیرانی زانستی وەك نێردە بنێرێت بۆ دەرەوە. لەسەردەمی شۆڕشیشدا، سوپایەكمان لەزانایان و بیرمەندان و مامۆستایان و دادوەران و پارێزەران لەهەموو بوارەكاندا بونیادنا، كەئەمانە سامانی گەل و نەتەوەن..

" ئەوانەیش باس لەدیموكراتیەت دەكەن، ئەوا خۆیان یەكەم كەس بوون كە ئاستەنگیان لەبەردەمیدا دانا. كاتێك كە شەرەفی بەپرسیارێتیمان وەرگرت، ڕووینەداوە بڕیارێكمان وەرگرتبێت بەبێ بەشداریكردنی براكانمان لەسەركردایەتیداو لەهەموو بوارەكاندا. ئەی دیموكراتیەتی خۆرئاوا لەكوێیە كاتێك كە بەملیۆنان كەس لەهاوڵاتییەكانیان لەدژی جەنگی سەر عێراق خۆپیشاندانیان كردو ناڕەزاییان دەربڕی، گوێ لە دەنگ و هاوارەكانیان نەگیرا. صەدام حوسێن ئەوە تورەی ناكات كە ئەو بەكرێگیراو و كلكانەی كە داگیركەر هێناونی و دایناون بۆ ئەوەی بەخۆیان بڵێن كە ئەوان دادوەرن، بەڵكو

ئەوەی ئازارم دەدات ئەوەیە کە ئەو کلکانە هەستن بە گۆڕینی جەژنی نیشتمانی و هێما نیشتمانیەکان بۆ ئەوەی کە سووک و نزم ڕیسوایە. لەبری ئەوەی شانازیی بەشۆڕشەکەیان و جەژنە نیشتمانیەکانیانەوە بکەن کەلەپێناویدا بەلێشاو خوێنمان ڕشتووە، ئەوا باس لە تاوانگەلێك دەکەن کەئەوان ناویان ناوە تاوان. وەك ئەوەی دەوڵەتەکەمان دەوڵەتی یاسا و دەوڵەتی دادپەروەریی و ئەمن و ئاسایش نەبووبێت. پێموتن یەکێك لەبەرپرسەکان ڕۆژێکیان دەستی لەکاری دادگا وەردابوو، کاتێك زانیم، ئەو شەوە نەنوستم پێش ئەوەی مافەکە بۆ خاوەنەکەی بگێڕمەوە. دادوەرەکانیش شوێنێکی شایستەیان هەبووەو ژیانێکی ڕێزدارانە ژیاون، ئێمە بەشێوەیەکی تایبەت سەرپەرشتیمان دەکردن بۆ ئەوەی دادپەروەریی بچەسپێنن و ماف بۆ زوڵملێکراون بگێڕنەوە، سوپاس بۆ خواش گۆڕەپانی دادگاش هیچ سنورشکاندن و پێشێلکردنێکی بەخۆوە نەبینیوە. گەل بەئەمن و ئاسایش لەسایەی دەوڵەتی یاساو دادمەزراوەیدا ژیانی بەسەر دەبرد. کاتێکیش قسە لەبارەی دیموکراسیەتەوە دەکەن، ئەوان ئەوان و لەپێشەوەشیان ئەمریکیەکان بوون کەئاستەنگیان لەبەردەم ئەو دیموکراسیەتەدا دانا کەئێمە خوازیاربووین بۆ گەلەکەمان، ئەو دیموکراسیەتەی کە ڕەسەنایەتی گەل بپارێزێت و لەئاینی ئیسلامی پاکوبێگەردەوە سەرچاوە بگرێت و ڕێز لەمافی توێژەکانی تری گەلەکەمان بگرێت.

لەساڵی ١٩٩٠دا، عێراق بەرنامەیەکی ئامادەکردبوو بۆ فرە حزبی، ئێمە خەریکی چالاککردن و کارپێکردنی بووین، بەڵام ئەو ڕەوشانەی کە ئەمریکاو زایۆنیزمی جیهانیو بەکرێگیراوەکانی و کلکەکانی لەناوچەکەدا سەپاندیان بەسەرماندا، نەیهێشت ئەوە بەدی بێت.

" بەڵێ، ئێمە ئەوساو ئێستاش بەتەنگ گەلەکەمانەوە بووین زیاتر لەبەتەنگەوەهاتنی خۆمان، هەروەها بەتەنگ مافەکانیەوە بووین لەهەڵبژاردندا کاتێك لەبەردەمیدا بە سوێندێکی مەزن سوێندمان خوارد، ئێمە ئەو پەیمانەمان پاراست کە دابوومان، هەروەها بەرگریمان لەهەموو عێراقییەك و ئابڕوی نیشتمانیی و بەرژوەندییە سەرەکییەکانی کردووە. ئیدی نرخەکەی هەرچەندێك بووبێت، خیانەتمان لەئیرادەی نەکردووەو سازشیش لەرۆڵی ئەم ئیرادە نیشتمانیەی گەلەکەمان ناکەین کە لەپێناویدا بۆ ماوەی چەندین دەیەیە عێراقیەکان بەڕووبار خوێنیان لەپێناویدا بەخشیوە. لەسەر ئەمە ڕەتمانکردەوەو ڕەتی

بەڵام بەنسبەت هەڵە بچووکەکانەوە، ئەگەر بەراووردمان کردن بەدەسکەوتە زەبەلاحەکان، ئەوا ئەوانە شتانێکی کەمۆ ئەوتۆنین کە حسابیان بۆ بکرێت و بەراوورد ناکرێن و کاروانێکی زل و زەبەلاحی وەك کاروانەکەمان خەوشدار ناکەن. ناکرێت هۆکاری هەموو ئەوانەی کەڕوویدا بدرێنە پاڵ ئەو، چونکە شەڕەنگێزو دوژمنکارەکان سوورو پێداگرن لەسەر ئەوەی عێراق داگیربکەن و خراپە بەگەلەکەی بگەیەنن.

ئەوەی ئەمڕۆ بەسەر گەلە ئارامگرتووە گرفتارەکەماندا دێت، دڵ بەجۆش دێنێت، بۆ هیچ شتێك نا، بەڵکو بۆ ڕۆڵی ئەم گەلە پێشەنگ و پێشڕەوە لەخزمەتکردنی بنەماکانی نەتەوەکەیدا، وەگەرنا عێراق چی کردووە، ئایا ئێمە زەریاکانمان بڕیوەو چووین تەعەداو سوکایەتیمان بەئەمریکا کردووە، ئایا ئێمە چاوی تەماعمان لەئەمریکا بڕیوە.. وەڵامی ئەمە هیچ شتێك نیە جگە لەتۆڵەی ئەوان و تۆڵەی دێرینی زەمانی فارسەکان..

" گەلەکەمان خوێنی لەبەر ڕۆیشتووەو تائێستاش خوێنی لەبەر دەڕوات، بەڵام لەکۆتاییدا سەردەکەوێت، کاروانی ئایندەشی زیاتر جێگیر دەبێت و ئەو جوامێرانە پێشەوایەتی دەکەن کە پارێزگارییان لەماناو بەها باڵاکان کردووە، کاروانی هەموو ئەوانەی کەبەشداریان کرد لەڕزگارکردنی عێراقدا بەپشتیوانی خوا، من بڕوام بەگەلەکەمو پیاوانی نەتەوەکەم هەیە، هەروەها بەتواناکانیان لەڕووبەڕووبونەوەی دوژمناندا، پارێزگاریکردن و درێژەدان بەوپەڕی ڕادەی مومکین لەمتمانەو باوەڕ، وە من سوپاسگوزاری ئەو پیاوانەم.

" ئەو خوێنەی لەعێراق ڕۆیشتوەو لێیدەڕوات، ئیدی لەگۆڕەپانەکانی ژاوەژاودا بێت لەوانەش ئەم دادگا گاڵتەجاڕەیان، یان لەهەر شوێنێکدا بێت لەسەر زەوی خەباتو بەرخۆدان لەعێراقدا، بەرپرسیاری یەکەم لێی بریتیە لەداگیرکەر. ئەمریکیەکانیش ئێستا دان بەوەدا دەنێن کە ناو چ کەندەلانێکی ترسناك کەوتوون لەعێراقدا، بەرهەڵستکاران بەوشێوەیەی کە ئێمە دەمانەوێت دەجولێنەوە، من خۆشحاڵم کە گوێم لە پاڵەوانیەتیەکانیان دەبێت وەك ئەوەی لەناویاندا بژیم. کاتێکش بەپشتیوانی خوا عێراق ڕزگاری دەبێت، ئەوا دەستەبژێری باوەڕداری پێداگر لەسەر بنەماکانی ڕۆڵێکی پێشەنگانەو سەرکردایەتیکەرانەی دەبێت لەسەرکردایەتیکردنی عێراقدا. گەلی عەرەبی و ئەرکەکانیمان لەیاد ناچێت کەلەسەرشانمانە، هەروەها ڕۆڵی ئەو پیاوانەمان لەیاد ناچێت هاتن بۆ

بەرگریکردن لەعێراق و لەبەهاو بنەماکانی، لەرێگەی بەرگریکردن لەصەدام حسێن.
بەپشتیوانی خواو هیمەتی دلێران و جوامێران دوژمن دەڕوات، ئەمریکاش شکستخواردوو
نەفرەتلێکراو دەبێت و بۆ ناو کەندەلانی دۆزەخ گلۆردەبێتـەوە.."

دوای ئەوەی کە لەعێراق ڕویدا غەمێك لەدڵدا دەمێنێتەوەو قەتیس دەبێت. پرسیارەکەش ئەوەیە کوا سەرکردەکانی ئەو وڵاتانەی کە بەرژوەندیی هاوبەشیان هەبوو لەگەڵ عێراقدا؟ کوا سەرکردەکانی وڵاتانی عەرەب و ئەوەی دەوترا لەبارەی هاریکاریی عەرەبییەوە؟ بۆچی زۆرینە بێدەنگ بوون و واز لەعێراق هێنرا خوێنی حەلاڵ بکرێت. لەبەردەم ملیۆنان کەسدا سەربڕێت؟ هەندێکیان چاویان لێپۆشی و هەندێکی تریش بەشدارییان کرد لە وێرانکردنی عێراقدا، بەتایبەتی کە صەدام حسێن کەمتەرخەمی نەنواندبوو لەبەرامبەر هیچ کەسێکدا.

پرسیم لەسەرۆك ئایا ئەو لەپێش جەنگدا گرەوی لەسەر هەڵوێستی نێودەوڵەتی و عەرەبیی کردبوو، ئایا پێشبینی کردبوو دەوڵەتێك دەنگ بەرزبکاتەوەو بڵێت ئەوەی ئەمریکا دەیکات تەواو کارێکی شێتانەیە؟

" بە دڵنیاییەوە کورم، ئێمە لە دورگەیەکی دابڕاو لەجیهان ناژین. عێراق بەناوچەیەکی حەیەویی و گرنگ دادەنرێت، بەڵکو گۆرەپانێکە بۆ بەرژوەندییە نێودەوڵەتیەکان نەك بۆ تەنها وڵاتێك هەر چەندەش گەورەو مەزن بێت. پەیوەندییەکی بەهێزو پتەو عێراقی بەهەندێك وڵاتەوە دەبەستەوە، هەروەها پەیوەندیی بەرژوەندییە هاوبەشەکانو بەڵێننامەی بەرگریکردنی هاوبەش لەیەکتر لەگەڵ وڵاتە عەرەبیەکاندا. بەڵام هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت لە کێشە عەرەبیەکان، وەك پێویست نەبوو. پاشان ڕوسیاش، زۆر کەمەتەرخەمیی نواند لەبەرامبەر عێراق و عەرەبدا، ئەو بەلانی کەمەوە دەبوو بەژوەندییەکانی خۆی لەعێراقدا بپارێزێت.

" ڕاستە ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت، ئەوەی کەبەهۆی ئەو ڕووداوەوە ڕوویدا، وای لەئەمریکا کرد زیاتر لووتبەرزیی بنوێنێت و ستەمکاریی بکات بەوپێیەی کە ئێستا تاکە جەمسەرە لەجیهاندا، ڕوسیا ئێستاش زۆر لاوازە لەوەی کەلەچوارچێوەی یەکێتی سۆڤییەتدا بوو، بەڵام هێشتا دووەم هێزە لەجیهاندا، دەیتوانی زۆر شت بکات و بەرژوەندی خۆیی و ئەوانە بپارێزت کە بە بەڵێننامەو ڕێکەوتنەکان پێیەوە پەیوەستن.

" بەڵام بەنسبەت ڕۆڵی فەرەنساوە، ئەوا کاریگەر بوو بەهەڵوێستی هەندێك لە لایەنە خۆرئاواییەکان کەلەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکاندان، بەڵکو فەرەنسا لەو هەڵوێستانەی

دورکەوتەوە کەلەسەردەمی دیگۆلدا لەسەری بوو. پێموایە فەرەنسا، بەهۆی ئەوەی ئەمریکا وەك تاك جەمسەرێك خۆبەخۆیی چارنووسی جیهانی بەدەستەوە گرتووە، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی سیاسەتەکانی ئەمریکاوە تا ئەوکاتەی جەمسەرێکی دیکەی زەبەلاح بەدیاردەکەوێت وەك چین و هاوپەیمانەکانی.

" کەواتە دەڵێین، هەڵوێستی نێوەدەوڵەتیی، بەداخەوە، وەك پێویست نەبوو هەتا بەڕادەیەکی زۆر کەمیش نەبوو لەڕێگرتن لەوەی نەهێڵن لەساڵی ۱۹۹۱و ساڵی ۲۰۰۳دا هێرش بکرێتە سەر عێراق. بەلام من پێموایە دوای ئەوەی ئەمریکا دەڕوخێت بەپشتیوانی خواش دەڕوخێت، ئەوا ئەوروپای یەکگرتوو وەك جەمسەرێکی سەرەکیی کاریگەر لەسیاسەتی نێودەوڵەتییدا دەردەکەوێت کەسەربەخۆیی خۆیی دەبێت لەهەڵوێستەکاندا لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتیی، بەوەش هەندێك لەولاتانی عەرەبیی لەشوێنکەوتەیی سیاسەتەکانی ئەمریکا ڕزگاریان دەبێت.

"پێش ساڵی ۱۹۹۰، پێشبینی ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت و بلۆکی خۆرهەلاتم دەکرد، ئەوەش کەبەدوایدا دێت لە ناهاوسەنگیی بوونی هێزەکان، پێشبینیشم کرد کە ئەمریکا بۆ خۆیی دەسەلات بگرێت بەسەر جیهانداو عەرەبیش باجەکەی بدەن.

" کاتێك کە پشکنەرە نێودەوڵەتیەکان لەمسەری عێراقەوە بۆ ئەوسەری دەگەڕان بەدوای چەکی کۆکوژو قەدەغەکراودا، ئێمە دڵنیابووین هیچ شتێك لەوانەمان نییە کە ئەوان ڕاپانگەیاندوو لەپێناویدا هاتبوون. سەرەڕای قەناعەتی منو براکانم لەسەرکردایەتی کە ئەو پشکنەرانە سیخوڕبوون و لەبەرژەوەندیی پلانەکانی ئەمریکا کاریان دەکرد، بەلام ئێمە هیواخوازبووین کە برا عەرەبەکانمان و دۆستەکانمان وەك فەرەنساو ڕوسیاو دەوڵەتە گرنگەکان لەئەورووپاو ئاسیا، ببنە سەرچاوەی یارمەتیو پشتیوانی بۆ سەرخستنی حەقو نەهێڵن جەنگ هەڵبگیرسێت یان هیچ نەبێت ئامۆژگاریی ئەمریکایان بکردایە بەوەی بێنەوە هۆش خۆیان و شوێن گەمژەیی و کورتبینی خۆیان نەکەون. سەرەڕای ئەوەش، ڕای گشتیی جیهانی ڕەتی جەنگی دەکردەوە بەتایبەتی لەخودی ئەو ولاتانەشدا کە داوای جەنگیان دەکرد، وەك ئەمریکا و بەریتانیا و هەندێك لەولاتانی تر. ئێمە هیواخوازبووین حکومەتی ئەمریکا بێتەوە هۆش خۆیی و ئەم ڕەتکردنەوەیەی ڕای گشتی بەهێند وەربگرێت. هەروەها ئێمە هیواخوازبووین هەندێك لەولاتان ڕۆڵی خۆیان بگێڕن بۆ ڕێگرتن لەڕوودانی جەنگ بەهۆی بوونی بەرژەوەندیی گرنگیانەوە لەعێراق، وەك ڕوسیاو فەرەنساو چین و هەتا ژاپۆنیش، چونکە عێراق ولاتێکی گرنگەو خاوەنی دووەم گەورەترین یەدەگی

نەوتە لەجیهاندا. لەسەر ئەم بنچینەیەش، لە ڕووی ململانێی بەرژەوەندییەکانەوە لەنێوان ولاتاندا، ئێمە هیواخوازبووین لێنەگەڕێن ویلایەتە یەکگرتووەکان شوێن سەرشێتیی خۆی بکەوێت و گەمژەییەکی ترسناک دژی عێراق ئەنجام بدات. ئەم هیواش لای ئێمە مابووەوە هەتا دوای داگیرکردنی شارە گرنگەکانیش لەعێراق. بەپێی ئەم بەرژەوەندییە نێودەوڵەتیانەش، بەهۆی گرنگی عێراقەوە، بڕوا وابوو کە جەنگ ڕوونادات یان بەلانی کەمەوە دوا دەکەوێت. ئەگەر ڕووشیدا، ئەوا بەشێوەیەکی ترسناک پەرەناسێنێت و ناگاتە ئەو ڕادەیەی کە ئێستا پێیگەیشت. ئێمەش بەپێی خیارات و ئەو توانستانەی کەمەمانبوو حسابمان بۆ ڕوودانی کردبوو".

وا دیارە سەرۆک صەدام حسێن پێشبینی نەدەکرد کە ویلایەتە یەکگرتووەکان عێراق داگیربکات، سەرەڕای ئەوەی عێراق ڕایگەیاندبوو کە ئامادەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر دوژمنکارییەک، هەروەها بەهۆی نەبوونی هیچ پاساوێکەوە کە بیانوو بداتە ئەمریکا تا هێرش بکاتە سەر عێراق بەتایبەتی کە عێراق هەموو دەرگاکانی لەبەردەم پشنکەرە سیخوڕەکان و ئەوانی تریشدا والاکردبوو.. سەرەڕای ئەوەش پێشبینی هەموو ئەگەرەکانی کردبوو. هێزی عێراق هەر چەندێك بێت، ئەوا هیچ ولاتێکی جیهانی سێیەم ناتوانێت بەرەنگاری بەهێزترین هێزی جیهان و سوپایەك بێتەوە کە ئامادەکرابوو بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی یەکێتی سۆڤیەت بێتەوە. جگە لەمەش عێراق بۆ ماوەی سیانزە ساڵ لەژێر گەمارۆیەکی ئابوریدا بوو، پێش ئەوەش تووشی دوژمنکارییەکی فراوانبووەوە، لەساڵی ١٩٩١دا کە بۆ ماوەی ٤٠ ڕۆژ بەردەوام بوو، کە ویلایەتە یەکگرتووەکان سەرکردایەتی کردو سوپای زیاتر لە بیست و پێنج ولات تێیدا بەشداریی کرد، هەروەك چۆن ڕۆژانە ڕووبەڕووی هێرشی ئاسمانی دەبووەوە، لەماوەی ساڵەکانی ١٩٩١ و ٢٠٠٣دا چوارجار لەلایەن ئەمریکاو بەریتانیاوە هێرشی گەورەی کرایە سەر. ئیدی چۆن دەتوانێت بەهێزێکی نابەرامبەر بەهۆی ئەو ڕەوشانەوە کە تووشی هاتبوون لەبەردەم سوپایەکی بێشوماردا خۆڕاگربێت. بەتایبەتی کە زۆرێك لەچەکە گرنگەکانی نەمابوو وەك هێزی ئاسمانی و ڕادارو چەکی دژ ئاسمانیی و پەیوەندییەکان و هتد.

سەرۆك بە بەردەوامی دەپرسی: " چۆن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی و دۆستەکانمان ڕێگە بەویلایەتە یەکگرتوەکان دەدەن لەعێراق بدات، بەتایبەتی و زۆرێك لەبەرژەوەندییەکانی ئەو ولاتانە لەولاتەکەماندایە، سەرەڕای ئەوەش ویلایەتە یەکگرتووەکان پێویستی بەبڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیی هەیە بۆ ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر لێدانی

عێراق نیشانبدرێت، ئایا دۆستە ڕوسی و چینی و فەرنسیەکان وەک تەماشەکەرێک دەمێننەوە؟".

هەروەها سەرۆک ووتی"

" ئەمریکا وڵاتێکی هەوسارپچڕاوە، بەڵام ئێمە لەجیهانێکدا ناژین کە یاسای دارستان بیبات بەڕێوە. ئەی کوا یاسای نێودەوڵەتیی و بەڵێننامەکانی، ئەی کوا جیهان وێڕای برا عەرەبەکانیشمان؟ من بەدوری نازانم کە هەندێک لەوڵاتانەی عەرەبی کە بێدەنگبوون مەبەستیان ڕەزامەندیی نیشاندان بووە لەسەر هێرشکردنە سەر عێراق.

" ئێمە پێشبینیمان دەکرد ولایەتە یەکگرتوەکان بوردومانی عێراق بکات بە فرۆکەو موشەکی دوورهاوێژ، لە ئامانج و شوێنی دیاریکراو بدات وەک ئەوەی لەساڵی ١٩٩١دا روویدا، وێڕای ئەوەش کە ئەمجارە هیچ پاساوێک نیە بەدەست ئەمریکاوە وا لەوڵاتانی زلهێزو براو دۆستەکانمان بکات هاوڕابن لەگەڵ ئەمریکاداو لەبەرامبەر هێرشی ئەژدیهای هاربووی ئەمریکدا دەستەوەستان دابنیشن و دەنگیان لێوە نەیەت. بەڵام من پێشبینیم نەدەکرد کە ئەمریکا بەسوپایەکی بێشوماری پیادەو مارێنزو هی ترەوە هێرش بکاتە سەر عێراق و داگیری بکات، ئەگەر ڕووشیدا، ئەوا سنوردار دەبێت و بەو شێوەیە نابێت کە روویدا. ئێمە حسبمان بۆ هەموو ئەگەرەکان کردبوو، بەڵام بەپشتیوانی خوا، ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لەڕوویاندا دەوەستنەوە (ئەمەش شتێکی نوێ نییە لای ئێمە)، عێراق لەمەوپێش بەرگەی هەموو شەپولێکی داگیرکارییانەی گرتووە، هەر لەهۆلاکۆەو ئەوانەی کە لەدوای ئەویشەوەن، من دڵنیام کە ڕۆڵەکانی گەلە سەربڵندەکەمان لەبۆسەدا دەبن بۆیان".

## چاوپێکەوتنی سەرۆک لەگەڵ وەزیرێکی ئێرانیدا

سەرۆک چیرۆکی زۆری بۆ گێڕامەوە دەربارەی چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ سەرکردە سیاسیەکانی عەرەب و وڵاتانی دراوسێدا، لەوانەش ئەم چیرۆکە:

" ڕۆژێکیان لەساڵی١٩٧٩ لەپەراوێزی لوتکەی بزوتنەوەی وڵاتانی بێ لایەندا لەکوبا، وەزیری دەرەوەی ئێران، کەبەتەواوی ناوەکەیم بیرنایەتەوە، داوایکرد چاوی پێمبکەوێت. لەو چاوپێکەوتنەدا هەوڵیدەدا کە بانگەشە بۆ شۆڕشی خومەینی و ئامانجەکانی بکات. هەروەها باسی لەپەیوەندییەکانی شا کرد لەگەڵ ئیسرائیلدا. ئەو داوای لەئێمەی عەرەب دەکرد کە پێشوازی لەشۆڕشی ئیسلامیی بکەین. لەو داواکارییە نامۆیانەشی ئەوە بوو کە عێراق دەست لەکاروباری ئێران وەرنەدات.

پێم ووت شۆڕشەکەتان با بۆ خۆتان بێت، وازیش لەوڵاتانی دراوسێ بێنن با بەخۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن، هەروەها پێویستە لەسەرتان سێ دورگە عەرەبیەکە بەجێ بهێڵن. قسەی زۆری لەوبارەیەوەم بۆ کرد. ئەویش بەشێوەیەکی ناشیرین و بێ شەرمانە وەڵامی دامەوە: ئێوە مافی ئەوەتان نیە دەست لەچارەنووسی ئەو سێ دورگەیە وەربدەن، کەسیش ڕاینەسپاردون لەبری وڵاتی ئیمارات داوای ئەو سێ دورگەیە بکەنەوە، ئێمە ئامادە نین لەوبارەیەوە قسەتان لەگەڵ بکەین. پێمڕاگەیاند کە پێویستە لەسەریان بەباشی پەیڕەو و پڕۆگرامی ئێمە بخوێننەوە بۆ ئەوەی بەهەڵە مامەڵەو هەڵسوکەوت نەکن، پێویستە لەسەریان بزانن ئێمە بەعسین ، هەموو کێشەیەکی عەرەبی کێشەی ئێمەیەو پێویستمان بەکەس نیە لەوبارەیەوە ڕامانبسپێرێت.

" لەبەرئەوە، پێویستە لەسەر برا عەرەبەکانمان و بەتایبەتی سەرکردەکان ئەوەیان بەبیربێتەوە کە چۆن عێراق وەك بەربەستێك وابوو لەبەرامبەر فارسەکان و نیازە شەڕانگێزیەکانیاندا. ئێران خەون دەبینێت بەڵکو پلان دادەڕێژێت بۆ ئەوەی لەدوای دیارنەمانی عێراق و هێزەکەی کەنداوی عەرەبی داگیربکات، بەڵام ئەگەر عێراق بەو شێوەیە بمایەتەوە کە پێش داگیرکارییە ستەمکارییەکەوە بۆ سەری هەبوو، ئەوا ئێران نەیدەتوانی دەستدرێژیی بکاتە سەر برا عەرەبەکانمان.

" کاتێك کە بەپاڵپشتی ئەمریکا خومەینی هاتە سەر حوکم، گروپ و دەستەو تاقمەکەی هەستان بەئاژاوەو پاشاگەردانییەکی زۆر لەئێراندا. ئەوکاتە ووتمان: ئەمە شۆڕش نییە بەڵکو ئاژاوەو بێسەروبەرەییە.

" پێویستە لەسەر برا عەرەبەکانمان هەمیشە ئەو ڕاسپاردەیەی شایان لەبیر بێت کە بۆ کوڕەکەیی کرد کاتێك کەپێی ووت: کوڕەکەم، من بەرەی خۆرهەڵاتی دەریای عەرەبی و کەنداوی (فارس)م بۆ ڕام و مسۆگەر کردووی"، ئەوەی لەسەر تۆیە کە بەرەی خۆرئاوا ڕام و مسۆگەر بکەیت. بەدڵنیایشەوە کوەیت یەکەمین زیانمەند دەبێت. سەلامی خوا لە (عومەر)ی سەروەرمان بێت کاتێك ووتی: خۆزگە لەنێوان ئێمەو فارسدا شاخێك لەئاگر هەبووایە".

لێرەدا سەرۆك ئەو چیرۆکە دەگێڕێتەوە لەبارەی ئەوەی کەعێراق ڕێگەی بەهیچ بەخشینێك نەدەدا کەلەلایەن ئێرانەوە بهێنرێت بۆ سەر مەزارگە پیرۆزەکان، دەڵێت:

(( ڕۆژێکیان، کاتێك کە جێگری سەرۆك بووم، بەشێوەیەکی پەنهان و نائاشکرا بەهەندێك ناوچەکانی بەغدادا دەگەڕام، ژمارەیەکی زۆر لەخۆپیشاندەرانم لەبەردەمدا

بینیەوە. هەندێك لەخۆپیشاندەرەکان پەنجەرەی ئاسنیان هەڵگرتبوو. لەئۆتۆمبیلەکە هاتینە دەرەوەو لەیەکێکیانمان پرسی مەسەلە چییە، ووتی: ئەوانە لەگەڵ ئێمەن، ئێرانین و بەخشینیان لەئێرانەوە هێناوە بۆ سەر مەزاری حوسەینی باپیرمان. پێمان ووت: ئێمە تەنها پەنجەرەیەك دەبینین. وەڵامی دایەوە" لەفلانە ناوچەی تریش پەنجەرەیەك هەیە. چووین بۆ ئەوێ، لەوێش قەرەباڵغی و خۆپیشاندانێکمان بینی، خۆپیشاندەرەکان پەنجەرەیەکیان هەڵگرتبوو کە هەر ئاسنگەرێکی عێراقی کەوا کەمترین کارامەیی هەبێت دەتوانێت هەزارجار لەوە باشتر دروست بکات. لێرەدا وەزارەتە پەیوەندیدارەکانمان ئاگادارکردەوە کە هیچ بەخشینێك وەرنەگرن کەلەئێرانەوە بێت، حسێن باپیرە گەورەی ئێمەیە، ئێمە لەهەرکەسێکی تر لەپێشترین بۆ ئەوەی لەسامان و سەروەتی زۆرو زەبەندی عێراق ببەخشینە مەزارەکە. بەداخەوە، ئێرانییەکان بەو شێوەیەن، سادەیی هەندێك کەس دەقۆزنەوە بۆ بەرێکردنی پلانە گومانلێکراوەکانیان. بەڵام ئێستا، ئەوا هیواخوازم عێراقیەکان ئاگایان لەم مەسەلەیە بێت)).

## یادەوەرییەکان لەگەڵ هەندێك لەبرا عەرەبەکاندا

قسەوباسەکان لەگەڵ سەرۆکدا سەریانکێشا بۆ هەندێك لەیادەوەرییەکانی لەگەڵ برا عەرەبەکانداو ووتی:

" لەساڵی ١٩٨٠دا، لەگەڵ سعودییەدا بڕیارێکمان ئیمزا کرد بۆ ئەوەی وڵاتانی جیهان لەگواستنەوەی باڵیۆزخانەکانیان بۆ قودس ئاگاداربکەینەوە، پێش گەڕانەوەم بۆ بەغدا، هەندێك لەوڵاتان دەستیان کرد بە گێڕانەوەی باڵیۆزخانەکانیان بۆ تەل ئەبیب، لەبەرئەوەی تەنها پێمان ووتبوون ئێمە چەکی نەوت لەدژی هەر وڵاتێك بەکاردەهێنین ئەگەر باڵیۆزخانەکەی بەرێت بۆ قودس. ئەو بڕیارە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو سەرەڕای ئەوەی تەنها لەنێوان دوو وڵاتدا ئیمزا کرابوو. ئەوان دەرکیان بەسووربوونی هەڵوێستەکەمان کردبوو.

پەیوەندییەکانمان لەگەڵ سعودییەدا باش بوون. خوالێخۆش بوو شا فەهدی برام پێی ووتم: فلانە کەس، ڕات چۆنە بابەتی ناکۆکی سنووریی نێوان عێراق و سعودییە یەکلایی بکەینەوە. منیش بۆ ئەمە یەکڕاست وەزیری دەرەوەم ڕاسپارد بەبێ هاتنە ناوەوەو دەستێوەردانی هەردوو سەکردایەتیەکە)).

## سەردانی سەرۆك بۆ سعودییە لەساڵی ١٩٩٠

ساڵی ١٩٨٨ تازە عێراق لەجەنگێکی وێرانکار هاتبۆوە دەرەوە کە ڕژێمی ئێران کردیە سەری، کەتێیدا لەمێژووی نوێی عەرەبدا عێراق گەورەترین سەرکەوتنی بەدەستهێنا. بەپێچەوانەی ئەوەوە کە بۆیان دەویست بەلاوازی لێی بێتە دەرەوە، بەڵکو وەك چوارەم بەهێزترین سوپای جیهان لێی هاتەدەرەوە، لەگەڵ تەرسانەیەك لەچەکی نوێ و سوپایەکی بێشومارو سەرکردەگەلێك کەخاوەن شارەزایی مەیدانی بوون لەهەموو جۆرەکانی جەنگدا.

کاتێك کە شا فەهدی کوڕی عەبدولعەزیز بەهاتنی سەرۆکی زانی بۆ شانشین، کەهێشتا فڕۆکەکەی بەئاسمانەوە بوو، بۆ پێشوازکردنی میوانە گەورەکەی ڕاپەڕی کە هەر لەساڵی ١٩٨٠ ەوەو کە ئەوکات ئەو وەلی عەهد بوو پەیوەندییەکی پتەو لەنێوانیاندا هەبوو. کاتێك کە سەرۆك گەیشتە فڕۆکەخانە، شا فەهد بەگەرمیەوە لەئامێزی گرت. بەرێکەوت لەوکاتەدا باران دەباری، شا فەهد پێی ووت: **وەڵلاهی باوکی عودەی هەتا ئاسمانیش بەخەیروبەرەکەتی خۆی پێشوازی لێکردی.**

لەو شوێنەدا کە تەرخان کرابوو بۆ سەرۆك هەردوو سەرکردە کۆبوونەوەو بەدرێژیی باسیان لە خەم و نیگەرانیەکانی نەتەوەو، پەیوەندییە توندوتۆڵەکانی نێوان عێراق و شانشینی عەرەبی سعودیە کرد، هەروەها لەبارەی ئایندەی ناوچەکەو بەتایبەتی مەسەلەی فەلەستینەوە دووان کە ئێستا ئەو مەسەلەیە تەوەری ململانێکانە لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

سەرۆك بێزاریی توندی خۆیی دەربڕی لە هەڵسوکەوتەکانی کوەیت، کوەیتیش هەڵناسێت بەم پلماندنانە ئەگەر لایەنێکی دەرەکی هانی نەدات. ووتیشی عێراق پاراستنی شانشین و هەر وڵاتێکی تری کەنداو لەئەستۆ دەگرێت و دەیپارێزێت لەهەر دەستێوەردانێکی دەرەکیی.

شا فەهد داوای لەسەرۆك کرد کار بۆ ئارامکردنەوەی ڕەوشەکە بکات، شانشینیش هەموو هەوڵەکانی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ چارەسەکردنی هەموو کێشەو گرفتەکان لەناوچەکەدا بەتایبەتیش لەنێوان عێراق و کوەیتدا، هەروەها شانشین هەڵدەستێت بەباشکردنی ئابووریی عێراق بۆ ئەوەی بتوانێت بێتەوە سەرخۆی، داواش لەوڵاتانی کەنداو دەکات یارمەتی عێراق بدەن، ووتیشی: باوکی عودەی، هیوادارم نە ئێمەو نە ئێوەش کارێك نەکەین کە ببێتە هۆی ئاڵۆزیی زیاتر لەناوچەکەدا. کە دەبێتە بیانوو بۆ هاتنی کەشتیگەل و سوپاکان، ئەگەرنا کارەساتێك لەهەموو ناوچەکەدا ڕوودەدات کەهەڕەشە لەئێستاو ئایندەی

نەتەوەکەمان دەکات. داوای لەسەرك صەدام حسێن کرد کە گوێ بەپلماندان (استفزاز)ەکانی کوەیت نەدات و ووتی: کوەیت تەنها ولاتێکی بچووکە، بەلام خۆرئاواو ئەمریکا بەرژەوندیی گەورەیان تێیدا هەیە، هەر دەستدانێکیش لەو بەلاو نەهامەتیی بۆ ناوچەکە دەهێنێت.

دوای تەواو بوونی سەردانەکە، سەرۆك داوای لە شا فەهد کرد بێتە میوانی عێراق، شا فەهدیش ئەوەی قەبولکردوو هەر لەو ساڵەدا سەردانی عێراقی کرد.

## پەیوەندیی عێراق بەئۆردنی براوە

سەرۆك بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

" ئێمە فرۆکەخانەمان هەبوو لەناو خاکی ئۆردندا لەپێناو پشتگیریی و پشتیوانیی لەئۆردن، شا حسێن لێی پرسیمو وتی: لەدانابیت پرسیار دەکەین دەربارەی ئەم بابەتە. منیش پێم ووت: فرۆکەخانەو زەوی فرۆکەخانەو ئەوەی دوای فرۆکەخانەو پێش فرۆکەخانەش هی تۆیە. هەموو ئەوەش لەلایەنی سەروەرییەوە نەك سیاسەت.

(( بیرم دێت ئۆردنی برا لەیەکێك لەساڵەکاندا بە نەدارییەکی داراییدا دەڕۆیشت. زانیم کە شا بەرێوەیە بۆ کوەیت. کوەیتیەکان بە شاحسێنیان ڕاگەیاندبوو کە وەزیری دەرەوە لەفرۆکەخانە لەپێشوازیدا دەبێت، وێڕای ئەوەی کە جابری میری کوەیت خۆی لەولات بوو، هیچ شتێکیش نەبوو کە بیانووی پێ بێنێتەوە کە بۆچی خۆی ئامادەی پێشوازیکردن نابێت لەشا حسێن. ئەم هەڵسوکەوتەش لەگەڵ پرۆتۆکولی فەرمیی و ڕەوشتی عەرەبیماندا ناگونجێت.

شا حسێن بەمە دڵتەنگ و نیگەران بوو. بۆیە پەیوەندیم پێوە کرد کە ڕەوتی گەشتەکەی بگۆڕێت و بێت بۆ بەغدا. یەکسەر بۆ پێشوازلێکردنی چووم بۆ فرۆکەخانە هەتا هەندێك لەهاوڕێیان سەرسام بوون، چونکە پێشوەخت بەو سەردانەیان نەزانیبوو. ئەوکاتە عێراق لەژێر گەمارۆیەکی ئابوریی ستەمکارانەدا بوو، بۆ خێرایکردنی ڕێوشوێنەکان، داوام لە سکرتێرەکە کرد پارێزگاری بانکی ناوەندیی و وەزیری دارایی بانگهێشت بکات، داوام لێکردن چی دراوی قورس لەخەزێنەی عێراقدایە بیکەن بەدوویەشەوە، بەشێکی لەخەزێنەدا بمێنێتەوەو بەشەکەی تریشی بۆ براکانمان لەئۆردن. ئێمە وەلامی داواکارییەکانی شا حسێنمان دایەوە چونکە بەیەك چاو سەیری عێراق و ئوردنمان دەکرد.

(( حاڵەتێکی هاوشێوەش لەگەڵ سەرۆك حوسنی موبارەکدا ڕوویدا، کاتێك کەڕەوشی دارایی میسر زۆر خراپ بوو. هەڵوێستێکمان وەرگرت کەنامەوێت بچمە ناو ووردەکارییەکانیەوە. بەڵام ئەو هەڵوێستێکی وا لەدژی ئێمە وەربگرێت، ئەوا ئەمە شتێکی سەیرو نامۆیە، هیچ هۆیەك نیە کەشایان بەو کارە بێت.

(( کاتێك کە ئەو هەڵوێستانە باس دەکەین، لەو ڕووەوە باسی ناکەین کە منەت بەسەر کەسدا بکەین یان بەو ووتەیە خۆشنودبین، بەڵکو لەبەرئەوەی ئێمە بڕوامان وایە ماڵ و دارایی عەرەبی یەکێکە، خەیروبێرەکانی ئوممەتیش پێویستە بخرێتە خزمەت گەلەکانیەوە، ئێمە هیچ کاتێك ناوچەیی و هەرێمیی نەبووین، هەروەها تەسك بین نەبووین، بەڵکو بەیەك چاو دەڕوانین بۆ عێراقی و مۆریتانییەك وەك چۆن دەڕوانین بۆ فەلەستینی و میسری و ئوردنی و کەنداویی و ئەوانی تر. ئەم ڕوانینەی ئێمەش مایەی خۆشحاڵی دوژمنەکانمان نەبوو، چونکە ئەمە بەسەر حاڵەتی دابەشبوون و هەرێمچیەتیدا زاڵ دەبێت کە سایکس بیکۆ و بەڵێننامەکانی تر بۆیان دارشتووین.

(( لە کۆنگرەکانی لوتکەی عەرەبیدا، ئەمریکا بەشێوەیەکی ئاشکرا دەستی تێوەردەدا، یان بە پەیامێکی نوسراو یان لەرێگەی نوێنەرەکانیەوە، پێی دەوتن چی دەڵێن و چی دەکەن. ئێمە دەمانووت بەبرا سەرکردە عەرەبیەکانمان گوێ لەئەمریکا مەگرن و سەرشۆڕیی با بەس بێت.. وادیار بوو ئوممەت فشاری لەسەر بوو، کورسیش هەندێك جار لەپێناو خودی کورسیدا وەڵامی فشار دەداتەوە. بەڵام صەدام حسێن وەڵامی فشاری نەدایەوە، بەڵکو وەڵامدانەوەی بۆ نەتەوەو بۆ خەباتەکەیەتی. ئێمە هەمیشە دەمانووت عێراقی بەهێز توانای هەر بەرەنگارییەکی هەیە و دەتوانێت پارێزگاریی لە نەتەوە بکات، بەڵام هەندێك لە بەرپرسانی عەرەب عێراقیان فەرامۆشکرد ئیدی لەبەر فەرامۆشیی یان لاوازی یان ئیرەیی، لەبیریان چوو عێراق پاڵپشتێکە بۆ ئەوان و دەتوانێت خەونی دوژمنان تێکبشکێنێت. هەروەك چۆن ئەوە لەنیشتمانی عەرەبیدا زانراوە، کە لەنێوان سەرکردەکاندا ئیرەیی هەیە، کاتێك کەیەکێکیان وەك سەرکردە دەردەکەوێت، ئەوا تیرەکانی ئیرەیی بەسەریدا دادەبارن.

لەبەرئەوە، ئێمە داوا لەبرا عەرەبەکانمان دەکەین و بەتایبەتی خاوەن شکۆو پایەدارن با بەرپرسیارێتی خۆیان لەبەرامبەر نەتەوەکەیاندا لەئەستۆبگرن و منیش دڵنیایان دەکەمەوە کە من جێی متمانەیان دەبم.

# بەشی پانزەیەم

## داواکردن لە سەرۆك بۆ وازهێنان لەدەسەلاَت و دەستپێشخەریەکەی شێخ زاید

سوپاس بۆ خوا، گەلەکەمان وەك ئەوەی کە هەین، ئێمەی بە دەستپاکیی و ڕاستگۆیی ناسیوە.
لەهەمانکاتیشدا، تێماندا هەستی بەهێزو خۆڕاگریی و دادپەروەریی و بەزەیی کردووەو، ئەم خەسڵەتانەی لەئێمەدا بینیوەتەوە.

(صەدام حسێن لەزیندان)

پێش ئەوەی پرسیار لەسەرۆك بکەم دەربارەی داوایەك کە خوالێخۆش بوو شێخ زاید ئالنهەیانی سەرۆکی دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی لەسەرۆك صەدام حسێنی کرد بۆ ئەوەی واز لەدەسەلات بهێنێت و، بە دەستپێشخەریی شێخ زاید ناونرا، بابەتی وازهێنان لەدەسەلاتم لەگەلّیدا باسکرد، ووتی:

" بەلّێ کورِم خەلیل، ئەگەر خوا وویستی، دوای ئەوەی ئەو ماوەیە کۆتایی دێت کە گەل هەلّیبژاردووین بۆ خزمەتکردنی (دوایین خول لەسالّی ٢٠٠٩)، من پێشتر برِیارمدابوو کە بحەوێمەوەو سەرکردایەتیکردنی عیراق بەجێ بهێلّم بۆ براکانمان لەسەرکردایەتی. من زۆر ماندوو بووم، دەمەوێت بحەوێمەوەو بەشێوەیەکی زیاتر خۆم بۆ پەرستنی خوا تەرخان بکەم. بەلاّم مەسەلەی ئەوەی بەزۆر لەو شوێنەمان دەربچین کەوا گەلە مەزنەکەمان بۆی هەلّبژاردووین، ئەوا ئەمە مەحالّە، چونکە ئێمە ناکەوینە ژێر فشارو زۆرلێکردنەوە".

### دەستپێشخەریەکەی شێخ زاید

کاتێك کە بوش دەهۆلّی جەنگی دەکوتی، گوێی لەهەموو ئەو بانگەوازانە نەگرت بۆ ئەوەی هێرش نەکاتە سەر عێراق، شێخ زاید، سەرۆکی دەولّەتی ئیماراتی عەرەبی یەککگرتوو، بۆ ئەوەی شەرِ لەعێراق لابدرێت دەستپێشخەرییەکەی پێشکەشکرد، ئەم دەستپێشخەریەش لەنامەیەکدا هاتووە کە شێخ زاید ئاراستەی شێخ حمدی کورِی عیسای کورِی سەلمان ئال خەلیفەی پادشای بەحرێنی کردووە بەو پێیەی کە ئەو سەرۆکی لوتکەی عەرەبی بوو کەلە کۆتاییەکانی مانگی شوبات/فێبرایەری ٢٠٠٢دا لە شەرەم شێخ دەبەسترا، ناوەرۆکی دەستپێشخەریەکەش ئەم چوار خالّەی لەخۆگرتبوو:

١- سەرکردایەتی عیراقی دەستبەرداریی دەسەلاّت بێت و، عێراق بەجێ بهێلّێت بەمەرجێك هەموو ماف و تایبەتمەندییەکی پارێزراوبێت، ئەویش لەماوەی دوو هەفتە لە بەرواری رِازی بوون بەم دەستپێشخەرییە عەرەبییە.

٢- پێشکەشکردنی گرێنتی یاسایی کە لەسەر ئاستی ناوچەیی و

نێودەوڵەتیدا کارپێکراوبێت کە هیچ جۆرە لێپێچینەوەیەکی لەگەڵدا نەکرێت و بەهیچ شێوەیەك لەشێوەکان ڕووبەڕووی گرتن و بەدواداگەڕان نەبێتەوە.

٣- دەرکردنی لێخۆشبوونێکی گشتیی و هەمەگیر بۆ هەموو عێراقیەکانی ناو عێراق و دەرەوەی.

٤- کۆمەڵی وڵاتانی عەرەبی بەهاوکاریی لەگەڵ ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرپەرشتی ڕەوشی عێراق دەکات بۆ ماوەی گواستنەوەو لەو ماوەیەشدا ئەوەی پێویست بێت لەگرتنەبەری ڕێوشوێنەکان ئەنجام دەدرێت، لەپێناو گێڕانەوەی کاروبارەکان بۆ ڕەوشی سروشتی خۆیان بەپێی ئەوەی کە گەلی عێراق بیری لێدەکاتەوەو بڕیاری لەسەر دەدات.

کەواتە دەستپێشخەرییەکە ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ چارەسەرێك نیە بۆ خۆلادان لەجەنگی سەر عێراق تەنها بەلاچوونی صەدام نەبێت لەدەسەلات! بەلام لوتکەی عەرەبی دەستپێشخەرییەکەی ڕەتکردەوەو بە پێشینەیەکی ترسناکی لەقەڵمدا. ئێمە هێشتا سەردانی دووەمی بریماکۆفمان لەیادە بۆ عێراق، پێش دەستپێکردنی جەنگ، کاتێك کە سەرۆك لێی پرسی: با وا دابنێین ئێمە وەلامی ئەو داوا ناپەسەندەمان دایەوە، وازهێنان لەدەسەلات و دەرچوون لەعێراق لەگەڵ خێزانەکەمدا، ئایا گەلەکەمان لە زیان و خراپەکارییەکانیان بەدوور دەبن. *بریماکۆف بە نەخێر وەلامی دایەوە. ووتی: بە بوونی تۆ و بەنەبوونت ئەمریکیەکان دێنە ناو عێراقەوە...*

وتوێژ لەنێوان من و سەرۆکدا بەردەوام بوو دەربارەی دەستپێشخەرییەکەی شێخ زاید و ڕەتکردنەوەی لەوکاتەدا، ووتی:

(( کەسێك کە بەرچاو ڕوون نەبێت لەبینینی ڕووداوەکاندا ڕەنگە بڵێت، بۆچی عێراق و صەدام حسێن ئەم دەستپێخەرییەیان قەبوڵ نەکرد بۆ ئەوەی عێراقیان لابدایە لەوەی کە ڕوویدا؟ بەو کەسانە دەڵێم کە شێخ زاید، خوالێخۆش بێت، دانایەکە لەداناکانی عەرەب و دەزانێت چۆن هەڵسوکەوت بکات. بەلام ئەوەی دراوتە پاڵی کە ئەمە دەستپێشخەریی ئەوە، ڕاست نیە و هی ئەو نیە، بەڵکو لەژێر فشارو کاریگەریی ئەمو ئەودا بەوەوە لکێنراوەو بەناوی ئەوەوە پێشکەشکراوە. ئێمە سەرکۆنەمان کرد کە بۆچی ئەو دەستپێشخەرییە خراپەی خستۆتە ئەستۆی خۆیەوە.

لەو کاتەدا بە ئەبو ئەحمەد (عیزە دووری)م ووت: جارێکی تر دوژمنان بەد حاڵیی دەبن و خراپ بیردەکەنەوە، ئەوان پەیڕەو پرۆگرامی بەعس ناناسن و شارەزای نین، هەروەها هەقیقەتی صەدام حسێن و هاوەڵەکانی نازانن. ئەوان پێشبینی دەکەن، بەتایبەتی بۆش، کە دەتوانن بەتەنها هەڕەشەو گوڕەشەیەك عێراق و سستەمە نیشتمانیەکەی ببەزێنن. کاتێکیش کە نیازو مەرامە شەڕانگێزیەکان بە دەروونە نەخۆشەکان تێکەڵ دەبێت ئەوانەی کە ملکەچی فەرمانی ستەمکارەکان دەبن لەئەمریکای شەڕو ئیسرائیل، ئەوا خۆشنودیکردن لەگەڵ هەر مرۆڤێکدا یان بێدەنگ بوون لەکردەوەکەی بەپێداگرتن و سووربوون لەسەر خراپەو زیانگەیاندن، پێویست دەکات بەدەنگێکی بەرزو بەرگریکردن لەهەق وەڵامی کردەوەیەکی وا بدرێتەوەو.

(( من متمانەم هەبوو کە عیزەت دووری جێگری سەرۆك هەڵوێستی پێویست لەبەرامبەر ئەمەدا وەردەگرێت، بەڵام گەشتە خێراکەی ، نەیهێشت مشتومڕی ئەم مەسەلە ترسناکەی لەگەڵدا بکرێت.

(( خاوەنانی ئەم بیرۆکەیە پێیان وابوو سەرکردایەتی نیشتمانی و صەدام حسێن وەڵامی ئەم ڕاوبۆچوونە خراپە دەدەنەوەو بەپیریەوە دەچن، بەهۆی ئەو ترسەوەی کە لە خەیاڵگەی نەخۆشیاندا وێنایان کردبوو، ئەم ترسەی کە بەبڕوای ئەوان ئەهلی باوەڕ شکست پێدەهێنێت، سەرکردایەتی نیشتمانی گەلی عێراق بەجێ بهێڵن و لێگەڕێن هاوەڵانی ڕێگەو خەبات بەتەنها خۆیان ڕووبەڕووی دوژمنکاریی ئەمریکاو زایۆنیزم ببنەوە... ئێمە قەدەر بۆ ئەم لێپرسراویەتیە هەڵیبژاردوین، وەك شۆڕشگێڕو خەباتگێڕ، هەر لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٩ەوە، بۆ ئەوەی ببینە بەشێك لەم گەلە مەزنەی کە بەنرخترین قوربانیەکانی پێشکەشکردووە، ئێمەش دەستی پێوەدەگرین و وازی لێ ناهێنین، وەك چۆن ئەو لە زەحمەترین ڕەوشەکاندا وازی لەئێمە نەهێناو دەستبەردارمان نەبوو.. من لەزیاتر ئامادەین بەباوەڕو هەق بەهێزی بکەین. ئێمە ئەمریکاو ئیسرائیل نەیهێناوینەتە سەر حوکم و فەرمانڕەواییکردن، ئیدی چۆن لێی بترسین.. لەبەرئەوەشە کە ئەو پلانگێڕیی لەدژمان ئەنجام دەدات. هەتا ئەو وڵاتانە کە ڕازیبوون، یان ڕازی بوون لەسەر دەستپێشخەرییەکەی خۆیان نوساندووە بە شێخ زایدەوە، ئەوا ئەم وڵاتانە خراپەیان بۆ عێراقناوێت، بەڵام

بەباشی بەدیی و فێڵ و تەڵەکەکانی زایۆنیزمیان نەخوێندۆتەوە، جگە لەشێخەکانی کوەیت کە مەبەستیان بوو هەموو زیانێك بەعێراق بگات.

((ئێمە پێش ئەوەی ڕەتیبکەینەوە تەنها بەبیستنی ئەوەی پێیدەوترێت دەستپێشخەریی، زۆربەی برا عەرەبە سەرکردەکانمان ڕەتیان کردەوە لەناویشیاندا شانشینی عەرەبیی سعودییە، دەبا نزمی و لەناوچوون بەشیان بێت ئەگەر بروایان وایە صەدام و هاوەڵەکانی عێراقیان لەسەر سینیەکی ئاڵتون پێشکەش دەکەن. لەگەڵیان جەنگاوین و لەگەڵیشیان دەجەنگین هەتا شکستیان پێدەهێنین، ولآتەکەمانیان لێ ڕزگار دەکەین و بەشێوەیەك شکستیان پێدەهێنین کە جیهان لەشەڕیان ئاسودە بکەین.

(( ئەوان بۆچوونیان وابوو کە ڕازیبوونمان لەسەر دەستپێشخەریەکە، وایان لێدەکات بێ جەنگ عێراق وەربگرن، لەحاڵەتێکیشدا ئەگەر داواکانمان ڕەتکردنەوە ئەوا بەپێی بەڵێننامەی بەرگریی هاوبەش عێراق بێ بەش دەکەن لەهەڵوێستی برا عەرەبەکانی. ئەم ڕەتکردنەوەیە شایانی سازش لەسەرکردن نییە هەتا لەناڕەحەترین ڕەوشەکانیشدا، ئەویش بەبیانووی ڕەتکردنەوەی دەستپێشخەرییەکە بەرپرسیارێتیەکە بخرێتە ئەستۆی صەدام و عێراق خۆیەوە. بەوەش، لەهەردوو حاڵەتەکەدا، ئەمریکاو زایۆنیزم مەبەستە پیس و گڵاوەکانیان بەدیدەهێنن، بەمەش بە بەردێك دوو چۆلەکە دەکوژن. بەڵام ئەوان هەمیشە ئێمە لەسەر سنگی خۆیاندا دەبیینەوە، لەناو بەرەکانی جەنگدا..

**بۆش و نرخی دوورکەوتنەوە ( لەدەسەلآت )!**

لەکاتێکدا کە هەموو فشارەکان لەسەر سەرۆك بوون بۆ ئەوەی لەفەرمانڕەوایی دووربکەوێتەوەو واز لەدەسەلآت بهێنێت، بۆ ئەوەی بەهەڵە لەهەمووان بگەیەنرێت کە وازهێنانی ئەو لەدەسەلآت لەبەرژەوەندی عێراقە، سەرەڕای ئەوەی کە بریماکۆف لەسەردانی دووەمیدا بۆ عێراق ووتی، هەروەها ئەو هەوڵانەی کە ئیمارەتی عەرەبی یەکگرتوو لەبەردەم لوتکەکەدا لەگەڵ سەرۆکەکاندا خستیەگەڕ لەپێناو ئەوەی سەرۆك صەدام حسێن و گەورە یاریدەدەرەکانی لەدەسەلآت دوورکەونەوە، ئەو دەستپێشخەریەش لەوکاتەدا وادانرا کە یەکەم جارە دەوڵەتێکی عەرەبیی داوایەکی فەرمیی لەمشێوەیەی ئاراستە بکرێت. لەوکاتەدا بەپێی ڕۆژنامەی ئیل باییسی ئیسپانیی کە لەژمارەی ڕۆژی

٢٠٠٧/٩/٢٦دا بڵاوکراوەتەوە، بۆش لە کرۆفۆردی تەکساس لە ٢٠٠٣/٢/٢٢دا لەگەڵ خۆسیە ئەسناری سەرۆك وەزیری ئیسپانیادا کۆدەبوویەوە. بۆش لەکاتی ئەو کۆبوونەوەیەدا وتی صەدام حسێن ئامادەیە بڕوات بۆ مەنفا بەمەرجێك یەك ملیار دۆلاری پێبدرێت. ئەسناریش پرسیاری ئەوەی لێکردبوو کە ئایا بەڕاستی صەدام حسێن دەڕوات، وەڵامی بۆش ئەوەبوو بەڵێ لەگەڵ ئەگەری ئەوەدا کەڕەنگە تیرۆر بکرێت. ڕۆژنامەکە دەڵێت لەوکاتەدا بۆش فشاری دەخستە سەر وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی پشتیوانی بڕیاری بەکارهێنانی هێز بکەن، هەروەها وتی: هەرچییەك ڕوویدات " لەکۆتایی مانگی ئازاردا لەبەغداد دەبین".

بەپێی ڕۆژنامەکە، ئەوا بوش بەشێوەیەکی گەشبینانە ئاماژەی بۆ سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی عێراق کردووە، هەروەها بڕوای وابووە کە عێراق " دەکرێت لەچوارچێوەیەکی فیدراڵیدا ڕێکبخرێتەوە". هەروەها ووتی:(( صەدام ناگۆڕێت و بەردەوام دەبێت لەسەر یاریکردن. ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە لێی ڕزگاربین و لەکۆڵی بکەینەوە".

ئەوەی صەدام حسێن بناسێت، دەزانێت کە هەموو پارەوپولەکانی جیهان ناتوانن فریوی بدەن بۆ ئەوەی نیشتمان و گەلەکەی بەجێ بهێڵێت بۆ ئەو هەرچی و پەرچییانە.. ئەگەر پارەش فریوی بدایە وەك ئەوەی دوژمنەکانی و دوژمنانی عێراق پێیان وایە، باشە بۆچی ئەم دەستپێشخەرییەی قەبوڵ نەکرد. سەرۆك بە قوڵی لە دەروون و سایکۆلۆژیەتی دوژمنەکانی و بەتایبەتیش بۆش شارەزابووەو دەزانێت ئەوان دەیانەوێت بەهەر نرخێك بووە عێراق داگیربکەن، صەدامیش لەبینیان گیربووەو دەیانەوێت دەری بێنن.

# بەشی شانزەیەم

## هەوڵە دبلۆماسیەکان
## بۆ ڕزگارکردنی سەرۆک

من تێناگەم کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی چۆن مامەڵە لەگەڵ سیمبولەکانی داگیرکەردا دەکات سەرەڕای ئەوەش کە دەزانێت عێراق وەك هێڵی پێشەوەی بەرگریی وایە لە نەتەوەی عەرەب، ڕوخانی عێراق و پسانی ئەم هێڵەش واتە لافاوەکە هەمووان ڕادەماڵێت و کارەساتەکە گشت لایەك دەگرێتەوە.

(صەدام حسێن لە زیندان)

سەرۆك صەدام حسێن متمانەی تەواوی پێبەخشیبووم بۆ ئەوەی بەپێی تێڕوانینی خۆم بۆ مەسەلەکان بجولێمەوە، بەپێی ئەو ڕەوشانەیش کە فەراهەمبوون بۆ سەردانی ئەو ولاتانەی کە پێموایە ڕەنگە کاربکاتە سەر دیمەنی عیراقیی. سەرۆك ڕۆڵی من و مەترسی پەرچەکردارەکانی دوژمنەکانی و دوژمنانی عێراقی بەهەند دەزانی، دوای ئەوەی زانی کە بۆ چەندین جار ڕووبەڕوی تیرۆرکردن بوومەتەوە (یانزە جار)، ئەو لەبەردەم هاوەڵە پارێزەرەکانمدا ڕۆڵی منی بەرزدەنرخاندو ستایشی دەکردم، لەدەرەوەی چوارچێوەی کاروبارە یاسایيەکانەوە لەزۆر مەسەلەدا پشتی پێدەبەستم. لێرەوە، لەگەڵ توندوبونەوەی ڕەوتی بەڕێوەچوونی گاڵتەجاڕانەی دادگاییەکە لەدوای مانگی پێنجەمی ساڵی ٢٠٠٦، ڕایسپاردم هەندێك پەیامی دەمی و نووسین بەرم بۆ ژمارەیەك لەسەرکردەکان بۆ ڕوونکردنەوەی ڕەوش و بارودۆخی عێراق بۆیان، ئەو سەرپشکی کردم کە چی بەگونجاو دەزانم بیلێم بێ ئەوەی قسەیەکی دیاریکراو بەسەرمدا بسەپێنێت. ئامانجی یەکەمی من ڕزگارکردنی سەرۆك و ڕزگارکردنی عێراق بوو لەڕێگەی ئەوەوە. بۆیە هەستاین بەهەڵمەتێکی چالاك ئەویش بەسەردانی ژمارەیەکی زۆر لە باڵیۆزخانەکانی ولاتان و نوێنەرانی حکومەتە عەرەبیی و بیانیەکان. من لەنووسینگەکانیان چاوم بەباڵیۆزەکان دەکەوت، ئەوان بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە پێشوازیان لێدەکردم و هەموو ئاسانکارییەکیان پێشکەش دەکردم. هەندێکیان بەشەو لەدەرەوەی نووسینگەکانیان چاوم پێیان دەکەوت. سەرۆك سوپاسگوزاری ئەو هەوڵ و کۆششانەی من بوو، لەچاوپێکەوتنێکی لەگەڵ من و هاوەڵەکانم لەبەرواری ٣٠ تشرینی یەکەم ٢٠٠٦دا وتی : (( دەستەی بەرگریی کارێکی ئەخلاقی و کۆشش و خەباتێکی شۆرشگێڕانەیە، هەمووان ئامانجیان یەکە، خوا فەرڕدارتان بکات و، کارەکەتان یەکسانە بە کاری مامۆستا خەلیل بەیەك ئاراستە لەگەڵ دەستەی بەگریدا))، بێ ئەوەی هاوەڵەکانم چۆنێتی کۆششەکانی ترم بزانن کەئەویش پەیوەندیکردن بوو بە سەرکردەکان و باڵیۆزەکانەوە. بەڵام کاتێك لایەنی ئەمریکی لەڕۆژەکانی کۆتاییدا، دوای دەرچوونی بڕیاری حوکمە ستەمکارانەکە، ڕێگەیان لێگرتم بێمەوە بۆ بەغدا بۆ بینینی سەرۆك صەدام حسێن، من و سەرۆك ناچاربووین لەڕێگەی یەکێك لەهاوەڵەکانەوە نامە بگۆڕینەوەو لەچۆنیەتی بەڕێوەچوونی کاروبارەکان ئاگاداری بکەمەوە.

لەکاتی هەستانمان بەو ئەرکەی کە سەرۆك پێیڕاسپاردبووم، داخوازیەکەم دیاریکرابوو کە ئەویشی ڕزگارکردنی عێراق بوو. من بەو سەرکردانەم دەووت کە چاوم پێیان دەکەوت بەبێ گەڕاندنەوەی سەرۆك صەدام حسێن بۆ سەرکردایەتیی کردنی عێراق ئەم کارە بەئەنجام ناگات و عێراق ڕزگاری نابێت، من قەناعەتم وابوو کەبەبێ سەرۆك صەدام حسێن عێراق نارامیی و سەقامگیریی بەخۆوە نابینێت، بەڵکو گێرەشێوێنی و پاشاگەردانیی بلاٌودەبێتەوەو عێراق لەناودەچێت، مەحاڵەیشە بەبێ ئەو شێوازەی کە لەسەری ڕاهاتوون و پێگەیشتوون بتوانرێت بەهەر ڕێگایەکی تر فەرمانڕەوایی عێراقیەکان بکرێت. وە من لەوبارەیەوە لەلایەن سەرکردەکان و هەتا باڵیۆزو نوێنەرانی حکومەتەکانی تر کە جەختیان لەسەر پێویستی گەڕانەوەی سەرۆك دەکردەوە بۆ سەر حوکم بەڵێنم وەرگرت، لەگەڵ خۆلادان لەهەندێك هەڵە کەلەڕابردوودا ڕوویان داوە، ئەوان هاوڕابوون لەسەر ئەوەی کەبەهۆی وێرانکردنی عێراقەوە ناوچەکە هاوسەنگیی خۆیی لەدەستداوەو بەڕوونی مەترسی فارسیی لەسەر عەرەب و موسڵمانان دەرکەوتووە. بەڵام کۆششەکانیان سەرکەتوو نەبوو، ئەویش لەبەرئەوەی هەوڵەکانیان تاکە کەسیی بوون.

لێرەدا دەبێت وەڵامی هەندێك لەو پرۆپاگەندەو قسەڵۆکانە بدەمەوە کە دەڵێن من و هەندێك لەکەسە نزیکەکانی سەرۆك وەك هەوڵ و کۆششێکی تاکە کەسیی هەستاوین بەپەیوەندیکردن بەهەندێك لەسەرۆکەکانەوە، ئەمەش قسەیەکی ڕاست و وورد نیە، چونکە سەرۆك صەدام حسێن خۆی داوای ئەوەی لەمنکردووە بەوپێیەی لەماوەی بەندکردنەکەیدا من نزیکترین کەس بووم لێیەوە، هەروەها ژمارەیەك نامەی دەستنووسی خۆییم لایە کەتێیدا لەبارەی عێراقەوە لەگەڵ ژمارەیەك لە سەرکردەکانی عەرەبدا دەدوێت و ئەو نامانەش بۆ مێژوو دەپارێزم.

ڕۆژێکیان، لەپایتەختی یەکێك لەولاٌتە عەرەبییەکان دیدارم لەگەڵ یەکێك لە باڵیۆزە دیارەکاندا هەبوو، کاتێك گەیشتمە شوێنەکە، ژمارەیەك لە میلیشیای تایبەتیم بینی کە وادیار بوو چاودێریان دەکردم، بۆیە ناچاربووین شوێنەکە بگۆڕین، بەڵام لەو شوێنەی تریشدا بەهەمانشێوە ژمارەیەك لەو میلیشیایانە هەبوون، بەڵام مەسەلەکەم فەرامۆشکرد بۆ ئەوەی تەنگ بەباڵیۆزەکە هەڵنەچنم. لەکاتی دانیشتنماندا، کونسوڵی یەکێك لە ولاٌتە عەرەبیەکان کەپەیوەندییەکی توندوتۆڵم لەگەڵیدا هەبوو هەستا، سەلاممان لەیەککردو ئاگاداری کردمەوە کەلەلایەن چەند لایەنێکی عێراقیەوە چاودێری دەکرێم. من لەو کاتەدا بەناو شەقامە گشتییەکاندا دەگەڕام و، بەئۆتۆمبیلی تاکسی هاتوچۆم دەکرد چونکە

ئۆتۆمبیلی تایبەتی خۆمم نەبوو. لەگەڵ کاتدا پێشبڕکێم دەکرد، کات بەخێرایی دەڕۆیشتو بەرپرسیارێتیشم لەبەرامبەر ئەو پیاوەدا وای لێکردبووم پەلەبکەم بۆ ڕزگارکردنی، ئەرکەکە قورس و زەحمەت بوو، کارەکە وای دەخواست خۆم بەتەنها ئەو کارە بکەم چونکە وا لەگەڵ سەرۆکدا ڕێکەوتبووین، کە کارەکە بەو پەڕی نهێنیەوە ئەنجام بدرێت. لەو ساتە سەختانەدا هەستم دەکرد کە من کۆشش دەکەم بۆ ئەوەی سەرۆک ڕزگاربکەم، لەکاتێکدا ئەو هەوڵی دەدا عێراق ڕزگاربکات.. ئەرکەکە زۆر قورس بوو. بەداخەوە، هەندێك کەس نرخی ئەو موعانات و نارەحەتیانەی نەدەزانی، ئەوکاتەی کە من لەشەقامەکانی پایتەختێکی عەرەبیدا دەسوڕامەوەو، لەباڵیۆزخانەیەکەوە دەچووم بۆ باڵیۆزخانەیەکی تر. باسی ئەو ئاستەنگە بەئازارانەش ناکەم کەلەوبارەیەوە ڕووبەڕووم بوونەوە.

ئامانجم ڕازیکردنی خوداو ڕازیکردنی ویژدانی مرۆڤانەو نیشتمانپەروەرانەم بوو، ئەویش لەسۆنگەی ئەو باوەڕەوە کە هەمبوو بە نەجابەتی ئەو ئامانجەی کە هەوڵی بۆ دەدەم. ئەو پێشوازیانەش کەلەلایەن باڵیۆزەکانەوە لێمدەکرا، کارەکەی لەسەر سووک دەکردم. لێرەدا دەبێت ئاماژە بکەم، هەروەها بۆ مێژوویش ئەمە دەڵێم، هەموو باڵیۆزخانەکانی وڵاتانی عەرەبی و بیانیی کە سەردانم کردوون، باڵیۆزەکانیان بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازیان لێدەکردم و بەهانامەوە دەهاتن، جگە لەباڵیۆزخانەی وڵاتی فەلەستین کە چۆن چووبوومە ژوورەوە بەو شێوەیەش لێی هاتمە دەرەوە بێ ئەوەی هیچ کەسێك پێشوازیم لێبکات..

## پەیوەندییەکان لەگەڵ سەرۆکەکانی عەرەبدا

سەرۆك هیواخواز بوو سەرکردەکانی عەرەب بۆ بەرگریکردن لەعێراقی دەروازی خۆرهەڵاتی نەتەوەی عەرەب بەئاگابێنەوەو ڕاپەڕن. پێمڕاگەیاند من چاوم بەهەندێك لەسەرکردەکانی عەرەب کەوتووە، ئاگادارمکردونەتەوە لەوەی لەعێراق ڕوودەدات هەروەها تێڕوانینی ئایندانە سەبارەت بەوەی کەلەناوچەکەدا ڕوودەدات. هەموویان هاوسۆز بوون لەگەڵ عێراق و سەرۆك صەدام حسێندا. پێمڕاگەیاند کە من چاوم بەسەرۆکێکی عەرەبی کەوتووە کە زۆر ڕێزی جەنابیانی لابووە، تورە بوو سەبارەت بەوەی کە لەعێراق ڕوودەدات، هەروەها ئەوەی بەسەر سەرۆکدا دێت لەبەندیخانەکەیدا. ووتی: هیواخوازبووم سەرۆك صەدام لەگۆڕەپانی جەنگدا شەهید بووایە یان خۆی بکوشتایە بۆ ئەوەی شەهید بووایە! ئەوەی بەسەر سەرۆکدا دێت مانای سوکایەتیکردن بەهەموومان دەگەیەنێت. هەروەها ڕۆڵی پارێزەرکانی بەرزنرخاند، بەڵام خۆپارێزیی لەئامادەبوونی سەرۆك کرد

لەدانیشتنەکانی دادگایکردندا. پێم ووت ئەو ئەگەر نارازی بێت ئەوا بەزۆر دەیهێنن. ئیدی لەمەسەلەکە گەیشت و بەڵێنی دا ئەوپەڕی کۆششەکانی خۆی لەپێناو عێراق و سەرۆک صەدام حسێندا بخاتەگەڕ.

سەرۆکێکی تر کە چاوم پێی کەوت پێی ووتم: برام خەلیل، سەرۆک صەدام حسێن وەك دیوارو شورەی عەرەب وابوو بۆیە بەوپەڕی هێزمانەوە هەوڵدەدەین ماف بۆ خاوەنەکەی بگێڕینەوە. ئەو سەرسامیی زۆری خۆی نیشاندا بە ڕەقی و خۆڕاگریی سەرۆك و ئازایەتیەکەی لەکاتی دادگاییکردندا. ئەم سەرۆکە کە دووجار پێشوازی لێکردم، ئەوپەڕی تواناکانی خۆی لەپێناو عێراقدا خستەگەڕ.

سەرۆکێکی تر پێشوازی لێکردم و پێی ووتم: خوا چیایەك لەئاگری بەخشیوە بەعەرەب بۆ ئەوەی لەشەڕی فارسەکان بیانپارێزێت، ئەویش صەدامە. بەڵام عەرەب لەدەستیاندا. کار دەکەین هەق بگێڕینەوە بۆ بنەڕەت و بنجی خۆی. تەنها دەمەوێت ئەبو عودەی خۆڕاگرو بەئارام بێت. ئێمە بەرژوەندیمان نییە لەعێراقدا، بەڵام ئەبو عودەی سەرقاپ و دەمەوانەی ئارامیی ئەم نەتەوەیە بوو. ئەم سەرکردەیە ئەوەی لەتوانایدا بوو کردی، بەڵام چەواشەکاریی ئەمریکیەکان هەموو هەوڵەکانی بۆ چاکسازیی تەفروتونا کرد.

( دوای کوشتنی سەرۆك، چاوم بەیەکێك لە سەرۆکەکان کەوت، ئەو زۆر نیگەران و بێ تاقەت بوو هەتا چەندین جار سەبارەت بەوەی بەسەر سەرۆکدا هات گریا).

دوای ئەوە چاوم بە ژمارەیەك لە نوێنەرانی هەندێك لە سەرۆکەکانی عەرەب کەوت کە نوێنەرایەتی سەرۆکەکانیان دەکرد بەهۆی ڕەوشەکانیان و سەرقاڵبوونیان. هەمووان هاوسۆزبوون لەگەڵ عێراق و صەدام حسێندا! بۆ مێژووش دەڵێم دوو وڵات نە سەرۆکەکانیان و نە نوێنەرکانیان پێشوازیان لێنەکردم. لەوانەیە بتوانم بیانوو بۆ یەکێکیان بێنمەوە بەهۆی ئەوەی دەکەوێتە بەرەکەی ترەوە . بەڵام ئەوی تریان هیچ بیانوویەکی نییە. بەڵام ئەو فشارەی لەسەری بوو ئاسایی نەبوو. بەڵام دەکرا سەرۆکەکەی بەنهێنی چاوی پێمان بکەوتایە وەك ئەوەی لەگەڵ سەرۆکەکانی ترداو بەدوور لەدەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕوویدا.

سەرۆك دەڵێت: (( سەرکۆنەی سەرۆکەکانی عەرەب ناکەم و نامەوێت تەنگیان پێهەڵبچنم، بەڵام لەهەمانکاتدا هەست ناکەم هیچ بیانویەکیان بەدەستەوە بێت، ئەوا گەردنی منیان بەدوور گرت لەخۆیان، من گەردنی خۆمم خستۆتە نێوان دەستەکانی

خوداوە، ژیانیشم هێندە بەلامەوە گرنگ نیە هێندەی ئەوەی گرنگە بەلامەوە مێژوو لەگەڵمدا دادپەروەر بێت.

بەڵام دەڵێم هەڵوێستی هەندێك سەرکردەی عەرەب سەرۆك صەدام حسێنی شکستخواردوو کرد. هەڵوێستی نەتەوەیی و پێشڕەوانەی سەرۆك صەدام، سەرەڕای فەزڵ عێراق بەسەر نەتەوەوە، لەوانەیە هەندێك لەو سەرکردانەی خستبێتە هەڵوێستێکی تەنگەلانەوە. هەندێکیان بەشداریان کرد لە وێرانکردنی عێراقدا ئیدی زانیبێتیان یان نا، ڕازیبووبن یان ناڕازیی. هێزەکانی ئەمریکا لەخاکی هەندێك وڵاتی عەرەبییەوە هاتنە ناو عێراقەوە، هێزی تری سیخوڕو بەکرێگیراویش لەوڵاتانی ئیسلامی هاوسێوە هاتنە ناوەوە.

بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بە کۆمکاری وڵاتانی عەرەبییەوە هەیە، ئەوا سەرۆك چەندین جار وتوویەتی ئەو زۆر سەرکۆنەو سەرزەنشتی کۆمکاریی عەرەبی و بەڕێز عەمرو موسا دەکات، ( هەر لەوکاتەوە کە عێراق داگیرکراوە هەڵوێستێکی ڕوونمان نەبینوە لێی، بەڵکو من تێناگەم کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی چۆن مامەڵە لەگەڵ سیمبولەکانی داگیرکەردا دەکات سەرەڕای ئەوەش کە دەزانێت عێراق وەك هێڵی پێشەوەی بەرگریی وایە لە نەتەوەی عەرەب، ڕوخانی عێراق و پسانی ئەم هێڵەش واتە لافاوەکە هەمووان ڕادەماڵێت و کارەساتەکە گشت لایەك دەگرێتەوە.

لەو کاتەدا دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە کە عەمرو موسا سەردانی عێراق دەکات، هەندێك لەسەرچاوەکان ڕایانگەیاندبوو کە سەردانی سەرۆك صەدام حسێن دەکات لەنێو بەندیخانەکەیدا. سەرۆك لێی پرسیم کەئایا بەڕاستی عەمرو موسا سەردانی عێراق دەکات، پێمراگەیاند هەندێك ڕۆژنامە ئەو هەواڵەی بڵاوکردۆتەوە. سەرۆك ووتی:

(( ئەگەر سەردانم بکات ئەوا بەگەرمیی پێشوازی لێدەکەم، باشە ئەوە دەکات، چونکە ئەم سەردانە ڕەنگە ببێتە خاڵێکی وەرچەرخانی یەکلاکەرەوە، ڕەنگە زۆر لەمەسەلەکان بگۆڕێت. بەدڵنیاییەوە شتێك لەهەگبەکەیدا دەبێت، من بەشێوەیەکی ئیجابی کراوە دەبم لەگەڵیدا ئەوەندەی کە خزمەت بەگەلە ئارامگرو خەباتکەرەکەم بکات)).

بەڵام عەمرو موسا نەهات..

## هەندێك دەستپێشخەریی بۆ ئازادکردنی سەرۆك

دوای ئەوەی بەشێوەیەکی شەخسی لەلایەن سەرۆکەوە ڕاسپێردرام بۆ ئەوەی پەیوەندیی بەژمارەیەك لە سەرۆکە عەرەبەکانەوە بکەم، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە

بەسەر عێراقدا دێت لە وێرانکاریی و پەرت پەرت بوون و کاولکردنی گشتگیرانە، هەندێکیان هەوڵیاندا ئیدارەی ئەمریکی قایل بکەن کە سەرۆک صەدام حسێن ئازادبکرێت. بەڵام هەموو ئەو هەوڵانە ڕووبەڕووی شکست بوونەوە ئەویش لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: ئەو هەوڵ وکۆششانە فەردی و تاکە کەسیی بوون، پێشنیشاریشم بۆ هەندێک لەو سەرۆکانە کرد کە لوتکەیەکی عەرەبیی بچوککراوە بگیرێت کە دەستپێشخەرییەکی لێبکەوێتەوە، شورەییە سەرۆک صەدام حسێن، لەپشتەوەی شیش و تەلەبەندەکانی زیندانەوە بمێنێتەوە.

دووەم: سەرلێتێکچوویی ئیدارەی ئەمریکی زیاد لەڕادەی، وای لە ئێران و لایەنگرەکانی کرد کەلەناو عێراقدان، هانی سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی ئەمریکا بدەن بۆ ئەوەی وێنەی ئەو ڕاستیانەی کەلەعێراق ڕوو دەدەن بشێوێنن و ئاوەژووی بکەنەوە، ئەویش لەرێگەی ڕاپۆرتەکانی ئەو سەرکردانەوە کە دەیاندایە کۆشکی سپی. من زانیاری تەواوم هەبوو کە هەندێک لەوڵاتانی عەرەبی تاڕادەیەك سەرکەتووبوون لەڕازیکردنی ئیدارەی ئەمریکی بۆ ئەوەی هەندێك لەو سەرکردایەتیە سیاسی و سەربازییە مەیدانییانە بگۆرێت. ئەمەش وایکرد کە ئیدی ڕاستیەکان بگەنە ئیدارەی ئەمریکی، خەریك بوو هەڵوێستەکە کەمێك دەگۆڕا. کاتێکیش ئێران و شوێنکەوتەکانی هەستیان بەم گۆڕانکاریانە کرد، پێش ئەوەی هەلەکە لەکیس بچێت، بەئاراستەی ڕزگاربوون لەصەدام و لەناوبردنی پەلە لەمەسەلەکەدا کراو فشارەکان خرانەکار. ئێمە هەتا بەهۆی هەڵوێستە مێژوویەکانیانەوە بەرامبەر عێراق و سەرۆك صەدام حسێن ئەو وڵاتە عەرەبیانە نەخەینە تەنگەلانیەوە، تا نەمانی ئەم سەختی و ناڕەحەتیانە، ناوەکانیان لای خۆمان دەپارێزین و ئاشکرایان ناکەین.

بەڵام ئەوەی پەیوەندیی هەیە بەدەستپێشخەرییە کەسیەکانەوە، ئەوا من ئاگاداری هەر ووردەکاریی هەر چاوپێکەوتنێك بووم لەگەڵ نوێنەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکان یان حکومەتی بەریتانیادا، لەو لایەنەوە کە سەرۆك ڕێی پێدابووم کە هەموو ئەوەی ڕوودەدات بۆی باس بکەم و ئاگاداری بکەمەوە لێی، لەگەڵ ڕەتکردنەوەی پێشوەختیدا بۆ هەر دانووستانێك کە لەدەرەوەی چوارچێوەی سەرکردایەتیی شەرعییەوە بکرێت کەلەناو گرتوخانەدایە. چەند دەستپێشخەرییەك هەبوون بۆ نمونە ئەمەی خوارەوە پوختەی یەکێك لەو دەستپێشخەریانە بوو:

لەساڵی ٢٠٠٥ ڕۆژێکیان، نوێنەری ئیدارەی ئەمریکی و نوێنەری تۆنی بلێر داوایان کرد لەیەکێك لەپایتەختە عەرەبیەکانداو لەژێر چاودێریی عەرەبیدا چاویان بە نوێنەرانی حزبی بەعس بکەوێت. چاوپێکەوتنی یەکەم لەگەڵ نوێنەری تۆنی بلێردا بوو بەئامادەبوونی یەکێك لەباڵیۆزەکانی بەریتانیا کەلەو وڵاتە عەرەبیەدا بوو. دەستپێخەرییەکەی ئەو وڵاتە عەرەبیە ئەمە بوو:

- هەڵوەشاندنەوەی یاسای ڕیشەکێشکردنی بەعس.
- هەموارکردنی دەستور بۆ هەڵوەشاندنەوەی فیدراڵیەت و دابەشکردنی سامانەکان.
- پارێزگارییکردن لەیەکێتی عێراق.
- ئازادی کاری سیاسی لەعێراقدا.
- گێڕانەوەی سوپای پێشووی عێراق.
- ئازادکردنی هەموو دەستگیرکراو و دیلەکان.

**بەڵام داواکاریی لایەنی عێراقی ئەمە بوو:**

- یەکەمجار کشانەوە ڕابگەیەنرێت.
- گێڕانەوەی سوپای عێراق و هەموو دامەزراوە دەستورییەکان.
- ئازادکردنی دیلەکان لەناویشیاندا سەرۆك صەدام حسێن.
- هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەوەی بەهۆی داگیرکردنەوە دەرچووبوون لەلێپێچینەوەکان و دەرکردنی یاسا نوێیەکان.
- لەهەموو خاڵێکی دانوستاندا بگەڕێنەوە بۆ لای سەرۆك صەدام حسێن.

وەڵامی ڕاوێژکارە بەریتانیەکە کە بە عەرەبیەکەی ڕەوان قسەی دەکرد ئەوە بوو کە ناکرێت لەبارەی صەدامەوە قسە بکرێت چونکە ئەو (بەگاڵتەپێکردنەوە) ئێستا لەشێونێکدایە دەستپێی ناگات، دەکرێت لەبارەی مەسەلەی ترەوە قسەوباس بکرێت. من هەڵدەستم بەگواستنەوەی ئەم پێشنیارانە بۆ حکومەتەکەم.

هەموو ئەو دانوستانانە هیچ بەرهەمێکیان نەبوو، چونکە دانوستکارە ئەمریکی و بەریتانیەکان چوونەوە بۆ وڵاتەکانیان بێ ئەوەی هیچ وەڵامێك بگێڕنەوە. هەموو ئەو دانوستانانەش وەڵامدانەوەی ئەو ناوەندکارییە عەرەبیە بوو بێ ئەوەی سەرۆك ئاگادار بێت یان ڕەزامەندیی وەرگیرابێت.

لەبارەی ئەو دەستپێشخەرییەوە سەرۆکم ئاگادارکردەوە، هەروەها دەستپێشخەرییەکەی دکتۆر خەیرەدین حسیب، ئەمینداری گشتی پێشوو و دامەزرێنەری کۆنگرەی نەتەوەیی عەرەبی لەبەیروت، ئەو هەر پەیوەندییەکی ڕەتکردەوە لەگەڵ ئەمریکی یان بەریتانیەکاندا کە ببێتە هۆی ئەوەی ئایندەی عێراق لەدەرەوەی سنوری سەرکردایەتی شەرعیی کە لەناو گرتووخانەدایە دیاری بکرێت، ووتی : (( ئەگەر ئەمریکیەکان جدین پێویست بەمانۆڕکردن ناکات لێرەو لەوێ ، یان خۆیان بەم لایەن و ئەو لایەنەوە بپێچن. ئێمەی لای خۆیانین و، پەیوەندیکردن پێمانەوە قورس نیە، ڕەتی پەراوێزخستنی ڕۆڵمان دەکەینەوە. ئەمریکیەکان دەیانەوێت سەرکردایەتی حزب و سوپا دەستنیشان بکەن بۆ ئەوەی گورز لە بەرهەڵستکاریی و بەرگریی بوەشێنن))

# بەشی حەڤدەیەم

## سەرۆك و بەڕێوەچوونی دادگاییەکە

ئەم دادگاییە ناشەرعیی و نادەستورییە، دروستکراوی داگیرکەرە.. بە بڕیاری پووچ و ناڕەواو لەژێر سایەی داگیرکەرداو، بەدەستی حاکمی ئەمریکیی پێکهێنراوە، ئەمەش مانای زەوتکردنی دەسەڵاتی شەرعیی و دەستدرێژییەکی ئاشکرایە بۆ سەر یاسای عێراقی و نێو دەوڵەتی وەکو یەك.

( صەدام حسێن لەگرتوخانە)

لەکاتی چاوپێیکەوتنی سەرۆك لەبەرواری ٢٠٠٦/٤/١٩دا لەگەڵ پارێزەرەکان، بەڕێز ڕەمزی کلارك بیرۆکەی گواستنەوەی دادگاییەکردنەکەی بۆ دەرەوەی عێراق خستەڕوو، ووتی دادگای باڵای ئەمریکا دەستیکردووە بە وەرگرتنی ئەو سکاڵایانەی کە دژ بە حکومەتەکەی بەرزکراونەتەوە، هەتا بۆ ئەو تاوانانەش کەلەدەرەوەی خاکی ئەمریکادا ڕوویانداوە، تا ئێستاش چەند سکاڵایەك لەدژی حکومەتی ئەمریکا بەرزکراونەتەوە، بەم پێیەش دەکرێت پارێزەرەکان سکاڵایەك لەدژی حکومەتی ئەمریکاو لەبەرژەوەندیی سەرۆك بۆ ئەو دادگایە بەرزبکەنەوە، هەروەها دەکرێت بەڕێز تاریق عەزیزیش سکاڵایەکی هاوشێوەی ئەمە بەرزبکاتەوە.

سەبارەت بە تاریق عەزیزو عەواد بەندەرو هەڤاڵەکانی تریش، سەرۆك وتی دەتوانن ئەمجۆرە سکاڵایە بەرزبکەنەوە. بەڵام ئەو وەك خۆی ، نایەوێت. وتیشی: (( من هەر لەلاویمەوە لەکەس نەپاڕاومەتەوە و ناشیکەم، چەند جارێك بە لەسێدارەدان حوکمدراوم، هیچ کاتێکیش داوای ژیانم بۆ خۆم نەکردووە، ئێستا کە تەمەنم لەحەفتا نزیکبۆتەوە چۆن ئەوە دەکەم. ئەو پرسیارەش کە خۆی دەکات لەبارەی ئەوەی کە ئایا دادگاییەکە لە ٢٠٠٦/١٠/١٦دا دەبەسترێت، لەوانەشە بۆ ماوەی چەند مانگێك دوابخرێت یان زیاتر لەوانەشە کەمتر)). سەرۆك دەپرسێت: کارەکە دەبێت چەندێك کاتی بوێت تا دادگا ئەمریکیەکە پەرچە کرداری دەبێت. بەڵام بەڕێز ڕەمزی کلارك جەختیکردەوە کەوا باشترە لەدوای ئەو بەروارەوە سکاڵاکە بەرزبکرێتەوە. ئەمەش ڕای هەموو پارێزەرکانی تریش بوو. سەرۆك وتی: ((ڕۆیشتین بۆ دادگایەکەی نێودەوڵەتیی، بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەژێر لێکۆڵینەوەو دادگاییکردندا دەمێنینەوە وەك میلۆسۆڤیچی سەرۆکی یۆگسلاڤیا. تەنها بەوەدا کە ئێمە تۆمەتبارین، پاشانیش داننان بەوەدا کە ئێمە تاوانبارین. پێموایە ٢٠٠٦/١٠/١٦دا دەربکەن.

سەرۆك بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

(( من مرۆڤدۆستی بەڕێز ڕەمزی کلارك و هاوەڵە پارێزەرە بەشەرەفەکانی و هەوڵەکانیان بۆ ڕزگارکردنی ژیانم پێدەزانم، بەڵام نامەوێت بەمشێوازە ڕزگار بکرێم، من سوپاس بۆ خوا ئەرکی خۆمم بەجێهێناوە، وام پێباشترە صەدام لەنێوان دوژمنەکانیدا بمرێت لەوەی هەزار ساڵ بژی. من خوازیاری ئەمەم. حوسێن سەلامی خوای لەسەربێت، خوای گەورە لە کەربەلادا گیانیکێشا، لەبەرئەوەی بە زوڵملێکراویش مرد، ئەوا ئەو تائێستاش لەدڵی ملیۆنان کەسدا دەژی، زوڵمێکراویش لەدڵی خەڵکدا دەژی نەك کەسی زاڵم و ستەمکار. حوسێنیش باپیرمانە، هەتا خافێری پارێزەریش لەیەکێك لەدانیشتەکاندا کاتێك داوای لێکردم سکالایەك لەدژی ئێران بەرزبکرێتەوە بەهۆی ئەو ڕۆڵەیەوە کە هەیبووە لە تراژیدیای شاری هەڵەبجەدا، ئەوا من ڕەتمکردەوەو وتم ئێمە باوباپیرانمان فێریان کردووین کە لای کەس سکالا نەکەین، چونکە سکالاکردن بەپێی نەریتی باوباپیرانمان نەنگییە. لەسەر ئەم بنەڕەتەش ئەوەمان بۆ ماوەتەوە، لە سیفەتی صەدام حسێنیشدا نییە سکالا لەدژی کەس تۆمار بکات، پێشتریش من ڕەتمکردەوە ڕۆژنامەی سەن بدەمە دادگا بەهۆی پێشێلکردنی مافەکانمەوە وەك دیلێکی جەنگ. بڕواشم وایە بەڵگەنامەکانی هەڵەبجەتان لا هەیە. براکانم، لەعێراق لەدایك بووم، تیایدا دەژیم ، تیاشیدا دەمرم. من لەسەر ئەوە ڕاهاتووم لەوڵاتی خۆمدا بژیم، هەواکەی هەڵمژم و لەئامێزی گەلەکەمدا بژیم.. مەسەلەی دادگایکردنیش لەگەڵ هەموو کێشەکانی عێراقدایە. تەنها پیاوانی ئازای بەرگریی دەتوانن یەکلایی بکەنەوە. ئەوەش پێی دەوترێت دادگای عێراقی ئەوا ئەویش ملکەچی گۆڕانکاریەکان و ڕەوشە سیاسیەکان و ئەو گۆڕانکارییانە دەبێت کە بەرهەڵستیی دەیانهێنێتە کایەوە، کەڕەنگە فشاری گەلی ئەمریکی وابکات ئەمریکا لەعێراق بکشێتەوە. وەمن لەکەس ناپاڕێمەوەو (پەنا نابمە بەر دەرگای کەس) بۆیە پێمباشترە داگاییەکە عێراقی بێت و لەناو عێراقیشدا بێت بۆ ئەوەی ڕاستیەکان لەگەل بگەیەنرێت، سەرەڕای ئەمەش چەندە بەرهەڵستیی بەهێزبێت ئەوەندەش دادگاییەکە کاریگەر دەبێت بە واقیعی سیاسی عێراق و ئەو باردۆخەی کە دێتە کایەوە.

(( من ڕەتیدەکەمەوە ئەم دادگاییکردنە ببرێت بۆ دادگایەکی نێودەوڵەتیی، چونکە دادگای نێودەوڵەتیی ناتوانێت بوەستێت کاتێك ئەگەر هەڵوێستی سیاسی گۆڕا، بەمشێوەیە ڕەتکردنەوەکەی من لەو چوارچێوەیەدا دێت کە دادگای نێودەوڵەتیی ئەگەر بڕیارەکەی دەرکرد ناتوانێت ببورێت. لەئەمریکادا ئەگەر بڕیارێك دەرچوو، ئەوا پێشینەییەك دروست دەکات، لەبەرژەوەندیی گەلی ئەمریکی و گەلانی تریش دەبێت و

دەبێتە ئەحەدایەکیش بۆ دادوەرە ئەمریکیەکە بەوەی کە کاریگەریی لەسەر جیهان دەبێت، دادوەرە ئەمریکیەکە دەزانێت ئەگەر بڕیارو ڕەفتارەکانی نایاسایی بوون ئەوا گەلەکەی ڕەتی دەکاتەوە. ئەوەش کە نیگەرانم دەکات چوون و هاتنی ئێوەیە کە بەمە خۆتان ڕووبەڕووی هەڵەگەلێکی گەورە دەکەنەوە.

" بەڵام سەبارەت بەم دادگایە، ئەوا من دانیپێدانانێم و بەوەشدا کە ڕاسپاردەی دامەزراندنەکەی داوە، ئەمەشم بە دادوەر ئەلجوحیم وت کاتێك کە پێی ووتم: تۆ صەدام حسێن، لەدایك بووی ساڵی ۱۹۳۷، سەرۆکی پێشووی کۆماری عێراق و سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارە هەڵوەشاوەکان و سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی هەڵوەشاوەی.. پێم ووت: من صەدام حسێنم سەرۆك کۆماری عێراق و سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان و سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشم و هێشتاش لەعێراقدا نیشتەجێم. کاتێکیش لێیپرسیم کە تۆ دەرچووی یاسایت؟ وەڵامم دایەوە: منیش پێموایە تۆ دادوەریت.. پێمووت: بەخوا ئەی کوڕی ئەلجوحیی، ئەگەر لەسەردەمی صەدام حسێندا نەئەبوویتە دادوەر ئەوا ئێستا دادوەر نەدەبوویت، چونکە هەلی خوێندن بۆ کوڕی جوتیارەکان و ئەوانی تریش فەراهەم نەدەبوو ئەگەر ئەو هەلوباردودۆخە نەبوایە کە صەدام حسێن بۆی فەراهەمکردن".

بیرمدێت دوای دانیشتنی گوێلێگرتنی یەکەمی دادگا کە ڕائد ئەلجوحی بەڕێوەی دەبرد سەرۆك لێی پرسیم کەئایا ئەم دانیشتنە گوێزراوەتەوە بۆ تەلەفزیۆن و دەزگاکانی ڕاگەیاندن، پێم ووت هەندێك لەبڕگەکانی پەخشکراوەو شوێنەوارێکی گەورەی بەجێهێشتووە لەسەر مەعنەویاتی شەقامی عەرەبیی، ڕای هەمووان ئەوە بوو کە سەرۆك صەدام حسێن دادگایی ئەوانی دەکرد، کە بەحساب ئەوان دادگایی ئەمیان دەکرد، شەقامی عەرەبیش زۆر سەرسامە بە خۆڕاگریی و خۆباییبوونی و ڕەتکردنەوەی ئەوەی کە پەشیمان ببێتەوە لەهەڵوێستەکانی، سەرەڕای ئەو فشارانەی کە دەخرێنە سەری...

سەرۆك دەڵێت:

(( ئەمە دادگاییەکی ناشەرعییە و نادەستوریيە، دروستکراوی داگیرکەرەو، یەکێکە لە بەرووبومەکانی ئەو تاوانە دوژمنکارییەی کە لەدەرەوەی شەرعیەتی نێودەوڵەتیی و یاسا و بەهاو دادپەروەرییەوە کراوەتە سەر عێراق)). سەرۆك بەردەوام بوو ووتی : ((ئەمە چەواشەکردنی ڕای گشتی و وێناکردنی مەسەلەکەیە کە گوایە ئەوان ملکەچی دادپەروەریی

و یاسا دەبن کە ئەوان دوورترن لەوەی بەمشێوەیە بن. من رێکەوتننامەی جنێڤم خوێندۆتەوە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی هەیە بەمافی دیلەکانەوە. لەبەرئەوە ئامۆژگاریی دەدەم کە تانە بدرێت لەپێکهێنانی دادگاکە کە سەرپێچیکردنە لە یاساو دەستووری عێراق و رێکەوتننامەکانی جنێڤ، چونکە ئەوەی لەسەر پرپوچی بوونیادبنرێت هەر پرپوچە))... پاشان وتیشی: ((ئەوان بەبڕیاری بەتاڵ و پووچ و بەدەستی فەرمانڕەوا ئەمریکییەکە دادگاکەیان پێکهێناوە. ئەمەش مانای زەوتکردنی دەسەڵاتی شەرعیی و زەوتکردنێکی ئاشکرایە لە یاسای عێراقی و نێودەوڵەتیی وەك یەك. لەبەرئەوە، هیوادارم بەرگرییەکەتان یاسایی و سیاسی و ڕاگەیاندنیی بێت)).

کاتێك دادوەر لەیەکێك لە دانیشتنەکانی لێکۆڵینەوەدا لەسەرۆکی پرسی کە کۆمەڵەکەی سەرۆك (هەڤاڵەکانی) دەڵێن فەرمانەکان لەوەوە دەرچوون، سەرۆك وەڵامی دایەوە: ساڵی ١٩٦٤، من ئەندامی سەرکردایەتی بووم، پلانمان بۆ شۆڕش دارشت. پاشان دوای سێ مانگ بەهۆی خیانەتێکەوە وەك خیانەتی قەیس دەستگیرکرام. لەکاتی لێکۆڵینەوەدا، یەکێکیان خۆی پێنەگیراو، پلانەکەی کەشفکرد. کاتێك دادوەر لەو دادگاییەدا لێی پرسیم، پێم ووت من پلانەکەم داناوە. ووتی: ئەی ئەبو هەیسەم (احمد حسن البکر)؟ وتم من گومانم هەیە کە ئەو پەیوەندی بە عەبدولسەلام عارفەوە هەبێت. من قورساییەکەم لەسەر لابرد. بەو شێوەیە پیاوان بە هەڵوێستەکانیاندا دەناسرێنەوەو دەپێورێن)).

سەرۆك بەم وتەیە کۆتایی بەقسەکانی دێنێت:

(( ئێمە بۆ قوربانیدان خولقاوین، پێویستە سەرۆکیش قوربانیدانەکە بخاتە ئەستۆی خۆی، ئەگەر بۆش حوکمی لەسێدارەدان بسەپێنێت بەسەرمدا، ئەوا ئەو لای من هاوتای پێڵاوەکانم نییە. ئەگەر پێویستیشە دادوەر حوکمی لەسێدارەدانەکە بخوێنێتەوە، ئەوا پێویستە ئەوەی لەیادبێت کە من پیاوێکی سەربازیم و دەبێت بڕیارەکە بەدەستڕێژی گوللە جێبەجێ بکرێت)).

هەروەها سەرۆك پرسی:

(( ئایا پارێزەر مافی ئەوەی هەیە پەیامێکی موەکیلەکەی بگەیەنێت بە خێزانەکەی؟ ئەگەر لەڕێگەی خاچی سوورەوە بێت، واتە ئێمە دیلین، دیلیش دادگایی ناکرێت، ئەگەر مەسەلەکەش بەشێوەیەکی تربێت، ئەوا ئەمە بە دوالیزمە دادەنرێت. دەپرسم بۆچی

سمێڵەکانی داواکاری گشتیی نالەرێتەوە بۆ دەیان و بەڵکو سەدان کەس لەوانەی کە رۆژانە بەهۆی ئاشوبی تایفییەوە لەبەغداو ناوچەکانی تری عێراق دەکوژرێن؟

(( ئێمە لەشێوازی دادگاکە لەچۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵماندا سەرسام نابین، وەك پارچە پارچەکردنی گیراوەکان یان هێنانیان بەشێوەیەکی کۆمەڵ یان کردنە ژوورەوەیان لەپێش پارێزەرەکانەوە. بەدادوەرم وت نابێت وەك لایەنی یاسایی جیاوازی ئەوەی شەرعی و ئەوەی پێچەوانەی ئەمەیە تێکەڵ بکرێت. ئەوەی شەرەف و غیرەتی هەبێت، ناکرێت بەم دادگا گاڵتەجارە رازی بێت.

(( لەدانیشتنی ئەمڕۆدا وەرچەرخانێکم بینی لە قسەی هەندێك لە برا پارێزەرەکاندا کاتێك دادگاکەیان بە دادپەروەر وەسفکرد. لەبەرئەوەی دادگاکەش ناشەرعییە، هەر وتارێکی دبلۆماسی لەلایەن ئێمەوە خوازراو نییە، لەبەرئەوە دەبینین مامۆستا خەلیلیان کردە ئامانج لەبەرئەوەی ئەو خۆشنوودانە لەگەڵیان نادوێت. ئەو وای دانا کە ئەوە لەفەزلی ئێمەوەیە کە هەر قسەیەك لەگەڵ دادگادا دەکەین و لەگەڵیدا دەدوێین، چونکە ئەوان شەرعیی نین؟ ئەو خۆشنودییەی کەلەسەر حسابی بنەماکان بێت ئازاربەخش دەبێت و، دەرئەنجامەکانیشی خراپ دەبێت. بۆیە پێویستە بنەماکان بەدووربگرین لە خۆشنودییکردن، هیوادارم وورپابن و لەکاتی کێشمەکێشی دادگادا تووشی ساتمەی زمان و هەڵەکردن نەبن، بەتایبەتی لە مەسەلەکانی رایکردندا، هەروەها ئەوەی پەیوەندیی بە دامەزراندنی دادوەرەکان و بنەما تایفیی و سیاسیەکانەوە هەیە. ئەوەشتان لەیاد بێت کە ئەم دادگاییکردنە لەسەر شێوازی فارسیی بەرێوەدەچێت)).

لێرەدا سەرۆك داوای لێکردم کە سڵاو سوپاسی بگەیەنم بە دادوەر رزگار محمد ئەمین، و هیوای سەلامەتی و تەندروستی باشی بۆ دەخوازێت، هەروەها پێی رابگەیەنم کە سەرۆك هۆنراوەیەکی بۆ نوسیوە. رزگار وەك سەرۆك دەڵێت، کاتێك لەگەڵ هەقیقەتدا بەر یەك کەوتن گەرایەوە.

هەروەها سەرۆك وتەکەی ئاراستەی پارێزەرەکان دەکات و دەڵێت:

" ئێوە بەئێمەوە گەورەبوون و ئێمەش بەئێوەوە ئەی پاڵەوانان. لەدانیشتنی پێشوودا دەستەی بەرگریکارانمان بینی، ئەوانە بەرگریی لەعێراق و لە کاروانەکە دەکەن و نامانەوێت بەرگریی لەصەدام حسێن بکەین. هێرشی دادگاش بۆ سەر پارێزەرەکە هەوڵێکی رێکخراوە لەدژی بەرگریکردن لەهەق و راستی، هێرشی پوچ و باتڵیش هەزار کەلێن و بۆشایی تێدایە. مەبەستی ئەوان گومان دروستکردن بوو لە بێگەردی پارێزەرە پاڵەوانەکان.

(( ئەگەر ئەوانەش کە حوکمی عێراق دەکەن حوکمی لەسێدارەدان نادەن، ئەوا ئەمە لەپێناوی خۆیاندایە، ئەوانە دەیانەوێت ئەوە بسەلمێنن کە ئەوان دژی لەسێدارەدانن. پرسیارەکەش ئەوەیە: ئەم دادگاییە بۆچی؟ بەپێی پێشبینیە کەسیەکانی خۆم، وای دەبینم کە ئەوان بڕیارێکی سووک دەدەن چونکە بینیان ئەم مەسەلەیە هیچ بوارێکی تێدا نیە بۆ ساختەکاریی و گاڵتەکردن، هەموو ئەوەی کە تێیدایە بەخێرایی کەشف بوو، دەیانەوێت هەستێکی هەڵە بدەنە ڕای گشتیی کە دادگاکە دادپەروەرە، ئەواتا هەندێک کەس ئازاد دەکات و بەریدەدات. لەلایەکی ترەوە، بەرپرسە ئەمریکیەکان، هەتا ئەوانەش کەلەحوکمدان، وایان لێهاتبێت پەلەیان بێت لەدەرکردنی حوکمەکەدا. هەندێک کەسیش وای دەبینێتەوە کە دەرکردنی ئەو بڕیارانەی کە لەبارەی تاوانی دژە مرۆڤایەتیەوەن لەلایەن دادگاکەوە تەنها بۆ ئەوەیە بڵێین کە ئەوانە ناتوانن بەشداریی لەپرۆسەی سیاسیدا بکەن چونکە بەتاوانی دژ بەمرۆڤایەتی حوکمدراون.

(( ئەوان زنجیرەیەک لە سەرپێچیان ئەنجام داوە، وە دەزانن کە دادوەر یان دادگا دادگایمان ناکات و فەرمانمان بەسەردا نادات، بەڵکو ئەمریکیەکان ئەوە دەکەن. وە من قەناعەتی تەواوم بەم ڕاستیە هەیە. ئەمریکاو زایۆنیزمە کە حوکم بەسەر ئێمەدا دەدەن، من پێش دەیان ساڵ حوکم لەدژم دەرکراوە. تەنها ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ڕای گشتییە، کە قەناعەت بەوە بکات ئەو بڕیارانە پێشوەخت لەدژم دەرکراون.

(( لەسەرپێچیەکانیشیان کە دەرکەوتن ڕێزنەگرتن بوو لە دەستەی بەرگریی کە قسەکردن بوو بەشێوەیەکی ئابڕووبەرانە لەسەر بۆینباخەکەی بەرێز دۆبلێری پارێزەر، ویستان لە شان و شەوکەتی کەمبکەنەوە و سوکایەتیی پێبکەن. پاشان چۆن دەبێت دادگا بێگەرد بێت ئەگەر وەزیری داد خۆی بەشێک بوو لەحکومەتی داگیرکەر)).

هەروەها سەرۆک دەڵێت:

(( ڕەنگە کەسێک بپرسێت، بۆچی کێشەی دووجەیلیان پێشخست و کردیانە دۆسیەی یەکەم، بەتایبەتی کە حزبی دەعوە حزبێک نییە بەڕادەیەک بەهێزبێت کە بڕیارەکانی بەسەر دادگادا بسەپێنێت. پێموایە ئەمریکیەکانن کە بڕیاریان داوە. بەڕای من ، لەبەردەم دادگادا دوو ڕێگە هەیە : ئەوەیە کە بڕیاربدەن پێویستیان بە هیچ ڕووپۆشیەک نییە، ئەوان نیازە شەڕانگێزییەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن، یان ئەوەتا مورافەعەکە ڕۆژی ٢٠٠٦/٧/٢٤ دوابخەن ئەگەر پێویستیان بە ڕووپۆشکردن هەبێت هەر ڕووپۆشییەک. پێویستە لەسەرمان ئەوە بزانین کە چوونمان بۆ دادگاو بێ ئەوەی دادگاش هەر جۆرە نەرمییەک بنوێنێت، ئەمە

پاڵی پێوەدەنێت کە زیاتر خراپە دەرهەق بەئێمەو بەپارێزەرەکان بکات. هەروەها هەڵدەستێت بەدەرکردنی ژمارەیەکی زیاتر لەپارێزەرەکان، یەکەم پارێزەرێکیش کە ڕووبەڕووی هەڕەشەو دەرکردن دەبێتەوە مامۆستا خەلیلە، چونکە هەر پارێزەرێك ئاڵۆزیی و شڵەژان بخاتە ناو ئەو تاریکەیەوە کە دادگاکە دروستی کردووە ئەوا سزاکەی دەرکردن دەبێت.

## ڕاسپاردەی سەرۆك بۆ پارێزەرەکان لەچەندین دانیشتندا

سەرۆك هەندێك تێبینی خستەڕوو سەبارەت بەدادگاکە:

– ئێمە لەبەردەم دوو حاڵەتداین، یان ئەوەتا بەرگریی بکەین ، یان ڕەخنە بگرین، من بۆ خۆم ڕای دووەمم پێباشترە.

– دکتۆر نەجیب، ئێوە پێویستان بە ڕوونکردنەوە نیە، چونکە بچووك ناتوانێت لەشانوشەوکەتی گەورە کەمبکاتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، هیوادارم هەڵسوکەوتی ئەو کەسە نامۆیانە لەسەر گەلی مەزنی عێراق حساب نەکەن. ئەوانە نامۆن.

– من بەو زەحمەت و ناڕەحەتیانە دەزانم کە ئێوە ڕووبەڕووی دەبنەوە هەر لەڕۆیشتننتان و پاشان هاتنەوەتان، هەروەها بەوەش دەزانم کە تووشی بەڕێز کلارك و بەڕێز دۆبلێر دەبێت. ئێوە بەهەموو مانایەکی ووشە تێکۆشەرو خەباتگێڕن.

–ئەگەر بەشێوەیەك لە شێوەکان وامان دانا کە بنچینەی دادگاکە یاساییە، ئەوا ئەوەی پێشکەشی دەکەن لەشانۆی دادگاکەدا پوچ و بەتاڵەو لەبەردەم گەلدا بنچینە نایاساییەکەیان ئاشکرا دەبێت.

– من پشتگیریی لە نامەکەی بەڕێز ئەحمەد بن بیللا دەکەم دەربارەی نایاسایی دادگاکە، بۆیە دەبێت بە بەردەوامیی ئەم تانە دانە لەدادگا دووبارە بکرێتەوە. مامۆستا خەلیلیش لەم بوارەدا کەمتەرخەمیی نەکردووە.

– دکتۆر نەجیب ئەلنوعێمی تێکۆشەرێکی عەرەبی ڕەسەنە ئەوەش بەسەریدا هاتووە شەرەف و سەربەرزییە.

– هەلێك بدەن بەعەلی حەسەن مەجید بۆ ئەوەی شایەتی خۆی بدات چونکە پێویستی پێیەتی.

– فەرمانی دەستگیرکردن پێویستە لەلایەن دادوەرێکی عێراقیەوە دەربچێت و دەسەڵاتێکی عێراقی جێبەجێی بکات، فەرمانی دەستگیرکردنیش دوای شەش مانگ لە بەندکردنەکە ئینجا دەرچووە.

– لایەنی ئەمریکی لەدادگاکەدا بەتوندی ئامادەیی هەیە و هەردوو ڕەوتی کۆماریی و دیموکراسیی ململانێی تێدا دەکەن.

– مامۆستا خەلیل، سوپاس بۆ خوا، برا بەندکراوەکانم زۆر ئاسودەن لەکارەکانت و شێوازی ئامادەگیت لەدادگاکەدا هەروەها سەرسامن بە ئازایەتی و هەڵوێستت.

– هەڵسوکەوتی داواکاری گشتیی ئیستیفزایی و ناشایستە بوو، ئەو وەك داواکاریی گشتیی ڕەفتاری نەکرد بەڵکو مومارەسەی پیشەکەی کرد وەك دژو رکابەرێکی شەخسی، بەسیفەتی داواکاریی گشتیی شەخسی و بەشێوەیەکی دزێو و ناشرین. ئەگەر دادگاش لەسەر ئەم پەیرەو بەرنامەیە بەردەوام بوو، واتا بەردەوامە لەملکەچبوون بۆ فشارەکانی دادگا. ئەگەر زوڵم و ستەم لەڕادەی خۆی زیادی کرد، پێویستە لەسەر مرۆڤ لەدژی ڕاپەڕێت و بەگژیا بچێتەوە.

– ئێمە پێشبینی ناکەین کە دادوەر مافە بنەڕەتیەکان بۆ مافی بەرگریکردن فەرامۆش بکات، لەوانەیە ئەو ئەمە فەرامۆش بکات یان ناچار بکرێت لەسەر فەرامۆشکردن. ئەمش کاریگەریی دەبێت لەسەر دەرئەنجامی بڕیارەکەی.

– سەبارەت بە هەڵوێستی دادگا لە ڕەتکردنەوەی پارێزەرە عەرەب و بیانیەکان و لەدواخستنەکان، هیوادارم هەڵوێستان لەمبارەیەوە زۆر توندبێت.

– مامۆستا ڕەمزی، تۆ پڕوپاگەندەیەکت کردوە بۆ ئەمریکا کە بیست باڵیۆزخانەو ملیۆنان دۆلار نایکات، تۆ ڕووی گەلی ئەمریکات دادگەرانە نیشاندا بەشێوەیەك کە هەموو کەناڵە ئاسمانیەکان و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن ناتوانن ئەمە بکەن.

– مرۆڤ کار دەکات و بەشێوەیەکی پشتپێبەستن چاوەڕێی ئیرادەی خودا ناکات، من بەشێوەیەکی خەباتگێڕیی و بەم قوڵییە کارمکردووە. ئەوەی دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە کە هەر بڕیارێك دەرکرا، با هیچ کەسێك تووشی خەمباریی و تێکشکان نەبێتەوە، ئێوە کارتان بۆ عێراق و بۆ صەدام حسێن کرد وەك چۆن کارتان بۆ وڵاتەکانی خۆتان کرد، چونکە گەلی عێراق و خەڵك ئەوانەی کە ئاست و ئامادەگیی زەینیان نییە لەو ساتەدا کە تێیدا بڕیارەکە

دەردەکرێت، ئێوە وایان لێدەکەن کۆببنەوەو سەرنج و بیریان بۆ ئەوە ڕابکێشرێت کە بڕیاری حوکمەکە لەلایەن حاکم و دەسەلاتدارەکانەوە دەرچووەو گەلان پەیوەندییان بەم کردەوە خراپ و شەڕانگێزیانەوە نییە، ئێوە کارتان بۆ ئێستاو بۆ ئایندەش کرد.

– ئەو بەکرێگیراوانەی لەناو دادگادان هەموویان بێ هەلاوێردەکردن دەیانەوێت لەسێدارەم بدەم، ئەوانەشیان کەلەسێدارەدانیان ناوێت بەزەییان بەمندا نایەتەوە بەلکو لەخۆیان و لەدەرئەنجامەکان دەترسن.

– سەرنجتان ڕادەکێشم کە ووشەو دەستەواژەی لاتینیی لە گەلالەنامەی نوسینگەی بەرگریدا هەیە کەلەلایەن دادگاوە دانراوە.

– من شایەتیدانە درۆینەکەی کوردەکە بەلامەوەو کتوپڕو نەبوو سەرسامی نەکردم. لەڕێگەی ووردبوونەوەی لەوەی کە دەیووت، ئەوەم هەلێنجان کە ئەو سیخوڕێکی ئیسرائیلە.

– کاتێك یەکێکتان بەرگریی لەهەر بەندکراوێکی تر دەکەن، وەك ئەوە وایە دووجار بەرگریی لەمن بکات.

– پاشەکشەکردن لە بڕیارەکەمان وا لەهەموو ئەوانە دەکات سوکایەتی بەوە بکەن کە ناودەبرێت تۆمەتبارو هەروەها بە پارێزەرەکانیش.

– ژمارەیەکی زۆر لەشایەتەکانی بەرگریکردن ئەوانەی خەلکی دوجەیلن ئەم قورساییە لەسەر شاری دوجەیل لادەبن، چونکە هەندێك کەس ئابڕوی ئەم شارەیان لەکەدارکرد، لەبەرژوەندی شاری دوجەیلیشە کە خەلکەکەی لەپێناو ڕەوت و کاروانی عێراقدا شایەنی بدەن نەك بەرگریکردن لەصەدام حسێن.

– داوای کشانەوە دوابخەن چونکە دادوەر عبدالله ئەلعامریی لەهەموو لایەکەوە فشارەی لەسەرە.

–دادوەر عەبدوللا ئەلعامریی قسەیەکی گەورەی کرد بێ ئەوەی داوای ئەمەی لێبکەین، قسەکەی گورزێکی کوشندە بوو لە بۆش، دادوەرەکان کێن ئەوانەن کە ئەوان لەدادگادا دایانمەزراندون و دەستکردو دەستەچنی ئەوانن. ئەم ووشەیە بەهێزتر بوو لە دۆڕاندنی بۆش لەهەلبژاردنەکاندا، هۆکاری دەستلەکارکێشانەوەکەشی هەر لەبەر ئەمە بوو. بەلام

دادوەر ڕزگار، دەستی لەکارەکەی کێشایەوە چونکە پێشوەخت زانی کە بڕیارەکە لەکۆتایدا بەدەستی کەسانی تر دەبێت.

– ئێمە قەبارەی ئەو فشارە دەزانین کە لەسەر مامۆستا خەلیلە، بۆیە پێمان وایە، ئەوەی کە ئەو دەیەوێت بیڵێت با بیداتە هاوەڵەکانی، پاشان خۆی دەست بەمانۆڕکردن بکات.

– دوێنێ وویستمان دادگا ئاگادار بکەینەوە سەبارەت بەوەی کە ڕوودەدات لە پێوتن و تێکەیاندنێکی ئاشکرا، ئامانجیش بریتیە لە ووریاکردنەوەی ڕای گشتی، هەر لەساتەوەختی یەکەمەوە بۆ ئەوەی بەئاگا بێت سەبارەت بەوەی کە ڕوودەدات لەشێواندنی ڕاستیەکان.

– پارێزەرەکان داهێنانیان کردو گروپێکی نایابیان پێکهێنا.

– بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی کە هەمە لەگەڵتاندا، داوایەك پێشکەش بە دادگای دوجەیل دەکەم بۆ دەرکردنی گەڵاڵەنامەی نوسینگەی بەرگریی لە دۆسێی کێشەکە، بەهۆی بوونی دەستەیەکی بەرگریی کەلەلایەن منەوە تەوکیلکراوە.

– ئامادەنەبوونی دەستەی بەرگریی بەهێزترە بۆ پرسیارکردن لە ئامادەبوونی، ئەویش بۆ ئەوەی سوود لەکات وەربگرین، پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئەی باشە ئەگەر دادگا بڕیارێکی دەرکرد بۆ ئەوەی پارێزەرانی دەستەی بەرگریی ئامادە نەبن؟ پێموایە چارەسەرەکە ئەوەیە کە دەستەی بەرگریی بگۆڕێت بۆ ناوەندێکی یاسایی و دەستەیەکی بەرگریی نوێ هەڵبژێرێت، بەڵام بۆ کێشەکانی تر نەك ئەم کێشەیە.

دوا پرسیاریش: ئەگەر بردنیانین بۆ بینای دادگاکە، یان بەزۆر ناچارکراین بڕۆین، ئایا بەرگرییەکەمان بکەین یان نا؟ کامیان بەهێزن کە بەرگرییەکەمان بەنوسراوی بخوێنینەوە یان وەك بەشێك لەناڕەزایی دەربڕینمان ڕەتی بکەینەوەو هیچ شتێك نەڵێین، وە ئەمە دەچەسپێنین و دەڵێین ئێمە بەرگرییەکی نووسراومان هەیە. بەڵام وەك ناڕەزاییەك لە بەرامبەر جێبەجێنەکردنی داخوزاییە یاساییەکانی بەرگریی، ئەوان ئێمە ئەو بەرگرییە پێشکەش ناکەین و لەدەرەوەی دادگاوە پێشکەشی دەکەین.

– حەزناکەم ئامادەی دانیشتنێك بم کە ئەو مەسخە (عربی) دەیبات بەڕێوە. کاتێکیش کە هەندێك لەو شتانەم باسکرد بۆ ئەم دادوەرە کەلەبارەیەوە دەیزانم، مەبەستم نەبوو خراپە لەبەرامبەر هیچ یەکێك لەعێراقیەکاندا بکەم، بەڵکو بۆ ئەوە بوو هەندێك شتی بۆ

باسم بکەم سەبارەت بەخۆی کە خۆی ئەم شتانە نازانێت، کاتێك ڕۆژێکیان لەکاتی لێکۆڵینەوەدا ووتی: من لەخێزانێکم لەبەناوبانگترین ئەو دە خێزانەی کەلەبەغدادان.

–شایەتیدانی مامۆستا تاریق عەزیز گرنگە، چونکە ئەو ئەندامێك بوو لە وەفدی دانوستانەکان، هەروەها لەبەرئەوەی زانیاری لایە لەبارەی کیماویی و ئەوەی کە بەکاری هێناوە.

–کاتێك کە پابەند دەبم بەشەرعیەتەوە لەبەردەم ئەم دادگا ناشەرعییەدا، ئەوا من دەست بە شکڵ و شێوەوە ناگرم هێندەی ئەوەی پابەندو دەستگرتوو دەبم بەو سوێندەوە کە خواردوومە، هەروەها ئەو پەیمانەی کەلەبەردەم خواو گەلدا داومە.

– دادوەری گەمژەو کەودەنی وەك ڕەئووف و عرێبی، بەسوود دەبن بۆمان بۆ ئەوەی قەبارەی ئەم گاڵتەجارییە لەجیهان بگەین.

– دادوەر سێ جار لەهۆڵی دادگا کردمیە دەرەوە، هەر لەو کاتەوەی کە خەباتگێڕبووم ساڵی ١٩٥٩ هەتا ئێستا ئەو شتانەم بەلاوە گرنگ نییە کە ئازارم دەدەن. بەڵام ئەوەی بەلامەوە گرنگە ئەوەیە گەلەکەمان ئەوە ببینین کەوا کاروبارو مەسەلەکان چۆن بەڕێوە دەچن، ئەو وێنەیەیان پێبگات کە ئێمە دەمانەوێت.

– ئاگاتان لەڕاگەیاندن بێت، درۆو پلانەکانیان ئاشکرا بکەن، جەنگەکەتان لەسەر چەند ئاستێکدایە کە جەنگێکی ڕاگەیاندنی و سیاسی و پاشانیش یاساییە. لاوازترین ئەڵقەشی یاسایە، ئەوانە لەڕێگەی دادگا پوچ و باتیڵەکانیانەوە دادپەروەر نەبوون لەگەڵماندا. من دڵنیام کە ئەگەر سزایەکی توندتر لە سزای لەسێدارەدانیان هەبوایە ئەوا دوو دڵ نەدەبوون لەدژمان دەریبکەن.. ئەوان دەیانەوێت ڕاستیەکان لەناوبەرن، ئەوان پێشتریش دەیانزانی کە عێراق چەکی کۆکوژی تێدا نییە، عێراق پەیوەندیی بە ڕێکخراوی قاعیدەوە نییە، هەر لەبەر ئەوەش بوو هەستان بەشانۆگەریی دادگایی و ڕاستیەکانیان شێواند بۆ ئەوەی خراپە دەرهەق بە شۆڕشێك بکەن کە تەمەنی زیاتر لە ٣٥ ساڵە.

– ڕامسفێلد یەکێکە لەسێ جەمسەرەکە، لەوانەش یەکێك لەو دوو جەمسەرە لە دروستکردنی بڕیاری ئەمریکیدا. بڕیاری دادگاش بڕیارێکی ئەمریکی دەبێت، ڕاڤەکردنی لێدوانەکەی ڕامسفێلد لەبارەی دادگاییەکەوە دەکەوێتە ناو چوارچێوەی یەکێك لەم ئەگەرەوە: یەکەم بۆ هەڵخەڵەتاندن و بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی ئەمریکا لەبڕیاری حوکمەکە

دەربهێنرێت و شەرعیەتێك بدرێت بەبڕیارەکە ئەگەر هاتوو خراپ بوو. دووەمیش دادگاییەکە دواخرا یان ئەگەر بڕیارەکە خراپ نەبوو، ئەوا دەیەوێت بڵێت ئەوەی کە دەرکردنی بڕیارە خراپەکەی پوچەڵکردەوە ئەمریکیەکان بوون. دادگاش ناتوانێت بڕیاری حوکمێك دەربکات کە دژبێت لەگەڵ ئیرادەی ئەمریکیدا، لەوانەیە هاوڕێك نەبێت بەڵام دژیش نابێت.

-(( عەرەب هەڵوێستیان هەیە بۆچی بێدەنگن؟)) دەستخۆشی و ئافەرین بۆ هەڵوێستی گەلی فەلەستین، لەهەموو رەوشەکاندا فەلەستین لەیادناکەین.

-دەربارەی داوای پارێزەرە سعودییەکانیش کە سەرۆك جلی عەرەبی لەبەربکات لەناو دادگادا بۆ ئەوەی پەرۆشی و بەدەمەوەچوونی عەرەب بەئاگابێنێتەوەو کەرۆچوونەتە ناو دۆخی سڕبوونەوە، سەرۆك وتی:

-((ئێمە وا دەستمان پێکرد و بەمشێوەیەش کۆتایی پێدەهێنین. دەترسم ئەمریکیەکان وا بیربکەنەوە کە خانەنشین بووین. ئەگەر ئەوان رێگەیان پێبدایانایە جلی سەربازی لەبەر بکەین ئەوا لەبەرمان دەکرد، بەڵام رێگە نادەن. من هەر شتێك لەسەرو پێستەوە بێت لام بەهایەکی نییە، ئەوەی گرنگ و بنچینەییە ئەوەیە کەلەژێر سنگەوەیە)).

-سڵاو لە حزب بکەن، بەیاننامەکانی ئەمدواییەی بەهێز و گەشبینانە بوو.

-لەدادگادا پێموتن: ئەگەر ئێوە لەدادگای شۆڕش دەپرسنەوە، ئەوا رۆژێك دێت کاتێك شۆڕشی گەل ئەنجامدەدرێت، ئەوا ئێوەش بەهەمانشێوە لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکرێت.

-ئەم رەئووفە شێتۆکە چەند عەقڵی بچووکە، دەیەوێت صەدام حسێن بتۆقێنێت و بە کوشتن تۆمەتباری بکات.

- ئەگەر ئەوان دەیانەوێت لەسێدارەم بدەن ئەوا وازیان لێبێنن با ئەنجامی بدەن و نەجاتمان بدەن.

-هەموو تێبینیەکانتان بۆ مێژوو بپارێزن.

-ستایش و سوپاسی خوای گەورە دەکەم چونکە ئێمە بەسەر مردندا زاڵ دەبووین ولەناومان دەبرد هەروەك چۆن مردن بەسەرماندا دەکەوێت و لەناومان دەبات، دانایی خوای جیهانیانیش وویستویەتی ئێمە بەزیندوویی بمێنینەوە بۆ ئەوەی راستیەکان بخەینەروو ریسوایان بکەین و پڕوپاگەندەکانیان پوچەڵ بکەینەوە، وەك ئەوەی ئێمە و

ئەوە بۆ ڕەخساندین ئەوە هەروەها خوای گەورەش دەیەوێت، هەلی ئەم داداگاییەش ئەوەی بۆ ڕەخساندین ئەوە دەکات.
بلێین کە ویژدان دەحەوێنێتەوەو ئاسودەی دەکات.
-دلخۆش بووم پێتان، بەلام بە قسەوباسەکانی گەلەکەم و سلاوەکانی ئەوان و سلاوی گەلی عەرەبی (چاوەکانی پڕبوون لەفرمێسك) ماندووتان کردم . لەخوای گەورە داواکارم توانای ئەوەم پێبدات کە بتوانم جێگەی متمانەو شانازی هەمووان بم.
-سەرەڕای ئەوەی کە صەدام حسێن بڕوای وابوو کە دادگا لەدۆسێی دوجەیلدا بڕیاری قورس دەرناکات، لەوانەیە هەندێك بەندکراو ئازاد بکەن لەوانەی ناویان ناون گەورە یاریدەدەرانی سەرۆك صەدام حسێن کە دەستەیەکی گەورە پێکدەهێنن لەکۆمەلگە لە جوتیارو کرێکاری پۆستەو گەیاندن و مامۆستا، بەلام ئەوەشی بەدوور نەگرت کە وەك وەلامدانەوەیەکی ئیرادەی ئەمریکی - سەفەویی بڕیارەکە ستەمکارانە بێت، بەلام بەشەکەی تری بەندکراوەکان، ئەوا سەرۆك پێی وابوو کەلەوانەیە بڕیاری سووکیان بۆ دەربچێت بۆ ئەوەی هەستێکی وا لای خەلك دروست بکرێت کە دادگاکە دادپەروەرە. ئەگەر بۆش بیوویستایە، وەك سەرۆك وتی، بیوویستایە بڕیاری حوکمەکە بەرخۆداربکات، ئەوا پێش دوو مانگ دەریدەکرد بۆ ئەوەی کار لەڕای گشتیی ئەمریکا بکات، بەلام دەرکردنی لەماوەیەکی کورتدا، کارناکاتە سەر ڕای گشتیی ئەمریکی و پاشانیش لەبەردەم ڕای گشتیدا. لەگەل ئەوەشدا، سەرۆك متمانەی نەبوو کە ئەم دادگایە بەویژدان و دادگەر بێت لەگەل بەندکراوەکاندا.
-سەرۆك پێشنیاری کرد کە پێویستە لەسەر ئەمریکیەکان کە پارێزەرەکان لەگەل موکیلەکانیان بەند بکەن دوای ئەوەی داوای لەپارێزەرەکان کرد ئامادەبن بۆ بەرگریکردن ئەگەر هاتوو ڕۆژێك لەڕۆژان پاشەکشەیان کرد.

### چ لە دوجەیل ڕوویدا؟

### لەمیانەی دانیشتنی دادگادا لەبەرواری ٢٠٠٥/١٢/٥ سەرۆك دەپرسێت:

- ئایا کاتێك تەقە لەسەرۆك کۆمار دەکرێت، هەتا ئەو سەرۆکەش کە ئەمریکا داینا‌وە، ئایا لێپێچینەوە ئەنجام نادرێت؟ ئایا مافی دەزگا ئەمنیەکان نییە کە بەدواداچوون بکات و لێکۆلینەوە لەڕووداوێکی لەمشێوەیە بکات؟

- بەرپرس صەدام حسێنە، ئەو دەیتوانی فەرمان بکات لێکۆڵینەوە نەکرێت و ڕەزامەندی لەسەر حوکمەکانی لەسێدارەدان نەکات.
- ئەو باخانەی کە دەستیان بەسەردا گیراو لێیەوە تەقەکان کران، حکومەت بەشێوەیەکی باش ناربووی خاوەنەکانی کردەوەو دواتریش جگە لەو پارانەی کە وەک قەرەبووکردنەوە وەریانگرت باخەکانیشیان بۆ گەڕێنرایەوە.
- ئەگەر ویستان لێپێچینەوە بکەن، یان ئەگەر ئەمریکیەکان ویستیان ئەوە بکەن، ئەوا من بەرپرسیارم و مافە دەستورییی و یاساییەکانی خۆمم وەک سەرۆکی دەوڵەت مومارەسە کردووە.
- ناکرێت بەردەوامبن لەسەر ئەم گەمەیە، ئەگەر ئێوە گەردنی صەدام حسێنتان ویست، ئەوا ئەوەی دەتانەوێت بۆ ئێوە.
- لەیەکێك لە چاوپێکەوتنە تایبەتەکانمدا لەگەڵ سەرۆك، پێموت هەندێك لەئەمریکیەکان دەڵێن کە تۆمەتی دۆسێی دوجەیل تۆمەتێکی هیچ و پووچ و بێنرخە، شایانی ئەوە نییە ئەم هەموو گاڵەگاڵەی لەسەر بکرێت، هەندێك لەو ئەمریکیانە پیاوی یاسا نەبوون، بەڵکو ئەو ئەفسەرەو پلەدارانەن کە ڕۆژانە لێرە لەناو حەوش و دەروبانی ئەم بەندیخانەیەدا یان لەناو ئەوەی کە نادەبرێت بەدادگا دەیانبینن.

سەرۆك لەسەری دەڕوات و دەڵێت:

(( دوای ئەوەی حکومەتەکەی دەبلیو بۆش و ئەوانەی لەگەڵیدان لە زایۆنییەکان و کلکە سەفەوییەکانیان، هەروەها ئەوانەی کەلەناوەوەو دەرەوەی عێراقدا چەپڵەیان بۆ لێدان، هەروەها دوای ئەوەی شکستیان هێنا لە ساختەکردنی ڕاستیەکان دەربارەی ئەوەی کەپێی دەوترێت چەکە کۆکوژەکانی عێراق، پەیوەندی عێراق بەتیرۆرەوە، پەنایان بۆ دامەزراندنی ئەم دادگایە برد، دەستیان کرد بەگەڕان بەدوای تۆمەتی ساختەدا. پاشان پیاوانی یاسایان هێنا کە هەندێکیان ناشایستەو نامۆن بەم پیشە بەرزو بەڕێزە، ئەوەش بۆ مەبەستێك کە لە دەروونیدایە یان بەئارەزووی شەیتان، یان لەبەرئەوەی خیانەتی لەسوێنەکە کردووە. بەڵام لەناویاندا پیاوانی بەشەرەف هەبوو کە دادگەرانە مومارسەی پیشەی دادوەریان دەکرد، دەستیان بەهەق و ڕاستیەوە دەگرت و سازشیان لەسەر نەکرد، لەسەروو هەموشیانەوە مامۆستا ڕزگار محەمەد ئەمینی ئازاو سەر ڕاست و دەستپاك و

دادوەر عەبدالله ئەلعامریی. نمونەی ئەمانە کە پاڵیان بەهەق و ڕاستیەوە دا پیاوی یاساو پارێزەری ئازاو نەبەزبوون، ئەمانە خۆبەخشانە کاریان دەکرد و ڕۆحی خۆیان خستبۆوە سەر دەستەکانیان بۆ ئەوەی هەق و ڕاستی سەربخەن سەرەڕای هەموو ئەو مەترسیانەی کە ڕووبەڕوویان دەبووەوە، ئەمانە پێشتر هیچ پەیوەندییەکیان بەئێمەوە نەبوو، بەڵام جوامێریان پاڵی پێوەنان بۆ ئەم وەستانە ئازاو دلێرانەیە. هەرچۆنێك بێت، دوای ئەوەی داگیرکەران و دارودەستەکانیان هەوڵیاندا ڕاستیەکان بسڕنەوەو لەناوییەرن بەوەی ناویان نابوو دۆسێی دوجەیل، دەپرسین ڕاستی ئەم دۆسێیە کامەیە کەصەدام حسێن و هاوەڵەکانی لەسەری دادگایی دەکرێن، کەلەڕاستیدا ئەوانە تەنها کارمەندی پۆستەو گەیاندن و مامۆستای قوتابخانەو کارمەندی کۆمەڵە جوتیاریەکانن..

(( لەو ماوەیەدا عێراق سەرقاڵ بوو بە بەرگریکردن لەدەروازەی خۆرهەڵات و پاراستنی لەتەماحکارییەکانی خومەینی. لەسەرمان بوو لەڕێگەی پێکەوە پەیوەستکردنی گەل و ڕێخستنەوەی ڕیزەکانیانەوە بەرەی سەربازیی پتەو تۆکمە بکەین. بۆ ئەمەش دەبوو ڕەوش و بارودۆخی گەلەکەمان بەسەر بکەینەوەو، سەردانی شارو شارۆچکەکان و گوندو زۆنگاوەکان بکەین. ئەم جارەش سەردانەکە بۆ قەزای (دوجەیل)ی دلاوەر بوو.

دوای ئەوەی کاروانەکە گەیشت، عێراقیەکانی ئەو قەزایە بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازیان لێکردین، ئەوان وەك هەموو شارو شارۆچکەکانی تر بە بەخشندەیی و میهرەبانی ناسراون " خەڵکی قەزاکە وەك ڕێزگرتنێك لەئێمە ئاژەڵیان سەردەبڕی، هەندێك لەژنانیش بۆ سلاوکردن لێمان دەهاتن بەپیرمانەوە. کاتێك کە وویستم سواری ئەو ئۆتۆمبیلە ببم کە لە ناو کاروانەکەدا بۆم تەرخانکرابوو، یەکێك لە پاسەوانە تایبەتیەکانم، داوای لێکردم کە سواری ئۆتۆمبلێکی تربم و ڕوونیکردەوە کە یەکێك لەژنەکان دەستی کردووە بەخوێنی ئاژەڵەکەداو وەك نیشانەکردنێك دەستە خوێناوییەکەی هێناوە بەو ئۆتۆمبیلەدا کە بۆ من تەرخانکراوە. ئەوەش نەریتێکی باوە لای عێراقیەکان کاتێك کە ئۆتۆمبیلێك دەکڕن ئەمە دەکەن، هەندێك جاریش بۆ ڕێزلێنانە لەمیوان. بەڵام پاسەوانە تایبەتیەکان حسابیان بۆ خراپترین ئەگەر کردبوو، ئەویش ئەوەیە کەڕەنگە ئەو نیشانەکردنە بۆ کارێکی دواتر بێت. پاشان ئۆتۆمبیلەکەمان خستە پێشەوەی کەژاوەکەوە کە هەندێك پاسەوانی لەناودا بوو. وەك بیرم بێت، ئەو ئۆتۆمبیلەی کە منی تێدا بوو سێیەم یان چوارەم بوو.

(( لەکاتی ڕۆیشتنی کەژاوەکەدا، دوای تەواوبوونی سەردانەکە، لەشەقامی سەرەکییەوە دەگەڕایەنەوە، کۆمەڵێك چەتەی بەرکرێگیراوی ئێران دەستڕێژی گوللەیان لەئۆتۆمبیلەکانمان کرد. تەقەکان بەشێوەیەکی چڕ لەبەشی چەپی باخەکانەوە دەکران، کە بووە هۆی پێکرانی ژمارەیەك لەئۆتۆمبیلەکانی کاروانەکە. زۆبەی زۆری گوللەکانیش بۆ ئەو ئۆتۆمبیلە دەچوو کە جێ دەستە خوێناویەکەی ژنەکەی پێوە بوو. ئەمەش بووە هۆی کوژران و برینداربوونی ژمارەیەك لە پاسەوانە تایبەتیەکان، کە ئەوانە کۆمەڵێك لەپاسەوانە تایبەتی و نزیکەکانی سەرۆکی دەوڵەت بوون، بەڵام ئەو هێلیکۆپتەرانەی کە بەسەر باخەکاندا دەفڕین، کە دەیانویست شوێنەکانی ئەو تاوانبارانە دەست نیشان بکەن، بەچەکی هەمەجۆرو ڕەشاش تەقەیان لێکرا، بەهۆی ئەوەشەوە کۆمەڵێك فڕوکەوانمان لەدەستدا. شتێکی ئاسایشە لەلایەن پاسەوانەکانی ئێمەشەوە ئەوانە ڕووبەڕووی پەرچەکرداری خێرا ببنەوەو تەقە لەو شوێنانە بکرێت کە تاوانبارەکانی لێ بوو، ئەوانەی کە بەرەو قوڵایی دارستانە چڕەکان هەڵهاتبوون، ئەو دارستانانەی کە سەرچاوەی مەترسی بوون تەنانەت بۆ خودی خەڵکی ناوچەکەش. لەوکاتەدا، خەڵکی بەپەرۆش و دڵسۆزی ڕاپەڕین، پشتی پاسەوانەکانیان گرت، ژمارەیەك لە تاوانبارەکانیان کوشت لەناویشاندا ئەوەی ناوی سەید کەربەلایی بوو، کە سەرۆك و پلاندارێژەری پرۆسەی تیرۆرکردنەکە بوو. ئەو کەسەش ئێرانیە نەك عێراقیی.

خەڵك و پیاوماقوڵانی دوجەیل پۆزشیان بۆ هێنایەنەوەو بەداخەوەبوونی خۆیان دەربڕی بۆ ئەوەی کە ڕوویدا. سەردانەکەم کۆتایی پێهێناو گەڕامەوە بۆ بەغداد. پاشان دەزگاکانی ئاسایشی وڵات، کە ئەمەش کارێکی سروشتییە هەستان بەلێکۆڵینەوە لەڕووداوەکە و گەڕان بەدوای تاوانباراندا. ئەم کردەوە تاوانکاریەش مایەی مەترسیەکی گەورە بوو لەسەر یەکریزی بەرەی ناوخۆی گەل. دەزگا دادوەریەکانیش ڕۆڵی خۆیان گێڕا لەلێکۆڵینەوە لەدادگاییەکەدا بێ ئەوەی ئێمە دەستوەردانمان هەبێت. کارێکی سروشتیش بوو کە بڕیار لەدژی تاوانبارانە دەربکرێت، لەزۆرێکیشیان بووراین. لەبەرئەوە، بەپێی یاساو دەستور، پاشان لایەنی تایبەت و خاوەن بڕیار بڕیاری تەملیککردنی ئەو باخانەی دا کە لەگەڵ شارەکەدا تێکەڵ بوون و بووبوونە مایەی هەڕەشە لەسەر ئاسایشی شارەکەو شەقامە سەرەکیەکە کەبەناویدا دەڕوات. پاش ماوەیەك دەوڵەت بەشێوەیەکی باش هەستا بە

قەرەبۆکردنەوەی ئەوانەی زیانیان لێکەوتبوو، ئەویش بەپێدانی پارچەیەك زەوی کشتوکاڵی و پارچەیەك بۆ نیشتەجێ بوون، دواتریش هەمان ئەو زەویانە کە تەملیك کرابوون بۆ خاوەنەکانیان گەڕێنرانەوە.

" بەڵام خێزانی تاوانکارەکان، گوێزرانەوەو بران لەشوێنی تردا نیشتەجێ کران. ئەمەش لەبەرژەوەندی ئەوان بوو هەروەها بۆ پارێزگارییکردن بوو لەژیانیان لەئەگەری هەر کردەوەیەکی تۆڵەسەندنەوە. ئەم خێزانانە تەواوی ئازادیان هەبوو سەرەڕای پارێزگاریکردن لەسەر هەموو سەروەت و سامانێکیان، بەڵام ئەوەی کە دەوترێت سەبارەت بە ئەتکردن و پێشێلکردنی شەرەفی هەندێك ئافرەتی عێراق لەو کێشەیەدا، ئەوا دەڵێین ئەمە مەبەستێکە ئامانجی زیان گەیاندن و خراپەکردنە دەرهەق بەئێمە، بەتایبەتی کە هەمووان دەزانن کاتێك عێراقیەك مافی دەخورێت و ستەمی لێدەکرێت صەدام حسێن ناخەوێت تا ئەو مافەی بۆ وەرنەگرێتەوەو سەری نەخات.

(( ئەمە ئەوە بوو کەڕوویدا، ئەگەر داواکاری گشتیش ڕاست دەکات، با دۆسیێ بنەڕەتیەکەی کێشەکە بهێنێت، کە تێدا دانپێدانانی تاوانبارەکان و ئیمزاکانیان هەیە کە پلانیان بۆچی دارشتبوو وە چیان ئەنجامدابوو، هەروەها بوونی دەستی ئێران لەپشتی ڕووداوەکەوە، حزبی دەعوەی یاساغکراویش لەیاسا و دەستوری عێراقیدا، کە سەرۆکی حکومەتی داگیرکەر سەر بەم حزبەیە، ئەو ئەم پرۆسە ترسنۆکانەیەی جێبەجێکرد، هەتا ئێران پێش ئاژانسەکانی عێراق هەواڵەکەی بلاوکردەوە.

(( بەڵام سەبارەت بەداواکردن لەوانەی کە ناویان لێناون تۆمەتبارەکان (گیراوەکان)، لە پارێزەری دەستەی بەرگریکاران بۆ ئەوەی دۆسیێی بنەڕەتی کێشەکە بێنن، ئەوام ئەمە داوایەکی ئەستەمانەیە. چونکە ئەوان دەزانن گیراوەکان و پارێزەرەکانیشیان هەڕەشەی مردنیان لەسەرە، ئەوانەش کە خۆیان ناوناوە داواکاری گشتیی، وە ئەوانەی کەلەپشتیانەوەن لەداگیرکەران، دەزانن دۆسیێی کێشەکە لەکوێیە. ئەمە ئەو دۆسیێیە کە صەدام و هاوەڵەکانی لەسەر دادگایی دەکرێن)).

# بەشی هەژدەیەم

## سازشی سەرۆك صەدام حوسێن

داوا لەگەلەکەم و هێزە چەکدارە تێکۆشەرەکان دەکەم کە جیاوازی لەنێوان حکومەتەکانی ولآتانی دەستدرێژیکەرو لەنێوان گەلەکانیاندا بکەن، لەسەر ئەم بنچینەیە بەدانایی هەڵسوکەوت بکەن و ببینن، خۆیان لەخەشم و قین بەدووربگرن کە دەبێتە هۆی کوێرکردنی چاوەکان و نەبینینی ڕاستیەکان.

(صەدام حسێن لە زیندان)

لەسەرەتای مانگی تشرینی یەکەم/ئۆکتۆبەری ساڵی ۲۰۰٦ لەسەرۆك صەدام حسێنم پرسیی ئایا داگیرکەرە ئەمریکیەکان هەوڵیان نەداوە لەگەڵی ڕێکبکەون، لەوەڵامدا ووتی:

" دوای دە ڕۆژ لەدەستگیرکردنم، ژەنراڵێکی ئەمریکی هات، پێموایە لەژەنراڵەکانی گرتوخانەکە بوو، وەرگێڕێکی میسریی لەگەڵدا بوو کاغەزێکی پێبوو. ژەنراڵەکە پێی ووتم: ئەی صەدام دواهەمین هەلت لەبەردەستدایە، یان ئەوەتە وەك ناپلیۆن پۆنابارت دەبیت یان وەك مۆسۆلۆنیی..منیش ڕاپەڕیم و کێشام بەوەرەقەکەی دەستیداو پێم وت: تۆ و گەورەکەت بڕۆن، وەڵا من لەصەدام حسێن زیاتر هیچ کەسێکی تر نابم، جگە لە بەرگریی و خەباتکردن بۆ ڕزگارکردنی عێراق و دەرکردنتان بەهێز، داوای هیچ شتێکی تر لەگەڵەکەم ناکەم. ئامانج لەقسەکەی ژەنراڵ ئەوە بوو داوا لە گەلەکەم بکەم کە بەرگریی و بەرخۆدانیان ڕابگرن و خۆیان بەدەستەوە بدەن.

(( بەڵام سەبارەت بە دانوستانی تر وەك سەردانی تێپەڕیانەی بۆش، یان ئەوەی کە ئەو ڕۆژنامە میسریە نووسیبووی کە مامۆستا خەلیل بۆی هێنام، کە دانوستان ڕوویدابێت لەنێوان من و ڕامسفێڵددا، سوێندبێ بەخوا هیچ کەسێك دانوستانی لەگەڵ مندا نەکردووە.. ئەوان بەهەموو ڕێگەیەك هەوڵ دەدەن کە ڕۆڵی من فەرامۆش بکەن یان هەڵیوەشێننەوە، دامبڕن لەگەل، بڕوایان وایە ئەوان بەم شێوەیە دەتوانن هەڵوێستمان بگۆڕن..ئەوان خەیاڵ دەکەن. هەڵوێستی ئێمە لەسەر بنەماگەلێکی ڕوون وەستاو و جێگیرە. بەڵام سەبارەت بەوەی دەوترێت کە دانوستان هەیە لەگەڵ هەندێك کەسدا، ئێمە نە کەسمان سەرپشك کردووەو نە دەیشیکەین سەبارەت بەوەی بەنوێنەرایەتی ئێمە دانوستان بکات، ئێمە ناسراوین لایان، ئەوەتاین لای خۆیان، من داوای هیچ شتێکیش لە دوژمن ناکەم جگە لەوەی کە ڕێز لە مافی گەلان بگرێت لەدیاریکردنی چارەنووسیاندا. ئێمەش گەل هەڵیبژاردوین و بەپشتیوانی خوا هەرگیز وازی لێناهێنین. کەواتە دەڵێین سەرکردایەتی لای خۆیانە هەروەها سەرکردەی سەرکردایەتیش بەهەمان شێوە، ئەگەر وویستیان قسەمان لەگەڵ بکەن، ئەوا با بێن و قسە بکەن. ئێمە هیچ ئامانجێکی شەخسی و کەسییمان نیە..

ئێستا ئێمە لەسەر کورسی فەرمانڕەوایین و لەدەرەوەی کورسی فەرمانڕەوایشەوەین، مەرگ و ژیان بەنسبەت ئێمەوە وەك یەکە. هەرچۆنێك بێت ئەوان دێن.. لێیان گەڕێن با لەهەموو دەرگاکان بدەن، کاتێکیش کە هیچیان پێناکرێت و دەستەوسان دەبن، ئەوکاتە، دەزانن دەرگا ڕاستەکان کامانەن کەپێویستە لەسەریان لێی بدەن.

(( من ئاگایی دەدەم بەسەرکردایەتی حزب، لەدەرەوەی گرتووخانە، سەرکردایەتیە سەربازییەکان لەهەر دانوستانێك لەگەڵ دوژمندا؟ ئێستا دوژمن لەژێر گورزەکانی ئەواندا سست و لاواز دەبێت. ئەوانیش لەهەوڵی ئەوەدان کە ئەم سەرکردایەتیە دەستنیشان بکەن بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسانی لێیبدەن و لەناوییبەرن. بۆیە پێویستە لەسەر ئەوانەی کەپەیوەندی بەئەمریکیەکانەوە دەکەن لەپێناو دانوستاندا، بەوە وەڵامیان بدەنەوە کە سەرکردایەتی و سەرۆکەکەی لای خۆتانە، دانوستانی لەگەڵدا بکەن. ئێمە دەڵێین ئەگەر دەیانەوێت نهێنی بێت ئەوا ئێمە لاریمان نیە، ئەگەر دەشیانەوێت ئاشکرابێت، ئەوا مەسەلەکە بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە. بەڵام وەك ئەوەی ئێمە بۆ دانوستان لەدەرگایان بدەین، ئەوا ئەم کارە هەڵوێستمان لاواز دەکات، ئەمەش مەحاڵەو هەرگیز ڕوونادات.

(( ئەوەی چارەسەری ئاشتیانەی دەوێت، ئەوا با لەدەرگا دروستەکە بدەن و بڵێت گفتوگۆمان دەوێت. چارەسەری ئاشتیانەش لەعێراقدا ئاسانترین چارەسەرەکانە کە دەکرێت ئەمریکا بەرەو ڕووی بڕوات. عێراقیەکان سەرەڕای ئەوەی (سەخت و زبرن)، بەڵام لەهەمانکاتیشدا نەرمونیانن.

" ئێمە مێژوویەکمان هەیە، سەدم حسێن لەچاو عەلی و ئەبی بەکرو عومەردا ڕەزای خوایان لەسەربێت تەنها کورتەباڵایەك بوو، ئەگەر پیرۆزی و سەرکەوتنێکیش هەبووبێت ئەوا لەخوداوە بووە. ئەگەر هەڵەیەکیش هەبێت ئەوا لەمنەوە بووە، تەنها خوای گەورەشە کە هەڵە ناکات، ئەم خۆڕاگرتنەشم کەمترین شتێکە کە دەتوانم پێشکەش بەگەلەکەمی بکەم.

بەڵام سەبارەت بەوەی دەوترێت دانوستان هەیە لەنێوان بەڕێز تەها یاسین ڕەمەزان و عەبد حەمموددا، ئەوا دەڵێم ئەو ئەمریکیانە لێکۆڵەرەوەن‌و دەیانەوێت بەهەر ڕێگەیەك بێت قسەیان لێدەربێنن و ئەوان پەیوەندییان بەبڕیاری سیاسیەوە نییە، وەگەر نا ئەوان بەمانای دانوستان دانوستانیان لەگەڵ من و لەگەڵ غەیری مندا نەکردووە بەڵکو دەیانەوێت

فەرامۆشمان بکەن، بەڵام من دەڵێم ئەوان ناتوانن لەووڕەو ئیرادەمان کەمناکەنەوەو هەر دەبێت بێن لەدەرگاکانمان بدەن بۆ ئەوەی لەعێراق هەڵبێن".

لێرەدا سەرۆك لایکردەوە بەلای پارێزەر ڕەمزی کلارك و بەگاڵتەوە ووتی:

" بەرێز ڕەمزی، پێموایە بۆش پاراستنی لەوەی لە داگیرکردنی جیهانەوە تێبگلێن، هەروەها عێراقیش. ئەو پێش ئەوەی ئازاری کەسانی دیکە بدات ئازاری وڵاتەکەی خۆیدا، لەوانەیە بۆمان نووسرابێت کە جارێکی تر بۆش تاقیبکەینەوە بۆ ئەوەی ڕادەی توانست و لێهاتوویی ببێوین.. ئایا پارتی کۆماری بە کەسە سەرەکیەکانیەوەو خودی سەرۆکیش هەروا کەشتیەکە واز لێدێنن بۆ ئەوەی بکێشێت بە کەندەلاندا و تێکبشکێت؟ عێراق ئەمریکاو مەترسیەکەیی تاقیکردۆتەوە، بەتەنها ئێوەن لەجیهان دەترسن لەهەڵوێست وەرگرتنیان لەئیدارەی ئەمریکی، بەڵام ئێمە چیدی لەئەمریکا ناترسین.

" من کەسێکی واقیعیم مامۆستا ڕەمزی، ئەگەر بەچاوێکی نزم سەیری وڵاتەکەم نەکرێت ئەوا بەو پەڕی نەرمییەوە مامەڵە دەکەم، چەندێکیش دوژمن لەگەڵم توندبێت ئەوان منیش زیاتر سەخت و زبر دەبم. بەڵام مامەڵەکردنێکی مرۆییانە لەلایەن بەرامبەرەکەمەوە، بەوە دەتوانێت بەشێك لەمافەکانیشم بەرێت بۆ خۆی. ئەوان لەرەوشی صەدام حسێن تێگەیشتوون، هەروەها لەوە تێگەیشتوون کە سەقامگیریی عێراق لەرێگەی پیاوەکانیەوە دەبێ، وە من هەتا بەشێوەیەکی شکلیش بێت ژیانم ناکەمە نرخ و بەهایەك".

لێرەدا سەرۆك لەبارەی زۆرێك لەمەسەلە گشتییەکانەوە دەدوێت و لەقسەکانیشدا جۆرێك لە سوعبەت و شۆخیکردنی تێدایە بۆ ئەوەی کەشێکی گەرم وگوڕمان بۆ دروست بکات ووتی:

لە (٢٠٠٦/١/١)دا بەرهەڵستکاران دلێرو نەبەرد بەموشەکێك لێیاندلین کەوا کەوتە ناو دەریاچەکەوە (دەریاچەی نور) یەکێکیان (واتە ئەمریکیەکان) لەت وپەت بوو، وویستیان دورم بخەنەوە بۆ ئەوەی پێوە نەبم! منیش ڕەتمکردەوەو ووتم لێمگەرێن با گوێم لەتەقەی نەبەردان بێت.. بەهاوەڵەکانم وت لەگرتووخانە ئەگەر ئەمساڵ بارانی سەرەتای بەهار باری ئەوا لەگرتووخانە دەردەچین. پێموایە ئێمە لەهاتنمان (لەدایك بوون) دواکەوتووین؛ پێویست بوو لەسەرمان پێش سەد ساڵ بهاتینایە.

عێراقیەکان وا لەگەڵم ڕانەهاتوون کە قسەیەك بکەم و دواتر پەشیمان ببمەوە لێی، دەڵێین ئەوەی داوای مافێك لەمافەکانی دەکات، ئەوا ڕێنمایی بکەن بۆ ڕێگەیەکی یاسایی و دوای ئەوە یەکباوەڕبن".

## قسەو باسەکان لەبارەی ئەمریکیی و ڕوسەکانەوە

لێرەدا سەرۆك ڕوو بەلای مامۆستا ڕەمزی کلارکدا وەردەگێڕێت بۆ ئەوەی لەبارەی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکاوە بدوێت و دەڵێت:

" پێموایە لەوانەیە دیموکراسیەکان بگەنە ڕێگەی دەربازبوون ئەگەر داوای کۆمەك و یارمەتی لەعەرەب بکەن، بەتایبەتی لای عەرەب ئەو قەناعەتە هەیە کە عێراقی صەدام حسێن لەگەڵ لایەنە خراپەکانیشیدا، باشترە لە عێراقێکی کراوە. بەلام عەرەب ناتوانن ئەم ڕایەیان بخەنەڕوو تەنها کاتێك نەبێت کە ئەمە لەئەمریکیەکان ببیستن، ئەگەر دیموکراتیەکانیش زۆرینەیان بەدەست هێنا لەهەڵبژاردنەکاندا، ئەوا پەلە دەکەن لەخستنەڕووی پێشنیاری بیرۆکەی لادانی بۆشدا، بۆشیش ناتوانرێت ڕزگاربکرێت چونکە ئابرووی لەئەمریکاداو لەدەرەوەی ئەمریکاشدا کۆتایی پێهاتووە. پێشتان دەڵێم کە ئەمریکا پێشتر بێزراو بوو لەسەر ئەوەی پشتیوانی لەئیسرائیل دەکرد ئەو لەبری ئەمریکا جەنگی دەکرد، بەلام ئێستا زیاتر مایەی بێزاری و ڕق لێبوونەوەیە چونکە خۆی جەنگەکە دەکات، عێراقی و موسڵمانەکان لەهەموو شوێنێکدا دەکوژێت. ئەوان لەبەردەم گەلەکەیاندا ڕایانگەیاند کە هێرشکردنە سەر عێراق لەپێناو چەکی کۆکوژدایە. مادام درۆشیان لەگەڵ گەلەکانیان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا کرد، ئەوا پێویستە لەسەریان یان حکومەتەکەیان بخەن یان ناچاریی بکەن دەست لەکاربکێشێتەوە. ئەوان ئێستا لەعێراقدا تێوەگلاون و زمانی حاڵیان دەڵێت ئەوەی تێیگلاندوین با ڕزگارمان بکات.. ئەوان فشار بەکاردەهێنن و چەندین شێواز بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی دامبڕن و دوورمبخەنەوە، بۆ ئەوەی بگۆڕێم، بەلام " شورەیی نییە بۆ صەدام حسێن کە بارودۆخەکان بیگۆڕن؟" .. من بەیەکێك لەژەنراڵەکانیانم ووت کە بەرپرسی گرتوخانەکە بوو: بمێننەوە و بەدوای دەروازەکاندا بگەڕێن، بەلام لەکۆتاییدا دەرگای ڕاستەقینە دەناسنەوە. سوێند بەخوا دیارە کە ئەمریکیەکان تۆقیون. ئەو شەڕانیانە (ئەمریکیەکان) پۆستاڵی جەنگاوەرێکی عێراقی و

مناڵێکی عێراقی باشترە لەوان. مامۆستا کلارک ئەگەر هەلێکی ئەوەت هەبوو قسە لەگەڵ
گەلی ئەمریکیدا بکەیت، ئەوا پێیان بڵێ صەدام حسێن ئەگەر لەبری گەل و ئوممەتەکەی
خۆیی کردۆتە قوربانی ئەوا ئامادە نییە هەڵوێستی هانا بۆ بردن و پاڕانەوە وەربگرێت".

سەرۆک بەردەوام دەبێت لەووتەکەی و دەڵێت:

" بەگشتی، وڵاتە خۆرئاواییە گەورەکان، هەموو وڵاتانی گەورە لەجیهاندا وەک چین و
ڕوسیا، نایانەوێت هەر وڵاتێك کە دروشمی یەکێتی و گەشەسەندن بەرزبکاتەوەو نەوتی
هەبێت سەقامگیری بەخۆیەوە ببینێت، ئیدی ئەو وڵاتە ئێران بێت یان هەر وڵاتێکی تر.
بەڵام ئەوان زیاتر توندوپێداگرن لەگەڵ عەرەبدا بەهۆی هەستیاری ئەو وڵاتانەوە لەبەرامبەر
مەسەلەی فەلەستینداو نەبوونی هەمان ئەو هەستیارییە لەگەڵ ئێراندا. بەڵام من دەڵێم
پێویستە لەسەر وڵاتانی گەورەو زلهێز، ئەگەر وویستیان ڕێگە لەجەنگی تر بگرن، ئەوا هێز
نیشان بدەن و بەکاری نەهێنن، کاتێکیش هێز نیشان دەدەیت و ئەو دەرئەنجامانە بەدی
نایەن وەک ئەوەی دەتەوێت، ئەوا کارەساتی گەورە ڕوودەدات.

" بەڵام بەنسبەت ڕۆژنامەکانەوە، ئەوا دەڵێم ڕۆژنامەکان کە بەدەستم دەگەن کوت
کوتکراون، زۆرێك لەو هەواڵانەیان لێ لادەبەن کە ڕوودەدەن بەتایبەتی سەبارەت بە
ڕاپەڕینی ئێستای عەشایەرو هۆزە عەرەبییەکان، بۆ ئەوەی ئاگادار نەبم لەوەی کە
ڕوویداوە.

هەروەها بە مامۆستا ڕەمزی کلارک دەڵێم لەوەڵامی ئەو قسەیەیدا کە حکومەتی ئەمریکا
هەموو ئەوەی لەعێراقی وویستووە بەدەستی هێناوە، بەڵێ ئەو بەپیرۆزبایی لێکردن
لەلایەن حکومەتی بەکرێگیراوەوە ساڵی ئایندە قازانجێك بەبڕی ٢٠٠ملیار دۆلاری
دەستدەکەوێت. ئەم ژمارەیەش زۆر گرنگە ڕابگەیەنرێت، وە بەڕادەیەکی زۆر سوود لە
نەوتی عێراق وەردەگرێت، بەڵام ئەوەی زیاتر سودی لێوەردەگرێت بریتیە لەو کۆمپانیانەی
کە هاوپەیمانی حکومەتی ئەمریکان. ئەوەش زیانی پێگەیشتووە بریتیە لەگەلی ئەمریکا،
لەبەردەم هەموو جیهاندا دۆڕاو هەموو ڕەگەزەکانی هێزی لەدەستدا. ئێمە کاتێك کە
ڕاستیەکان دەڵێین، لەترساندا نییە، هەروەها ئارەزووکردنی ئەوە نییە گەلی ئەمریکا
سەرمان بخات بۆ ئەوەی لە گرتووخانە بێینە دەرەوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ڕاستی بڵێین. نە
حکومەتی عێراق و نە گەلی عێراقیش ڕۆژێك لەڕۆژان دژی ئەمریکا نەبوون، ئێوە ڕێبازی

بیروباوەڕی سیاسیمان دەزانن. گەلی ئەمریکاش بەرژەوەندی نییە لەجەنگدا، بەڵکو رۆژێکیش دەردەکەوێت کە حکومەتەکەی چەندە تاوانی لەدژی گەلانی جیهان و دژیەتی، ئەنجامداوە. بە ئەرکێکی ئەخلاقیی خۆیشم زانیوە کە قسە لەگەڵ گەلی عێراق لەناویشیاندا بکەم، لەنامەکەشمدا پرسیومە ئایا حکومەتی ئەمریکا نازانێت کە عێراق گەلی ئەمریکادا هیچ چەکی کۆکوژی تێدا نییە، یان ئەو ناتوانێت ئەوە بزانێت یان نایەوێت بزانێت، هەروەها ناماژەم کرد بە نەبوونی پەیوەندی عێراق بەتیرۆرەوە. پێمووتن حکومەتەکەیان لەهەڵوێستێکی گلاندوون کە بەرژەوەندیی ئێوەی تێدا نیە، ووتویشم ئێوە دەتوانن ئەم هەڵوێستە چاکبکەنەوە ئەگەر بتانەوێت، یەکباوەڕ بن لەسەر ئەوەی کە دەتانەوێت، ئەوکاتە وڵاتەکەتان و هەموو مرۆڤایەتیش ڕزگاردەکەن لەناویشیاندا عێراق".

لەبارەی پەیامەکەشیەوە بۆ گەلی عێراق، سەرۆک دەڵێت:

" من خاڵێکی گرنگم لابوو وویستم بیخەمە ناو پەیامەکەوە، بەڵام حەزم نەکرد درێژەی پێبدەم، ئەویش ئارەزوومان بۆ ئاشتی و هەروەها لەبەر ناوچەکەش. لەبەهاری ١٩٩٠دا لەکۆتاییەکانی مانگی سێدا یان بەراییەکانی چواردا، وەفدێکی کۆنگرێسی ئەمریکا سەردانی کردم کە کۆمەڵێك کەسایەتی هاوڕێیەتیان دەکرد ئەم وەفدە سیناتۆر بۆب دۆڵ سەرۆکایەتی دەکرد، بە فرۆکەیەکی تایبەتی هێنامن بۆ موسڵ کە ئەوکات خۆم لەوێ بووم، چاوم پێیان کەوت و پێشنیارم بۆ کردن وا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بکەین بەتاڵ بێت لە هەموو چەکێکی کۆکوژ وەك دەستپێکێك بۆ ئەوەی لەسەر ئاستی جیهانیشدا هەمان کار بکرێت و هەموو جیهان پاکبکرێتەوە لەو چەکە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش رۆڵێکی چالاك بگێڕێت لەمەدا. لەوکاتەدا عێراق لەجەنگدا نەبوو لەگەڵ ئەواندا، بەڵکو سەرکەوتوو بوو بەسەر ئێراندا، لەنێوان ئێمەو ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هیچ گیروگرفتێك نەبوو. کاتێکیش کە سەرۆك حوسنی موبارەك سەردانی کردم، ڕامسپارد بەناوی عێراق و میسرەوە قسە بکات، کاتێکیش پێمووت دەمانەوێت خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەتەواوەتی چۆڵبکرێت لەچەکی کۆکوژ لەناویشیدا ئیسرائیل، سەرسام بوو ووتی: تۆ وا دەڵێیت؟ ووتم: دەتوانیت لەبری ئێمە لەمبارەیەوە قسە بکەیت. ئەم ووشانەمان کردە پەیامێك و دامە باڵیۆزخانەی ئەمریکا. من ئەو کاتە ئەوەم بۆ سیناتۆر ڕوونکردەوە کەپێویستە ئەمە بەدی بێت. هەروەها لێم پرسی: ئێوە چی دەکەن ئەگەر یەکێك لەتیرۆریستەکان چەکێکی

کۆکوژی خستە ناو ئۆتۆمبیلێك و لەواشنتۆن تەقاندیەوە؟ هەروەها ئامۆژگاریمکرد ی ئەمریکا واز لەفشارخستنە سەر ڕێکخراوە فەلەستینیەکان بهێنێت لەکاتێکدا کە خۆی لایەنگریی ئیسرائیل دەکات لەدژی عەرەب. هەروەها پێمووتن ئەگەر ئیسرائیل لێمان بدات ئەوا ئێمەش لێیدەدەین. قسەکەشم ڕوون بوو، هەروەها پێمووتن سەرەڕای ئەوەی ئێمە داوا دەکەین ناوچەکە چۆڵبکرێت لەچەکی کۆکوژ، بەلاّم مافی عەرەبیشە هەر چەکێکیان هەبێت کە دوژمن هەیەتی. هەندێك کەسیش قسەکەی ئێمەی وا لێکدابووەوە کەئەمە هەڕەشەکردنێکە لەئیسرائیل. ئەم قسەیە پێش جەنگ بوو واتە پێش چوونە ناو کوەیتەوە، هەروەها پێش ئەوەی بابەتی چەکی کۆکوژ بوروژێنرێت، صەدام حسێن هەمیشە ئاشتی وویستووە بۆ خۆی و بۆ کەسانی تریش، وە صەدام حسێن لەئارەزوومەندانی کۆکردنەوەی چەك نییە. بەلاّم ئێمە قەناعەتمان وابوو، ئێستاش هەر هەمان قەناعەتمان هەیە، کەعێراق هەمیشە پێویستە بەهێزبێت. سنووری لەگەڵ ئێراندا دەخوازێت بەئاگابێت. ئێمە لەگەڵ ئێراندا سنووورێکمان هەیە درێژترە لەو سنوورەی کە لەگەڵ عەرەبدا هەمانە. ئەگەر عێراقیش بەلاوازی مایەوە ئەوا دەخورێت.

" بەخوا، هەر لەساڵی ١٩٥٩وە ڕۆشنایيەکان لەسەر صەدام حسێن بوون. لەوکاتەدا گەلچییەتی زاڵبوو بوو بەسەر فەرمانڕەوایەتیدا، بوو بووە هەقیقەت و واقیعێك بەهۆی ئەم نزیکی و هاوسنوورییە بەدبەختانەیەوە لەگەڵ ئێراندا، بەلاّم گەلچییەتی لەئاستی دووردا ترسنۆك و بکوژو زەبروزەنگ بەکارهێنەرە. گەلچیەتی لەعێراقدا ئاراستەیەکی خوێناوییە، پەیڕەوێکە دانراوە بۆ ئەوەی عێراق لەناوببات، کەئەم ئاراستەیەش بەتەواوەتی پەیوەستە بەئێرانەوە، ئەو گەلچییەتیکەرانەش خەنجەرێکن چەقیونەتە پشتی نەتەوەوە..ڕووی ڕاستەقینەیان هەڵماڵراو ڕاستی کارەکانیان ئاشکرابوو، لاوازتر دەرکەوتن لەوەی کە هەندێك کەس بۆچوونیان وابوو، پاڵەوانەکانمان گورزی کاریگەریان تێسرەواندن و تووشی شکستی یەك لەدوای یەکیان کردنەوە. لەوکاتەدا بیرۆکەی نەتەوەیی هێشتا توانای ڕێکخستنی نەبوو، بەلاّم لەئەنجامی کۆتاییدا، ئەوا ئەم بیرۆکەیە سەرکەوتوو دەبێت.

" کاتێك کە ڕۆشنایيەکان لەسەر ئێمە بوون، ئەوا بەلامەوە گرنگ نەبوو، نازناو و ناونیشانەکان ڕۆژێك لەڕۆژان سەرقاڵیان نەکردووم، لای من هیچ بایەخێکیان نیە. کاتێکیش نازناوی "سەرۆك"م وەرگرت، ئەوا ئەمە بۆ خۆم نەبوو، بەڵکو لەپێناو ئیرادەی گەلەکەمدا

بوو کە دەستی پێوەوە گرتووم و پشتی بەرنەداوم. سوپاس بۆ خوداش ئێمە ناونیشان و ناوبانگ بەلامانەوە گرنگ نەبووە، گەلەکەمان بەشی هەرە گەورەی لەژیانمان پێداوین. بەڵام قوربانیدان، ئەوا شورەییە لەبارەیەوە بدوێین هەروەها نازایەتیش، بەڵام لەقۆناغێکدا، پێویستە لەسەر فەرمانڕەوا کەبیسەلمێنێت نازایە. لێرەدا بەوپەڕی نازایەتیەوە دەڵێم ئەو دەسکەوتانەی کەبەدەستمان هێناون لەسەردەمی گەمارۆدا هاوبەرامبەی ئەوەیە کەلەماوەی سی و پێنج ساڵدا ئەنجاممان داوە.

" ئێستا دەپرسم بۆچی ئەم سیناتۆرە نایەت سەبارەت بەهەموو مەسەلەکان لەگەل تاریق عەزیزدا قسە بکات و لێیان بەئاگابێت".

سەرۆکم لە ڕفاندنی دبلۆماسە ڕوسەکان ئاگادار کردەوەو، ووتی:

" پێموایە ئەمریکەیەکان ڕفاندونیان بەمەبەستی ڕاگواستنیان لەعێراق تا نەڵێن عێراق چەکی کۆکوژی تێدا نییەو ئاگاداری ناڕاستی بانگەشەکانی ئەمریکیەکان و ڕەوشی ڕاستەقینەی ئەوان نەبن لەعێراقدا.

" ئێمە نامانەوێت ئەمریکا پڵنگێك بێت لەسەر کاغەز، لێشی ناترسین کاتێك دەبێتە پڵنگێك لەسەر زەوی و نامانەوێت ستەم بکات، بەڵکو لەپێناو ڕاستیدا دەمانەوێت. ئەو لەسەر زەوی هەڵیکی لەبەردەستدا بوو. ئەو ئەگەر بە داگیرکردنی ئەفغانستان وازی بهێنایە، بیووتایە لێرەدا دەوەستین چونکە ئەوەی وویستمان بەدیمان هێنا، ئەوا ئەمە بۆ ئەوان باشتر بوو لەبری ئەوەی هەموو هێزەکانی بەفیڕۆ بدات و خۆی بخاتە ناو ئەم گرفتەوە. ئەگەر ئەمریکاش پێویستی بەصەدام حسێن نەبووایە ئەوا لەناوی دەبرد. بەڵام بەزیندوویی دەیهێڵێتەوە ئەویش لەبەر چەندین هۆ: بۆ هەڕەشەکردن لەئێران و هاوسەنگڕاگرتنی ناوخۆیی، پاشان حسابی ئەوەش بۆ پەرچەکردای بەرهەڵستیی عێراقی دەکات ئەگەر ژەنراڵێکی ئەمریکی بە دیلیی کەوتە دەست بەرگرییەوە، ئەوا ئەو کاتە صەدام وەرقەیەکی زۆر بەنرخ دەبێت.

" بەڵام بۆش، ئەوا دەیەوێت کات بەدەست بهێنێت، لەڕێگەیەوە گەلی ئەمریکا هێور دەکاتەوە، بەڵام لەڕاستیدا لەگرفت و کەندەلانێکی گەورەدایە. پێش ماوەیەك بەماوەلەکانم ووت کاتێك باسی ڕوخان و دابەزینی جەماوەرێتی بۆشیان بۆ کردم، ئێمە هەموومان دەمانەوێت گەلی ئەمرکیا ڕاستیەکان بزانێت، ئەوکاتە دەڵێین مەسەلەکە تەواو بوو. ئێستا

مەسەلەکە بریتییە لەکات. ئەو سەرۆکەش کە لەقۆناغی دووەمی حوکمڕانیەکەیدا دەکەوێت، ناکرێت دەرباز بکرێت.. لەکۆتایشدا ڕاستی و هەق سەردەکەوێت، سەرکەوتنەکەش تەنها بۆ گەلی عێراقی نابێت بەتەنها، بەڵکو بۆ گەلی ئەمریکاش دەبێت بۆ هەموو ئەو کەسانەش کە دەڵێن نا بۆ جەنگ. لێرەدا حەز دەکەم ئەوە بە دادوەر (سادق عەلی) بڵێم ئەی دادوەر، حەزدەکەم لەبەردەمیاندا بوەستن و پێیان بڵێن ئەمە هەڵەیە. ئەمریکا دەوڵەتێکی بیانیی داگیرکەرە، بەچاوی گریاناوییەوە لەعێراق دەریان دەکەین"..

## پەیامێک بۆ واشنتۆن

وا بۆتە باو لەچاوپێکەوتنەکاندا کە لەنێوان سەرۆک صەدام حسێن و دەستەی بەرگریدا دەکرێت، بەهەموو لایەنە پرۆتۆکۆلیەکانیەوە، دیدارەکە دابەش دەکرێت بۆ دوو دیدار، یەکێکیان دیدارێکی گشتیی لەگەڵ پارێزەرەکانداو ئەوی دیکەشیان تایبەتە کە لەسەر داوای سەرۆک دەبێت لەلایەنی ئەمریکی، کە تەنها لەگەڵ سەرۆکی دەستەی بەرگریدا دەبێت.

لە بەرواری ٧ تەممووزی ساڵی ٢٠٠٦دا، دەستەی بەرگریی لەفرۆکەخانەی شاژنە عەلیائی نێودەوڵەتیەوە لەعەممان بەرەو فرۆکەخانەی بەغدای نێودەوڵەتی بەرێکەوت. پاشان دەستەی بەرگریی گوێزرانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە تایبەتکراوە بۆ چاوپێکەوتنی سەرۆک کە لەباشوری فرۆکەخانەکەدایە، لەیەکێک لەسەربازگەکانی پاسەوانی کۆماریی تایبەت (ناوچەی ڕزوانیە)، کەئێستا بارەگای فرقەی تایبەتی هێزەکانی مارینزە و ئەندامانی سەرکردایەتی لەوێ بەندکراون. سەرۆک صەدام حسێن بەئۆتۆمبیلی زرێپۆشی ئەمریکی گەیشت کەلەسەر یەکێکیان نیشانەی خاچی سوور هەبوو (زرێپۆشی فریاکەوتن) پاشان فەرماندە ئەمریکیەکە داوای لەگروپەکە کرد نەچنە شوێنی چاوپێکەوتنەکەوە، ووتی کە سەرۆک تەنها دەیەوێت لەگەڵ سەرۆکی دەستەکەو بەرێز ڕەمزی کلارکی ئەندامی دەستەکەدا کۆببێتەوە. دوای چوونە ژوورەوەمان، بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین، پاشان داوامان لێکرد ڕێگە بە ئەندامانی دەستەکە بدات بێنە ژوورەوە سلاوی لێ بکەن و دوای ئەوە چوونە دەرەوە و من لەگەڵ بەرێز کلارکدا ماینەوە. سەرۆک پێی وابوو من دەتوانم

بەشێوەیەکی باش و پاراو بەئینگلیزی قسە بکەم، بەتایبەتی کە بەڕێز کلارک پێویستی بە وەرگێڕێکە کە بتوانێت زمانی ئینگلیزی بزانێت.

سەرۆك دەیوست بابەتەکە لەدەرەوەی چوارچێوەی شیکارە ڕاگەیاندنیەکان و شیکاری لایەندارەکانەوە بمێنێتەوەو، لەرێگەی بەرێز کلارکەوە نامەیەکی ڕوونکردنەوەی سەرزارەکی تایبەت ئاراستەی حکومەتی ئەمریکا بکات، ناشیەوێت جگە لەمن و بەڕێز ڕەمزی کلارك کەسێکی تر بیزانێت، بەڵام کێشەی وەرگێڕانمان بۆ دروست بوو. بۆیە ناچار بووین یەکێك لەهاوەڵە عەرەبەکان بێنینە ژوورەوە بۆ ئەوەی ببێتە وەرگێڕ لەنێوان سەرۆك و کلارکدا، ئەمەش سەرۆکی ناچار کرد کە تەنها پەیامێك بنێرێت بۆ گەلی ئەمریکی، ئازادی چۆنیەتی گەیاندنی پەیامەکەشی بۆ بەڕێز کلارك بەجێ هێشت، کەبیەوێت لەناو ئەمریکادا پەخشی بکات لەرێگەی کەناڵە ئاسمانییەکانەوە، یان لەرێگەی کەناڵێکی عەرەبی لەدەرەوەی ئەمریکا. بە بەڕێز کلاکی وت:

" پەیامێکی نووسراوم هەیە بۆ گەلی ئەمریکا، کە پەیامێکی درێژەو تێیدا ئاماژەم بۆ کۆششەکانتان کردووە، وە من دەیدەمە ئێوە چونکە جێگەی متمانەی من و متمانەی گەلی ئەمریکان، ئەگەر وویستت دەیسپێرم بەتۆ، تۆش ئازادی چۆن دەیدەیتە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، ئەگەر پێت باشبوو دەکرێت لەیەککاتدا لەئەمریکاو لەیەکێك لەکەناڵە عەرەبیەکاندا بڵاویبکەیتەوە. ".

بەڵام پەیامە (زارەکیەکە) کە وادیاربوو پەیوەست بوو بە چارەسەرێکی هەمەلایەنە بۆ گرفتی عێراق و ناوچەکە بەگشتیی، سەرۆك ئارەزەوی دەکرد لەرێگەی بەرێز کلارکەوە بینێرێت، ڕەوشەکەو (زمان) وای وویست کە سەر نەگرێت. بۆیە سەرۆك تەنها پەیامە نوسراوەکەی دایە بەڕێز کلارك کە ئاراستەی گەلی ئەمریکای کردبوو.

وەك پێشتریش جەختمکردەوە، هیچ دانوستانێك لەگەڵ سەرۆك صەدام حسێندا نەکراوە. کاتێکیش لەگەڵ یەکێك لەهاوەڵە پارێزەرەکاندا لە کرۆبەر سەردانم کرد، داوام لەسەرۆك کرد ڕێگەم بدات ئەمجارە بەوپەڕی ڕوونیەوە قسەی لەگەڵ بکەم، قسەکانم بەشێوەیەکی تر لێکنەدرێتەوە. داوام لێکرد بەسەر لایەنی ئەمریکیدا بکرێتەوەو هەوڵبدات کەناڵێکی لێکتێگەیشتن لەگەڵیاندا دروست بکات بۆ ئەوەی بتوانێت ئەوەی ماوەتەوە لەعێراق بیپارێزێت، هەروەها بۆ پارێزگاریکردن لە یەکێتی نیشتمانی و قەوارە

هەڕەشەلێکراوەکەی، ئەم داوایەی منیش لەسەر پێداگریی و نامەی کەسانێك بوون کە خەمی سەرۆك و ژیانی ئەویانە. هاوەڵە پارێزەرەکەشم دەزانێت مەبەستم چییە و پێش ڕۆژێك لەسەردانەکە چی ڕوویدا، بۆ ئەوەی هیچ کەسێك بەوە تۆمەتبارمان نەکات کە ئێمە وامان لەسەرۆك کرد لەسەر هیوایەکی ساختە بژی و مەسەلەکان نەبینێت وەك ئەوەی کە هەن، دوای پێداگرییەکەی زۆرم ، سەرۆك ووتی:

" پشتیوان بەخوا کەمتەرخەمی ناکەم، بەڵام تا ئێستا نەهاتوون. ئەوان دەزانن پەیوەندی لەگەڵ کێدا دەگرن. هەموو هاوەڵەکانم لەگرتووخانە کە پەیوەندیان پێوە کردوون بۆ ئەوەی هاوکاریان بکەن، ڕەتیانکردۆتەوە هاوکاری لایەنی ئەمریکی بکەن. ئەگەر ئەمریکیەکانیش وویستیان دانوستان بکەن، ئەوا با لە لۆژیکی هاوبەرامبەری و هاوتاییەوە دلنوستان بکەن، ئێمە لۆژیکی خۆ بەگەورە زانین لەکەس قەبوڵ ناکەین، یان مامەڵەکردن بە بەزاڵیی بەچاوپۆشین لە هێزی لایەنەکەی تر. ئەگەر ئەمریکیەکان بەعەقڵانیانە مامەڵەیان کرد، ئەوا دەبینن ئاسانە مامەڵەکردن لەگەڵ عێراقیدا، بەڵام بەلۆژیکی خۆبەزلزانیی، ئەوا جگە لەسەختی و خۆڕاگریی هیچی دیکە لەعێراقی نابیننەوە، دەزانن کە کلیلەکە بریتیە لەصەدام حسێن".

# بەشی نۆزدەیەم

## پێشبینییەکان و سۆزەکان و نامەکان

پارتەکەمان پارتێکی مەزنە لەکلتورو ژیاننامەو دەسکەوت و ئاراستە نەتەوەیی و مرۆییەکانیدا، دڵم زۆر ئازارم دەدات کاتێك کۆمەڵێك داوای دوژمنەکان و ئەوەی لەبازنەی ئەواندا دەسورێتەوەو هەوەس و خەشم و قین کوێری کردوون دەبیستم بۆ گۆڕینی ناوی ئەم تەلاری خەباتو بەرخودانە کە ئێمە بەشێکین لێی و ئەویش بەشێکە لەگەڵ عێراق و ناوەندە عەرەبیەکەی.

(صەدام حسێن لەناو زیندان)

لەمیانەی چەندین قسەو باسدا، سەرۆك صەدام حسێن پێشبینیەکانی خۆی دەخستەڕوو هەروەها هەست و سۆزی خۆی دەردەبڕی لەبەرامبەرە براکان و ڕۆڵە عێراقیەکانی. پاشان قسەی لەبارەی چەند نامەیەکی دیاریکراوەوە کردوو و ووتی:

" ئەوەی پێشبینیی دەکەم حکومەتێکی تر لەدوای حکومەتەکەی مالیکییەو دێت، پاشان بۆش یان حکومەتی ئەمریکیی دێت بۆ دان لەدەرگا ڕاستەکە. کەسانێك یان پێکهاتەیەك لەدەرەوەی حزبی بەعسەوە دێنن و دەڵێن ئەمە ئەو حکومەتەیە کە نوێنەرایەتی گەل دەکات، پێشموایە ئەمە لەماوەی شەش مانگی ئایندەدا ڕوو دەدات.

" پێش چوار ڕۆژ (٢٠٠٦/٩/٢٨)، لەگەڵ هاوەڵە بەندکراوەکانمدا لەبینای دادگاکەدا قسەم دەکرد، پێمووتن ئەگەر ئەم قەیرانە کۆتایی هات و عێراق ڕزگارکرا، ئەوا مەسەلەکە بەمشێوەیە دەبێت:

### بەیاننامەی سەرکەوتن:

١- بەیاننامەی یەکەم: ئەوەی دێتەوە بۆ عێراق ئەوا خوای گەورە لەوە خۆش بوو کەتێپەڕیی لەناویشیاندا ئەوانەی کە کوڕەکانی صەدامیان دا بەدەستەوە، واتە بەلاوەنانی تەواوەتی هەموو ئەوانەی کە ڕوویاندا.

٢- بەیاننامەی دووەم: ئەوەی چەکی بەرزکردەوە هەتا مردن لەگەڵیدا بجەنگێن تەنها ئەوکاتە نەبێت کە خۆی دا بەدەستەوە، ئەوا بەپێی یاسای تاوان مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. چونکە ناتوانین لە یەکباوەڕی و پێداگرییەوە بگۆڕێین بۆ کەسانی گەلۆرو گەمژە. ئەوە مومکین نیە. بەڵکو ووریایی دەدەین و ئاراستە دەکەین و لێدەبوورین، بەلاّم پێداگیریی و سووربونیش دەبێت هەبێت.

" ڕۆژێکیان، لێرە لەگرتووخانەکەم هەستمکرد ڕەوشێکی نائاسایی لەبەغداد هەیە، کاتێك پرسیارمکرد، ووتیان حکومەت پلانێکی ئەمنیی دارشتووە. وێنای بکەن، دوای زیاتر لەسێ ساڵ لەداگیرکردن ئەمریکیەکان و حکومەتی بەکرێگیراو دەیانەوێت پلانی ئەمنیی دابڕێژن، هێزی زیاتریان ڕەوانەی ئەنبار کردووە ، باشە سوپا ١٥٠٠٠٠ هەزار کەسیەکە چی

بۆ کردونن تا ئەم فرقەیە یان ئەو کەتیبەیە بۆیان بکات. بەغداد ئەوان و هەزاری وەک ئەوانیش هەڵدەلوشێت و قوتیان دەدات. بەوانەیش دەڵێم کە دەیانەوێت دەستور دابنێن، هەر هەڵسوکەوتێك لەگەڵ بوونی داگیرکەردا دانپێدانانی داگیرکەرە، هەروەها پێیان دەڵێم: ئەوەی گەلەکەی لەگەڵیدا نەبێت ناتوانێت هیچ بکات. لەعێراقیش هیچ رۆژێك لەرۆژان لە شۆرشی ١٧-٣٠ تەمموزی ١٩٦٨ەوە تا ئێستا هاتوچۆ قەدەغە نەکراوە. من ئازار دەکێشم کاتێك دەبینم خوێن لەبەر گەلەکەمان دەروات، چونکە ئەو خۆشەویستە لامان. منیش لەهەموو کەس زیاتر گەلەکەم دەناسم چونکە من شەڕی ئێرانم پێکردووە، بەلامەوە گرنگە گەلەکەم سەربکەوێت. پاشان لەگەڵ زەلیلی و سەرشۆرشیدا ژیان مانای چی دەگەیەنێت، ئێمە ژیانێکی لەو شێوەیەمان ناوێت. وەك پێشینانیش ووتویانە دۆزەخ بەسەربەرزیی خۆشترین ماڵە.

" پێش ئەوەی بێمە سەر حوکم، خەڵکی لەهەژاریدا دەژیان، من ژیانێکی شایستەو سەربەرزانەم بۆ دابینکردن. صەدام هەتا ئێستاش بە موچەی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەژی، شەرم لەخۆم و لەهاوەڵەکانم دەکەم داوایان لێبکەم موچەکەم راست بکەنەوە. کاتێك کە تەماتە نرخی لەبازاڕدا بەرزدەبۆوە، صەدام شەو نەدەخەوت. بەلاّم ئێستا.."

هەروەها بەپارێزەرەکانی ووت:

" بەعێراقیەکان بڵێن ئەوان وەك یەك گەل ژیاون، پێویستە لەسەرتان بەو شێوەیە بژین هەروەها پێویستە لەسەرتان کار بۆ دەرکردنی بیانیی بکەن. ئەگەر قەدەر وویستی گەڕامەوە، ئەوا دەتوانم لەماوەی حەوت ساڵداو بەبێ کۆمەکی هیچ کەسێك عێراق ببوژێنمەوەو وای لێبکەم باشتر بێت لەکاتژمێری سویسریی. بەلاّم ئەگەر کارەکە بەیارمەتی هەر یەکێك بوو، ئەوا دەتوانم لەماوەی پێنج ساڵدا ئەو کارە بکەم. پێموایە ئەمریکیەکان بۆ ماوەی پەنجا ساڵی تر دەستیان بۆ وێرانکردنی هیچ دەوڵەتێکی تر نابەن. گورزی ئەمریکاش گورزێکی زووتێپەڕەو نامێنێت ئەمەش بەپێچەوانەی ئیمپراتۆریەتەکانی پێشووەوە.

" هەمیشە کاتێك سەردانم دەکەن هەواڵی گەلتان لێدەپرسم. ئەوەی بێزارم دەکات ئەوەیە کە رۆڵەکانی گەلەکەمان بەهۆی ئاشوبی تاییفیەوە لەدژی یەك دەجەنگێن.

بەلامەوە گرنگ نەبووە ئەگەر مرۆڤ حزبی بووبێت یان نا، شیعە بووبێت یان سوننی یان مەسیحیی یان شتی تر، من باکگراوندی کەسەکان و تێڕوانینە تەسکبینیەکانم بەلاوە گرنگ نەبووە. ڕۆژێکیان بە ئەحمەد حەسەنی سەرۆکی دیوانم وت، داوات لێدەکەم لەسەر بنچینەی عێراقیی بوونی مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکە- زانینی باکگراوەند پێویستە بەلام تەنها لەسەر بنچینەی شایەنیی بوون مامەڵە دەکەین. کاتێکش قسە لەبارەی سەفەوییەکانەوە دەکەم دەڵێم ئەوان فێڵلێکراو نین، بەڵکو پەیوەندیان بەئێرانەوە وایان لێدەکات کە ئەم ڕێگە دژ بەگەلە هەڵبژێرن. کاری نهێنی لەلایەن ئەوانەوە نمایشی هەقیقەت ناکات، چونکە مەرج نیە هەموو کارێکی نهێنیی کارێکی نیشتمانی بێت، بەتایبەتی ئەگەر گەل لەبەرەکەی تردا بوو کە ئەم کۆمەڵە نهێنیە لەدژیان دەجەنگێت و مژێکی کەماڵی داوە بەدەوری کارە نهێنیەکانیدا. لەوانەشە پێویست بێت ماوەیەك فەرمانڕەوایی بکات بۆ ئەوەی هەقیقەتی دەربکەوێت، ئەمەش وویستی پەروەردگارە. هەتا ئەوانەی کەلەبارەیانەوە دەوترێت کە( تیرۆریستن) وەك زەرقاویی و غەیری زەرقاویی، ئەوا پێمان وایە کاری ئەمانە کەمتر خراپ بێت لەچاو هەڵسوکەوتی ئەو کینە لەدڵانە.

" بەلام سەبارەت بەتێڕوانینم بۆ ئایندە وەك ئەوەی کە دەیبینم، دەڵێم: ئەگەر بۆش دانی بەهەڵەکەیدا نا، ئەوا پێویستە ئەوە چاکبکاتەوە کەبەدەستی خۆی خراپی کردووە.. ئەمریکاش زۆر شت دەدۆڕێنێت تا نرخی تاوانەکانی بزانێت. بەڕای من گەلان نەسەرمایەداریی و نەسۆسیالیزم کەڵکیان پێناگەیەنێت، بەڵکو دادپەروەریی بریتیە لەگرەنتی سەقامگیریی گەلان. بەلام سەبارەت بە بەریتانیا، ئەوا من لەگەڵ هاوەڵەکانمدا باسی ئەوەم دەکرد کە لەناو حزبی کرێکاراندا کەسێك بەدیاردەکەوێت کە هەوڵی ڕزگارکردنی ئەو پارتە دەدات نەك بۆ ڕزگارکردنی کەسێتی بلێر. ئەوەش شێوازێکی زیرەکانەیە بۆ دەربازبوون لەبارقورسی بەرپرسیارێتی و پوختکردنەوەی حزب لێی. هەر ئەمەش ڕویداو ڕووشدەدات لەبەریتانیادا. کۆمارییەکانیش لەئەمریکا لەسەر هەمان ئەم هێڵە کاردەکەن.

## نامەی سەرۆک بۆ تاڵەبانیی

دوای دەستگیرکردنی سەرۆک جەلال تاڵەبانی ڕایگەیاند، ئامادەیە میوانداریی خێزانی سەرۆک بکات. لەڕێگەی پارێزەر خەمیس ئەلعوبەیدییەوە (کە میلیشیاکانی سەر بەئێران دواتر تیرۆریان کرد) ئەوەم پێگەیشت کە جەلال تاڵەبانی دەیەوێت چاوی بە سەرۆکی دەستەی بەرگریی و جێگرەکەی پارێزەر خەمیس ئەلعوبەیدیی بکەوێت، دواتریش سەرۆک سەدام حسێن سەبارت بەبۆچوونی خۆی لەمەڕ بابەتەکەوە پێیڕاگەیاندین و ووتی:

" من پێموایە تەنها بەڕاگەیاندنی ئەوەی کە ئامادەیە میوانداریی خێزانەکەم بکات لەباکوری عێراق، ئارەزوویەکی ڕاستگۆیانە لەخۆدەگرێت ئەگەر پەیوەست بێت بەبڕیارێکەوە. ئەمەش شایستەی ئەوەیە بەچاوی ڕێزو پێزانینەوە سەیری بکرێت. بەڵام سەبارەت بەچاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆکی دەستەو جێگرەکەیدا ئەوا مەسەلەکە بەجێهێڵراوە بۆ خۆتان. دەڵێین لەوانەیە بەڕێز جەلال تاڵەبانی بڕوای وابێت یان هەستی کردبێت ئەمریکیەکان گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە بەبێ صەدام عێراق پارچە پارچە دەبێت، ئەگەری چارەسەرکردنی ئەم بابەتیش بەشێوەیەکی جدیی لای ئەوان لەئارادایە-لەوانەیە وا گومانیان بردبێت کە پارچە پارچەبوونی عێراق یان زاڵبوون و دەسەڵات پەیداکردنی ئێران لەعێراقدا هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانیان دەکات. جا ئەگەر تاڵەبانی هەستی بەم هەڵوێستە کردبێت یان پێشبینی دەکات، ئەوا نزیکبوونەوەی بەشێکە لە بەرنامەکەی. وە ئەگەر داواشی کردوون چاوی پێتان بکەوێت، ئەوا پێی بڵێن:

" صەدام سلاوت لێدەکات و پێت دەڵێت: دەکرێت عێراقیەکان لەنێوان خۆیاندا ناکۆک بن، بەڵام بیانیی ئەم ناکۆکیە دەقۆزێتەوە بۆ بەرپاکردنی ئاگری جەنگ لەنێوانیاندا. تۆش دەزانیت کە صەدام حسێن ئەوە زیاتر ئازاری دەدات کەعێراقیەکان لەژێر هەر ناوێکدا بێت لەدژی یەك بجەنگن. لەسەر ئەمەش، من ئەو ڕەوشەی لەکوردستان هەبوو وەك خۆی هێشتمەوە بێ ئەوەی هیچ ڕێکەوتنێکی پێشوەختم لەگەڵتاندا هەبێت، هێزی سەربازیشم بەکارنەهێناوە تەنها لەمەسەلەی هەولێردا نەبێت، ئێوەش خۆتان هۆکارەکان دەزانن. من هەڵوێستی ئێوە بەرز دەنرخێنم لەکوژاندنەوەی ئاگری ئاشووب لەنێوان عێراقیەکاندا، ئەگەرچی ڕەنگە بەهۆی حسباتی سیاسیی تایبەتیەوە تائێستا هەڵوێستی خۆتت یەکلایی نەکردبێتەوە".

بەڵام ئەو دیدارەی کە ئاماژەی پێکراوە ڕووینەدا، بەوەش نامەکەی سەرۆک نەگەیەنرا بە جەلال تاڵەبانی.

سەرۆک لەوەڵامی پرسیارگەلێکدا دەربارەی تاڵەبانی قسەکانی تەواو دەکات و دەڵێت: " جەلال پیاوێکی زیرەکە، بەڵام هەندێك جار پەلە دەکات لەهەندێك مەسەلەدا.. زۆرم لا نییە کەبیڵێم چونکە لەناو زینداندام، ئەگەر لەناویدا نەبوومایە، ئەوا زۆر شتم لابوو کە بیڵێم هەروەها بۆ بەرێز مەسعود بەرزانیش، ئەگەر ئێستا بیڵێم، بەو پێیەی لەناو زینداندام ئەوا بەوە لێکدەدرێتەوە لەڕووی لاوازیمەوە".

## شانازیکردن بەعەرەب و عێراقییەکانەوە

" سڵاوم بۆ ئەنباری پاڵەوان، سەماوەو دیوانیەو عەممارە، ئەوا من دڵخۆشم پێیان کەئەوان بڕبڕەی پشتی عەرەبن. پێتان دەڵێم تێرمکەن لەهەواڵی گەلەکەم. من خۆشحاڵم بەهەڵوێستی ئیمام ئەلحوسنی چونکە بەڕوونی ڕایگەیاند لەگەڵ بەرگرییدایە. وە بە ئیمامی بەغدادیی، ئەوا بەهاوەڵەکانم وت کە بەعسیەکان پەیوەندیی پێوە بکەن چونکە ئەو جیاوازی ناکات لەنێوان دەستەو لایەنە جیاوازەکانی گەلدا.

پێتان دەڵێم ئەو وێرانکارییەی لەعێراق ڕوویدا، وا لەگەلەکەمان دەکات سەرلەنوێ هەستێتەوەو زیاتر دڵگەرم بێت لەسەر بوونیادنانەوە. ئاوەدانکردنەوە دەگەشێتەوەو بەپشتیوانی خوا وڵات ڕووناك دەبێتەوە. سڵاوم بۆ هەموو عەرەب بەتایبەتیش بۆ گەلی ئۆردنی ڕەسەن. لێرەدا بۆتان دووپاتدەکەمەوە کەعێراق وەك پێشوو بە مەزنی عروبە هەڵدەگرێت و وڵاتێکی جیاو تایبەت دەبێت، ڕووناسیەکەی سەرکردەی دامەزرێنەرم لەیادە کە عێراق پەرچەمی دامەزرێنەریش لەجێگەی خۆیدا بوو. خوای گەورە لێیخۆش بێت، ڕێزو سڵاویشم بۆ خێزانە بەڕێزەکەی".

سەرۆک بۆ ساتێك بێدەنگ دەبێت، عێراق بەهەموو پارێزگاو شارەکانی و پیاوە پاڵەوان و ژنە سەلارەکانیەوە لەنێوماندا ئامادەبوو و..و.. بەتایبەتی ئامادەگیی ئەنبار زیاتر بوو لەسەلاحەدین. هەروەها دەڵێت:

" ئەنبار عەگالەکانمانی ڕێککردەوە کاتێك لەساڵی ١٩٩١دا لاربوو، ئێستاش وا مامۆستا خەلیل و هاوەڵەکانی هەوڵدەدەن عەگالەکانمان هەڵگرنەوەو لەسەر سەرمان داینێنەوە. ئەوان لەگەڵ هەموو عێراقیەکاندا شانازییەکی گەورەن بۆ ئێمە. پارێزگاکانی ئەنبارو سەلاحەدین و دیالەو نەینەوا، لەبەرابیەکانی ئەو پارێزگایانە بوون کە چەکیان لەپێناو خۆماڵیکردنی نەوتدا هەڵگرت".

**سەرۆك بەردەوام دەبێت و دەڵێت:**

" من زۆر قسە ناکەم لەبارەی پارێزگای سەلاحەدینەوە لەبەرچەند هۆکارێك کەزانراوە. بۆیە ئەگەر ڕۆڵەکاتی دیالە دووجار بجەنگن ئەوا پێویستە سەلاحەدین چوارجار بجەنگێت. بۆیە بەم پێیە ئاوەدانکردنەوە لەدوای هەموویان دەگاتە سەلاحەدین، لەعۆجەش کە گوندە، پێمووتن نابێت لەپێشبوونی ئەم بدرێت بەسەر گوندەکانی تری عێراقدا، هەتا بڕیاری گۆڕینی بۆ شارۆچکە بەدەستی خۆم هەڵموەشاندەوە.

سڵاوی من بگەیەنن بەفەلوجەو بەسرەو بێجی و شارە خۆشەویستەکانی ترمان، هەروەها بەشێخەکان بڵێن لەفوراتی ناوەڕاست مێژووتان مەزن و عەرەبایەتیان پڕبەپڕو دروستە. هەروەها سڵاوم بگەیەنن بەشێخ حارس زاری و ساغ و سەلامەت بێت. هەروەها سڵاوم بگەیەنن بە عەشیرەتی ئەلبوعامر و شێخەکانی. لەبارەی گەلی کوردیشمانەوە دەڵێم: من دڵخۆش دەبووم کاتێك سەرکردەیەك لەکوردەکانم دەبینی و چاودێریم دەکرد کە دەبوو سەرکردەیەکی ناسراو و بەناوبانگ. کاتێکیش کە داواکارییەکانی گەلەکەمانم لەباکور دەخوێندەوە، کاتی داواکارییەکان ئامازەیان بە بەرواری کۆن دەکرد، چونکە ئەوان پێشبینیان دەکرد ڕۆژێك لەڕۆژان دیدەنیم دەکەن".

ساتەکانی بێدەنگی گوزەر دەکەن، تێیدا یادەوەریم ڕەها دەبێت، ئەو ڕۆژانەم بەیاد دێتەوە کە سەرۆك قسەی بۆ گەل دەکرد لەبۆنە فەرمی و نافەرمییەکاندا، هەندێکیانم بیردەکەوێتەوەو هەندێکیش لە کۆڕی گوندەکاندا دەگێڕرایەوە. ئەو دەیوت: " هەندێك کەس لەعێراقدا، بەهۆی تالانکردنی سەروەت و سامانەکانیان لەلایەن داگیرکەرەوە پێش خۆماڵیکردنی نەوت زۆر هەژاربوون، پێخاوس بوون. هەندێك کەس لەوانەی لەشارەکان دەژیان بەتایبەتی دوای خۆماڵیکردن، قەڵس و نارەحەت دەبوون و هەندێکیشیان بڕوایان

بەم قسەیە نەدەکرد چونکە لەشارەکاندا دەژیان". بەڵام من بەڕاستگۆییەوە دەڵێم سەرەڕای منالّی تەمەنم لەوکاتەدا، لەزۆربەی کاتەکاندا لەساڵەکانی ١٩٦٨و ١٩٦٩دا پێخاوس بووم. خەڵك هیچیان نەبوو. ئێمە هەتا کۆتایی شەستەکانیش لەبەردەم چرادا دەمانوسی و دەمانخوێندەوە، ئاوی پاك و خزمەتگوزاریی و تەندروستی شیاومان نەبوو. بەڵام عێراق، لەسەردەمی سەرۆك صەدام حسێندا، لەهەموو لایەنەکانەوە گەیشتە ئاستی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان.

## پەیامێك بۆ ڕەوتە نیشتمانیەکان

هەواڵمدایە سەرۆك لەبارەی ئەو ڕەوتە نیشتمانیانەوە کە لەعێراق پەیدابوون و ڕەتی داگیرکەر دەکەنەوە، ئەوەی کە بڵاوبۆتەوەو دەوترێت لەبارەی پشتیوانی حزبی بەعس بۆ هەندێك لەو ڕەوتانە، وەڵامی دایەوەو ووتی: " من لەناو زینداندام، هەڵوێستی براکانم لەهێڵی گشتیی نازانم، لەهێڵی گشتی حزبدا، پێویستە حزب یارمەتیو پشتیوانی لە هەموو ئەو ڕەوتانە بکات کە پەیوەندیان بەئێرانەوە نییە، هەروەها پێویستە هانی هەموو ڕەوتەکان بدرێت کەوا کار لەسەر یەکێتی عێراق دەکەن و لەسەر بنەمایەك یەکبگرن کەئەویش بەڕوودا وەستانەوەی داگیرکەرە. بۆیە پێویستە لەسەرمان هاوکاریان بکەین و هانیان بدەین".

## بەعس و ئاینده

سەرۆك لەبارەی بۆچوونەکانیەوە سەبارەت بە حزبی بەعس لەئایندەدا دەڵێت:

" حزبەکەمان حزبێکی مەزنە دەوڵەمەندە بەفیکرو کۆشش و خەباتەکانی، هێندەی ئەوەش کەوا چەند پێویستە بۆ قۆناغێك، ئەوا هەندێك جاریش زیانبەخش دەبێت و دەبێتە قورساییەك لەسەر کاروانەکە و لەسەر شانی حزب ئەگەر چەندیش لەسەر بنەمای نادورست بوونیاد نرابێت، یان بەشێوەیەکی نادروست تەیار کرابێت. بەڵام ئێمە لەدوای ئەم تەنگانە سەختەو دوای ڕزگارکردنی عێراق، دەڵێین ئەگەر بەپشتیوانی خودا دوو سەد خەباتگێڕی باوەڕدار دەرچوون کەباوەڕێکی ڕەهایان هەبێت لەسەر بنەماگەلێك لە ئازایەتی و متمانە بەخۆبوون ئەوا ئەمە ئەوە دەبێت کە ئێمە داوای دەکەین. بوونی چەندێك کە باش نین،

نالێین خراپ، چونکە حزبەکەمان جگە لە مرۆڤە باشەکان کەسیتر ناهێنێتە ناو ریزەکانیەوە. ئەم چەندە ئەگەر لەگەڵ جۆرە باشەکەدا لەیەك سەنگەردا بوون، ئەوا بەدڵنیاییەوە باری سەرشانی کەسە چاك و تەواو باوەڕدارەکان قورس دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی جۆرێك لە تێکچوونی هاوسەنگیی یان پەنا بەخودا ئاڵۆزکانی ریزەکان، لەقۆناغی داهاتوودا پێویستە لەسەر حزبمان، جەخت لەسەر جۆر بکاتەوە لەگەڵ فەرامۆش نەکردنی چەندی باشدا. وێڕای ئەوەی من بڕوام وایە کە قۆناغی داهاتووی دوای ڕزگاریی، لەگەڵ حزبەکەماندا حزبی تریش دەبێت. عێراق هی ئەو کەسەیە کە ڕزگاری دەکات، سەنگەرو خەندەقەکانی جەنگانیش بۆ ڕزگارکردنی عێراق ئێستا پڕە لە پاڵەوانە غەیرە بەعسیەکان.

### نامەیەك بۆ مامۆستا عیزەت دوریی: بەعس و باوەڕ

لە ٢٠٠٥/٩/١٣دا، سەرۆکی دیلکراو صەدام حسێن نامەیەکی نارد بۆ عیزەت دوریی براو هاوەڵی ڕێگای، نامەیەکی زارەکی گرنگ کە ئەمەیە:

" ئەبو ئەحمەد پێیان بڵێ کە شیعە بەشێکی گرنگن لە گەلەکەم، بەبێ شیعە لەجەنگی ئێراندا سەرنەدەکەوتین. بەهۆی هەڵسوکەوتی ناپاك و خائینەکانیانەوە سەرکۆنەی شیعەکان نەکەن. هیوادارم ئەوە بۆ هەموو ڕەوت و ئاراستە ئاینیەکان ڕوون بکەنەوە کە گەورەترین هەڵە ئەوەیە کە وا دابنێین ئێمە دژ یان دوژمنی ئەوانین. تێڕوانینی ئێمە لەم مەسەلەیەدا کۆنە، ئێمە ناکۆك نین لەگەڵیاندا بەتایبەتی لەمەسەلەی ئایندا. ئێمە لەوەدا، تاکە دەوڵەتێکین کە پابەندین بەهاندەری ئەخلاقیی و ئایینی و نەریتیەوە. سەرەڕای چاودێریکردنمان بۆ هەتیوان و لایەنی کۆمەڵایەتی لەعێراقدا. هەروەها ئێمە تاکە وڵاتێکین کە هیچ قەڵەمڕەوییەکمان بۆ بیانی نەهێشتۆتەوە تێیدا. هەروەها عێراق تاکە وڵاتێکە کە خوێندنی ئایینی لەقۆناغەکانی سەرەتاییەوە هەتا ئامادەیی گشتاندووە، هەروەها لەسەر هەموو بەڕێوبەرێکی گشتیی و بەرەو ژوورو هەموو ئەندام فرقەیەك و بەرەو ژوور، لەسەر هەموو دادوەرەکان. هەروەها یانەکانی مەی خواردنەوەی یاساغکردووەو، سزای داناوە بۆ هەرکەسێك بەئاشکرا لەڕەمەزاندا شت بخوات و ڕۆژو بشکێنێت، هەروەها سزادانی سوێند خواردن بەناڕەوا.

" پێیان بڵێ ئێمە هەمیشە بانگەشەمان بۆ باوەڕداریی کردووە، ئێمە لەوەدا بێ لایەن نین، هەروەها پەیڕەوی ئێمە ئەوە بووە کە وڵات ڕانەپێچینە ناو مەزهەبچییەتی و ئاینزاگەرییەوە".

ڕۆژێکیان پارێزەر مامۆستا زیاد ئەلخەصاونە ئەو کاتە کە ئەو سەرۆکی دەستەی پشتیوانی بوو، داوای لێکردم خێرا بچم بۆ نووسینگە چونکە کەسێك هەیە دەیەوێت چاوی بە خاتوو ڕەغد صەدام حسێن بکەوێت. کاتێك گەیشتمە ئەوێ، چاوم بەو پیاوە کەوت، تەمەنی لەسەرو پەنجاو پێنج سالّیەوە بوو. دیاربوو لەپیاوانی (بروسکە)بوو. وتی کە ئەو جێگری ئەفسەری هێزە تایبەتەکانە. پاشان بەناوێکەوە خۆی پێناساندم. وتی دەیەوێت چاوی بە خاتوو ڕەغد بکەوێت، کاتێکیش پرسیم بۆچی، وتی ئەوان دەیانەوێت هەڵکوتنە سەر ئەو شوێنەی کە سەرۆکی لێ بەندکراوە " بۆ ئەوەی دەریبێنین لەو ڕەوشەی کە مایەی زەبوونی و ڕیسواییە بۆ ئەو و بۆ ئێمەش". بەشێوەزاری باشوری عێراق قسەی دەکرد. داوای ژمارەی تەلەفۆنەکەیم لێکرد، داوای لێبوردنی کرد کە نازانێت تەلەفۆن بەکاربهێنێت. قسەکانی گومانی دەوروژاند. دوای لێکۆڵینەوەو بەدواداگەڕان بۆمان دەرکەوت کە لە چەند لایەنێکی سەفەوییەوە نێراوە کە ئێرانی لەپشتەوەیە، بۆ ئەوەی هەڵکوتێتە سەر زیندانەکەی سەرۆك، پاشان بیڕفێنێت بۆ ئێران، سەفەویی و ئێرانیەکان پێیان وابوو کە ئەمریکا حوکم بەسەر صەدامدا نادات، لەوانەیە بیگێڕێتەوە بۆ فەرمانڕەوایی! لەمبارەیەشەوە پڕوپاگەندەی زۆریان بڵاوکردبۆوە.

نمونەی ئەم جۆرە هەوڵانە دووبارەبوونەوە. خێزانەکەی سەرۆکم ئاگادارکردەوە، بەتایبەتیش ڕەغدی کچی کە بەهەموو شێوەیەك ڕەتیکردەوە چاوی بەو جۆرە کەسانە بکەوێت.

ڕۆژێکیان لەکاتی چوونمدا بۆ بەغداد بۆ ئەوەی چاوم بەسەرۆك بکەوێت، ئەو کەسەی کە ئاسایشی دەروازەکانی بەغدادی بۆ دابین دەکردم و هەروەها بەخۆی و پیاوەکانی پاسەوانیان دەکردم، سەرۆکی یەکێك لەگروپەکانی بەرگریی عێراقی بوو، ئەم کەسە زۆر لای سەرۆك صەدام حسێن خۆشەویست بوو، پێشنیاری کرد کە بەسەرۆك بڵێم کە ئەو هەڵدەستێت بەئامادەکردنی فرقەیەك لەپیاوەکانی هێزە تایبەتەکان و خۆبەخشەکان بۆ ئەوەی هەڵکوتنە سەر شوێنەکەی سەرۆك و دەربازکردنی. کاتێك بەسەرۆکم ڕاگەیاند، دڵخۆش بوو ووتی: بەخوا کوڕەکەم نامەوێت هیچ عێراقێك لەپێناو مندا لەدەست بچێت،

لەگەڵ ئەوەشدا با هێزەکەی ئامادەو ئامادە باش بکات، بەڵام بڕیاری جێبەجێکردن دەمێڵینەوە بۆ ئەو ڕەوشەی کە تێیداین. بەهیوای ئەوەی ئەمریکیەکان بگەڕێنەوە سەر هۆشی خۆیان و تێبگەن کەهێشتا صەدام ژمارە هەرە سەخت و قورسەکەیە لەهاوکێشەکەدا، هەوڵەکانی دابڕینیشم هیچ سوودی نابێت، ئەگەر گەیشتمە ڕەوشێك لەبێ نومێدیی بەرامبەرە هەر چارەسەرێکی تر لەگەڵ ئەمریکیەکاندا، ئەوا ڕەزامەندی دەدەمە ئەو هێزە بۆ ئەوەی هەڵکوتنە سەر زیندانەکە".

ڕۆژێکیان لەپایتەختێتکی عەرەبیدا چاوم کەوت بە کەسێك ناوی (ئەبوعەممار) بوو ئەویش لەسەر پەیوەندیکردن و پێداگرییەکی زۆر، ئەوکاتە یەکێك لە کوڕە مامە دڵسۆزەکانی سەرۆکیشمان لەگەڵدا بوو. ئەبو عەممار ووتی: ئێمە هێزێکین نزیکەی فرقەیەك دەبین لەهەموو ئاست و پلەکانی سوپاو، لیوایەکی هێزی تایبەتیشمان هەیە، ئەویش ئەو هێزەیە کە سەرۆك پێش دەستگیرکردنی دروستی کردبوو، ئەرکێکی بۆ دیاری کردبوو ئەویش هەڵکوتانە سەر زیندانەکەیەتی ئەگەر کەوتە دیلییەوە، سەرەڕای دڵنیابوونی سەرۆك لەوەی ئەگەری دیلکەوتنی زۆر لاوازە، سەرۆك ووشەیەکی نهێنی بۆ دیاریکردووین. منیش داوای ووشە نهێنیەکەم کرد لێی کەلەنێوان ئەو و سەرۆکدا لەسەری ڕێکەوتوون. پاشان ووتی: ئێمە ئامادەین بۆ ئەوەی هەڵبکوتینە سەر شوێنەکەی سەرۆك و دەربێنین بۆ ئەوەی سەرکردایەتی بەرهەڵستیی بکات. ووتیشی: ئێمە زیاتر لە چل شوێنمان بۆ سازکردووە، پرۆسەکەش بەڕێژەی ٩٠٪ سەرکەوتووە بەڵام مەرجێکم هەیە ئەویش ئەوەیە وەڵامەکە بەدەست وخەتی سەرۆك خۆی بێت بۆ ئەوەی ئەگەر هەوڵەکە شکستی هێنا بتوانێت خۆی بپارێزێت یان ئەگەر کەسێك سەر زەنشتیی کرد.

بەسەرۆکم ڕاگەیاند لەبارەی ئەوەی ڕوویدا لەوتوێژ لەگەڵ ووشە نهێنیەکەدا، ووتی : " سوپاس بۆ خوا، من بەجێمهێشتن لیوایەك بوون وا ئێستا بوونەتە فرقەیەکی تەواو، لەوانەیە زیاتریش، ئەوان لەباشترین پیاوە باشە و شەرفەمەندەکانی عێراقن". پاشان ووتی : " پێیان ڕابگەیەنە کە بەشێوەیەکی وورد ئامانجەکە دەستنیشان بکەن، پاشان لێیان بگەڕێ ڕێژەی سەرکەوتن یان شکست دیاری بکەن، پاشان ووردەکاریی ناوچەکانی دوژمنیان پێبدە، هەروەها ئەو چەکانەی کەپێویستە بەکاری بهێنن، هەروەها هێزی

هێرشبەرو پشتیوانیکەر" پاشان داوای لێکردم بەشێوەیەکی تەنهاو بۆ چەندین جار سەردانی گرتوخانەکەی بکەم (کەهەندێك کەس بەئارزووی خۆی ئەمەیان لێکدەدایەوە).

بە کۆمەڵەکەم ڕاگەیاندو شوێنەکەیان پەیگیرکردو چەك و هێزەکانیان گواستەوە بۆ نزیك ئامانجەکەو وتیان: بەسەرۆك بڵێ ئێمە ئامادەین و کاتیش لەبەرژوەندیماندایە.

سەرۆك داوای لێکردم خێزانەکەی لەمە ئاگادار نەکەمەوە، بابەتەکە بەوپەڕی نهێنی بهێڵێتەوە. داوای لێکردم جلی بۆ بێنم بۆ ئەوەی لەکاتی چوونە دەرەوەدا لەبەری بکات (دشداشەیەکی شین و جامانەیەکی سوور و شتی تر). پێشی ووتم کە لەفلانە ڕۆژدا بێمەوە بۆ سەردانی بۆ ئەوەی بڕیاری کۆتایی و کاتی ئەنجامدانی پرۆسەکەم پێبدات.

ڕۆژی هەڤدەی تەمموز ساڵی ٢٠٠٦ چووم بۆ سەردانی، پێی ووتم: ( بەئەبو عەممار بڵێ ) پشت بەخودا ببەستە" ووشەی نهێنیش لەم دێڕە هۆنراوانەدا بوو:

أبا عمار وفعلك فيها عامر
يحكي يه اهلونل والسامر
تذكره الطيور خيث ارعبت
وغزال ترانا إذ فز نافر
تعرف ان الافعال لحمايتها
بعرفها الكريم الله والناظر
فما اخافه هبوات عدونا
ولا فت في عضده متامر
اقدم تفديك نفوس العدا
فلكل توقيت والرب قاهر.

پاشان وتی : " با بێن و هەریەکەیان لەدوایەوە کەسێکی تری جێگرەوەی هەبێت.

پێش دەستپێکردن بەپرۆسەکە بەچەند ڕۆژێك، یەکێك کە لەدەرەوەی عێراق نیشتەجێیە بەتەلەفۆنی سورەیا پەیوەندیی پێوەکردم و وتی: ئەبوعەلا بەسەرۆك بڵێ ئایا پەیامەکە گەیشتووە؟ کاتێك ڕوونمکردەوە، دەرکەوت کە ئەو هیچ پەیوەندییەکی نییە بەو بابەتەوە کە ئێمە بەنیازین جێبەجێی بکەین و هیچ شتێك نازانێت.. بەڵام ئاشکرایە ئەو بەو

کارە مەسەلەکەی ئاڵۆز کرد و پلانەکەی پەك خست بەڵکو هەموو هەوڵەکان بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەکەش، ئیدی ئەگەر مەبەستی بووبێت یان نا.

کاتێك کە رۆیشتم بۆ لای سەرۆک بینیم زۆر ماندوو بوو بەهۆی شەونخونییەوە، نیشانەکانی ماندوویی لەدەموچاویدا دیاربوون. وتی:

" کورەکەم، پێش چوار رۆژ، گوێم لەدەنگی تەقەی دوو کلاشینکۆف بوو، کە زیاتریش لەدەنگی یەك دانە دەچوو. لەدیواری دەرەوەی گرتووخانەکەوە تەقێنرا. خێرا ئەمریکیەکان کەوتنەخۆ و چوون بەدەم تەقەکەوە بینیم ئامێری لەحیمکردن و پارچە ئاسن وکۆمەڵێك قفلیان پێبوو کە پێشتر نەمبینیبوون. ماوەی سێ شەو و رۆژە بەبەردەوامی خەریکی لەحیمکردنی کۆمەڵێك قفلی زۆرن بۆ ئەم چوار دەرگایە، بەهۆی بەهێزیی و ژاوەژاوی زۆری ئەو دەنگە دەنگەوە، یەك کاتژمێر نەخەوتووم، جا نازانم کێ ئەم زەحمەت و نارەحەتیەی بۆ دروستکردووم. بۆیە بە (ئەبو عەمار)و پیاوەکانی بڵێ دابمرکێن و چاوەڕوان بن تا کاروبارەکان ئارام دەبنەوە".

دوای ئەوە، داوای لێکردم بە برادەران بڵێم کە بەباشی خۆیان ئامادەو توندوتۆڵ بکەن، هەروەها پلانی تەواوەتی هەڵکوتانە سەرەکەی پێدام. کاتێکیش داواملێکرد لەگەڵ هێزەکەدا بەشداری بکەم لەهەڵکوتانە سەرەکەدا، ووتی " ئەبو عەلا تۆ هیچ کاتێك کەمتەرخەمیت نەکردووەو تۆم بۆ ئیشوکاری تر پێویستە، دەمەوێت دووربیت لەم بابەتە بۆ ئەوەی شوێنت نەکەون یان دەستگیر بکرێیت".

ئێمە دەمانزانی کە ئەمریکیەکان ئامێری تۆمارکەری دەنگیان لەشوێنێکدا داناوە لەناو مێزە گەورەکەدا، بۆیە دووردەکەوتینەوە لەمێزەکەو لەژێر ئامێری فێنکەرەوەکەدا دەوەستاین و سەرۆك پلەکەیی زیاد دەکرد بۆ ئەوەی بەدەنگێکی بەرز کاربکات و ژاوەژاو بۆ ئەمریکەیکان و ئامێرەکانیان دروست بکات. ئەمەش یەکەمجار نەبوو کە ئەم شێوازەمان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی ئەوان گوێیان لەقەسەکانمان نەبێت.

من دڵنیا بووم لەپرۆسەکە کە بەسەرپەرشتیی و بەشداریی یان ئەو پیاوانەی سەرۆك ئەنجام دەدرێت کەپێشتر زۆربەیان پەراوێزبوون بەهۆی ئەو پەنهانیەی کەپێشتر دەوری سەرۆکی دابوو. هەندێکیان لەدادگادا دەرکەوتن کە بەرگرییان لەسەرۆك دەکرد، هەندێکیشیان ، تەنها سەرۆکیان لەرێگەی کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە بینیی بوو.

هەندێکیشیان لەکەسە نزیکە دڵسۆز شەریفەکانی بوون، هەروەها ئەمانیش لەوانە بوون کەلێیەوە بەدووربون. ئەمانە ئەو پیاوانەن کەبە پاڵنەری پیاوەتی و نیشتمانپەروەریی لەڕەوشە سەختەکان و کاتەکانی تەنگانەدا دەردەکەون.

کردەوەی تەقاندنی کلاشنکۆفەکە لەسەر دیواری گرتووخانەکە، ئەوەی بەدوایدا هات، ئەو هۆیە بوو کەلەو کاتەدا جێبەجێکردنی کارەکەی پەکخست، دواتریش دوایخست، سەرۆك ناچاربوو کاتێکی تر دیاری بکات بکەوێتە پێش دەرکردنی بڕیارەکەی دادگاوە، بۆ ئەوەی دواهەمین .هەل بداتە ئەمریکیەکان بۆ هەر کارێکی دانووستاندن کە لەگەڵ جموجوڵێکی دبلۆماسیدا ڕووبدات، کە منی بۆ ئەو کارە ڕاسپاردبوو، فەرمانەکانیشی بۆ ئەمە دایە سەرکردەی هێزەکە.

بەوپەڕی ڕێکوپێکی و نهێنیەکی ڕەهاوە ئامادەباشی بۆ ئەنجامدانی پرۆسەکە کرا، هیچ کەسێکیش لە پرۆسەی دیاریکردنی ئامانجەکە ئاگادار نەکرایەوە جگە لەسێ کەس نەبێت لە سەرکردەکانی هێزی جێبەجێکارو هەروەها منیش. پاشان چوون بۆ ناوچەی پرۆسەکە، ئەو شوێنانەو شوێنی تری جێگرەوەش ئامادەکرابوون کە پاش ڕزاگرکردنی سەرۆکی بۆ دەبرێت بۆ ئەوەی لەوێ دەستبکات بە سەرکردایەتیکردنی بەرگریی، ئەو وەرەقە بەهێزەی لەدەست ئەمریکیەکاندایە لەدەست بچێت کەوا کاتێك دەستگیریان کرد زۆر یاریان پێوەکردو گەل و بەرهەستکارە ئازاو چاو نەترسەکەیان بێبەشکرد لەو حاڵەتە دەرونیەی کەئەگەر سەرۆك لەنێو ڕیزەکانیاندا بوایە هەستیان پێدەکرد.

سەرۆك فەرمانی دا بە هێزەکە سازبن، تەنها دیاریکردنی کاتەکەو پشت بەستن بەخوا بۆ دەستپێکردن بەپرۆسەکە مابۆوە... فەرماندەی سەرپەرشیتاری بالآی هێزەکە، داوای فەرمانێکی نوسراوی کرد لەگەڵ ووشەی نهێنی لەلایەن سەرۆکەوە، سەرۆکیش بەم چەند دێڕە وەڵامی دایەوە:

أعزنا الرحمن بأحسن هدية — هديته صديقنـــا رحمن
عبد ربه صقر في امتنا — يخزى إذ يقدم الشيطان
في كل ركن تضاء مكارمهم — أكرم بهم مكارمهم الوان
اقدم فديت وعزت أفعالك — العزم عزم والهوان و هوان

پاشان داوای لێکردم مامۆستا عیزەت دوریی لە پرۆسەکە ئاگاداربکەمەوە بۆ ئەوەی پێش جێبەجێکردنی پلانەکە ڕاو سەرنجەکانی خۆی لەو بارەیەوە بخاتەڕوو. ئەو کەسەی کە لەسەرۆکەوە نزیك بوو چوو بۆ بینینی ئەلدوریی، بەڵام بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك گیربوو نەیتوانی بگاتە لای (ئەبو ئەحمەد)، ڕەوشی ئەمنیی زۆر سەخت و دژواربوو.

ڕۆژی ٢٦/اب/٢٠٠٦، لایەنی ئەمریکی پەیوەندیان پێوەکردم (نووسینگەی پەیوەندیی)، داوایان لێکردم سەردانی سەرۆك بکەم و ڕۆژی ٢٨ ئابیان بۆ دیدارەکە دەستنیشان کرد. من هاوڕابووم لەگەڵ سەرۆکدا بۆ ئەم سەردانە ئەویش لەسەر خواستی ئەو چونکە دەبێتە سەردانی یەکلاییکەرەوە بۆ ڕەوشی سەرۆك وەك دیل، سەرۆك پلانی بۆ ئەم سەردانە داڕشتبوو و ئامۆژگاریی کردم یەکێك لەهاوەڵەکان لەگەڵ خۆم بهێنم، بۆ ئەوەی بە بەرپرسیارێتیم لە هەڵکوتانە سەر زیندانەکە تۆمەتبار نەکرێم. وەك هەمیشە، ئەم سەردانانە بەڕەزامەندی هەندێك لایەنی دیاریکراو دەبێت، ئەو لایەنانەش بەتەواوەتی ئاگاداری ئەم سەردانانەن. بەڵام بەهۆی خۆپەرستیی زیاد لەڕادەی هەندێکەوە، ڕێزنەگرتن لەمەسەلەکان وەك ئەوەی کە پێویستە، ئەوا ژاوەژاو خرایە سەر ئەم سەردانە وەك ئەوەی کە ئارەزوویەکی کەسیی منە بۆ ئەو سەردانیکردنە، کاردەکاتە سەر ئەو سەردانەی کە بڕیارە دەستەکە لەڕۆژی ٢٠٠٦/٩/٩دا بیکەن وێڕای ئەوەی لایەنی ئەمریکی جەختی کردەوە کە ئەم سەردانە بەهیچ شێوەیەك کار ناکاتە سەر بەرنامەی سەردانە بڕیارلێدراوەکەی دەستەکە کەلەو بەروارەدا بڕیارە ئەنجامی بدەن.

دوای ئەوە ئەمریکیەکان لێپێچینەوەیەکی توندیان گرتەبەر لەپاسەوانێتیکردنی سەرۆکدا، ئەو هێزەش کەپێشتر پاسەوانی دەکرد گۆڕدرا، بەڵام ئەمجارە بەهێزێك کە سەرۆك بەخراپترین هێز وەسفی دەکرد.. بەمەش ئەو هەلە لەکیس چوو کە دەکرا تێیدا سەرۆك دەربازبکرێت.

ڕۆژی ٢٠٠٦/١١/٥ بڕیاری حوکمی ستەمکارانەی ئەمریکی ئێرانی دەرچوو بە لەسێدارەدانی سەرۆك صەدام حسێن. ڕۆژی ٢٠٠٦/١١/٧ من و هاوەڵەکانم چاومان بەسەرۆك کەوت لە بینای دادگادا، ڕۆژی ١١/٩ بەغدامان بەجێهێشت. لەو دیدارەدا سەرۆك ڕایسپاردم: " مامۆستا خەلیل، بەشێوەیەکی تایبەت ڕاتدەسپێرم کاتێك دەجولێیتەوە، تۆ مافی

ڕەمای هەڵسوکەوتت هەیە بەپێی خەملاندن و بۆچونەکانت بەمەرجێك گەردنی صەدام حسێن نەخەیتە تەرازووی قسەکانت لەگەڵ سەرکردە عەرەبیەکاندا یان کەسانی تردا، تەنها هەڵوێستەکە ڕووندەکەیتەوە ڕوونکردنەوەیەکی گشتیی و هەڵوێستی گەل. بەڵام صەدام حسێن ئەوا خوداو خەڵکە باشەکانی هەیە لەڕۆڵەکانی گەلی عێراق و عەرەبی، هەروەها چاکەخوازەکان لەمرۆڤایەتیدا ئەگەر خودا بڕیاری شتێکی دابێت، ئەوا هیچ گەڕانەوەو پاشگەزبوونەوەیەك نییە لەفەرمانی خوادا. لەوانەیە خوای گەورە هەڵوێستێکی تری بۆمان ویستبێت، سوپاس بۆ خوا، سوپاس بۆ خوا. بەڵام خیزانەکەم، ئەوا دڵنیایان بکەرەوە و پێیان بڵێ " ئەوەی خوا بیەوێت ئەوەم بەسەر دێت". کەواتە لەئەمانەتی خوادا بن، لەئەمانەتی خوا".

دوای چەند ڕۆژێك، نووسراوێکم نارد بۆ نووسینگەی پەیوەندییەکانی لایەنی ئەمریکی بۆ ئەوەی چاوم بەسەرۆك بکەوێت لەگەڵ داوای دابینکردنی ئاسایش بۆم لەفرۆکەخانەی بەغداوە هەتا لای ئەو. بەڵام وەڵامم بۆ هاتەوە کە چاوەڕوان بم. دوای هەفتەیەك، داوایەکی ترم پێشکەشکرد، وتیان کە یاداشتێکی دەستگیرکردنم لەلایەن "حکومەتی عێراقییەوە" بۆ دەرچووە. منیش لەو بارەیەوە نامەیەکم بۆ وەزارەتی ناخۆیی حکومەتی داگیرکەر نووسی، هەروەها بۆ سەرۆکی دادگاش، ئەوان نکوڵیان لەبوونی هەر یاداشتێکی لەو شێوەیە کرد. پاشان جەعفەر ئەلموسەویی، سەرۆکی داواکاری گشتیی ئەم دادگایە ڕایگەیاند هیچ یاداشتێکی دەستگیرکردن لەدژم دەرنەکراوە.

لەوکاتەدا دەرکم بە بوونی شتێك کرد لەدژی سەرۆك بۆ ئەوەی بێبەش بکرێت لە ئەڵقەیەکی گرنگ لە ئەڵقەکانی پەیوەندیکردنی بەجیهانەوە. نامەیەکی دەستنووسم لەگەڵ یەکێك لەپارێزەرەکاندا نارد بۆ سەرۆك، داوای لێکردم پەیوەندی بکەم بەلایەنێکی عەرەبیەوە کە پەیوەندیەکی باشی هەیە لەگەڵ ئەمریکیەکاندا بۆ ئەوەی سەردانەکەم بۆ ئاسان بکرێت. هەوڵمدا لەڕێگەی پۆستی ئەلەکترۆنیەوە پەیوەندی بە باڵیۆزی ئەمریکاوە بکەم لە عەممان، بەڵام بۆم دەرکەوت لەمەسەلەکەدا نهێنی و گۆڵمەزو داو هەیە کە ڕۆژانی ئایندە دەیخەڕوو ئاشکرای دەکەن.

بەهۆی (......) بێبەش کرام لەچاوپێکەوتنی، بەڵام ناچار دەبین لەڕۆژانی ئایندەدا هۆکارەکان و ئەو کەسەشی هۆکاری ئەمە بوو ئاشکرای بکەین.

## پلانی هەڵکوتانە سەر!

سەرۆك پلانی تەواوەتی دارشت بۆ هەڵکوتانەسەر زیندانەکەی لەلایەن پیاوانی بەرەهەڵستکارەوە ئەگەر هاتوو هەموو هەوڵە سیاسیەکان شکستیان خوارد، وە بە دابڕاوی مایەوەو هیچ کەسێك دانوستانی لەگەڵ نەکرد.

پلانەکەش من بەمشێوەیە بوو:

### یەکەم: دوژمن

پێیان ڕابگەیەنە کە هێزی دوژمن کەمترە لەسریەیەك بەشێك لێی دابەش بووە بەسەر چوار قوللەی ئاسنیدا کە دەکرێت بەئاسانی سەرقاڵبکرێت و زیانی پێبگەیەنرێت. بەڵام ئەوەی کە دەمێنێتەوە لەهێزەکە. لەناو خانوویەکی بچووکدایە لە نهۆمی سەرەوەدا ( سەرۆك لەنهۆمی زەمینیەکەدا بەندکرابوو). هەروەها پێیان بڵێ چەکی هێزکەی سەرۆکیان بەندکردووە سووك و مامناوەندە ( جەی جی سی و بی کەی سییە)، هەروەها نارنجۆکی دەستی و دەمانچە". هەروەها سەرۆك پێی ڕاگەیاندم کە هێزەکە ترسنۆکە و تاکەکانی منداڵن و هەرکەسێك دەتوانێت تەنها بەزلەو چنگندان لەگەڵیاندا چەکیان بکات.

### دووەم: هێزی هەڵکوتانەسەر

سێ شۆفلی قورسی قەڵغانپۆشکراو ئامادە دەکەن بەتایبەتی ژووری شۆفێرەکە لەگەڵ بوونی دوو کراوە لەلای ڕاست و چەپی شۆفێرەکەوە بۆ دانانی دوو چەکی بی کەی سی. پاشانیش کێلی شۆفڵەکانیش قەڵغانپۆش دەکەن. یەکێك لە شۆفڵەکان هەڵدەستێت بە دروستکردنی کەلێنێك لە دیوارە سەرەکیەکەدا. پێش ئەم کارەش هێزێك لەهاوەن و موشەکهاوێژو کاتیوشا ناوچەی سەوز بەقورسی بوردومان دەکەن ئەمەش بۆ سەرقاڵکردنی دوژمن، پاشان هێزێکی تر هەڵدەستێت بەبۆمبارانکردنی بارەگای هێزەکانی مارینز لەناو فڕۆکەخانەدا ئەمەش هەروەها بۆ سەرقاڵکردنیان. سریەیەك هەڵدەستێت بە داخستنی دەروازەو هاتنەژوورەوەی ئەو ڕێگایانەی کە دوای ئەوەی سەرۆك ڕزگاردەکرێت پێیاندا تێپەڕ دەبێت. پاشان سریەیەکی پشتیوانی تەواوەتی دەجوڵێت بۆ ئەوەی بەرهەڵستی

فرۆکەکان بکات کە جۆرە چەکی دژە فرۆکەیان پێدەبێت وەک (ستریلا و ئارپی جی سێڤن و بی کەی سی). پاشان دانانی لیوای پاراستن لەسەر ئەو ڕێگەیەی کە لەبەغداوە دەچێت بۆ سەلاحەدین، لیوایەکی تریش لەسەر ئەو ڕێگایەی لەبەغداوە دەچێت بۆ ئەنبار. دوای ئەمە سریەك هەڵدەستێت بە هەڵکوتانە سەر بارەگاکە ئەمەش دوای بڕینی دیواری شوێنەکەو ئاگربارانکردنی بە چەکی ئارپی جی و بی کەی سی، هەموو کەسێکی ئەم سریەیەش بەدیلێکی ئامادەباشی هەیە کە شوێنەکەی بگرێتەوە، شۆفلێکی تریش هەڵدەستێت بە ڕاکێشانی دەرگاکان و لەبێخڵەکێشانیان چونکە قوفڵەکانیان بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت بشکێنرێن یان بتەقێنرێنەوە". لەو ڕۆژەدا سەرۆك بەخۆی و هەموو ئەو جلوبەرگانەیەوە کە بۆی هێنراون سازو ئامادە دەبێت.

سەرۆك ئەوەشی وت: " دەبێت ئۆتۆمبیلی گشتی و تایبەتی ئامادە بێت، کە دەکرێت بەین بەین بگۆڕدرێن. دوای دەرهێنانی ئامانجەکە، هێزێك هەڵدەستێت بە بوردومانێکی چڕی شوێنی گرتوخانەکە بەچەکی هاوەن و کاتیوشا، هەروەك چۆن هێزێکی تری گەورە هێرش دەکاتە سەر سەربازگەی کرۆبەر بۆ ڕزگارکردنی هاوەڵەکانمان لەئەندامانی سەرکردایەتی و وەزیرەکان و هەموو دیلەکانی تر". پاشان سەرۆك دەڕوات بۆ ئەنبار، دوای ئەوەش پلانێکی خێرا دادەنێت بۆ یەکخستنی هێزە بەرگریکارەکان و هێرشکردنە سەر بەغداد و پاشانیش هەموو هێزەکانی بەرهەڵستیی کە لەپارێزگاکاندا هەن هێرش دەکەنە سەر دوژمن.

# بەشی بیست و یەك

## هەوڵەکانی ڕفاندنی سەرۆك

سوێند بەخوا لەم شوێنە ناچمە دەرەوە
تەنها وەك سەرۆکێك نەبێت کە گەل هەڵیبژاردووم
یان وەك شەهیدێك بۆ ناو گۆڕەکەم

(صەدام حسێن لەناو زیندان)

پۆل بریمەری، حاکمی ئەمریکیی لەعێراق، داوای لەو ئەنجومەنی حوکمە کرد کە سەر بە ئەو بوون، ئیمزا لەسەر مەرج و داواکارییەکانی بکەن، هەندێکیان دوو دڵیان نواند، ئەویش هەڕەشەی لێکردن و وتی پێیان: ئەگەر ئیمزای نەکەن، ئەوا صەدام لێرەیەو نزیکەو دەیهێنینەوە. ئیدی هەموو ئەندامەکان ئیمزایان کرد. دوای ئەوە هەواڵ و ووتارو لێدوان و راپۆرت زۆربوون، کە باسیان لەوە دەکرد عێراق هیچ جۆرە چەکێکی کۆکوژی تێدا نییە، هیچ پەیوەندییەك بوونی نییە لەنێوان عێراق و رێکخراوی ئەلقاعیدەدا، عێراقیش بەهەبوونی صەدام حسێن، باشترە لەوەی کەئێستا ڕوودەدات لەعێراقدا، ڕەنگە ئەمریکاش جارێکی تر پەنای بۆ بەرێت ئەمەیش لەسەر ئامۆژگاریی سیاسەتمەدارەکانی و ئەوانەی کە میانڕەون لەجیهاندا، هەروەها لەسەر ئەو داخوازییانەی کەلەناو عێراقەوە دەکرێن بۆ ئەم مەبەستە، لەو کاتەدا نارەزاییەکان لەدژی ئەم لێدوانانە دەستیان پێکرد. ئێرانیش یەکەم وڵاتێك بوو کە نارەزایی دەببڕێت، دوای ئەو موقتەدا سەدر، پاشان سەرکردەکانی پارتە کوردییەکان و کەسانی تریش. هەروەها گومانەکان دەربارەی جدییەتی دادگایی و دادگا سەری هەڵدا، هەروەها ئەوەی کەبەپێی ئیرادەی ئەمریکی ڕاڤەی بۆ دەکرا بەلەسێدارە نەدانی سەرۆك صەدام حسێن، پاشانیش ئەگەری گێڕانەوەی بۆ حوکم بەپێی کۆمەڵێك مەرج و ڕێکەوتننامە، یان ئەوەی کە دەکەوێتەوە لەسکاڵاو نارەزایی ترسناك ئەگەر لەسێدارە بدرێت، لەناوەوەو دەرەوەی عێراقدا، کەواتە هەمووان لەپەرچەکردارەکانی لەسێدارەدانی صەدام حسێن دەترسان لەناویشیاندا ئەمریکیەکان خۆیان.

لەبەرامبەر ئەمەدا، دەزگاو پارتەکان کەلەسەر پشتی تانکە ئەمریکیەکاندا هاتبوون، هەستان بەڕاوێژکردن لەگەڵ ئەو لایەنانەدا کە لەدەرەوەدا هاوپەیمانیان بوون، بەتایبەتی لەئێران و ئیسرائیل، چەندین تێڕوانین و پلان دانرا بۆ لەناوبردنی صەدام حسێن یان بێدەنگکردنی، پشت نەبەستن بە ئەو دەرئەنجامانەی کە لەدادگاو دادگاییەکە دەکەوێتەوە، یان سەپاندنی مەرجەکانیان لەسەری کاتێك کە لەڕەوشێکدا دەبێت، بەپێی تێڕاوانی ئەوان، کە ئاسانە بەو مەرجانە ڕازی بێت و قەبوڵیان بکات، بەبێ ئەوەی بەباشی کەسایەتی سەرۆك و ڕەقیی و پتەوی ئەو بناسن ، کە هیچ سازشێك قەبوڵ ناکات.

## هەوڵی پاکتاوکردنی سەرۆک یان لەناوبردنی

لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٦دا ، لایەنێکی دیاریکراو، کە بە باشی ئامادەگیی لەدیمەنی سیاسیی عێراقی داگیرکراودا هەبوو، ڕادەی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئێران و ئیسرائیلدا دەزانین، ئەویش لەڕێگەی نوێنەرایەتی کەسایەتیەکەوە کە سەرۆکی یەکێك لەحزبە فەرمانڕەواکانە لەعێراقدا، ئەم لایەنە هەستا بە هاندانی کەسێك بۆ ئەوەی هەستێت بە پەیوەندیکردن بە پارێزەر مامۆستا زیاد ئەلخصاونە، کەئەمەی خوارەوەی وەك پێشنیازێك بۆ خستبووە ڕوو:

ئەم لایەنە بەڵێن دەدات کە بەشێوەیەك لەشێوەکان سەرۆك صەدام حسێن لەزیندان بهێنێتە دەرەوە، بیداتە دەستی ئێمە یان هەرکەسێك کە هەڵیدەبژێرێت کە ئەو پێی دەووت (هەر سەرۆکێك)، یان دەست خێزانەکەی، لەهەر شوێنێکدا بەبێ هیچ بەرامبەرێك. بۆ هەمان ئەم مەبەستەش ئەم لایەنە پێی باشە پەیوەندی بە پارێزەر خەلیل دلێمیەوە بکات.

مامۆستا زیاد ئەلخەصاونە پەیوەندیی پێوەکردم، داوای لێکردم بچم بۆ نووسینگەکەی کە ئەوکات نووسینگەی هەرکەسێك بوو کەخۆیبەخشیایە بۆ ئەوەی بەرگریی لەسەرۆك صەدام حسێن بکات، هەتا ئێستاش مەکتەبەکە هەر لەسەر ڕەوت و ئاراستەیەتی. چووم بۆ لای، مەسەلەکەی پێڕاگەیاندم، داوام لێکرد مەسەلەکە بەنهێنی بهێڵێتەوە تا لێکۆڵینەوە لەبابەتەکەدا دەکرێت، یان بخرێتە بەردەست سەرۆك و ئەوانەی کە مەسەلەکەیان بەلاوە گرنگ و جێی بایەخە، پاشان داوام لێکرد، کە ژمارەی تەلەفۆنەکەم بدات بەو لایەنەی کەپەیوەندیان بەوەوە کردووە بۆ ئەوەی خۆم بەڕاستەوخۆ قسەیان لەگەڵدا بکەم.

دوای دوو ڕۆژ، ئەو کەسە پەیوەندیکرد، ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە پێشتر بە مامۆستا ئەلخەصاونەیان ڕاگەیاندبوو، ووتی: مامۆستا خەلیل ئەوەی لەسەر تۆیە کە ڕازی بیت، ئیدی دوای ئەوە ئێمە سەرۆکت تەسلیم دەکەین لەهەر شوێنێکدا بتەوێت لەناوخۆی عێراقدا بێت یان لەدەرەوەدا، تۆ و هەرکەسێك کە متمانەی پێدەکەیت و تۆ ڕایدەسپێریت دەتوانن بێن و ئەمانەتەکە (سەرۆك) لەدەستمان وەربگرن، کەئەو ئێستا لەتەندروستییەکەی زۆر باشدایە، دەتوانین لەهەر شوێنێکدا بتەوێت بۆتی بپارێزین، ئەگەر تێچوونی گواستنەوەو مانەوەشی نەبێت، ئەوا هەموو ئاسانکارییەکت بۆ فەراهەم دەکەین بۆ تۆ یان بۆ هەرکەسێك

کە تۆ دایدەنێیت. بۆ زیاتر دروستبوونی متمانەش، ئەوا ئێمە کەسێکی گرنگ دەکەینە بارمتە لاتان هەتا سەرۆک دەگات، دوای چەند ڕۆژێك ئێوە بارمتەکە ئازاد دەکەن.

پرسیاری زۆرم لێکرد، بۆ یەکەمجار هەستمکرد کە شێتە، یان خەون دەبینێت. پرسیارم لێکرد: چۆن دەتوانن ئەم پرۆسە ترسناکە ئەنجام بدەن، ئایا ئەمریکیەکان لەگەڵتاندان، ئایا ئێرانتان لەپشتە، ئایا ئیسرائیل و موسادتان لەگەڵە، ئایا...ئایا..

وتی: تۆ ئەوەندت لەسەرە کە ڕازی بیت و ئیدی پرسیار لەبارەی هیچ ووردەکارییەکەوە مەکە. تەنها پلان بۆ وەرگرتنی سەرۆك دارێژە بەمەرجێك دوای ئەوەی ئازادکرا هیچ لێدوانێك نەدات، ئیدی نەیەتەوە ناو عێراق، لەهەر دەوڵەتێك کەبیەوێت بژی. وە ئێمە گرەنتی ئەوەی بۆ دەکەین کە لەهیچ کەس و لایەنێکەوەو لەناویشیاندا ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا، یان عێراق و هیچ لایەنێکی ترەوە دوای نەکەون و بەشوێنیدا نەگەڕێن، هەروەها گرەنتی ئەوەی بۆ دەکەین بەسەلامەتی بگاتە لای خێزانەکەی، تەنها ئەوەتان لەسەرە لێمانی وەربگرن. ئەگەر پارەشتان وویست، ئەوا پێتان دەدەین، ڕەوشی دارایی و ڕەوشی خێزانەکەیی بۆ دابین دەکەین، وە تۆش لەگەڵیاندا دەبیت.

دوای بگرەو بەردەو قسەکردنێکی زۆر، پێموت: با ئەم بابەتە بخەمە بەردەستی ئەوانەی کە بابەتەکە جێی بایەخیانە و پەیوەندیی پێیانەوە هەیە، یەکەمجاریش سەرۆك خۆی.

من لەڕووی بنەماوە، خۆپارێزی دەکەم لەبەرامبەر داوایەکی وادا، نازانم چی لەپشتیەوەیە لە گزڵمەزو پلانگێڕیی. ئەم مەسەلەیەم لای کەسانێك خستەڕوو کە کوێبەرین، ئایا ئەو پیاوێکی ئاساییە تا بیشارینەوە، پاشان ئەگەر ئەوانە بەجدی کاردەکەن، ئەوا مەبەستیانە صەدام لەسەر شانۆی سیاسی دوربخەنەوە، چونکە بەهێزترین رکابەری ئەوانە، یان لەوانەیە بیانەوێت لەم ڕێگەیەوە لەناوی بەرن. پاشان وتیان: ئێمە ڕازی نابین و بەرپرسیارێتی لەمشێوەیە لەئەستۆناگرین.

پەیوەندیم کرد بە نووسینگەی پەیوەندیی ئەمریکیەوە (ئەو لایەنەی کەبەرپرسیارە لە پاراستنمان و گەیاندنمان بۆ دادگا) بۆ دیاریکردنی کاتێك تا لەنزیکترین کاتدا سەردانی سەرۆك بکەین. کاتێك کەچاوم بەسەرۆك کەوت، بەو شێوەیەی کە پێشتر باسمکرد تا تۆمارەکە ئەلەکترۆنیەکە نەتوانێت دەنگەکەمان تۆمار بکات، مەسەلەکەم لەسەرۆك گەیاند. ئەویش ئەو ڕێگەیە کە سەرۆك بەکاری دەهێنێت کاتێك دەیەوێت لەگفتوگۆ تایبەتیەکاندا

قسەم لەگەڵ بکات (شێوازی نزیك بوونەوە لە فێنکەرەوەکە و زیادکردنی خێراییەکەی بۆ ئەوی دەنگەکەی زیاد بکات و ژاوەژاو دروست بکات بۆ تۆمارکەرەکە).

وێنەکەم بەشێوەیەکی تەواوەتی بۆ سەرۆك روونکردەوە، هەروەها ئەگەرەکان، پاشان نیاز خراپیش. بابەتەکە ئاڵۆزە. ووتی: ڕات چۆنە. باسم لەهەڵوێستی خۆپارێزانەم کرد دەربارەی ئەم بابەتە. پێشمڕاگەیاند کە من لەڕووی ئەمانەتگەیاندنەوە ئەمەی پێ دەڵێم چونکە بەڵێنم پێدابوو کە هیچ شتێکی لێ نەشارمەوە کە پەیوەندی بە ژیانیەوە هەبێت.

پێی ووتم کە ئەویش هەمان ڕای هەیە، بۆچوونی من و بۆچوونی ئەوانەش کە ڕاوێژم پێکردبوون ڕاست و دروستە. پاشان بەردەوام بوو ووتی: (( ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بەژیانی صەدام حسێن و گەردنی ئەوەوە هەیە، ئەوا من چەند ساڵێکە ژیانم وازلێهێناوە، لەپێناو پاراستنی ژیانمدا سازش لەسەر عێراق و ڕزگارکردنی ناکەم. هەربۆیە، ئەوا من بەشێوەیەکی تەواوەتی ئەم داوایە ڕەتدەکەمەوە، پێیان بڵێ: لەبەردەم صەدام حسێندا دوو هەڵبژاردن هەیە، یان ڕزگارکردنی عێراق و گەڕانەوە بۆ گەلە کە هەڵیبژاردووم، یان شەهیدبوونێك کە وڵاتەکەم و هەموو چاکەوویستان لە نەتەوەی عەرەبی و گەلی عێراق و چاکەویستان لەمرۆڤایەتی پێی گەورەو شۆکمەندبوون".

ئەمە ئەوە بوو کە دوژمنانی عێراق پلانیان بۆ دادەڕشت. بەهۆی ئەوەی سەرۆکیش ژمارەیەکی قورس بوو لەهاوکێشەکەدا، کەناکرێت تێبپەڕێنرێت یان فەرامۆش بکرێت، بۆیە لەمانەوەی دەترسان، لەهەمانکاتیشدا لەو دەرئەنجامانەش دەترسان کەبە لەسێدارەدانی سەرهەڵدەدەن و دەکەونەوە لێی. ئەمەش ئاماژە بە قوڵیی هاتنەناو و ڕۆچوونی هەواڵگریی ئێران و ئیسرائیلی دەکات لەعێراقدا. کێ دەوێرێت صەدام حسێن لەدیلی دەربهێنێت و بیبات بۆ دەرەوەی عێراق جگە لەموسادو هاوپەیمانێتیە ناسراوەکانی لەعێراقدا، هەواڵگری ئێرانی و گروپە هەژمونکەرەکانی لەناو حکومەتی داگیرکەردا نەبێت. دەیانویست بەم ڕێگەیە دەمی سەرۆك دابخەن، بەلاوازی دەربیبکەن، پاشان دوایی هەستن بەپاکتاوکردنی و بەوەش وێنەکەی و مێژووەکەی بشێوێنن.

هەروەها ئەو چیرۆکەی تریشم بەیاد دێت کەسەرۆك بۆی گێڕامەوە. لەو ڕۆژەدا کە چووم بۆ دیداری سەرۆك پێش کاتی دانیشتنی یەکەمی دادگاییەکەی لە ٢٠٠٥/١٠/١٩، بەتەواویش لەڕۆژی پێشووتردا، شەو سەرۆك گەیشتە بینای دادگایی (بینای سەرکردایەتی نەتەوەیی)، ئەمەش ئەو شوێنە بوو کە تەرخان کرابوو بۆ شانۆگەریی دادگاییەکە.

فەرمانیان بە پاسەوان و ئێشگرانی زیندانەکە کردبوو ئەگەر سەرۆك صەدام لێی پرسین لەبارەی شوێن و ناوی بیناکەوە، پێویستە لەسەریان پێی بڵێن کە بینای پیشەسازی سەربازییە. هەر بەو شێوەیەش بوو سەرۆك لێی پرسی بوون لەبارەی شوێنەکەوە ئەوانیش ئەوەیان وەڵام دابووەوە کە فەرمانیان پێکرابوو. کاتێك سەرۆك صەدام حسێن لەدانیشتنی یەکەمدا لە هۆڵی دادگاییەکەدا وەستابوو، بەدادوەری وت. ئەمە بینای پیشەسازیی سەربازییە. ئەو دەیویست پەیامێك بنێرێت بۆ سەرکردەی بەرهەڵستیی بۆ ئەوەی شوێنەکە بوردومان بکرێت و خۆی و ئەوەی کە لەناویدا لەناوببرێت و خاپور بکرێت. پاشان دادگاییەکە دواخراو لە کرۆبەر چاوم پێکەوت، ئەوەی بۆ گێرامەوە، پێمراگەیاند کە ئەوە بینای پیشەسازیی سەربازیی نیە بەڵکو بینای سەرکردایەتی نەتەوەییە چونکە ئێمە وەك پارێزەرەکان پێش دەستپێکردنی دادگاییەکە شوێنەکەمان نەدەزانی، هەر لەبەر هەمان مەبەست و مەبەستی تریش لێیان شاردبووینەوە، وەك ئەوەی کە پاڵ بە بەرهەڵستیی و خۆبەختەکانەوە بنێت هەڵکوتنە سەر شوێنەکە. ئەگەر هەر هەڵکوتانە سەرێکیش بۆ سەر بینای دادگاییەکە ڕوویدات، ئەوا کوشتارەگەیەك ڕوویدەدا کە هیچ کەسێك دەربازی نەدەبوو ئەویش بەهۆی گرتنەبەری ڕێوشوێنی توندو حساب بۆکردنی بۆ هەر ئەگەرێکی لەمشێوەیە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە. لایەنی ئەمریکی ئەوەیان لەبیرچوو بوو کە سەرکردەکانی بەرهەڵستیی لەژیانی سەرۆك و سەلامەتی ئەو نەترسانایە، ئەوا هەر لەڕۆژی دواتری یەکەم چاوپێکەوتنی من لەگەڵیدا لەساڵی ٢٠٠٤دا هەڵیاندەکوتایە سەر گرتووخانەکەی، بەڵام ئامادەیی و ڕۆحی پێشڕەوی و قوربانیدان لای پیاوانی بەرهەڵستیی هەمیشە سازو لەسەرپێ بوو، چونکە بەرهەڵستیی و عێراقیەکان دڵنیابوون لەوەی کە ئەمریکا بە دیلکردنی سەرۆك و بەردەوامبوون لەگرتنی تەحەدایەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ عێراقیەکان و عەرەب و موسڵمانان. بەڵام گرفتی سەلامەتی سەرۆك ڕێگربوو لەمەدا. کاتێکیش سەرۆك دواتر لەدانیشتنی دادگادا شوێنی دادگاییەکەی ئاشکرا کرد، پەخشی بەڕێوەچوونی دادگاییەکە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە پچڕا. لەبەر ئەم هۆیەش، ئەمریکیەکان هەستان بە گواستنەوەی ڕووداوەکانی شانۆگەرییەکە ئەویش دوای بیست خولەك و دوای دانانی فلتەری تۆمارکردن.

ئەمریکیەکان بایەخیان بەسەلامەتی سەرۆك و شاردنەوەی شوێنەکەی دەدا، ئەو بەشێوەیەکی تەواو نهێنی دەگوێزرایەوە کاتێك کە دەچووین بۆ بینینی، یان کاتێك دەگوێزرایەوە بۆ دادگا. شێوازەکانی گواستنەوەشی جۆربەجۆربوون هەندێکجار بە

ڕێپێوشێنێك کە ئاماژەی خاچی سوری لەسەربوو، یان لەنێوان پاسەوانەکان و فرۆکەکانی بلاك هۆکدا. ئێران سوور بوو لەسەر ئەوەی بگاتە سەرۆك بەتایبەتی میلیشیاکانی سەر بە ئەو (بەدرو سەدر). دەزگا هەواڵگرییەکانیشی توانیبوویان چەند وەرگێڕێکی مەشقدیدە بخەنە ناو سوپای ئەمریکیەوە، بە سود وەرگرتن لەو قەڵەمرەویەی کەهەیبوو لەعێراق لەلایەك، گەمژەیی ئەمریکاش لەلایەکی ترەوە، هەتا توانی لەڕێگەی ئەو وەرگێڕانەوە بەجۆرێك لەجۆرەکان لە سەرۆك نزیك ببێتەوە. ڕۆژێکیان ئەوەی ڕاگەیاند کە نزیکە لەصەدامەوە، لەهەر ساتێکدا بیەوێت فەرمان دەکات فیشەکێك بنێن بەسەریەوە. منیش هەمیشە لایەنی ئەمریکیم لەوە ئاگادار دەکردەوە. پاشان ئەو مەترسییە ڕەویەوە کاتێك کەوا تێبینیم کرد زۆربەی وەرگێڕەکان کە نزیکبوون لەسەرۆکەوە یان مەسیحیی بوون یا عەرەب بوون و لەگەڵ سوپای ئەمریکیدا هاتبوون.

پلانی ئێران و میلیشیاکانی، ئەوە بوو کە ئەگەر بتوانرێت شوێنی بەندکردنی سەرۆك دەستنیشان بکرێت، ئەوا ئیتلاعات (هەواڵگریی ئێرانیی) و دەستەبژێرێکی هەڵبژێردراو لەمیلیشیاکان هەڵدەستن بە بوردومانکردنی گرتووخانەکە بە قازیفەو موشەکی تایبەتی و پێشکەوتووی ئێرانییو وێرانکردن و لەناوبردنی ئەوەی لەناویدایە. هەروەها پلانێکی تری تۆکمەش کە تارادەیەك سەری گرت، ئەویش ئەوەیە " ئەگەر توانرا بەفێڵ تەوقە ئەمریکیەکە بشکێنرێت و توانرا بگەنە سەرۆك، ئەو کەسەی کە بەم ئەرکە هەڵدەستێت بە سەرقاڵکردن و خافڵگیرکردنی سەربازە ئەمریکیەکە و بردنی چەکەکەی و تەقەکردن لەسەری سەرۆك و پاشانیش کوشتنی خۆی. بەڵام لەداداگادا، ئەوا هەمان پلانی بۆ دارێژرابوو. دوای کوشتنی سەرۆك، هاوەڵەکانی سەربازەکە خۆی سەربازەکە دەکوژنەوە ئەویش بۆ سڕینەوەی شوێنپێ و سەرەداوی تاوانەکە. بەڵام وریایی ئەمریکیەکان نەیهێشت ئەوە سەربگرێت، ئەویش دوای ئەوەی بۆ چەند جارێك ئاگادارمان کردنەوە ئیدی لەڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بێت، یان لەڕێگەی چاوپێکەوتنەکانمانەوە بێت لەگەڵیاندا لەکاتی سەردانماندا بۆ لای سەرۆك یان لەماوەی دادگاییە شانۆگەرییەکەدا.

### پێشنیاری ئەفیکردن و دروخستنەوەی سەرۆك

دوای ئەو کۆنگرەیەی لوتکەی عەرەبی لەشەرمەم شێخ لەکۆتاییەکانی شوبات/فێبرایەر ۲۰۰۳دا کەپێشتر ئاماژەی پێکرا، هەروەها ئەو دەستپێشخەرییانەی کە خرانە بەردەم

سەرۆك بۆ ئەوەی واز لەدەسەڵات بێنێت و دورخستنەوە قەبوڵ بکات، سەرۆك هەمیشە ڕەتیدەکردەوەو دەیووت: لەعێراقدا ژیاوم و لە عێراقیشدا دەمرم.

ساڵی ٢٠٠٥، هەوڵەکان سەبارەت بەپێشنیارکردن بۆ سەرۆك تا لەدەسەڵات دوربکەوێتەوە چەند جارێك دووبارە بوونەوە، یەکێکیان وڵاتی (...) خۆم بەچاوی خۆم کۆشکەکەم بینی. کە بەتایبەتی ئامادەکرابوو بۆ پێشوازیکردن لەسەرۆك صەدام حسێن. بەڵام پێیان ڕاگەیاندم کە ئەم کۆشکە دوایین کۆشك نییە بۆ سەرۆك، بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانەکەیدا بژی، سەرەڕای پارەو پولێکی زۆر کە خۆی برەکەی دیاری بکات. لەڕێگەی هەندێك ووردەکاریی ترەوە کە نامەوێت باسی بکەم بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەخەمە تەنگییەوە توانیم لەمەبەستەکە تێبگەم. بەڵام سەرۆك، بەشێوەیەکی براوەویەلاکییکەرەوە ڕەتیکردەوە، زیاد لەچەند جارێکیش ئەو دەستەواژەیەی دووبارە دەکردەوە: " سوێند بێت بەخوا لەم شوێنە نایەمە دەرەوە تەنها وەك سەرۆکێك نەبێت کە گەل هەڵیبژاردووم یان وەك شەهیدێك بۆ ناو گۆڕەکەم".

لەیەکێك لەدیدارە تایبەتیەکانمدا لەگەڵ سەرۆك، جارێکی تر لێمپرسی ئایا لەلایەن ئەمریکیەکانەوە یان هەر لایەنێکی ترەوە دانوستاندنی لەگەڵ کراوە. ئەویش بەنەخێر وەڵامی دایەوە تەنها داوای یەکێك لەژەنراڵە ئەمریکیەکان نەبێت ئەویش دوای دە ڕۆژ لەدەستگیرکردنی. ئەویش داوایەکی دیاریکراو بوو نەك دانوستان. ئەم پرسیارەشم لەسەرۆك دوای کۆمەڵێك لە قسەو باسی ناو ڕۆژنامەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن دێت کە ئامانجەکەی زانراو و ڕوونە کە ئەویش ورووژاندن و قازانجە، یان شێواندنی ژیاننامەی ئەم پیاوە مەزنەو کاروانی ٣٥ ساڵ لە خەبات و بوونیادنانە. هەروەها ئەم پرسیارە دوای قسەی یەکێك لە ئەفسەرەکانی سوپای ئەمریکی دێت، ئەویش ئەو پاسەوانە تایبەتە بوو کە سەرپەرشتیی دەستگیرکردنی سەرۆکی دەکرد، ئەو ئەفسەرە ڕازی نەبوو لەوەی کە لەزنجیرەکانی لێکۆڵینەوەدا ڕوویدەدا، پێش ئەوەی دادگاییەکەش دەست پێبکات لێی پرسیم: ئایا سەیری کاغەزەکانی داواکەت کردوە، ئایا لەگەڵ موەکیلەکەتدا مشتومڕت کردووە...هتد لە پرسیارە یاساییەکان، دیاربوو تورە بوو لەوەی کە ڕوویدەداو بەناو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، ئەو ژوورەی کە منی لێ بووم بۆ ئەوەی چاوم بەسەرۆك صەدام حسێن بکەوێت. پاشان زۆری نەبرد ووتی: پێموانییە ئەم ڕێگەیە خۆت و موەکیلەکەت بگەنێتە ئامانجەکەتان، بەڵکو ڕێگەی دبلۆماسی ڕێگە دروستەکەیە. پێمووت من پارێزەرم..

ئەم قسەیەم گواستەوە بۆ سەرۆك، ئەویش ووتی: (( لەدەرگایان نەداوم بۆ دانوستان و ناشکرێت من لەدەرگایان بدەم، چونکە ئەوە بەلاوازیی لەسەرمان حساب دەکرێت".

من بۆ خۆم هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکانم لەمە ئاگادارکردەوە، چونکە دەمزانی، هەر لەیەکەم ڕۆژی کارە مەترسیدارەکەمەوە، کە ئەمە ڕێگەی ڕزگاربوون نییە، چونکە ئەمریکییەکان لەزمانی یاسا تێناگەن. قەناعەتی تەواوەتیشم هەبوو کە ڕێگەی سیاسی سەلامەتترە بۆ نەجاتدان و ڕزگارکردنی سەرۆك و لەوێشەوە ڕزگارکردنی عێراق لەم مەینەتییە.

## یاریی ڕاوکردن

ئەمریکیەکان هیواخوازبوون لەبەرامبەر ئازادکردنی سەرۆك صەدام حسێندا بەرهەڵستیی عێراقیی ڕابگرن، بەدڵنیایشەوە نەفیکردن و دورخستنەوەی بۆ دەرەوەی عێراق. لەبیرمدێت لەیەکێك لەڕۆژەکاندا، کە لەچارەکی کۆتایی ساڵی ٢٠٠٥دا بوو، بێ نیاریکردنی بەروارەکە! لەچوارچێوەی ڕاوێژکردنەکاندا لەسەردانی یەکێك لەولاتە عەرەبییەکان دەگەڕامەوە. کاتێك گەیشتمە یەکێك لە میوانخانەکان لەپایتەختێکی عەرەبی، کەسێکی ئەمریکی پەیوەندی کرد پێمەوە، داوای لێکردم کە چاومان بەیەك بکەوێت، داوای لێبوردنم کرد کەبەهۆی گەشتەوە ماندو شەکەتم، دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ عێراق بۆ بینینی کەسوکارەکەم، وە من دوای ئەوەی گەڕامەوە دەتوانێت لە عێراق چاوی پێیمبکەوێت. بەلام پیاوەکە پێداگریی کردو وتی مەسەلەکە زۆر گرنگە. ئیدی لەکاتژمێر دوانزەی شەودا چاوم پێیکەوت. پێموابوو، هەیشە لەگەڵمدا هاوڕابێت، کە ئەم پیاوە یەکێکە لە پیاوەکانی هەواڵگریی ئەمریکیی، چونکە مەعقول نییە ئەمریکاو دەزگا هەواڵگرییەکانی لێگەڕێن دەستەی بەرگریی چۆنیان بوێت وابکەن بەبێ هیچ ئامرازێك یان چاودێرو تێبینیارێك.

پێی ووتم: بەڕێز خەلیل، من دەزانم کە تۆ چەند بایەخ بە مەسەلەی صەدام دەدەیت، هەروەها دەزانم کە تۆ لەژیانتدا چاوت بەصەدام نەکەوتووە تەنها لەناو زینداندا نەبێت، هیچ ڕۆژێکیش تۆ نزیك نەبوویت لەدەسەلاتەوە و..و..هتد، بەلام دەمەوێت دوو پرسیارت لێبکەم، دەمەوێت دوای وەڵامدانەوەیان ئەوەی کەدەتەوێت و لەپێناویدا تێدەکۆشیت (ڕزگارکردنی صەدام) بۆت بەدیبهێنم، بەلام یەکەمجار دەمەوێت لێت بپرسم بۆچی تۆ ژیانی خۆت و خێزانەکەت دەخەیتە مەترسیەوە؟

پێمووت: دوژمنکاریی ئەمریکا مەسەلەیەکە ناکرێت لێی خۆش بین، من وەك عێراقیەك ئەو شێوازەم بینیوە کە ئەمریکا هەولیدا پێی ئیستیفزازمان بکات ئەویش بە دەستگیرکردنی سەرۆکەکەمان و نیشاندانی وێنەکەی لەسەر شاشەکانی تەلەفزیۆن بەشێوازێك کە وویستان تێیدا رۆحی عێراقییەکان و عەرەب بکوژن، سەرەڕای ئەوەش ئێوە بوون ولاتەکەمتان وێرانکردو، سەرکردایەتی شەرعیی عێراقتان خستە زیندانەکانەوە. پاشان صەدام حسێن پیاوێکە تەمەنی لەحەفتا سالٌ نزیك بۆتەوە، ئەخلاق و دادپەروەرانە نییە ئەوەی بەسەربێت کەبەهۆی ئێوەوە بەسەری هات.

ووتی: ئەی چی ئەگەر کودەتایەك لەلایەن گەل و هێزە چەکدارەکانەوە روویبدایە، ئەوکات هەلوێستت چۆن دەبوو؟

وتم: هەلوێستم لەگەلٌ ئەوەدا دەبێت کە گەل دەیەوێت، بەدلنیایشەوە، تۆ دەزانیت کە سەرۆك صەدام حسێن دووجار بۆ سەرۆکایەتی هەلبژێردراوەتەوە، هەموو جیهانیش دەرئەنجامی هەلبژاردنەکەی بینیوە، هیچ کەس و لایەنێکیش تانەی لێنەداوە، بۆیە شەرعیەتی دەستووریی و یاساییان بەدەست هێناوە. ئەمەش بریتیە لەئیرادەی گەل. فەرموو پرسیارەکانت بکە.

ووتی: صەدام حسێن متمانەی پێت هەیەو ڕێزت لێدەگرێت، دەزانین تۆ دەتوانیت کاری تێبکەیت، ئایا دەتوانیت ڕازی بکەیت تا لەیەکێك لە دانیشتنەکانی دادگادا بانگەوازێك ئاراستەی بەرهەلستیی بکات بۆ ئەوەی واز لەکردەوەکانیان لەدژی ئەمریکیەکان بێنن؟

بەدلنیاییەوە ڕەتمکردەوە، وتم: ئەوە من نیم کە داوای ئەوەی لێبکەم.

پاشان پرسیاری لێکردمەوە: ئایا صەدامە کە سەرکردایەتی بەهەلستیی دەکات، ئایا ڕێژەی ئەو پیاوانە چەندە کە ئەم سەرکردایەتیان دەکات؟

وتم: سەرۆك صەدام حسێن پلانی بۆ بەرهەلستیی داناوە، سەرکردایەتی زیاتر لە ٨٥٪ی کردەوەکانی بەرهەلستیی دەکات ئەگەر نەلێین زیاتریش. پاشان هیوادارم بزانیت کە خەلیل دلیمیی پارێزەرە نەك سیاسی. پاش ئەوە بڕیارمدا کە ئاراستەکەم بگۆڕم و بڕۆم بۆ سوریا لەبری گەڕانەوە بۆ عێراق ئەویش وەك گرتنەبەری ڕێوشوێنێکی ئەمنیی.

بەو شێوەیە، هەوالگریی ئەمریکا هەولیدەدا لەهەموو ڕێگاکانەوە بۆمان بێن، بێ ئەوەی بەوە بزانن کە ئیرادەی عێراقی شەرەیف سازش قەبولٌ ناکات.

کاتێك ئەوەم بۆ سەرۆك گێڕایەوە کە ئەو پیاوە وتی، سەرۆك وتی: " باشتکرد کوڕەکەم، وەك ئەوەی من پێشتر ڕامسپاردبیت کە وا بلێیت. ئەوان هەولیان داوە کە

نامانجەکەی خۆیان بەدیبهێنن ئەویش بەوەستاندنی بەرگریی و نمونەی منیش ئەو کارە ناکات، تەنانەت ئەگەر گەردنیشیان خستمە تەرازووەوە. پاشان ئەو پیاوە دەیویست ڕادەی کاریگەریی صەدام و قەڵەمڕەویی بەسەر بەرهەڵستیدا بزانێت، بەڵام بەرهەڵستیی تەنها بەرگریی لەصەدام حسێن ناکات بەڵکو لەهەموو دیل و گیراوەکان، لەبنچینەشدا لەعێراق".

## سازش و پێکهاتن ڕووینەداوە

دووبارەی دەکەمەوە، وە من بەرپرسیارم لەبەردەم خواو مێژوودا، لەو کاتەوەی صەدام حسێن گیراوە هیچ پێکهاتنێك لەگەڵ سەرۆکدا ڕووینەداوە، ئەگەر ئەمریکیەکان بیانوویستایە دانوستانی لەگەڵدا بکەن ئەوا ئەوە ڕوویدەدا، ئەگەر لەدوای دەستگیرکردن نەبووایە، ئەوا دەبوو لەدوای دەرچوونی بریاری لەسێدارەدانەوە بکرایە. چونکە لەم کاتەدا هەڵبژاردنەکان لەبەردەم سەرۆکدا سەخت و گران دەبوون، چونکە ئەو کات بەپێی خواست و هەڵبژاردنی ئەمریکی دەبوو. بەڵام هەموو ئەمانە ڕوویان نەدا. بەڵام ئەوانەی کە یارمەتی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیان داو ئامۆژگاریان کردن لەشکستخواردوو خیانەتکارەکان، ئەوانەی کە خیانەتیان لەئەمانەت و پەیمان و بەڵێنەکانیان کرد لەگەڵ سەرۆکدا، وتیان بەئەمریکیەکان سەرۆك بەربەستێکە لەبەردەم هەر دانوستانێکی ئێمە لەگەڵتاندا، ئەوانە کارتەکەی سەرۆکیان سوتاند. بەڵام هەموو ئەوەی ڕۆژنامەکان باسیان کردووە سەبارەت بەپێکهاتن و سازشکردن، ئەوا بۆ وروژاندنی ڕاگەیاندنی و پێشڕادەستکردنی هەواڵ و مەبەستگەلێکی ترە کە زانراو و ئاشکرایە لامان.

## بەیاننامە نەزانراوەکە؟

لەبەرواری ٢٠٠٦/١٢/٢٤دا، کەسێك لە نووسینگەی "پشتیوانی" دەستەی پشتیوانی بۆ بەرگریکردن لە سەرۆك و هاوەڵەکانی) لەعەممان پەیوەندی پێوەکردین، کەسێك وای ڕاگەیاند کە دکتۆر فلانەو میسریە. هیچ بیرۆکەیەکم لانەبوو لەبارەی ئەم کەسەوەو پێشتر هیچم لەبارەوە نەبیستبوو. پێیووتم کە بەیاننامەیەکی لایە لەسەرکردایەتی عێراقیەوە کە تێیدا ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ڕوودەدات لەعێراق و ناوچەکەدا، نەبوونی هیچ جۆرە چەکێکی کۆکوژ لەعێراقدا، لاریی نەبوونی عێراق لەوەی هەموو کێشەکانی ناوچەکە بەشێوەیەکی گشتیی چارەسەربکرێت لەناویشیدا کێشەی فەلەستین و چۆڵکردنی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەچەکی کۆکوژ، ئەمەش بەهاریکاریی سەرجەم وڵاتانی جیهان.

بەپێی قسەی دکتۆر، عودەی صەدام حسێن پێش هێرشی ئەمریکا بۆ سەر عێراق ئەم بەیاننامەی پێداوە، بەشێوەیەکی ووردتر چلو هەشت کاتژمێر پێش هێرشەکە. ئەم کەسە نەیتوانیوە عێراق بەجێ بهێڵێت بۆ ئەوە بەیاننامەکە بداتە ئاژانسەکانی هەواڵ و دەزگا جۆراوجۆرەکانی ڕاگەیاندن، کە بەشێوەیەکی ئەنقەست لەلایەن ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە ئاستەنگ خراوەتە بەردەم گەشتەکەی.

لێم پرسی کە چی دەوێت، وەڵامی دایەوە: دەمەوێت بەیاننامەکەتان بۆ بنێرم بۆ ئەوەی بیگەیەننە دەست سەرۆك، بۆ ئەوەی ئەگەر وویستی بیگۆڕێت یان شتێکی لێ لابدات یان بۆی زیاد بکات، یان لەبری ئەم بەیاننامەیە بەیاننامەیەك بنوسێت بۆ ئەوەی ڕاستیەکان ڕوونبکاتەوە تا جیهان لەڕاستی مەسەلەکان لەدوای دوژمنکاریی و وێرانکارییەکە ئاگاداربکاتەوە، چونکە ڕاستیەکان بەتەواوەتی شێوێنراون بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەندیی بەخودی سەرۆکەوە هەیە.

دوای ئەوە، دکتۆرەکە بەیاننامەکەی نارد.

لەکاتی کۆبوونەوەمان لەنووسینگەی "پشتیوانیی" پێش ئەوەی سێ لەپارێزەرکان ڕابسپێرێن بۆ ئەوەی لە ٢٠٠٦/١٢/٢٦دا سەردانی سەرۆك بکەن، ئەم بابەتەمان لەگەڵ ئەو برادەرانەدا باسکرد کەلەوێ بوون، ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی ئەو سێ هاوەڵەمان کە دەچن بۆ بینینی سەرۆك بەیاننامەکە لەگەڵ خۆیان بەرن بۆ ئەوەی سەرۆکی لێ ئاگادار بکەنەوەو لەڕاستی و دروستیەکەی دڵنیاببنەوە، هەڵبژاردنەکان لەبەردەمیدا کراوەن. ئەم ڕێکەوتنەشمان بەهەلێك دانا کە لەوانەیە سەرۆك ووتەی یەکلاییکەرەوەی هەبێت تێیدا، لەوانەشە یارمەتیدەر بێت بۆ ڕزگاربوون لەو تەنگوچەڵەمەیەی کە عێراق و سەرکردایەتیەکەی پێیدا گوزەر دەکەن. بەڵام سەرۆك صەدام حسێن هیچی لەبارەی ئەو بابەتەوە نەووت. پەیوەندیمکرد بەو هاوەڵەمانەوە کە سەردانی سەرۆکی کردبوو وەڵامی دامەوە: " بابەتەکەم خستە پێش چاوی سەرۆك بەڵام هیچ وەڵامێکی لەو بارەیەوە نەدایەوەو هیچی نەووت".

# بەشی بیست و دووەم

## لەدانیشتنەکانی لێکۆڵینەوەکاندا چی گوزەرا



بەردەوام دەبم لەبەرگیرکردن لێت،

هەتا ئەگەر لەپێناو ئەوەدا ژیانیشم دانابێت.

خەلیل ئەلدلێمیی

پێش دەستپێکردنی دانیشتنەکانی دادگایی کەلەبەرواری ۲۰۰۵/۱۰/۱۹دا دەستی پێکرد، دەستەکانی لێکۆڵینەوە چەند دانیشتنێکیان لەگەڵ سەرۆکی دیلکراو صەدام حسێن و هاوەڵە دیلەکانی ئەنجامدا.

ئەمەی خوارەوە چەند کۆپلەو وەرگێراوێکی ئەو دانیشتنانەیە کە هەڵگری ئاماژەگەلێکی دەوڵەمەندە لەلایەنی مرۆیی و خەباتگێڕیی و پاڵەوانێتی و سەرکردایەتیی لەکەسایەتیی صەدام حسێندا:

## سەرۆك صەدام حوسێن و دورخستنەوەی پارێزەرەکان

لەیەکێك لەدانیشتنەکانی لێکۆڵینەوەدا ساڵی ۲۰۰۵، قازی ڕائد ئەلجوحی ئەو داوایەی بۆ سەرۆك خوێندەوە کە خێزانەکەی لەڕێگەی پۆستی ئەلەکترۆنیەوە بۆ دادگای ناردبوو، بۆ دورخستنەوەی هەموو پارێزەرەکانی جگە لە پارێزەر خەلیل دلێمیی، ئەویش بۆ ڕێکخستنەوەی بریکاریی و کاروبارە یاساییەکان. سەرۆك لەبارەی هۆکارەکەوە پرسیار کرد، بۆم ڕوونکردەوە ئەوە ئارەزووی خێزانەکەیەتی کە دوای ڕاوێژکردن بە ڕاوێژکارە یاساییەکەی ئەو داوایەیان لەدادگا کردووە، ئەمەش بۆ ڕێکخستنەوەی کارەکان بەشێوەیەکیووردو بەرپرسیارانەتر. سەرۆك سەرسامیی دەربڕی و وتی: من شەرمەزار دەبم لەمە، نامەوێت کەرامەتی هیچ عێراقیەك برینداربکەم، چۆن دەتوانم ئەو کەسە برینداربکەم کە خۆی بەخشیوە بۆ ئەوەی لەسەختترین بارودۆخەکاندا بەرگریی لەمن بکات. بە ئەلجوحیی وت: دوای ئەوە ڕوونبووەوە، ئەوا من ڕازیم لەسەر داوای خیزانەکەم تەنها بۆ مەبەستی ڕێخستنی زیاتر ووردتری کاروبارەکان، نەك لەبەر هەر هۆکارێکی تر.

## چاوپێکەوتنی سەرۆك لەگەڵ دادوەردا لە ۲۰۰۵/۸/۲۳

ڕائید ئەلجوحی: صەدام، ئایا ڕەزامەندیت لەسەر دورخستنەوەی هەموو پارێزەرەکان و هێشتنەوەی تەنها مامۆستا خەلیل دلەیمیی یان بریکارێتی ئەوانیش دەهێڵیتەوە، ئەوەش لەسەر داوای ڕەغدی کچتە، ئەمەش داواکەیە کە بەدەستمەوەیە؟

سەرۆك : " ربنا لاتزغ قلوبنا بعد اذ هديتنا وهب لنا من لدنك رحمة إنك لا تخلف الميعاد". سەرەتا من سوپاسی هەموو پارێزەرەکان دەکەم بۆ ئەو هەوڵ و کۆششانەی کە ئەنجامیانداوە، بەڵام لەپێناو سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەو پێویستیەکان کە پەیوەستە بە

قۆناغەکەوەو ئەوەی کەڕوو دەدات، ئەوا من ڕەزامەندم لەسەر هەڵوەشاندنەوەی هەموو بریکارییەکان و تەنها هێشتنەوەی مامۆستا خەلیل دلێمیی وەك بریکارو پارێزەرم.

ڕائد ئەلجوحی: لەئایندەدا، ئەگەر پارێزەرەکەت بریکارییەکی نوێی پێشکەش کرد بۆ ئەوەی کەسانی تر بکاتە بریکاری تۆ لەبری خۆی، ئایا ڕەزامەند دەبیت لەسەری؟

سەرۆك: من ڕازیم لەسەر هەر شتێك کە مامۆستا خەلیل دلەیمی لەسەری ڕەزامەندبێت ، مامۆستا خەلیل دەکەمە سەرپشك بۆ هەڵبژاردنی هەر کەسێك کە دەیەوێت وەك مەرجێك لەمەرجەکانی ڕازی بوونم لەسەر ئیمزاکردنی هەر بریکارییەك.

ڕائد ئەلجوحی: سەبارەت بە پارێزەرە عێراقیەکان یان عەرەب یان بیانیی، ئایا داوای پارێزەری عەرەب یان بیانیی دەکەیت؟

سەرۆك؟: ئەگەر پارێزەرەکان عێراقیی بن یان عەرەب یان بیانیی، ئەوا من پێویستیم بە بریکار و ڕاوێژکردن هەیە، هەموو ئەو کاروبارانەش بۆ مامۆستا خەلیل بەجێدەهێڵم.

## دانیشتنی ٢٠٠٥/٩/١٥ ڕەقی و لەڕوودا وەستانەوەو پیاوەتیی

دادوەر: سدام، ئەمڕۆ بەو پێیەی کە پێشتر سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان بوویت، دەمانەوێت لەتۆوە ئەوە بزانین کەلە پرۆسەکانی ئەنفالدا چی ڕوویدا؟

سەرۆك: بسم الله الرحمن الرحيم: " ربنا أفرغ علينا صبرا وثبت اقدامنا وانصرنا على القوم الكافرين" صدق الله العظيم.

لەسەرەتادا دەمەوێت بڵێم صەدام حسێن هێشتا سەرۆك کۆماری عێراق و سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکانە، مەگەر تەنها گەل پێچەوانەی ئەمەی وویست. بەم پێیە ئەوا من وەڵام نادەمەوە چونکە ئەو دوژمنکارییەی کە ئەمریکا پێی هەستاوەو ئەوەی کە لێیکەوتۆتەوە تێکڕا هەمووی پوچ و بەتاڵە.

دادوەر: ئێمە دادوەرین، پێشتریش لەسایەی ئەو ڕژێمەدا کە تۆ سەرۆکی بوویت هەر دادوەر بووین، هێشتاش هەر دادوەرین.

سەرۆك: ناکرێت سستمێکی دادوەری بەبێ هەردوو دەسەڵاتی یاسادانانی و جێبەجێکردن بوونی هەبێت. هەروەها ئەوەش دەڵێم، ئەگەر هەلی ئەوەم هەبوایە کەلەدەرەوەی گرتوخانە بوومایە، ئەوا بەردەوام دەبووم لەسەرکردایەتیکردنی بەرەنگاریی و بەرهەڵستیی لەدژی داگیرکەر.

دادوەر: ئەم دانیشتنە پەیوەندی هەیە بەوەوە کەلەساڵی ۱۹۸۸دا ڕوویدا لەپرۆسەی ئەنفالدا، بەوپێیەی کە تۆ سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان بوویت و فەرمانی جوڵەپێکردنی هێزە سەربازییەکانت لەدەستدا بووە، بەشێوەیەکی تێرو تەسەل پێمان بڵێ دەسەڵاتەکانی سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان کامانەن؟

سەرۆك: دووبارەی دەکەمەوە من وەڵام نادەمەوە، نەك تەنها بۆ ئەم پرسیارە، بەڵکو وەڵامی هەموو پرسیارەکانی تریش نادەمەوە. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە من هێشتا سەرۆك کۆمارو سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارە عێراقییەکان و سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشم، بەپێی دەستور حەسانەی دادوەریی تەواوم هەیە. دووەمیش ڕەنگە یەکەمیش بێت، چونکە داگیرکەری ئەمریکی و ئەو هاوپەیمانێتیەی کەلەگەڵیدایە هێرش و پەلاماردانێکی پووچ و بەتاڵە، ئەوەیشی لەسەر پوچی و بەتاڵی بوونیادبنرێت پووچ و بەتاڵە. ئەو لێکۆڵینەوەیەش کەئێستا دەکرێت و دەستەی دادوەریش لەسایەی داگیرکاریدا پووچ و بەتاڵە چونکە هەموو ئەوە بەپێچەوانەی دەستورەوەیە.

دادوەر: پێموایە کە تۆ دەرچووی یاسایت.

سەرۆك: پێت وایە؟! منیش هەروەها پێموایە تۆیش دەرچووی یاسایت. وە دەڵێم دەستەی لێکۆڵینەوە کەسانێکی تێدایە کە برامن و شانازییان پێوە دەکەم، کاتێکیش قسە دەکەم مەبەستم کەس نییەو نامەوێت سوکایەتی بەکەس بکەم.

دادوەر: ئایا بەشێوەیەکی تەواوەتی وەڵامی پرسیارەکان نادەیتەوە؟

سەرۆك: مەگەر تەنها گەل بیەوێت.

دادوەر: شورەییە کە لەبارەی دەسەڵاتەکانتەوە قسە نەکەیت.

سەرۆك: دەستەی لێکۆڵینەوەی تر هەن کە دادوەرەکان تێیدا ناوی خۆیان نەووتووە. پاشان من بەرپرسیارم لەتەواوی دەسەڵاتە دەستورییەکانم، وە شانازیشی پێوە دەکەم و پێیەوە دەنازم.

دادوەر: قسەمان لەگەڵ سوڵتان و عەلی حەسەن و فەرحان ئەلجبوریی و حوسێن ڕەشید دا کردووە، دانیان بەحاڵەتێکدا ناوە کەئەویش ئەوەیە کە ئەنفال پرۆسەگەلێکی سەربازیی بووە. با واز لەکاروباری سەربازیی بێنین و بڕۆین بۆ ڕۆژنامەکان (فلان بروسکەیەك بلاودەکاتەوە دەربارەی پرۆسەکانی ئەنفال) ئەم پرۆسانەش ماوەی شەش مانگ بەردەوام بوون و هەموو جیهان بینیوویەتی. کاتێکیش دێتە سەرەی سوڵتان دەڵێت کە فەرمانەکان لە نزار ئەلخەزرەجی یان صەدام حسێنەوە پێیگەیشتووە.

سەرۆك: عەلی حەسەن ئەلمەجید یان کەسانی تر، بەپێی دەستور دەسەلاتیان هەیە، وەلامنەدانەوەی منیش کەمکردنەوە نییە لەتۆ یان لەکەسایەتیی تۆ.

دادوەر: هیچ گرفتێك نییە لەوەی وەلام دەدەیتەوە یان نا، من ماوەیەکە دادوەرم، دەتوانم بەڕێگەی تر بگەمە هەموو بەلگەکان. ئەگەر دەرگات داخست، هیچ گرفتێکم نییە، من ڕێگەو سازاندنی یاسای دادەنێم و دەیگرمەبەر، داخستنی دەرگاکان و خۆلادان لەوەلامدانەوە یان پاساوهێنانەوە ئەمە پاساو نییە. چەندین کەس هەیە لەپرۆسەی لێکۆلینەوەدا کەلەوانەیە بەپێی لێکۆلینەوە لەگەلتدا هەلویستیان بگۆڕێت.

سەرۆك: ئایا لێبویەتەوە؟... کاتێك بەشێوەیەکی هونەریی تێڕوانینی یاسایی بەشبەش دەکەیت، بەهەنگاوگەلێکی هەلە دەگەیت. من لەناو داگیرکەردام و ولاتەکەم داگیرکراوە، ئەگەر تەمەنم مابێتەوە، ئەوا لەدەرکردنی داگیرکەردا بەسەری دەبەم.

دادوەر: تەنها لە لایەنی یاساییەوە قسە بکە.

سەرۆك: من شانازی بەخۆمەوە دەکەم وەك هاولاتییەك زیاتر لەشانازیکردنم بە ناونیشانەکانەوە.

دادوەر: کەواتە وتت هاولاتیی هاولاتیش بەڕێزە لەبەردەم یاساداو ئەرکی لەسەر شانە. نامەوێت بچمە ناو مشتومڕی ترەوە، لەژێر ڕۆشنایی ئەوەدا منیش ئەرکێکی دیاریکراوم هەیە، لێکۆلینەوە دەکەم و بڕیارەکانم دەردەکەم. من شانازیی بەدادوەرییەکەمەوە دەکەم کەلەسەری ماندوو بووم. بۆ ئەوەی پیشەییانەش بین، من پرسیارەکان دەکەم و ئیدی ئەوی تریش بەجێ دەهێلم بۆ تۆ وەلام دەدەیتەوە یان نا.

سەرۆك: ڕازی بوونت بەوەی لێکۆلینەوە بکەیت پێچەوانەی دەستورە و بەزاندنی یاساکانە تۆش یاسات بەزاندووە بەوەی کە ڕازی بوویت بە پێکهێنانی دەستە لێکۆلینەوەییەکان لەسایەی نەبوونی دەسەلاتی یاسادانان و جیبەجێکردن و لەسایەی داگیرکردندا.

دادوەر: پرۆسەکانی تانەدان لەشەرعیەت و ناشەرعیەتی بوون لەکاتی لێکۆلینەوەدا نابێت.

سەرۆك: کاتێك کە بنچینە تۆکمەو پتەو و دروست نەبێت بیناکەی سەری دەڕوخێت.

دادوەر: لەقسەکانی تۆمەتباران سولتان هاشم و حسێن ڕەشید دا هاتووە کە پرۆسەکانی ئەنفال پرۆسەی سەربازیین و بە بڕیارگەلێکی سەربازیی جێبەجێکراون کەلەلایەن سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکانەوە لەوکاتەدا دەرکراون، لەلایەن

سەرکردە مەیدانییەکانیشەوە جێبەجێکراون. بەو پێیەش کە تۆ لەو کاتەدا لەو پۆستەدا بوویت لەساڵی ١٩٨٨ بەپێی بەڵگەنامەکان کە لای دادگا هەن، ئەوا ئەوان ئەو فەرمانانەیان جێبەجێکردووە کەلەلایەن تۆوە ڕاستەوخۆ دەرچوون، تۆ چی دەڵێیت؟

سەرۆك: ( بێدەنگ بوو و قورئانەکەی کردووە، پاشان بۆ ماوەیەکی درێژ سەیری دەموچاوی دادوەری کرد).

دادوەر: ئایا بنووسم بێدەنگ بووەو وەڵامی نەداوەتەوە؟

سەرۆك:..............

دادوەر: لە وتەکانی تۆمەتبار عەلی حەسەن ئەلمەجیددا هاتووە کە بە پێی بڕیاری ١٢٠ لە ١٩٨٧/٣/٢٩دا بە بەرپرسی ناوچەی باکور دامەزراوە، ئەو دەسەلآتانەی پێدراوە کەلە بڕیارەکەدا هاتووەو لەخوارەوەی ئیمزایەکی لەسەرە کە بۆ تۆ دەگەڕێتەوە، کەبڕیاری ڕاگواستنی گوندە کوردییەکانە لەناوچەی یاساغکراوەوە بەفەرمانی ڕاستەوخۆی تۆ بووە. وەڵامت چیە لەسەر ئەوە؟

سەرۆك:.........................

دادوەر بۆ نووسەر: بنووسە " بێدەنگ بوو وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوەو هیچ ووشەیەکی نەدرکاند و لەمەدا مافە یاساییەکانی بەکارهێنا". ئایا نیازی وەڵامدانەوەت هەیە یان نا؟

سەرۆك: من وەڵامم یەکێکەو ناگۆڕێم.

دادوەر: لەدانوستانەکانی ساڵی ١٩٩٢ کەلەنێوان سەرکردە کوردەکان و ئێوەدا ڕوویدا، داواتان لێکرا کە چارەنووسی ئەو خێزانانەو ئەو کەسانە ئاشکرا بکەن، وەفدی دانوسانکار کە بەشێك لەئەندامەکانی عەلی حەسەن مەجید و تاریق عەزیز بوو وەڵامیان دایەوە.. کە ئەوەی ڕوویدا ڕوویداو لەئەنجامی پرۆسەی ئەنفالدا نەمان و کۆتاییان پێهات. بەو پێیەی کە تۆ بەرپرسی باڵا بوویت لەدەوڵەتدا، وەڵامت چیە لەسەر ئەم پرسیارە؟

سەرۆك: ئەوەی لەناو وەفدەکەدا بوو ئێستا سەرۆکی دەوڵەتە و ئەمریکیەکان دایانناوە. وە من کەسم نەدیوەو چاوم بە وەفدەکە نەکەتووە.

دادوەر: هەتا جەماعەتیش؟

سەرۆك: جەماعەت کێن؟

دادوەر: تاریق عەزیزو عەلی حەسەن مەجید.

سەرۆك: باشترین جەماعەت! خوا دەزانێت.

دادوەر: خوا لەهەموو شتێك بەئاگایە، بچووك وگەورەو تۆمارکراوەکانیشی لایە.

سەرۆك: ئەگەر خوا بیەوێت هیچ شتێك لەناو ناچێت و دەمێنێتەوە.

دادوەر: (زەردەخە دەیگرێت) هێزەکانمان قەرەداغ پاکدەکەنەوە!

سەرۆك: ئایا ئەم قسەیە نازانیت، دەتبینم سەرسامیت، ئایا لەکاتی خۆیدا ئەم قسەیەت گوێ لێ نەبووە؟

دادوەر: هەموو قسەیەك کە دەتەوێت تۆماری بکەم ئەوا تۆماری دەکەم. ئەمڕۆ ئەمە دانیشتنەکەیە هیچ شتێکمان نییە. (دادوەر چەند کۆپلەیەك لە ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە).

سەرۆك: ئایا گەلەکەمان لەمسەریەوە بۆ ئەوسەری لەخۆشی سەرکەوتن بەسەر ئێراندا سەمایان نەکرد لەسەر شەقامەکاندا؟

دادوەر: پرسیارێکی دەرەکییە.. صەدام چەندجار ( پرسیارت لێکراوەو وەڵامت نەداوەتەوە) لەساڵی ١٩٣٧ ەوە هەتا ساڵی ٢٠٠٥؟

سەرۆك: کاتێك بمەوێت وەڵام بدەمەوە ئەوا وەڵاممداوەتەوە، مێژووی صەدام حسێنیش ڕوونە هەر لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییەوە نەگۆڕاوە.

دادوەر : ( هەمان پرسیار دووبارە دەکاتەوە).

دادوەر: شەرەفی پیشە دەخوازێت واز لە مێژو کورسی بهێنرێت.

سەرۆك: بنەما ئەساسە و بنچینەیە کاتێك کە وتم وەڵام نادەمەوە.

دادوەر: خەڵکانی بێتاوان ستەمیان لێدەکرێت.

دادوەر: من غەیب نازانم. بەڵام بەڵگەنامەم لایەو پرسیاردەکەم . کاتێك کە کەسێك داوای شایەتیدان دەکات و دەڵێت لەصەدام بپرسن، تۆش وەڵام نادەیتەوە چی پێ بڵێین؟

سەرۆك: بەدەست خوایە.

دادوەر: هەموومان بەدەست خواین.

دادوەر: جەنگی ئێران و بەرپەرچدانەوە لە ١٩٨٠/٩/٢١دا ئایا ئەو جموجوڵانە بەفەرمانی تۆ بوون؟

سەرۆك: وەڵامم دایتەوە.

دادوەر: بۆچی چەکی کیمیاویی بەکارهێنرا لەو پرۆسانەدا، بەو پێیەی لەچەکە ستراتیژیەکانە، تەنها بەفەرمانی تۆ نەبێت بەکار ناهێنرێت، باشە بۆچی فەرمانتدا بەکاربهێنرێت؟

سەرۆك: دەمەوێت شتێك بۆ مێژوو بڵێم، ئەگەر هەردوو دەستی صەدام حسێن ببڕێتەوە فەرمان بە کوشتنی یەك عێراقی نادات، ئەگەر لەگەردنی صەدام حسێن بدرێت ناکرێت بەکیمیاویی لەگەلەکەی خۆی بدات.

دادوەر: گوێت لە تۆمارێکی دەنگی دەبێت کەلەگەڵ سەرکردایەتی گشتیی هێزە چەکدارەکاندا کۆبوویتەتەوە لەو ماوەیەدا تێیدا یەکێك لەئەفسەرەکان کاریگەریی چەکی کیمیاویی ڕوون دەکاتەوە لەو پرۆسانەداو بەدیاریکراویش لەناوچەی قەرەداغ کە ئەویش یەکێك بووە لەناوچەکان لەپرۆسەکانی ئەنفالی دوودا.

دادوەر: دەنگی خۆتت بۆ دەردەخەم کە لەناو کۆبونەوەکەدا دانیشتوویت.

سەرۆك: دۆبلاژ هەموو شتێك دەکات، تۆش وەك دادوەر ناکرێت تۆمارە دەنگیەکان وەربگریت و کاریان پێبکیەت.

سەرۆك ( لەکاتی گوێگرتن لە تۆمارەکە) ئەو قسەی ئەوکاتەیە کە جەنگ لەگەڵ ئێراندا بەردەوامە.

دادوەر: منیش پێچەوانەی ئەوەم نەوتووە.

دادوەر: یەکێك لە ئەفسەرەکان لەتۆمارەکەدا دەڵێت کاتێك کە گورزە کیمیاوییەکان لەقەرداغ دراون کاریگەرییان نەبووە. لەمبارەیەوە چی دەڵێیت؟

سەرۆك: بۆ ڕاستکردنەوەی قسەکانت، ئەو گفتوگۆیە لەکاتی جەنگدایە لەگەڵ ئێران، قسەکەش بۆ دەرکردنی ئێرانی دوژمنە لەقەرەداغ.

سەرۆك: ئایا پرسیارت لە نزار ئەلخەزرەجی کردووە.. نەیانتوانی پرسیاری لێبکەن چونکە ڕای کردووەو ئێوەش هەڵوێستی دەزانن.

دادوەر: ئەی لەبارەی وەفیقەوە چی دەڵێیت؟

سەرۆك: تۆ ئەوەی کە من دەیڵێم تۆماری ناکەیت، بەڵکو پارچە پارچەی دەکەیت و ئەوەی خۆت دەتەوێت تۆماری دەکەیت.

دادوەر: لەرێگەی بەڵگەنامە و قەواڵەکان و ڕۆژنامەکانەوە کە بەروارەکەیان ئاماژە بە مێژووی ساڵی ١٩٨٨ دەدەن، ئەوە ڕوونە کە ئەوەی ڕوویداوە لەپرۆسەکانی ئەنفال لە پرۆسە سەربازییەکان و ئەو فەرمانانەی کە لەلایەن بەرپرسەکانەوە دەرچوون لەلایەن تۆوە دەرچوون. چی دەڵێیت؟

سەرۆك: ئایا وەك دادوەرێك دەکرێت ئەوەی لە ڕۆژنامەدا بڵاودەکرێتەوە وەك بەڵگەیەك بەکاری بهێنیت؟

دادوەر: ئایا وەڵامت هەیە؟

دادوەر: لەگۆڕە بەکۆمەڵەکاندا لەناوچەی (حزر) کە دەکەوێتە بیابانی نەینەواوەو ناوچەی بیابانیی نزیك (نوگرە سەلمان) سەدان جەستە دۆزراونەتەوە کە هی ژن و منداڵ و پیاون، زۆربەی ئەو بەڵگەنامانەش کەپێیانە ئاماژە بەوە دەکەن و جەخت دەکەنەوە کە هی رۆڵەکانی گەلی کوردمانە ئەوانەی کەلەپرۆسەکانی ئەنفالدا دیلکراون لەدانیشتوانی ئەو گوندانەی کە پرۆسەکانی ئەنفال گرتوونیەتەوە.. بەوپێیەش کە تۆ سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان بووی لەو ماوەیەدا، پرۆسە سەربازییەکانیش بەفەرمانی تۆ بەڕێوە دەچوون، باشە بۆچی ئەو دیلانە کوژران؟

سەرۆك صەدام حسێن: ئەگەر ئەوانە لەپرۆسەی سەربازیدا کوژرابن، ئەوا ئەمە شتێکە. ئەگەر بشتەوێت ٧٢ کاتژمێر ماوەم بدەرێ ، ئەوا دەتوانم بەسەدان لاشەت بۆ کۆبکەمەوە.

دادوەر: بۆچی هەموو دەسەڵاتەکانت دایە عەلی حەسەن مەجید لەنووسینگەی رێکخستنی باکور و هەروەها دەسەڵاتی دەرکردنی فەرمانەکان بۆ سەرکردایەتییە سەربازییەکانت لەناوچەی باکور پێدا. ئایا هیچ هۆکارێکی تایبەت هەبوو؟ ئەم دەسەڵاتانە دراونەتە ناوبراو بەپێی بڕیاری ٦٠ لە ١٩٨٧/٣/٢٣دا.

سەرۆك: لەسەرەتاوە وەڵامم دایتەوە.

دادوەر: بۆچی رێتدا بە عەلی حەسەن مەجید چەکی کیمیاویی لەو ناوچەیەدا بەکاربهێنێت؟

سەرۆك: ئەو بەڵگەنامەیەم بدەرێ کە ئەوە دەسەلمێنێت، ئەمە شێوازێکە بۆ وروژاندنی رای گشتیی، وە من تەحەدای هەموو جیهان دەکەم کە بیسەلمێنێت عەلی حەسەن مەجید یان هەر کەسێکی تر چەکی کیمیاویی لەدژی گەلەکەی بەکارهێنابێت.

دادوەر: تۆ وەڵام نادەیتەوەو ڕاستیش دەخەیتەوە شوێنەکەی خۆی.

سەرۆك: هەموو شتێك لەکاتی خۆیدا خۆشە.

دادوەر: مەبەست چیە لەلێدانی تایبەت؟ ئایا مەبەست پێی لێدان نییە بەچەکی کیمیاویی؟

سەرۆك: لێدانی تایبەت یانی خودی لێدان.

دادوەر: هەموو تۆمەتبارەکان وەڵامیان داوەتەوە کە لێدانە تایبەتەکان بریتیە لەبەکارهێنانی چەکی کیماویی.

سەرۆك: لەسەر ئەو قسەیەت، هەتا تۆپبارانکردنەکانیش وا تێگەیشتنی بۆکراوە

دادوەر: ئایا ئەوە بچەسپێنم ؟

سەرۆك: نەخێر..

دادوەر: ژمارەی ئەو کەسانە چەندن کەلەدوای ئەنفالەوە ڕێزیان لێنراوە ؟

سەرۆك: هەموو ئەو پاڵەوانانەی لەجەنگدا ڕێکوپێك کارەکانیان ئەنجامداوە ڕێزیان لێنراوە.

دادوەر: ژمارەی ئەو ئەفسەرو پلەدارانەی کە ڕێزیان لێنراوە ؟

سەرۆك: ئەگەر تۆ سەرۆك کۆمار بوویتایە ئایا ژمارەی ئەوانت لەبیر دەما کەڕێزت لێناون؟

دادوەر: ئایا ئەم وەڵامە بچەسپێنم؟

سەرۆك: بەشێوەیەکی مەبدەئیی.

دادوەر: تۆ فەرمانی ئەنجامدانی پرۆسەکانی ئەنفالت دەرکردووە و تۆ پیرۆزبایت لێکردووە ؟

سەرۆك: خەتم روونەو ئیمزاکەشم چەسپاوە.

دادوەر: ئایا پشیلە لەئەنفالدا تیاچووە ؟

سەرۆك: خراپ و بەکرێگیراو، پشیلە باشترو شەریفترە لەو.

دادوەر: قەناعەتم نییە بەوەڵامەکەت.

سەرۆك: دەمبینیت بەرزترم لەتۆ ئەگەر قەناعەتت بەشتێك کرد ئەوا بیکە.

دادوەر: ئەو کێیە ؟

سەرۆك: قسەکەر.

دادوەر: بۆچی فەرمانت دەرکرد بۆ ئەوەی ناوچە ئاوەدان و نیشتەجێبووەکان وێران بکرێن لەناوچەکانی باکوردا سەرەڕای ئەوەی ئەمە پێچەوانەی یاسایە ؟

سەرۆك: ئایا بەپێی یاسا ڕومادی وێران کرا؟ وێرانکردنی تکریت بە فرۆکەی ئێف ١٦ ئەمە یاسایە ؟

دادوره: وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە.

دادوەر: تۆ لەبەرامبەر هەقدا بێدەنگی.

سەرۆك: نەخێر سوێند بەخوا لەهەق بێدەنگ نابم.

دادوەر: وەڵامت نەدایەوە.

سەرۆك: نەخێر...

دادوەر: بەپێی بەرپرسیارێتی و ئەوەی کە تۆ سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان و ئەمینداری گشتیی رێکخستنی سەرکردایەتی هەرێمی بوویت، ئەوا تۆ بەرپرسیاری یەکەمی لەکوشتنی هەموو هاولاتیە مەدەنیەکان لەپرۆسەکانی ئەنفالدا.

سەرۆک: ئەم باس و خواسە کورت و پوختەت لەکوێوە هێناوە؟

دادوەر: ئەمەم پێ مەڵێ مافی خۆمە هەموو پرسیارێك بکەم.

سەرۆک: تۆ بۆ پلماندن وئیستفزاز پرسیارم لێدەکەیت.

سەرۆک: بەخوا ئەی رایەد ئەی کوڕی ئەلجوحی ئەگەر لەسەردەمی صەدام حسێندا نەبوویتایە بە دادوەر، ئەوا ئێستا نەدەبوویت بەو دادوەرە، چونکە هەلی خوێندن بۆ رۆڵە جوتیارەکان و هی تریش فەراهەم نەکرابوو ئەگەر ئەو هەلە نەبوایە کە صەدام حسێن فەراهەمی کرد.

دادوەر: قسەوباسی دەرەکیی لێرەدا قەبوڵکراو نیە (وەڵامی نادرێتەوە).

دادوەر: تۆ ئەمرۆ ئەوەی داتمەزراندووە دەڵێی دامنەمەزراندووە.

سەرۆک: دەڵێی چیی.

دادوەر: من وەڵامم لانیە.

دادوەر: تۆمەتبار عەلی حەسەن مەجید ئەوەی باسکرد راگواستنی گوندە کوردییەکان بە پشتبەستن بەفەرمانەکان جێبەجێکراوە.

سەرۆک: جەنابت دەزانیت لەژێر وێرانکردنی سوپای ئەمریکادا کێ خەڵکی موسڵی راگواست.

دادوەر: وەڵامێکم دەوێت بیخەمە سەر کاغەز.

دادوەر: لەساڵی ۱۹۸۷دا بەڕێوەبەرێتی هەواڵگریی سەربازیی لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەش کردوویت دەربارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی، دوای کۆتایی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەسەر هەردوو مادەی (زارین و خەردەل) رەزامەندی تۆی لەسەر دراوە، تۆمەتبار سابر دەروێش جەختی لەسەر بوونی ئەم لێکۆڵینەوەیە کردۆتەوە هەروەك چۆن حامد یوسف حەمادی کە وەك سکرتێریك لای تۆ کاری کردووە بەهەمان شێوە جەختی لەسەر ئەم رووداوە کردۆتەوە، قسەت چیە لەسەر ئەمە؟

سەرۆک: بەکارهێنانی دژی گەل یان دەتەوێت ناوی وڵاتەکە بهێنم؟

سەرۆک: وەڵامم نیە.

دادوەر: ئێستا چی دەخوێنیتەوە؟

سەرۆك: ئەو شتانەی کە حکومەتی ئەمریکی دەهێنێت، شتانێك کە سیاسەتی تێدا نییە وەك هۆنراوەو قورئانی پیرۆز.

دادوەر: ئەمە سیاسەتی تێدا نییە.

سەرۆك: دیموکراتیەتی ئەمریکی حەزی لەسیاسەت نییە. نە ڕۆژنامە و نە گۆڤارو نەڕادیۆو نە تەلەفزیۆن، بەو پێیەی لەپێداویستیەکانی دیموکراسیەتن.

دادوەر: دەبینم ئێستا ڕەوشت باشترە لەپێشوو!

سەرۆك: ئەگەر خوا وویستی لەسەربێت.

دادوەر: پزیشك کەی دەتبینێت؟

دادوەر: هەیە، (هەرکات).

دادوەر: ڕەوشی ئەو نەشتەرگەریی فتقە چۆن کە بۆت کرا؟

سەرۆك: سوپاس بۆ خوا.

دادوەر: بەڵام لەدەرەوەی بازنەی خزمەتگوزاریەوە.

سەرۆك: سەلامەت و پرچەکەو...

دادوەر: وەڵامی پرسیارەکانت نەدامەوە. ئەوان دەڵێن فەرمانن و تۆش وەڵام نادەیتەوە.

سەرۆك: لەساڵی ١٩٦٤دا ئەوکات من ئەندامی سەرکردایەتی بووم پلانمان بۆ شۆڕش دارشت، پاشان دوای سێ مانگ لە خیانەتی قەیس ئەلنامیق دەستگیرکرام، لەکاتی لێکۆڵینەوەدا یەکێکیان لاوزابوو پلانەکەی لەدژی (ئەلبەکر) درکاند کەئەو دایڕشتووە، کاتێك دادوەر لێی پرسیم، پێمووت من پلانەکەم داڕشتووە. ووتی ئەی ئەبو هەیسەم (ئەلبەکر)؟ پێمووت: گومانمان هەیە لەوەی ئەو پەیوەندی بەعەبدوسەلامەوە هەبێت.. بەو شێوەیە قورساییەکەم لەسەر لابرد، پیاوان بەهەڵوێستیاندا دەناسرێنەوە. ژمارەی ئەوانەی لەوکاتەدا دەستگیرکرابوون ١٢٠٠٠-١٣٠٠٠ کەس دەبوون لەکاتێکدا ئەوانەی پلانەکەیان جێبەجێ کردبوو ٧ کەس بوون.

دادوەر: بەڵام تۆمەتت لەسەر کەس لانەبرد.

سەرۆك: لەیاداشتەکانمدا کە پێشکەشم کردیت وەك پێویست ڕوونکردنەوەی تێدایە.

دادوەر: لەسەر کۆمەڵەکەت هیچت لانەبردووە.

سەرۆك: هەموو شتێك بەکاتی خۆی.

داوەر: چیرۆکێك هەیە لەبارەی (هدیب)و براکەیەوە.

سەرۆک: هەوڵ مەدە کە داو و گۆڵمەز بنێیتەوە.

دادوەر: ئایا تۆ پێشتر حوکم دراویت؟

سەرۆک: دەگەڕێمەوە بۆ وەڵامەکەم لەسەرەتاوە.. بۆ ئەوەی هیچ جۆرە تێکەڵکردنێک روونەدات. حوکم نەدراوم تەنها لەسەر ئەوە نەبێت کە پەیوەندی بە خزمەتکردنی گەلەوە هەیە.

دادوەر: کۆتایی پێدەهێنم.. ئایا ئیمزا دەکەیت یان مافی خۆت بەکاردەهێنیت لەوەی کە ئیمزای نەکەیت؟

سەرۆک: مافی خۆم بەکاردەهێنم بەوەی ئیمزای ناکەم.

## دانیشتنی لێکۆڵینەوە لەرووداوەکانی ساڵی ١٩٩١

سەرۆکی دانیشتنی لێکۆڵینەوە: دادوەر عەلی ئەلروبەیعیی

ئەندامان: عەدنان ئەلبەدریی و عەبدول حسێن حەتتاب

شوێنی لێکۆڵینەوە: بینای سەرکردایەتی هەرێمیی.

دادوەر: مامۆستا خەلیل ئایا بریکارەکانت کردووە.

خەلیل دلەیمیی: بەڵێ ئەمەش سێ نوسخەیە.

سەرۆک: ئایا نابێت پێش ئەوەی بێم بۆ ئێرە چاوم بەپارێزەرەکان بکەوێت؟

دادوەر: ئایا پارێزەرە بەڕێزەکان بریکارنامەکانیان ئیمزا کردووە؟

سەرۆک: کام کێشە کە بریکارنامەکانیان ئیمزا بکەم؟

دادوەر: کێشەی ساڵی ١٩٩١.

سەرۆک: بۆ هەموو شتێک ئیمزایان بۆ دەکەم.

دادوەر: ناوی خۆت و ناونیشانت بڵێ.

سەرۆک: ئایا تۆ دادوەریت؟

دادوەر: بەڵێ من دادوەرم.

سەرۆک: تۆ و گەلی عێراق ناو و ناونیشانی من دەزانن.

دادوەر: بەپێی کۆنووسی ٢٠٠٥/٧/٢٨.

سەرۆك: من لەسیفەتی فەرمیی خۆم سازش ناكەم. گەلی عێراق منی وەك سەرۆك و سەركردەی خۆی هەڵبژاردووە.

ئەلدلێمی: بەپێی برگەی ب لە مادەی ١٢٦ لەیاسای ئوسوڵی دادگایی، برگەی ٩ لەمادەی ١٩ لەیاسای دادگا، برگەی ج لە ڕێسای ٢٧ لەڕێوشوێنەكانی لێپێچینەوە و كۆكردنەوەی بەڵگەكان، ئەوا موەكیلەكەم بەڕێز سەرۆك صەدام حسێن مافی ئەوەی هەیە بێدەنگ بێت وەڵام نەداتەوە، وە ناچار ناكرێت لەسەر وەڵامدانەوە كەئاڕاستەی دەكرێت یان هەر ئیفادە دانێك یان خستنەڕوویەك بێجگە لە ناساندنی خۆی و وتنی نازناوی و پلە و ساڵی لەدایك بوونەكەی، بێ ئەوەی ئەم بێدەنگ بوونەی وەك بەڵگەیەك لەدژی بەكاربهێنرێت. هۆكەشی ئەوەی كە هەڵمەت و داگیركاریی پووچ و بەتاڵە و ئەوەش لەسەر پووچی و بەتاڵی بووونیادبنرێت ئەویش بەتاڵە ووردو درشتی، لەناویشیدا دادگاكەتان و هەموو ئەو دەستانەی لێكۆڵینەوە كەلەڕێگەیەوە دروست بوون. دەبوو پێش ئامادەبوونمان بۆ ئەم دانیشتنە چاومان بە موەكیلەكەمان جەنابی سەرۆك بكەوتایە. بەڵام تۆ ڕەتتكردەوە.

دادوەر: نەخێر من ڕەتم نەكردۆتەوە.

ئەلدلێمیی: تۆ ڕەتتكردەوە. ئەمریكیەكان وایان پێ ووتین.

دادوەر: دەبوو داوایەكتان پێشكەش بكردایە.

ئەلدلێمیی: ئەمە پێشتر كاری پێنەكراوە تەنها لای تۆ نەبێت. وا باوە چاوپێكەوتنەكان بەبێ پێشكەشكردنی هیچ داوایەك ئەنجام دەدرێن، ئەمەش مافێكی ڕەوایە. لەبیریشت نەچێت ئەمە دانیشتنی لێكۆڵینەوەیە نەك دادگاییكردن.

دادوەر: ئێمە ناوو ناونیشانی تۆمان لایە، ئایا ناو ناونیشانی خۆتمان پیدەدەیت؟

سەرۆك: ناوم صەدام حسێن عەبدول غەفورە. كارم سەرۆك كۆماری عێراق و سەركردەی گشتیی هێزە چەكدارە عێراقییە خەباتگێڕەكانە. ساڵی لەدایك بوونم ١٩٣٧. لەبەغدای پایتەخت دادەنیشم، كۆشكی كۆماریی.

دادوەر: پلەی حزبیت چییە؟

سەرۆك: نایڵێم چونكە ئێستا حزب نهێنیە، ئەخلاقم ڕێگەم پێنادات ئەوە بڵێم چونكە كار لەكاری خەباتگێڕیمان دەكات و نهێنیەكە لەنهێنیەكانی كار.

دادوەر: لەبەرواری ١٩٩١/٣/٢ کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتی کراوە کە ژمارەیەك لە ئەندامانی سەرکردایەتی هەرێمیی هەڵوەشاوەو ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی هەڵوەشاوەت بانگهێشت کردووە، لەو کۆبوونەوەیەدا چی ڕوویدا؟

سەرۆك: هیچ کاغەزێکم پێنەدراوەو نەمبینوە، چاوم بەپارێزەرەکان نەکەوتووە، لەبەر ئەوە هیچ وەڵامێکم نییە.

دادوەر: فەرموو پرسیارەکە لەلایەن دەستەی لێکۆڵینەوەیە.

سەرۆك: با وای دابنێین کە تۆمەتبارەکە غەیری صەدام حسێنە، ئایا پێویست نییە تۆمەتبار لەکاغەزەکان ئاگاداربکرێتەوە بیانبینێت بەتایبەتی ئێمە لەعێراقداین و دادوەر هەیە؟

دادوەر: دادگا دەیگێڕێتەوە بۆ تۆمەتبار، پارێزەرێك بکاتە بریکار یان نا بەپێی ئارەزووی خۆی.

سەرۆك: بریکارە نەك بەدیل، ناکرێت ڕۆڵی من فەرامۆش بکرێت و هەڵبوەشێنرێتەوە هەتا ئەگەر هەزار پارێزەرەیش هەبێت. بۆیە دەبوو کاغەزەکانم ببینیایە بۆ ئەوەی بمتوانیایە ڕۆڵی خۆم بگێڕم.

دادوەر: دەبوو پارێزەرەکەت وردەکارییەکانی پێ ڕابگەیاندیتایە.

سەرۆك: نەك پارێزەر، بەڵکو ئێوە. دەبوو هەلی ئەوەتان پێ بدامایە بۆ ئەوەی کاغەزەکانم ببینیایە.

دادوەر: لەبەرواری ١٩٩١/٣/٢دا کۆبوونەوەیەك لەنێوان ئەندامانی سەرکردایەتیدا کراوە، کە تێیدا ژمارەیەك لەئەندامانی سەرکردایەتی هەرێمایەتی و ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشیش بانگهێشتکراون، لەنێوان ئامادەبووەکانیشدا تەها یاسین ڕەمەزان و محمد حەمزە زوبەیدی و حسێن کامیل و عبدول حەمید مەحمودو کەسانێکی تر هەبوون. ئەم کۆبوونەوەیە پەیوەندی بەڕووداوەکانی ١٩٩١ەوە هەیە. ئامانج چی بوو لەم کۆبوونەوەیە، ئایا ئامادەبووان ڕاسپێردران بۆ ئەوەی سەرکردایەتی برکە سەربازییەکان لەو ماوەیەدا بکەن، ئایا پلان و شێوازو ئەو بەرنامەیە دانرا کەلەلایەن ناوبراوانەوە پشتی پێببەستن؟

سەرۆك: دەڵێم سەرەڕای ئەوەی کە قسەکەم مانای دانپێدانان نییە بەحکومەتدا یان بەوەدا کەئەم دەستانەی پێکهێناوە. لەبەرئەوە بێدەنگ دەبم.

دادوەر: هیچ وەڵامێکت لا نییە لەسەری؟

سەرۆك: وەڵامم دایەوە.

دادوەر: وەڵامت نییە جگە لەبێدەنگیی؟

سەرۆك: ئایا بێدەنگیی ماف نییە؟

دادوەر: وەڵامی دایەوە: بێدەنگ بوون و نەدویی.

سەرۆك نەمووت نەدویی (نەگۆیی).

دادوەر: لەناوچەی باشور بارەگایەکی بەرەی پێشەوەی هێزە چەکدارەکان هەبوو، کەئەوان ئەندامانی ئەم بارەگایە بوون. بۆچی ئەم بارەگایە پێکهێنرا، دەسەڵاتی ئەم بارەگایە چییە لەبەسرە؟

سەرۆك: وا دابنێین ئەگەر تۆ یەکێك بوویتایە لە ئەندامانی سەرکردایەتیی، صەدام سەرۆکت بووایە، ئایا پێتوابوو بڵێت ئەندامانی سەرکردایەتی فلانە کەس و فلانە کەسن؟ ئەگەر بۆ ڕێزلێنان بوایە دەمانووت و دادپەروەر دەبووین و ناوی پیاوەکانمان دەووت. کەواتە پابەند دەبم بەبێدەنگیەوە.

دادوەر: ئایا ئەوە بچەسپێنم؟

سەرۆك: ئەمە پرسیارێکە بۆ ڕوونکردنەوە مادام تۆ ئەوەی پێشتر کە وویستووتەو مەبەستت بووە نەتچەسپاندووە، ئەوا من بێدەنگ دەبم.

سەرۆك: ڕوونکردنەوەکەم بچەسپێنە کە عێراق لەلایەن ئەمریکاوە حوکم دەکرێت

دادوەر: ئایا دەتەوێت ڕوونکردنەوەکە بچەسپێنم یان نا؟

سەرۆك: بێدەنگ دەبم.

سەرۆك: وەك وەڵامدانەوەیەکم بۆ دەستەی بەرگریی، ئەوا بێدەنگ دەبم.

دادوەر: حسێن کامل ڕاسپێردراوە بەسەرکردایەتی کردنی برکە سەربازییەکان لەنزیك پارێزگای کەربەلاوە، لەو کاتەشدا کەلەنزیك پارێزگای کەربەلاوە بووە، هەستاوە بە بوردومانکردنی شارەکە و لێدانی هەردوو مەزارگەی ئیمام حسێن و عەباس سلاوی خوایان لەسەربێت، ئایا تۆ فەرمانت پێکردووە، ئایا بەوەت زانیوە کە حسێن کامیل لەکەربەلا

ئەنجامی داوە، ئەو لێپێچینەوانە چین کەلەوکاتەدا گرتتەبەر بەتایبەتی کە ووتەیەکی بەناوبانگی حسێن کامیل هەیە لەکەرلابەدا کە بەئیمام حسێنی وتووە سەلامی خوای لەسەربێت: تۆ حسێنیت و منیش حسێنم بابیبنین بزانین کامان سەردەکەوین.

سەرۆك: بێدنگ دەبم (وەلام نادەمەوە)

دادوەر: دوای کۆتاییهاتنی ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٩١، بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە ٢٣٩ لە ١٩٩٢/٥/٢٤دا ڕێز لەئەندامانی سەرکردایەتی و سەرکردە سەربازییەکان و دەزگا ئەمنیەکان نراوە لەکێ و لەسەر چ شتێك ئەم ڕێزلێنانە ئەنجامدراوە؟

سەرۆك: زۆرێك لەخەڵكان ڕێزیان لێگیراوە. هەر بەڵگەنامەیەکیش ئیمزای منی لەسەربێت، ڕاست بێت ئیمزای من بێت ئەوا بەرپرسیارێتیەکەی هەڵدەگرم.

داواکاری گشتیی: شایەتحاڵێك لەناو سەدان شایەتحاڵەکاندا کەوا کەسێکی پاکو بیگەردو خاوەن توانستە، دەستگیرکراوەو نێردراوە بۆ (ڕەزوانیە). لەوێ خراوەتە ناو یەکێك لەو جەمەلۆنانەوە کە ژمارەیان بە دوانزە جەمەلۆن دەخەمڵێنرێت، هەریەکێك لەو جەمەلۆنانەش زیاتر لە ٢٠٠٠ گیراویان تێدابووە هەموو ئەوانەی لەهۆڵەکەدا بوون لەسێدارەدراون. لێرەدا پرسیارەکە دەربارەی تۆمەتبار تاریق عەزیزە کە ئەوکات هەڵدەستا بە هەماهەنگیکردن لەگەڵ بەڕێوەبەرێتی ئاسایشی گشتیدا بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی گیراوەکانی ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٩١ و لە ١٠٥٠٠ کەسەوە کەمیانکردنەوە بۆ ١٥٠٠٠ پاشان ژمارەکە کەمکراوەتەوە بۆ ١١٠٠٠ کەس ئەوانیش لەلایەن دادگا تایبەتەکانەوە کەفەرمان دراوە پێکبهێنرێن سزای لەسێدارەدانیان بەسەریاندا جێبەجێ کراوە... وەڵامت چییە؟

سەرۆك: ئەوەی داواکاری گشتیی باسی کرد، دەبوو لەڕێگەی ئەوانەوە کەلە ڕەزوانیە نیشتەجێن پرسیاربکرایە لەژمارەی جەمەلۆنەکان، ڕەزوانیە ناوچەیەکی گەورەی پڕ لەدانیشتوانە، بەلام بۆ لایەنەکانی تری پرسیارەکەت، ئەوا وەلامێکم نییە بۆیان.

داواکاری گشتیی: شایەتحاڵێك لەکوردستان کە لەو کەسانەیە پاك وخاوەن ڕەوشتە، باسی ئەوە دەکات کەلە ١٩٩١/٤/٤دا هێزەکانی سوپا دەوری شارەکەیان گرتووە ، پاشان جامی توڕەیی خۆی بەسەریاندا ڕشتووە.

سەرۆك: خەڵكینە ئەوە وتار بوو داواكاری گشتی پێشكەشی كرد یان ئیفادە بوو، ناوچەی باكور لەلایەنی كەشوهەوایەوە ناسراوە زانراویشە كە هەفتەی كۆتایی لەنێوان ٢٦-١٩٩١/٤/٢٧دا كەشوهەوا بەو شێوەیە نییە كە داواكاری گشتیی باسی كرد. بەڵام هەڵهاتنی هاوڵاتیان دەبێت لێكۆڵینەوەی لەبارەوە بكرێت، ئایا پێش هاتنی هێزە چەكدارەكان بووە یان دوای هاتنی. ئەو كاتەش دەستەی لێكۆڵینەوە دەتوانێت لەوە بكۆڵێتەوە، كە تەنها یەك گۆڕ هەیە كە ٤٠٠ كەسی تێدایە ئەوانەی لەگەڵ مامۆستا عیزەت دوریدا وەستان، دەشتوانن لەمە بكۆڵنەوە لەڕێگەی سەركردەی فرقەكانەوە و مامۆستا جەلال تاڵەبانی و بەڕێز تەها محێدین مەعروفەوە، بەڵام لایەنەكانی تر ، ئەوا بێدنگ دەبم.

دادوەری گشتیی: شایەتحاڵێكی تر كەپلەیەكی سەربازیی گەورەی هەیە لەفوراتی ناوەڕاست دەڵێت كە تالع ئەلدوریی و فەرحان ئەلدلێمی و محمد جواد عنیفس لەبەردەمیدا خەڵكیان كوشتووە، ئەم شایەتە لەكاتی ڕووداوەكەدا گیراوە، هەروەها كوڕە مامەكانیشی. ئەم شایەتە موشەك و تۆپی بینیوە كە بوردومانی كەربەلایان كردووە، هەروەها گۆڕێكی بەكۆمەڵی بینیوە كە تەرمی ٤٠٠ كوژراویان لێ دەرهێناوە، تۆمەتبار لەبارەی ئەمەوە قسەی چییە؟

سەرۆك: بۆچی سمێڵەكانی دادوەری گشتیی لەسەر كوژرانی دەیان و بگرە سەدان كەس نالەرزێنەوە كە ڕۆژانە بەهۆی ئاشوبی تایفییەوە لەبەغدادو هەندێك ناوچەی تری عێراقدا دەكوژرێن؟ كەواتە قسەی صەدام لەسەر هەر ئازاردانێك كە بەناهەق ڕووبەڕووی عێراقیەك دەبێتەوە چ ئێستاو چ پێشتریش، ئەوە كارێكی ترسنۆكانەو تاوانە.

دادوەری گشتیی: ئایا تۆمەتبار لەناو عێراقدا بووە و مومارەسەی دەسەڵاتی خۆی كردووە وەك سەرۆك كۆمار؟

سەرۆك: وەڵامی ئەم پرسیارە نادەمەوە چونكە شایانی وەڵام دانەوە نییە.

# بەشی بیست و سێیەم

## چەند لایەنێکی مرۆیی
## لەکەسایەتیی سەرۆکدا

بەلامەوە گرنگە هیچ عێراقییەك لەدەست نەدەین، بەهاوەڵەکانی لەگرتووخانەشم، کاتێك لەپەراوێزی ئەوەی پێی دەوترێت دادگا بینینم پێموتن، هەموو عێراقیەك ئەگەر تێڕوانینێکی هەڵەی بوو یان هەڵسوکەوتێکی هەڵەی کردو ویستی چاو بە هەڵوێستیدا بخشێنێتەوە و ڕێك بێتەوە و تەوبە بکات، ئەوا دەرگای تەوبە و پاشگەزبوونەوە والآیە هەتا دوایین کاتژمێر پێش ڕاگەیاندنی سەرکەوتن بەپشتیوانی خوای گەورە. بەلآم ئەم کەسە یەکسان نابێت لەگەڵ خاوەنانی بڕواو پلەوپایەی نیشتمانی ئەوانەی لەسەر بیروباوەڕیان مانەوە، هەموو شتێکیش لەسەر بنچینەی هەڵوێست و بەخشین.

(صەدام حسێن لەزیندان)

**سەرۆك هەندێك شتی بۆ گێڕامەوە كەلەبیری مابوو سەبارەت بە پەیوەندیی بەرۆڵەكانی گەلەكەیەوەو ووتی:**

" حەزم لەپەروەردەكردن و بەخێوكردنی مەڕومالآت و ووشتر بوو، هەروەها جۆرەكانی تری گیانەلەبەرەكان بەتایبەتی ماڵی و هۆگرەكان. ڕۆژێكیان، لەكاتی سەردانمدا بۆ پارێزگای سەلاحەدین، هەلەكەم قۆزتەوە بۆ ئەوەی سەردانێكی ئەو مەڕومالآتانە بكەم كە هی خۆم بوون. بەهاربوو، زەوی بەگژوگیا داپۆشرابوو. بەلآم، كاتێك گەیشتم، بینیم شوانەكە مەڕەكانی دەبرد بۆ شوێنێك كەوا گیای تێدا نەبوو، یان كەمی تێدا بوو. گالۆكێكم بەدەستەوە بوو، كەلەناو ئەو زەوییە قوڕاوییەدا پشتم پێدەبەست، قارچكم پێدەدۆزیەوە. پرسیارم كرد لە شوانەكە بۆچی مەومالآتەكە لەو شوێنەی ئەوبەرەوە نالەوەڕێنێت كەگژوگیای باشترە. زۆر كاریگەربووم بەڕەوشی ئەو مەڕە برسیانە. بۆیە دارەكەم چەقاندە شانی، بەلآم بەشێوەیەك ئازاری پێنەگەیەنێت، ئاگاداركردنەوەی بۆ ئەوەی لەداهاتوودا ئەوە ڕوونەدات. گەڕامەوە بۆ بەغداد.. بەلآم ئەو شەوە نەنووستم، لەخەمی ئەوەی لەوانەیە ئازاری ئەو شوانەم دابێت. لەڕۆژی دواتردا، بە سكرتێرەكەمم ڕاگەیاند كە پێویستە ئەو شوانەم بۆ بهێنێت. كاتێك هات ، دەترسا، پێشبینی دەكرد كە سزای بدەم. پێشوازیم لێكرد. لەئامێزمگرت، پۆزشم بۆ هێنایەوە. پاشان ڕێزم لێناو كاتێك ڕۆیشت بڕوای بەوە نەدەكرد كە ڕوویدا. ئیدی ئەو كاتە هەستم بەئاسوودەی دەروون و ویژدان كرد.

" ڕۆژێكیان، لەبەغداد دەسوڕامەوە، هەندێك سوالكەرم بینی، ڕقم لەو دیاردەیە دەبووەوە، پێداگریم دەكرد لەسەر ڕۆڵی چاودێریكردنی هەتیوان و پەككەوتووان، پێدانی مووچە بەگەورە سالآن، سەرەڕای پێدانی مووچە بەو كەسەی كە سەرپەرشتی پەككەوتەكان دەكات. داوام لەسكرتێر كرد هەموو سوالكەرەكانی بەغداد كۆبكاتەوە، زیاد لەجارێك، لەگەڵیاندا نانم خواردو یارمەتیمدان، هیوام خواست كەجارێكی تر نەگەڕێنەوەبۆ ئەو ڕەوشە كەشایانی پیاهەڵدان نییە.

" دەرگای نوسینگەكەم كراوە بوو بۆ پێشوازیكردن لەڕۆڵەكانی گەلەكەم، هەتا لە برا عەرەبەكانمان ئەوانەی كە لەناو گەلەكەماندا دەژیان. چاوم بەهاولآتیان دەكەوت هەتا كاتانێكی درەنگ و هەندێكجاریش تا بەرەبەیان و تا بەیانیی، پاشان بۆ ڕۆژی دواتر بەردەوامم دەبووم لەسەر كارەكەم لەناو عێراقییەكاندا، لەڕەوش و بارودۆخی ژیانیانم دەپرسی، هەستم بە ئاسوودەیی تەواو دەكرد كاتێك پێشوازیم لەژمارەیەكی گەورەتریان

دەکرد، چارەسەری گرفتەکانیانم بۆ دەکرد. کاتێك کە دەنووستم هەستم بە ئاسوودەیی ویژدان دەکرد کە توانیومە خزمەتێکی بەرچاو پێشکەش بەهاوولاتی بکەم".

سەرۆك باسی لەڕەوشی ژیانی خێزانەکەی کرد هەر لە لەدایك بوونیەوەو ووتی:

" کاتێك ساڵی ١٩٣٧ لەدایك بووم، باوکم پێش پێنج مانگ مردبوو. زانیم خوالێخۆش بوو، دوای ئازارو ئێشێکی زۆر کە بەهۆی ئەوەی پەراسوییەکی شکاوی چەقیبووە ناو گورچیلەیەکیەوەو هەڵیدڕی بوو گیانی لەدەستدابوو. ئەمەش بەهۆی هەڵوێستێکی پیاوانەی باوکمەوە بوو کە وویستبووی بەرگریی لەژنێکی خزمی بکات کە دز چوو بووە سەری، باوکم لەسەر دیوارێکی قوڕینی بەرزەوە خۆی هەڵدابوو ئیدی تووشی ئەو رووداوە هاتبوو، وەك دایکم دەگێڕایەوە خوا لێی خۆش بێت، میزی خوێنینی دەکرد، ئیدی ووردە ووردە بڕینەکەی سەخت بوو، ڕەوشی بەرەو خراپی و لەشی بەرەو لاوازی ڕۆیشت تا گیانی سپارد.

" دوای لەدایك بوونم، دایکم شووی کردەوە. ئەمەش نەریتێکە لەنەریتەکانی خەڵکی عێراق بەشێوەیەکی گشتیی، بەتایبەتیش خەڵکی گوند، کە بێوەژن شوویکاتەوە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی زەحمەتی ژیان نەبێتەوە. بەڵام دایکم لەو شووکردنەیدا سەرکەتوو نەبوو، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە حاجی ئیبراهیم حسن، رەحمەتی خوای لێبێت، زۆر توندو خراپ بوو لەگەڵیدا بەهۆی سروشتی گوندو زەحمەتی ژیان و هەژاری و دواکەوتن و شتی تریشەوە... هەتا توندوتیژیەکەی هەندێك جاریش صەدامی دەگرتەوە، ئەو کاتە تەمەنم چەند ساڵێك دەبوو، کاری ڕۆژانەم کۆکردنەوەی داربوو سەرەڕای قورسی و نارەحەتی کەشو هەوای زستان و گەرمیی هاوین. هەروەها هەڵدەستام بە یارمەتی دانی دایکم لە بەخێوکردنی مانگاکان و ئەو ووشترانەی کە هەمانبوو. من فەرمانەکانی حاجی ئیبراهیم حەسەنم جێبەجێ دەکرد بەهۆی ئەوەی خۆشیدەویستم و لەمامەڵەدا جیای نەدەکردمەوە لەکوڕەکانی تری، سەبعاویی و، بەرزان و وەتبان، هەروەها زۆر خراپ و توندبوو لەگەڵ ئەدهەمی کوڕیدا چونکە پێی وابوو زیرەکی و وورییایی تێدا نییە.

سەرەڕای ئەوەش، کاری کشتوکاڵ و ئاودێریم دەکرد، هەروەها شوانی ئاژەڵ و مەڕومالاتەکانیش بووم... بەهۆی حەزکردنم لەخوێندن و فێربوون، چووم بۆ ماڵی خاڵم خوا لێخۆشبوو خەیروڵلا تلفاح.

" ژیانێکی زۆر سەخت ژیام چی لە منالی و چی لەلاویەتیمدا. کاتێکیش حوکمم گرتە دەست، سووربووم لەسەر خزمەتکردنی گەلەکەم، بۆ ئەوەی ڕەزامەندی ئەو و خوای گەورە

بەدەست بێنم. جیاوازیم نەکردووە لەنێوان ڕۆڵەکانی گەلەکەمدا، ڕقم لەکەس نەبووە، هەتا ئەو کەسەی خراپەی دەکرد، ڕقم لێی نەدەبووەوە، بەڵکو ڕقم لەکردەوەکەی دەبووەوە. کاتێکیش وازی لەهەڵەکەی دەهێناو دەگەڕایەوە بۆ سەرێگای ڕاست پێی دڵخۆش دەبووم".

کاتێك سەرۆك بڕیاری دا لەبەغداد بچێتە دەرەوە لە ۲۰۰۳/٤/۱۱دا، داوای لەپاسەوانەکانی کرد بڕۆنەوە بۆلای خێزانەکانیان، سوپاسی هەڵوێستیانی کرد، تەنها ژمارەیەکی کەم لەپاسەوانە تایبەتیەکانی لای مانەوە کەمتمانەی پێیان هەبوو. پرسیاری لێدەکردن لەبارەی ڕەوش و بارۆدۆخی کۆمەڵایەتیانەوە، یەك بەیەك لێی دەپرسین کە ئایا ژنی هێناوە، ژمارەی منداڵەکانی چەندە، ژمارەی مێینەکانیان، ئایا جگە لەخۆی کەسێکی تر هەیە خێزانەکەی بەخێو بکات.. زۆرێك لەو پرسیارانەی کە ئاماژە بە لایەنی مرۆڤانە دەکەن تێیدا. لەوانەش صەدام کۆمەڵێك منداڵی هەتیوی بەخێو دەکرد کەلەگەڵیدا نیشتەجێ بوون. ئەو منداڵانە گەورە بوو بوون و پێیان دەووت " بابە". دوای داگیرکردنی بەغداد، سەرۆك لەگەڵ کوڕەکەی و سێ لەپاسەوانەکانیدا دادەنیشێت، کاتێك کە قوسەی سەیری یەکێك لەپاسەوانەکان دەکات ، کەپەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵیدا هەبوو، پێی ووت: فلانە کەس، تۆ لەگەڵ خێزانەکەمدا دەمێنیتەوە و پاسەوانی لێدەکەیت. ئەو لاوە ووتی: من نەبووم و نابم تەنها لەگەڵ مام و باوکی سەرۆکمدا نەبێت.

## پەیوەندی سەرۆك بە پارێزەرەکانەوە

بەخۆشییەکی زۆرەوە پێشوازی لێدەکردین و لەزیاتر لەبۆنەیەکدا دەیووتەوە: ئێوە کەسانی بەرزو بڵندن کەمتەرخەمیتان نەکردووە لەدادگاو لەدەرەوەیدا ئەوەی لەتواناتاندا بێت کردووتانە، من تەنها گوێتان لێناگرم بەڵکو ڕێزتان لێدەگرم و ڕێز لەڕاکانتان دەگرم بەڵکو ئێوە لەپێشەوەی ئەو کەسانەوەن کە ڕێزیان لێدەگرم". من پێش هاوەڵەکانم سڵاوم لێدەکرد، سەرۆك تەنانەت ئەو کاتەش لەگرتووخانەدا بوو پێداگربوو لەسەر پێشەنگی و پلە لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتی و دووپاتیدەکردەوە کە پابەندبین بە لەپێشیی بوونەوە. ئەو بە هاوەڵەکانی دەووت پێویستە لەسەریان کەئەوان کاتێك دابنیشن کە هاوڵەکەتان دادەنیشێت " ئەبو عەلا"، واتە خەلیل ئەلدلیمی، چونکە من سەرۆکی دەستەکە بووم و لەپێشتربووم لەڕووی خۆبەخشییەوە.

ساڵانی دوورو درێژی گرتووخانە بەنسبەت سەرۆکەوە کاری نەکردبووە سەر

ڕەفتارەکانی و ئەو سروشتەی کەلەسەری گەورە بوو بوو، ئەو بایەخی بەڕەفتارمان و ڕووخسارمان دەدا بەو پێیەی ئێمە لەهەموو شتێکدا لەسەر ئەو حسابین. ئەو سەیری شێوەو شێوازی دانیشتن و قسەکردن و جووڵەکانی دەکردین. ئەو حەزی لەدیسپلین بوو لەهەموو شتێکدا. هەتا کاتێك لەسەر یەك خوان و سفرە نانمان لەگەڵیدا دەخوارد، لەهەموو دانیشتنەکاندا، سەیری ئەو بڕە خواردنەی دەکرد کە پێشکەش بە هەر یەکێکمان دەکرا.

سەرۆك داوای لێدەکردین سڵاوی بەخێزانەکانمان بگەیەنین، سەرەڕای سڵاو ناردنی بۆ خزمان و کەسە نزیکەکان و ئەو گەلانەی کە پارێزەرەکان ئینتیمایان بۆی هەبوو. لەهەموو دانیشتنێکدا، داوای لەمن دەکرد سەری دایکم ماچ بکەم، هەروەها سڵاوی پێدا دەناردم بۆ منداڵەکانم و خزمەکانم و هۆزەکەم و شێخەکانی هۆزەکەم. زۆر دڵخۆش دەبوو کاتێك پاسەوانەکانی پێیان دەووت پارێزەرەکانت هاتوون. هەروەها لە بۆنەو جەژنەکاندا، هەروەها لەیادی لەدایك بوونیدا، ئەوەی وەبیردەهێنایەوە کە چۆن عێراقیەکان بەم بۆنەیەوە ئاهەنگیان دەگێراو، هەستی بەئازار دەکردو دەیووت:

" داوام لەهیچ کەسێك نەکردووە هیچ ئاهەنگێك یان مەراسیمێك تایبەت بەصەدام ڕێکبخات، ئیدی لە چەژنی لەدایك بوونمدا بێت یان ئەوەی کە بەشێوەیەکی کەسیی پەیوەندیی بەخۆمەوە هەبێت. مەسەلەکەم بۆ گەل بەجێ هێشتووە چۆنی بوێت وا هەڵسوکەوت بکات، هەتا بەنسبەت ئەو پەیکەرانەوە کە دانران، هیچ پێشنیارێکی منی تێدا نەبوو، بەشێوەیەکی کەسیش داوام لێنەکراوە، ئازادی گوزارشتکردنمان بەجێ هێشتبوو بۆ گەل و دامەزراوەکانی، بەڵام هەندێك مەسەلە بە بەشێك لەکەلتورومان دادەنرێت وەك پەیکەری سەربازی وون و یان پەیکەری شەهید یان پەیکەری هەندێك سیمبولیی مێژوویی یان هەندێك پەیکەریی فەرمیی یان ئەوەی شوانی عێراق و مێژووەکەی و شارستانیەتەکەی نیشان دەدات. ئەوا لەمانەدا ئێمە ڕۆڵمان هەبووە". هەروەها لەیادە ئاینیەکان و بۆنە نیشتمانییەکاندا، داوام لێدەکرا سەردانیان بکەم. منیش سەردانم دەکردو لەگەڵ خۆمدا دیاریم بۆ خۆشەویستان دەبرد.

ئێمەی پارێزەران، تاکە پەیوەندی ئەو بووین بەجیهانی دەرەکیەوە. دوای شەهیدکردنی هاوەڵمان پارێزەر خەمیس ئەلعوبەیدی، جێگری سەرۆکی دەستە، سەرۆك داوای لێکردم، کە زۆر کاریگەربوو بە شەهیدبوونی ئەو هاوەڵەمان، کە چیدی سەردانی نەکەم، هەروەها هاوەڵەکانی تریشم، لەترسی گیانی ئێمە. پێی ووتم: " کوڕەکەم (ئەبو عەلا)، دەترسم ئەو پیاوخراپانە زیانت پێبگەیەنن، منداڵەکانت زیاتر لەمن پێویستیان بە

چاودێریی تۆ هەیە. بەڵام من خوایەکم هەیە فەرامۆشم ناکات". هەروەها دەیووت: " ویژدانم ئازارم دەدات بەهۆی شەهیدبوونی هاوەڵەکەتانەوەو نامەوێت هیچ کەسێک لەئێوە لەپێناوی مندا ژیانی خۆی لەدەست بدات".

ئەم پیاوە مەزنە بەمشێوەیە بوو. زۆر کاریگەر دەبوو کاتێک هەست و سۆزی عەرەب و عێراقیەکانمان بۆ باس دەکرد..

## بڕیارەکانی دادگا پێشتر

پرسیارم لەسەرۆک کرد دەربارەی ئەوەی دەوترێت لەبارەی ئەو بڕیاری لەسێدارەدانانەوە کەلەسەردەمی دەوڵەتی نیشتیمانیدا دراوون و هەڵوێستی لەبارەیانەوە، ووتی:

" سزای لەسێدارەدان دەستورو یاساکانی عێراق دایبیناوە. ئەم سزایە کاری پێکراوە نەک تەنها لەعێراقدا، بەڵکو لەزۆربەی وڵاتانی جیهاندا لەناویشیاندا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەم سزایەش بۆ تاوانە گەورەکان دانراوە وەک خیانەتی گەورە، یان کاتێک تاوانکار دەگاتە ئاستیک ناکرێت چاك بکرێت ، یان تاوانی کوشتن یان ئابڕووتکاندنی ئەنجام دابێت.

" ئەوەی خیانەت لەولاتەکەی بکات، ناکرێت چیی چاوەڕوانی چاکەی لێبکرێت. ئەگەر وازیشمان لێهێنا، ئەوا خەڵکانی تریش تێوە دەگلێنێت. عێراقیەکانیش شایەتی ئەوە دەدەن کە ئێمە لەزۆرێك لەو کەسانە خۆش بووین کە شایانی ئەو سزایە بوون، هەندێکیان باش بوون و پلەی سەرکردایەتیان لەدەوڵەتدا وەرگرتووە، هەندێکی تریشیان هەڵەکەیان نەقۆزتۆتەوە، چونکە مرۆڤەکە لەوژیدانیدا مردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، لەوانەیە هەڵەگەلێکیش ڕوویان دابێت کە پێویستی نەکردبێت ئەو سزایە بەکاربهێنرێت، ئەو هەڵەیەش لەئێمەوە نەبووە بەڵکو لەلایەنی لێکۆڵینەوەوە بووە. سەرەڕای ئەوەش، ئێمە زۆر نارەحەت دەبووین کاتێك ئەو حاڵەتانە ڕوویان دەدا، ئێمە ئەوانەمان بەشەهید دادەنا، لەبەر چەند هۆیەك، لەوانەش، هەتا کارنەکاتە سەر مەعنەویاتی کوڕەکانی و خزمەکانی و هۆزەکەی. هەتا هەندێك حاڵەت کە شایانی لەسێدارەدان بووە، بەبێ بوونی هەر هەڵەیەك لەلێکۆڵینەوەدا، بەڵام ئێمە بەشەهیدمان داناون، بۆ ئەوەی کەسوکارەکەی لەیەنی مەعنەویی و مادییەوە زیانیان پێنەگات، چونکە ئێمە نامانەوێت زیان بەکەسوکارەکەی بگەیەنین. سەرەڕای ئەوەیش ئەوانە بەشەهیدمان داناون هەموویان بێتاوان نین.

" کاتێك کە ئیمزام لەسەر ئەم سزایە دەکرد، داوام لەسکرتێرەکە دەکرد بۆم نەهێنێت تەنها لەوکاتانەدا نەبێت کە لەباشترین حاڵەتەکانی دەروونیی و جەستەییدام، بەدوور لەماندوویی پیشەو کار. هەموو حاڵەتێکم بەووردی دەپشکنیی، بەڵکو زۆر جار، داوام دەکرد سەرلەنوێ لێکۆڵینەوە بکرێت. کاتێك لەبەردەم حاڵەتێکدا دەبم، پێویستە لەسەرم ئیمزای خۆمی لەسەر دابنێم وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ ئەمانەتی دەستوریی کەوا گەل خستوتەیەتە گەردنمەوەو بەپێی ئەوە سوێندم خواردووە کەوا پارێزگاریی لە بەرژوەندییەکانی گەل بکەم، زۆرجار دوو دڵ دەبووم، سەرەڕای ئەوەی من کەسی دوو دڵ و ڕاڕاییکەرم خۆش ناوێت. کاتێکیش ئیمزام لەسەر بڕیارێك دەکرد، بۆ ماوەیەك نائاسوودە دەبووم، چونکە ئێمە عێراقییەکمان لەدەستدا. ئێمە بەو شێوەیە مامەڵەمان لەگەڵ گەلەکەماندا دەکرد. ئێمە دەیان بڕیاری لێبوردنمان دەکردووە لەلێبوردنی تایبەتی و گشتیی، زیاتر لەجارێك زیندانەکانمان بەتاڵکردۆتەوەو، هەلی زیاترمان داوە. گەلی عێراق شایستەی ئەوەیە کە مرۆڤ ژیانی خۆی بکاتە قوربانیی بۆی، هەتا من لەدوای داگیرکردنی بەغداد، زۆرێك لەسەرزەنشتم بیستەوە لەبارەی خاڵەتەکانی لێبوردنەوە. پێش ئەوەش، هەندێك لەهاوەڵەکانمان لەسەرکردایەتی حەزیان بەوە نەدەکرد کە بڕیاری لێبوردن دەربکەین بۆ هەندێك لە تاوانکارەکان و ئەوانەی خاوەن ڕابردووی خراپ بوون و ئەوانی تریش".

سەرۆك ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە کە لەدوای سەرکەوتنی شۆڕش ڕوویداوە لەگەڵیدا، دەڵێت:

" لەساڵی ١٩٥٩دا، هاوپەیمانیەتێك لەنێوان حزبی شیوعی و عەبدول کەریم قاسمدا ڕوویدا. لەو ماوەیەدا چەند کوشتاروبڕۆ لەعێراق ڕوویاندا کە حزبەکەمان بەوپەڕی جوامێرییەوە بەرەنگاریی بووەوە، ڕەوانەی دادگایەکی سەربازی کرام کە سزاکە لەسێدارەدان بوو. لەساڵی کۆتایی ئامادەییدا بووم. نۆ کەس شایەتیان لەسەردام، هەموو شایەتیەکانیان درۆبوون وەك ئەوانەی کە ئێستا لەم دادگاییەدا شایەتی دەدەن. دوای ئەوە شۆڕشەکەمان سەرکەوت. دەمتوانی ئەوەی بمەوێت پێیان بکەم، بەڵام سوێند بەخوا نەمکرد. یەکێك لەئەفسەرەکان ناوی عەبدول هادی بوو خەڵکی موسڵ بوو، لەکاتی گرتنمدا دەستی بۆ درێژکردم و لێیدام.. دوای سەرکەوتنی شۆڕش، دەستگیرکرا یان بۆ ماوەی چوارمانگ بوو یان چل ڕۆژ، بیرم نایەت. ئەو گرتنەش بۆ ئەوە بوو لەئازارو ئەشکەنجەدان بپارێزرێت. لەو ماوەیەدا، خێزانەکەی سەردانیان کردم، منیش چاودێریمکردن وەك چۆن

چاودێریی و سەرپەرشتیاریی خێزانەکەم کرد. پاشان عەبدول هادیم لەگرتووخانە هێنایە دەرەوەو بەجێگری بەرێوەبەری گشتیی دامەزراند لە وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەلآیەتی. سوپاس بۆ خوا، ئێمە ڕق لەکەس هەلّناگرین و تۆلّە لەکەس ناکەینەوە.."

## خواردنی سەرۆك

سەرۆك ڕۆژانە پێش نان خواردن دوو تا چوار دانە خورمای دەخوارد، ئەویش بەهۆی ئەو سوودەوە کە خورما هەیەتی، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی هەندێك تەنگوچەلّەمە لە گەدەدا. لەسەرەتای دەستگیرکردنەکەوە، ئەمریکیەکان هێندەی کە پێویست بێت خواردنیان نەدەدا بەسەرۆك سەرەڕای خراپی جۆرەکەی. لەمبارەیەوە قسەم لەگەلّ ئەمریکیەکاندا کرد. دوای ئەمە ئیدی ژەمە خواردنێکیان بۆ سەرۆك دەهێنا پاسەوانە ئەمریکیەکانی دەیانووت ئەو خواردنە بۆ ئەفسەرەکانی سوپای ئەمریکا ئامادە دەکرێت، وێڕای ئەوەی خۆی زیاد لەجارێك ووتی" هیچ گرفتێکم نییە سەبارەت بەوەی بۆم دەهێنن یان بۆم ناهێنن لەخواردن، چ جۆرەکەو چ بڕەکەشی، من چلّێس نیم لەخواردندا، ئەو مەسەلانە من بە شتی لاوەکیان دادەنێم".

## پارێزکردنی ئەمنیی و پاکوخاوێنی

سەرۆك زۆر بایەخی بە پاکوخاوێنی جلو لەشی دەدا. ئەو لەمبارەیەوە دەیووت کە لەئەرکەکانی کەسی موسلّمان و باوەڕدارە ئەولەویەت بدات بەپاکوخاوێنی. هەکاتێك کە ڕۆژنامەی سەنی بەریتانی وێنەکەی بلآوکردەوە، کە خەریکی پاککردنەوەی جلوبەرگەکانیەتی، لەبارەی ئەو وێنەیەوە ووتی: " ئایا بەخەوشێکی دەزانن لەئێمەدا کە پابەندبین بە نەریتی ئایینی بێگەردمان و دابونەریتی عەرەبیمانەوە کە خۆمان و جلوبەرگەکانمان پاك بکەینەوە. چ خەوشی و نەنگییەکی تێدایە؟" هەروەها ووتیشی: " پاکوخاوێنی ناوەڕۆکی باوەڕمانە، ئێمە ئایینە پاکو بێگەردەکەمان ڕایسپاردووین کە پاکوخاوێن بین، بایەخدانی مرۆڤیش بە تەندروستی و پاکوخاوێنی لەڕووی خۆپارێزیەوە باشترە لەچارەسەکردن". سەرەڕای ئەوەی کە ئەمریکیەکانیش ئەوەیان بۆ تەرخانکردبوو کە خزمەتی بکات، بەلآم ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی بۆ خۆی خزمەتی خۆی بکات، جلەکانی خۆی دەشۆرد و دەیخستە شوێنێکەوە بۆ ئەوەی ووشك بێتەوە: سەرۆك دەیووت: " وەك ئاشکرایە، من ناتوانم پێداگریی بکەم کە سەربازە ئەمریکیەکان ئەوانەی

کە پاسەوانیم دەکەن هیچ جۆرە نەخۆشیەکی پەتایی و گوازراوەیان نییە کەبەهۆی جلوبەرگەوە دەگوێزرێنەوە، من پەرژینم بۆ ئەوە کردووە، چونکە ئەو پاسەوانانە لاوان و لەکۆمەڵگەیەکن جیاوازە لەکۆمەڵگەی ئێمە، ئەوان دابونەریتێکیان هەیە جیاوازە لەهی ئێمە. لەبەرئەوە ئەوان نزیکترن لەتووشبوونیان بە نەخۆشی و گواستنەوەی نەخۆشی ترسناک. من ڕێگریم دەکرد لەوەی جلوبەرگەکانیان لەنزیك ئەوانەی منەوە هەڵواسن. لەبەرئەوە پێموایە پاکوخاوێنی هەرکەسێك بۆ تۆمار دەکرێت نەك لەسەری".

بەڵام سەرۆك، پێش دانیشتنەکانی دادگاییە گاڵتەجاڕییەکە، ناچار بوو کە چاکەتەکەی بنێرێت کەلەکاتی دادگاییدا لەبەریدەکرد، بۆ بەشی شۆردن و ئوتوکردنی سەر بە سوپای ئەمریکا.

لەناویشیاندا یەکێك لەبراکانی، هەندێك لەخزمەکانی جلوبەرگیان بۆ خێزانەکەی و دەنارد. بەڵام بەپێی ئەو ڕێنومایانەی کە بۆمان دانرابوون، لەڕووی سەلامەتی ئاسایشی سەرۆکەوە، من دیاریی و جلوبەرگم دەبرد بۆ سەرۆك کەلەلایەن هاوڕێیان و خزمەکانیەوە نێردرابوون. بەڵام لەبەری نەدەکردن، دواتر بۆی دەگێڕاینەوە. من ناوی خاوەنی دیارییەکانم پێ دەووت، سوپاسی دەکردم و داوای لێدەکردم بەردەوام خۆپارێزییم هەبێت، ئاگادارکردنەوەی لەو جلوبەرگانەی کەلەلایەن خێزانەکەیەوە دەنێرران و ئەوانەی لەلایەن غەیری خێزانەکەیەوە بۆی دەنێردرا. دەیووت: سوپاس بۆ خوا کوڕەکەم خەلیل کە تۆ بەتەنگمەوە دێیت وەك چۆن من بەتەنگ خۆمەوە دێم.

هەروەها هەندێك لەو جلوبەرگانەی کە لەلایەن خێزانەکەیەوە بۆی دەنێردرا لای خۆی گلی دەدایەوەو لەبەری نەدەکرد، پاشان جارێکی تر دابەشی دەکردەوە. هەروەها هەندێك لەجلوبەرگەکانی دەنارد بۆ هاوەڵە گیراوەکانی و هەندێك لەو دیاریانەش کەلەڕێگەی ئەمریکیەکانەوە بۆی دەنێردرا. سەرەڕای ئەوەی هەندێك لەو دیارییانەی دەدایە هاوەڵە پارێزەرەکان وەك جگەرو شتانی تر. هەروەها هەندێك دیاریشی دا بە من وەك جلوبەرگ و کاتژمێری دەستی و جانتای جلوبەرگ و هەروەها تەزبێح و چەند شتێکی تر.

بەڵام بەنسبەت هەندێك خواردەمەنی تر وەك شیرینی و شتانی تر کە بۆی دەنێردرا لەلایەن خزمە نزیكو خۆشەویستانیەوە، پێمرادەگەیاند بەڵام نەمدەدایە.

لەبەرامبەردا، ئەمریکیەکان لەگرتووخانە هەمیشە پێداگریان دەکرد لەو شتانەی کە بۆ سەرۆکم دەبردو پرسیاریان لەبارەی سەرچاوەی ئەو کەسەوە دەکرد کە شتەکانی ناردبوو بۆی، ئەوان متمانەیان بە دڵسۆزیی و بەتەنگەوە هاتنم بۆی هەبوو.

ڕۆژێکیان، خێزانەکەی و بەدیاریکراویش ڕەغدی کچی، چەپکێك گوڵی سروشتی بۆ ناردبوو بەبۆنەی یادی لەدایك بوونیەوە لە ٢٠٠٦/٤/٢٨. کاتێك چووم بۆ لای سڵاوم لێکرد بەو شێوەیەی کە ئەمریکیەکانی سەرسام دەکرد، سەرۆك پێداگیریی دەکرد لەسەر ئەوەو سوپاسی دەکردم لەسەری. ئەمریکیەکان ڕێگیریان کرد لەوەی کە چەپکە گوڵەکە لەگەڵ خۆم بەرم، بەڵام پێمووتن کەلەلاین کچەکەیەوە بۆی نێردراوە. پرسیاریان لەبارەی سەرچاوەی گوڵەکەوە کرد، گومانیان کرد لەوەی سەرچاوەکە پاك نەبێت. بەزەحمەت قەناعەتم پێکردن، خۆم بۆنی گوڵەکەم کردو، بۆ ئەوەی نیازپاکیی دەربخەم جەختمکردەوە کە ئامادەم هەر بەشێکی بخۆم. دوای ئەمە، ڕێگەیان پێدام بیبەم بۆ سەرۆك، بەڵام هەندێك هیلم پێنەبوو کە ڕەنای کچی بۆی ناردبوو نەیانهێشت بیبەم بۆی، ووتیان: ئێمە خەمی ئەومانە، نامانەوێت ئەوە ڕووبدات کەبەسەر میلۆسۆڤیجی سەرۆکی یوگسلافیادا هات.

ئەمریکیەکان نەیاندەهێشت هیچ کەسێکی تر ئەو جۆرە شتانە بەرێت بۆ سەرۆك تەنها لەڕێگەی منەوە نەبێت بۆ ئەوەی لەسەرچاوەکەی دڵنیاییان بکەمەوە، واتە لەخێزانەکەیەوە. لەچەند هەفتەی پێش لەسێدارەدنی سەرۆك، یەکێك لە هاوەڵە پارێزەرەکان نوێنەرایەتی منی دەکرد دوای ئەوەی کە نووسراوێکی فەرمییم لەڕێگەی پۆستە ئەلەکترۆنیەکەمەوە بۆ ڕەوانە کردو لەسەر ڕێکەوتنێك لەگەڵیاندا. هەتا لەبابەتی سەردانەکاندا، وا ڕێکەوت کە یەکێك لەهاوەڵەکان سەردانی باوکی دەکرد کە لەسەربازگەی کرۆبەر دەستگیر کرابوو، ئێمە هەندێك جار سەرپشکمان دەکرد سەردانی سەرۆك بکات، ئەمەش تەنها دوای شەهیدکردنی هاوڵەکەمان خەمیس ئەلعوبێدی ڕوویدا، لایەنی ئەمریکی نەیاندەهێشت سەردانی سەرۆك بکرێت تەنها کاتێك نەبوایە کە ڕەزامەندی شەخسی خۆمم بۆ بناردنایە، هۆکارەکەیم بە پۆستی ئەلەکترۆنی بۆ ڕوونبکردنایەتەوە، کاتێکم بۆ سەردانکردنی هاوەڵەکەمان دادەنا بۆ ئەوەی هەستن بەگەیاندنی بۆ ئەو شوێنەی کەتەرخان کرابوو بۆ چاوپێکەوتن.

## سەرۆك لەناو هۆڵی دادگادا

سەرەڕای ئەو مامەڵە خراپەی کە صەدام حسێن لەناو دادگادا تووشی هات، بەڵام ئەو بەشێوەیەکی ئاسایی مامەڵەی دەکرد لەگەڵ هەمووان‌دا. کاتێك دەچووە ناو هۆڵی دادگاوە، بەزەردەخەنەیەکی لەسەرخۆو هێمنانەوە سڵاوی لەهەمووان دەکرد. کەسایەتی ئەو بەشێوەیەکی گەورە هاوسەنگ بوو لەهەمانکاتیشدا جێگەی مشتومڕ بوو. کاتێك کە

چەند مەترێکی دەبڕی لە دەرگاکەوە هەتا شوێنی دانیشتن لەناو قەفەسە ئەفرەتیەکەدا، ئەمریکیەکان وازیان لێی دەهێناو خۆیان لەپشتی دەرگاکەوە دەمانەوە. ئەو بەهەژموون و بلندییەکەیەوە ئامادەگییەکی بەهێزی هەبوو. ئەندامانی حکومەتی داگیرکەر لەسەرەوەی هۆڵی دادگاکەوە لە بەرزی چوار مەترەوە، بەرق و کینەوە لێیان دەڕوانی، دڵیان غەشم و قین پڕیکردبوو چونکە ئەو یاخیی بوو لەوەی جگە بۆ خوا نەبێت سەری نەوی نەکات و نەچەمێتەوە. ئەحمەد چەلەبی چاوی بڕی بووە دەموچاوی سەرۆك و دەستەکانیشی لەسەر ڕووخساری دانابوو، بە خەندەیەکی زەردەوە لێی دەڕوانی. موەفەق روبەیعی پێدەکەنی کاتێك کە ئەمریکی و جۆرجیەکان بەدەست و بە ئامێر دەیان پشکنیی، هەروەها هەموو سەرانی حکومەتی داگیرکەر ئەوانەی کە ڕام دەبوون بۆ پشکنین، تەنها گیراوەکان نەبێت کە نەدەپشکنران.

سەرۆك صەدام حسێن سەری دادوەرەکانی دەکردو بەوپەڕی مرۆییانەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، بەهەمان شێوەش لەگەڵ داواکاری گشتیشیدا. هەندێك لەپارێزەرەکان وەك مافێکی شەخسی لەکاتی پشوودا سلاویان لێدەکرد، بەلام دواتر دەستیان دەکردەوە بەبریندارکردنی هەستیی. ئەو زۆر ئازاری دەچەشت کاتێك دەیبینی دادوەرەکان ئازاریان پێدەگەیاندو هەلی ئەوەیان پێنەدەدا قسە بکات.

## مومارەسەکردنی دروشمە ئیسلامیەکان

سەرۆك لەسەرەتای گرتنیەوە قورئانی پیرۆزی لانەبوو. پاشان ئەو قورئانەی دەست کەوت کە چیرۆکە ناسراوەکەی هەیە. منیش دانەیەکم بۆ برد هەروەها خێزانەکەشی. ئەو کتێبی ئایینی و دۆعای زۆری لابوو کە زۆر دەیخوێندنەوە، هەتا ڕۆژێك پێی ووتم: سوپاسی خوا دەکەم کەوا کاتی پێبەخشیم بۆ ئەوەی یەکلایی ببمەوە بۆ ئایینەکەم.. لەماوەی مانگێکدا چەند جارێك خەتمی قورئانی دەکرد، سەرەڕای نووسینی هۆنراوە. سەرۆك سوور بوو لەسەر خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە لەسەر داوای خۆی بۆمان دەهێنا زۆربەشیان لەلایەن خۆشەویستانیەوە بەدیاری بۆی دەهات، ئەو ئەوانەیانی لا باشتر بوو کە پەیوەندی هەبوایە بە کلتورو نەریتی میللی و هۆنراوەو فقە و نەحوەوە، سەرەڕای ڕۆژنامەو وتارو بەیاننامەکان کە دواتر ڕێگەیان پێداین بیانبەینە ژوورەوە.

ئەو زۆر ویردی دەخوێندو دەپاڕایەوەو داوای لێخۆشبوونی لەخوا دەکرد، هەندێك لەڕۆژەکانی هەفتە بەڕۆژو دەبوو ئەویش بۆ نزیکبوونەوە لەخوا، زۆر سوپاسگوزاریی خوای

دەکرد، هەمیشە لەکاتی چاوپێکەوتنەکانماندا لەگەڵی یان دیدارم لەگەڵیدا، ئەم دەستەواژەیەی دووبارە دەکردەوە" سوپاس بۆ خوا، ئەمەی بەسەرمان هاتووە ئیرادەی ئەوی لەسەرە، خوا لەگوناهەکانمان خۆش بێت و چاکەکانیشمان زیاد بکات"، هەمیشە ڕایدەسپاردین کاری چاکە بکەین و لێبوردن بنوێنین لەکاتی هەر ڕووداوێکدا کە ڕوودەدات، کینە بەکار نەهێنین وەك پەرچەکردارێك لەدژی ئەوانەی خراپەمان لەگەڵدا دەکەن.

بەڵام لەمانگی ڕەمەزاندا، ئەوا لەمومارەسەکردنی دروشمە ئیسلامیەکاندا قوڵ دەبۆوە، لەپێش ڕەمەزان و لەپاش ڕەمەزانیشەوە بەڕۆژو دەبوو، هەروەها لەڕۆژەکانی ساڵیشدا ڕۆژوی دەگرت. بەخورمای بەرەکەت بەربانگی دەکردەوەو هەمیشە ڕایدەسپاردین بۆی بهێنین. خێزانەکەشی بڕی زیاتر لەم جۆرە خورما پێچراوانەیان بۆ دەنارد کە لەجۆرەکانی تری خورما بەلایەوە باشتر بوو.

ڕۆژێك لەڕۆژان، قسەوباس لەگەڵ سەرۆك دەربارەی هەندێك مەسەلەی ئایینی بوو، وتی پێم: " ئێمە هیچ ڕۆژێك لەڕۆژان هەڵوێستی بێ لایەنانەمان نەبوو لەنێوان ئاین و بێباوەڕیدا، هەتا لەئایدۆلۆژییەتی حزبیماندا، ئێمە لەگەڵ ئاینین و دژی بێباوەڕین. لەهەمانکاتیشدا ڕێز لەمافەکانی خەڵکانی تر دەگرین". هەروەها سەرۆك دەڵێت : " هەر بینایەك کە بوونیادمانناوە یان مزگەوتێك کە دروستمان کردووە یان مەزارگەیەك کە نوێمان کردۆتەوە، ئەرکێك بووە لەسەرشانمان، تەنها لەبەر خواو لەپێناو ڕەزامەندی ئەودا دروستمان کردووە".

## سەرۆك و مەرجەعیەتە ئاینییەکان

دوای دیداری یەکەمم لەگەڵ سەرۆك صەدام حسێن لەساڵی ۲۰۰٤دا، کەسێکی گرنگ هات بۆماڵەکەم لەئەنبار کەیەکێك لەشێخەکانی هۆزە ناسراوەکان لەگەڵیدابوو. خۆیی پێناساندم کە پەیوەندی هەیە بەموقتەدا سەدرەوەو دەیەوێت لەڕێگەی منەوە پرسیارێك لەسەرۆك بکات لەبارەی کوژرانی باوکی موقتەداوە، ئەمەش بەئەمانەتەوە دەگوازێتەوە بۆ موقتەدا، بەوەش پێداگریی کرد لەسەر داواکەی تا ناکۆکی و ئاشوبێك خەفەبکات کە لەڕێی ڕوودانیدایە.

دواتر ئەوەم بۆ سەرۆك باسکرد کاتێك کە لەبارەی سوپای مەهدییەوە قسەوباس دەکرا لەگەڵیدا، وەڵامی دامەوە: " هەموو ئەو زانیاریانەی کە لامە لەبارەی باوکی موقتەداوە ئەوەیە کە ئەو هەوڵی دەدا عێراقیەکان کۆبکاتەوەو پێشنوێژیان بۆ بکات

لەنوێژی هەینیدا (واتە نوێژی ملیۆنی) لەڕێگەی ئەو زانیاریانەی کەلای دەزگا ئەمنیەکان هەبوون، دەرکەوت بۆمان کە ئێران ئەم فێڵ و تەڵەکەیەی دارشتووە بۆ ئەوەی وەک نەریتی خۆی بیخاتە سەر دەوڵەتی عێراقی و درزبخاتە ڕیزەکانەوەو ئاشوب هەڵبگیرسێنێت. ئەمەش بەرنامەی فارسەکانە کە ناسیومانە لەخستنەوەی ئاشوب و فیتنە لەنێوان موسڵمانان و یەک گەلدا". هەروەها دەڵێت: " ئاگام لەڕووداوەکە نەبوو، کاتێکیش پرسیارم لەبەرپرسەکان و دەزگا ئەمنیەکان کرد، پێیان ڕاگەیاندم چ لەدوور و چ لەنزیك ئاگایان لەم بابەتە نییە.. ئیدی دڵنیا بووین لەوەی کە ئێران پلانی بۆ ئەو ڕووداوە دارشتووە لەسەر زەوی وڵاتەکەمان بۆ ئەوەی ئێمە تاوانبار بکات، پاشانیش ئاشوبێکی خراپ هەڵدەگیرسێت، لەکاتی خۆیدا سەرەخۆشیمان لە موقتەدا کردو پرسەنامەمان بۆ نارد و ئەویش سوپاسنامەیەکی بۆ ناردین".

هەروەها پرسیارم لەسەرۆك کرد لەبارەی محمد باقر ئەلحەکیمەوە (دوای داگیرکردنی عێراق لە ڕووداوێکی تەقینەوەدا لەکەربەلا کوژرا)، ووتی: " کاتێك ڕووداوەکە ڕوویدا، من لەدەرەوەی بەرپرسیارێتیەوە بووم، ئەوەشم لەنامەیەکدا بۆ گەلەکەمان ڕوونکردەوە کە نووسیم و دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش بڵاویان کردەوە. مەسەلەکە ڕوون بوو پێویستی بە کۆششێکی گەورە نییە بۆ گەیشتن بەهەقیقەت و ڕاستی چۆنیەتی ڕووداوەکە. ئێران و هەندێك لە بەکرێگیراوەکانیەتی لەناوخۆدا، ئەو ڕووداوەشیان دروست کرد لەبەر چەند مەسەلەیەك کەپەیوەندی بەحەوزەو مەرجەعیەتەوە هەیە. سەرۆك هەر لەوبارەیەوە ووتی: " ئێمە ڕێزمان لەپیاوانی ئایینی دەگرت لەهەموو چین و ڕەنگە جیاوازەکانی گەلەکەمان، ئیدی موسڵمان بێت یان مەسیحیی یان سابئی و هەموو تایفەکانی تریش، هیچ جیاوازییەکەمان لەنێوان ئەم و ئەودا نەدەکرد تەنها لەسەر بنچینەی هاوڵاتیی بوون و دڵسۆزیی نەبێت بۆ عێراق".

## هەڵوێستە ناخۆشەکان

سەرۆك صەدام حسێن بەهەڵوێست و بە کاتی نارەحەت و گرژبووندا تێپەڕی لەکاتی دانیشتنەکانی لێکۆڵینەوەدا لەوانەش شەڕە قسە لەنێوان ئەو و دادوەر قازی ڕائد ئەلجوحی لەدانیشتنەکانی لێکۆڵینەوە لە ساڵی ٢٠٠٥داو ئەوەی پێی دەوترێت کێشەی دوجەیل و کێشەی ئەنفال. ئەم دادوەرە بە بەردەوامی چاوی دەبڕییە چاوی سەرۆك بێ ئەوەی پێڵوی چاوی لێ بتروکێنێت، سەرۆکیش بەهەمان ئەو ڕوانینەو پێداگرییەکی زیاترەوە سەیری

دەکردەوە. من جارناجارێك ڕەخنەم لەم دادوەرە دەگرت.

لەیەکێك لەدانیشتنەکانی لێکۆڵینەوە لەکێشەی دوجەیل ساڵی ٢٠٠٥، چاوم بەسەرۆك کەوت دیاربوو ماندوو بوو، وا دیاربوو وەك پێویست نەخەوتبوو. لەساتێکدا بۆم دەرکەوت شێوەی جیاواز بوو لەسەر ئەوەی کەپێشتر بینیبووم، هەتا گومانی ئەوەم لادروست بوو کە ئەمە سەرۆك صەدام حسێن نییە. کاتێکیش هاتە ناو هۆڵی لێکۆڵینەوەوە، دادوەر ئەلجوحی بەجۆرێك لەپشکنین و سەیریەتیەوە بۆی ڕوانی، دوای ئەوە دەمەقاڵەو شەڕە قسە لەنێوان ئەو و دادوەردا ڕوویدا.

هەروەها لەهەڵوێستە نارەحەت و ناخۆشەکان، ئەو هەڵوێستانەیە کە لەدانیشتنی لێکۆڵینەوە لەکێشەی بازرگانەکاندا ڕوویاندا. دادوەر ئەوکاتە سەرۆکی دەستەی لێکۆڵینەوە عەلی روبەیعیی بوو، دادوەر عەبدول حسێن حەتتاب یاریدەدەری بوو. پێش ئەوەی لێکۆڵینەوەکە دەست پێبکات، دادوەر حەتتاب ئیستیفزازی سەرۆکی کرد، ئیدی دەمەقەڵەو شەڕە قسە لەنێوانیاندا دروست بوو کە ووشەی ناشیرین هات بەدەمیدا، ئیدی سەرۆك و من، دوو هێندەی خۆی ووشەکانمان بۆ ڕەوانە کردەوە. بەڵام دادوەر عەلی روبەییعی رازی نەبوو لەهەڵسوکەوتەکانی هاوەڵەکەی.

لەو کاتەدا، کەسێك ناوی تەحسین بوو، کە لێکۆڵەوەری دادی بوو، لەو شوێنەوە کە تەرخان کرابوو بۆ پیاوەکانی هەواڵگریی ئەمریکی هەستایەوە، بەخێرایی بەرەو لای سەرۆك چوو کە وویستی بچێت کەمێك پشوو وەربگرێت ئەویش دوای ئەوەی لەلایەن منەوە ڕەتمکردەوە کە لێکۆڵینەوەکە بەردەوام بێت. ئەم پیاوە هەستا بەگرتنی مەچەکی سەرۆك بۆ ئەوەی لێیبدات. منیش خێرا ڕاپەڕیم و سەرۆکم خستە پشتی خۆمەوە بۆ ئەوەی بیپارێزم، ئەو کەسەم گرت، پێش ئەوەی تێیسرەوێنم مایك ماکوی کاپتنی ئەمریکی هاتە ناوەوە. داوام لەدادوەرەکان و ئەمریکیەکان کرد بەمەرجێك سەرۆك دەگەڕێتەوە بۆ هۆڵی دادگا کە ئەو لێکۆڵەرەوەیە بکرێتە دەرەوە، بەڵام ئەوان داوایان لێکردم کە ڕازی بم لەسەر ئەوەی ئەو کەسە دووربخرێتەوەو ببرێت بۆ کورسیەکانی دواوەی هۆڵەکەوەو لەپشتی دانیشتوەکانەوە بێت. داوام لەسەرۆك کرد لێکۆڵینەوەکە ڕەتبکاتەوەو وەڵامی هیچ پرسیارێك نەداتەوە، ئەمەش وای لەدادوەر کرد کە داوام لێبکات داوایەك پێشکەش بکەم بۆ ئەوەی دانیشتنەکە دوابخرێت.

هەروەها لەو هەڵوێستە ناخۆشانەی تر، لەیەکێك لەدانیشتەکانی دادگاییدا بوو، سەرەی سەرۆك بوو قسە بکات، ئەو شتێکی دەخوێندەوە کە جۆری بابەتەکە لەڕووی

ئەوەی قسەو هۆنراوە بوو هەروەها لەچەند لاپەڕەیەك پێکهاتبوو دادوەر ڕەئووف تووڕە کرد، بۆیە دادوەر چەند جارێك پێیبڕی و ئیستیفزازی کرد. سەرۆك سوور بوو لەسەرئەوەی کە مافی خۆیەتی قسە بکات بێ ئەوەی کەس پێیبڕێت. ئیدی سەرۆك ڕێگەی پێدایەوە قسە بکات و هێندەی نەدەبرد پێی بڕییەوەو زیاتر ئیستیفزازی دەکرد، ئیدی سەیرێکی دادوەری کرد، سەرۆك بەدەستی ڕاستی کۆمەڵێك کاغەزی گرتبوو، هەستا بەگوشینی کاغەزەکان بەتوندی، چاوەکانی پڕبوون لەتووڕەیی و ڕق، وەك ئەوەی زمانی حاڵی بڵێت: ئەگەر ئێستا ئازاد دەبووم.. بەڵام ئەم حاڵەتە وێنە نەگیرا. دوای ئەمە دادوەر ڕایگەیاند کە دانیشتنەکە نهێنی دەبێت کاتێك کە کاغەزێکی لەژووری ژەنەراڵەکان و سی ئای ئەی و حکومەتی داگیرکەرەوە پێگەیشت.

سەرۆك زۆر ئازاری دەچەشت کاتێك یەکێك لەهاوەڵە دەستگیرکراوەکانی (لەدۆسیێی دوجەیل)دا لەبەردەم دادوەردا دەوەستان و بەدادوەریان دەووت کەئەوان فەرمانیان پێگەیشتووەو جێبەجێیان کردووە. سەرۆك بەسەرکۆنەکردنێکی توندەوە سەیری دەکرد. لەدۆسیێی ئەنفالیشدا ئەم هەڵوێستە دووبارە بووەوە. کاتێکیش کە سەردانم دەکرد، ئەوەی لەدانیشتنەکانی دادگاییدا ڕوویدەدا دەیگێڕایەوەو دەیووت: " نازانم دەبێت کەسێك کەلەئاستی بەرپرسیارێتیدا بووبێت لەحکومەتی عێراقیدا وابڵێت". پاشان دەیووت: " هەندێك کەس دەسەڵات و پیسییەکانی قورس و گرانی کردوون پیاو بەپیاوەتی دەمێنێتەوە لەسەر ئەو بنچینەیەش پیاوانە هەڵسوکەوت دەکات". هەروەها دەیووت: " هەڵوێستی هەندێك لەهاوەڵەکانی لاواز بوو، ئەوان دەبوو بچوونایەتە دەرەوە کاتێك هەڵسوکەوتی ئەو گەمژە (دادوەر)یان بینی لەگەڵ مندا. هەڵوێستی گیراوەکان لەدۆسیێی دوجەیلدا زۆر بەهێزترە لەوانەی کەلەم دۆسێیەدان". پاشان ئەم ووشەیە دووبارە بووەوە دەربارەی وەرگرتنی فەرمانەکان، سەرۆك لەیەکێك لەدانیشتنەکاندا بێزار بوو لەمەو هەستاو بەدادوەری ووت: " من صەدام حسێنم، قورسایی، یان بەرپرسیارێتی هەر عێراقییەك دەخەمە سەرشانی خۆم کەناتوانێت خۆی هەڵیبگرێت". ئەم قسەیەی بەو پەڕی ئازارەوە دەووت.

لەدانیشتنێکدا کەپێی دەوترێت نووسین یان تۆمارکردن، ئەو کورسیەی کە سەرۆك لەسەری دادەنیشت بەشێوەیەکی پێچەوانە دایان نابوو پێچەوانەی شەرع و عورف. سەرۆك ناڕەزایی دەربڕی و پێی وتن: " دەتانەوێت وا دابنیشم کە مەجوسەکان دادەنیشن؟" بۆیە هەستا بەڕاستکردنەوەی کورسیەکەی و دانانەوەی بەشێوە ئاساییەکەی خۆی.

لەو مەسەلانەی کەسەرۆکیان بێزار دەکرد، چیرۆکی گرتنەکەی بوو، هەروەها ئەو ناپاکییەی کە ڕوویدا. بەڵێنی تۆڵەو هەقکردنەوەی دەدا بەو کەسەی کە هەستاوە بەو ناپاکییە لەگەڵیدا، هەتا پێی وتم: من ئەو کەسە ناناسم کە هەواڵی کوڕەکانمی داوە بەئەمریکیەکان، ئەگەر لەو کردەوەیەی خۆشبم لەبەردەم خواو لەبەردەم گەلی عێراقدا و ئەوە بگێڕمەوە بۆ ساویلکەیی، ئەوا نەرمی نانوێنم لەگەڵ ئەو کەسەی کە بەبێ هیچ کەمتەرخەمیەك لەلایەن منەوەو بەبێ هیچ هۆکارێك ناپاکیی لەگەڵ کردم. پاشان چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە کەلەگەڵیدا ڕوویدا پێش کۆتایی مانگی حوزەیران/یۆنیۆ ٢٠٠٣ و ووتی:

" بەناو ڕۆڵەکانی گەلەکەمدا دەسوڕامەوە کاتێك بڕیارمدا بڕۆم بۆ یەکێك لەگوندەکانی موسڵ لای شێخك لەشێخە دڵسۆزو بەوەفاکانی دابەزیم ( لەبەر ڕەوشی ئەمنی ئەو شێخە لێرەدا ناوی ناهێنین). کاتەکەی ئێوارە بوو شێخ بەکارێکەوە سەرقاڵ بوو لەنزیك ماڵەکەیەوە. داوام لەیەکێك لەپاسەوانەکانم کرد کەلەگەڵم مابوونەوە کە ئۆتۆمبیلی تاکسیەکە زیاتر نزیك بخاتەوە لەماڵەکە. ئەو ڕۆژە جلوبەرگێکم لەبەرکردبوو کە نەناسرێمەوەو ڕیشیشم زۆر نەهاتبوو، کاتەکە دوو مانگ پێش داگیرکردنی بەغداد بوو. خاوەنی ماڵەکە شڵەژاو بوو ووتی: من لە زووەوە چاوەڕوانی ئەم سەردانەم، بەڵام ئێستا خەمی تۆمە. داوام لێکرد کە هێوربێتەوە، پێمووت کە من خواردنێکی دیاریکراوم دەوێت ئەویش دۆشاوی تەنها خورماو ئاردو نانە. ئەو کاتە خۆم ڕاهێنا بوو لەسەر هەر بڕێکی کەم لەخواردن کە دەستم دەکەوت. بەڵام شێخەکە داواکەی ڕەتکردمەوەو داوای لەکوڕە گەورەکەی کرد کە مەڕێك سەربڕێت بۆ ئەوەی نانی ئێوارەم بۆ ئامادە بکات. لەکاتی چوونە ژوورەوەم بۆ ناو ماڵەکە کەسێك بینیمی سەرەڕای ئەوەی هەوڵمدا خۆم پەنهان بکەم بەڵام ناسیمیەوە. ئەویش کەسێکی تری تێگەیاندبوو کەدیاربوو بەکرێگیراوی ئەمریکیەکان بوو. پاش کەمێك گوێمان لەدەنگی هەلیکۆپتەرو جوڵەیەکی نائاسایی بوو لەناوچەکەدا. شێخەکە چووە دەرەوە بۆ ئەوەی بزانێت چییە. هەلیکۆپتەرو هێزەکانی ئەمریکا ناوچەکەیان گرتبوو، شێخەکە منی برد بۆ ئۆتۆمبیلەکەی خۆی دوای ئەوەی من داوام لەپاسەوانەکانم کرد بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان. شێخەکە هێشتا شڵەژابوو، پێم وت ئەوە کارێکی ئاساییە بەنیسبەت منەوە، سەرەڕای ئەوەی من چەکی خۆمم پێیە، دوو دەمانچەو کلاشینکۆفێك. پاشان شێخەکە پێی ڕاگەیاندم کە ئەمریکیەکان لەدووڕاینەکاندا هێزەکانیان دابەزاندووە، بۆیە پێویستە لەڕێگەیەکەوە بڕۆین کە دووربێت لەدەستی ئەوان.

دوای ئەوە چەند میلێکمان لەبیابان و دۆڵ و شیوەکاندا بڕی ، بێ ئەوەی گڵۆپی ئۆتۆمبیلەکە دابگرسێنین، تا گەیشتینە ئەو شوێنەی کە من دەمەوێت لەوێ سواری ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگری بچووک بووم تویتا پیکاب، داوام لەشێخەکە کرد بگەڕێتەوە، سوپاسمکرد، ئەو بەجێی نەهێشتم تا ئۆتۆمبیلەکە دەستی بەجوڵان کرد، زۆر دڵتەنگ بووم لەو پیاوەی کە هەواڵی لێدابین. دوای زیاتر لەمانگێك، نامەیەکی دەست نووسم بۆ ئەو شێخە بەرزو بەڕێزە نووسی، داوام لێکرد بڕوات بۆ لای یەکێك لە خزمەکانم کە هەندێك پارەم بە ئەمانەت لا دانابوو بۆ ئەوەی بیداتە پیاوە ئازاکانمان کەلەبەرەی بەرەنگاریدا دەجەنگن، کاتێك نوێنەرەکەم چوو بوو بۆ ماڵی خزمەکەم و داوای پارەکەی کردبوو، تورە بوو بوو نامەکەی دڕی بوو نکوڵی لەئەمانەتەکەش کردبوو وتبووی دە ساڵە کە منی نەبینیوە. بەوەش نەوەستابوو، بەڵکو هەستابوو بەناردنی کوڕەکەی بۆ ئەوەی لەبارەی میوانەکەیەوە هەواڵ بداتە ئەمریکییەکان. ئەم مەسەلانەش لەکۆمەڵگەی ئێمەدا لەسەریان ڕانەهاتووین کە عێراقی خیانەت لەمیوانەکەی بکات. بەڵام میوانەکە بەئاگا ببوو، بۆیە توانی بوو بەخێرایی خۆی دەربکاتو بچێتە لای یەکێك لەئەندامانی هۆزەکەی ئەویش سەرزەنشتی کردبوو لەسەر ئەوەی چووە بۆ لای ئەو پیاوە".

هەروەها لەهەڵوێستە نارەحەتەکان ئەوە بوو لەیەکێك لەدانیشتنی دادگاییە گاڵتە جاڕەکەدا، کاتێك کە دادوەر ڕەئووف فەرمانی کرد کەبەرزان لەهۆڵەکە بکرێتە دەرەوە، پاسەوانەکانی ناو هۆڵەکە لەبەردەم صەدامدا لەبەرزانیاندا، سەرۆکیش بەوە زۆر تورەو نارەحەت بوو.

قورسترین هەڵوێست لەکاتی چاوپێکەوتنمان لەگەڵ سەرۆك لە ١١/٤/دا بوو، واتە ڕۆژێك پێش ئەوەی حوکمەکەی دەربچێت. وا سەیری یەکترمان دەکرد وەك ئەوەی خواحافیزی لەیەکتری بکەین، لەو شەوەدا لەهۆڵی دادگایی زۆر کەشەکە بارکراو قورس بوو. چاوەڕوانی ئەوەمان دەکردو دەانووت دەبێت قەدەر بۆ سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی چی حەشاردابێت. سەرۆك لەسەر کورسیەك دانیشتبوو دوو قاچی هەبوو، نەك چوار قاچ وەك کورسی ئاسایی، بەڵکو بنکەکەی بۆ پێشەوە بوو لەوکاتەدا قسەوباسمان لەگەڵدا دەکرد. سەرۆك جارێك پشتی دەبرد بۆ دواوەو پاڵی دەدایەوەو جارێکیش دەهات بۆ پێشەوە، لەناکاو کورسیەکە شکا، سەرۆك کەوت بەپشتدا. خێرا ڕۆیشتم و هەڵمگرتەوە، ئەفسەرە ئەمریکیەکە یارمەتیدام و کورسیەکی تریان بۆ هێنا ئەو هەڵوێستە وەك ئاماژەدانێکی شووم وابوو لام پاشان ئەفسەرەکە پێی ڕاگەیاندین کەوا کاتی دیدارەکە کۆتایی پێهات هاوەڵەکانم

چوونە دەرەوەی هۆڵەکەوە. لەسەرۆکم پرسی ئایا دەیەوێت بەتەنها بمبینێت وەك جارانی پێشوو. بەنیگایەك سەیری کردم کەپێشتر و لەماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا لەچاویدا ئەو نیگایەم نەبینی بوو. نیگای خواحافیزیم خوێندەوە، بەو پەڕی هەستی خۆمەوە درکم پێکرد بەهۆی ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی کە ڕۆژانی سەخت لەنێوان من و ئەودا گرێیدابوو لەو ساتەدا هیوام خواست کە داوام لێنەکات دابنیشم یان بەیەکەوە بەتەنها بین، وەك ئەوەی ئەویش ئەوەی خوێندبێتەوە کەبەخەیاڵمدا دەهات بەنیگا تیژو پەیپێبەریەکانی. بەڕوانینێك بۆ یەکتری ماڵئاوایمان لەیەك کرد، وەك ئەوەی جارێکی تر یەك نەبینینەوە. خۆم گرت، ئازارەکەمم هەڵگرت، هەر ئەوەندەی کە چووە پشتی دەرگاکەوە، ئیدی گریانم بەتوندی تەقیەوەو دەنگم لێ بەرزبووەوە بەشێوەیەك کە پێشتر وام نەکردبوو، ئەمریکیەکان هاتن بۆ لام و دڵیاندامەوە، هاوارم لەهاوەڵەکانم کرد، نەمدەویست ئەمریکیەکان ئەوەم لەگەڵ بکەن و دڵمبدەنەوە چونکە ئەوان هۆکاری هەموو ئەو نەهامەتیانە بوون کە بەسەر عێراقدا هات.

ئەمە کەمێکە لەوەی لەماوەی سێ ساڵی وشکەساڵیدا بەسەرم بردو تێیدا زیاتر لەساڵ و نیوێك بەتەنها لەگەڵ شەهید سەرۆك صەدام حسێندا بووم هەرچەند بنووسم لەبارەی ئەو ڕۆژانەوە، ئەوا قەڵەمەکەم دەستەوسانە لەوەی ئەو هەست و سۆزو ڕووداو و موعاناتانە بنووسێتەوە کەمن و هاوەڵە پاڵەوانەکانم ڕووبەڕوومان بووەوەو هێندەی شاخێك بەرپرسیارێتیان خستە سەرشانی خۆیان بۆ ئەوەی هەق بگێڕنەوە بۆ بنچینەو شوێنی خۆی ئەوانە کاتژمێرو ڕۆژان و شەوان و ساڵانێکن کە لەبیر ناچنەوە.

## تەندروستی سەرۆك؟ ئایا ژەهریان داوەتە سەرۆك لەگرتووخانەدا؟

سەرۆك تەندروستی زۆر باش بوو، کاتێکیش دەستگیرکرا پێش ناوەڕاستی کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٣ تەمەنی لەشەست و شەش ساڵی تێنەپەڕی بوو. بوونیادی بەهێز بوو، جەستەی پڕبوو، باڵای بەرز بوو. لەیەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵیدا کەلەکۆتایی ساڵی ٢٠٠٤دا لەگەڵم سازکرد دەرکەوت کەزۆرێك لەکێشی لەدەستداوە، هەتا لەو ساتەدا وامزانی کە هاوشێوەکەیەتی نەك خۆی. لەگەڵ ئەوەشدا تەندروستی باش بوو. لاوازبوونیشم گێڕایەوە بۆ ئەو ماوەیەی کەلەناو پیاوانی بەرهەڵستیدا بوو کە شەوو ڕۆژ لەنێوان ناوچە جۆراوجۆرەکاندا هاتووچۆی دەکرد، هانی زیاتر وەشاندنی ئەو گورزانەی

دەدا کەدوژمنی ئازار دەدا، داوای دەکرد ڕیزەکان ڕێکبخەن و دوژمن دەرپەڕێنن.

دوای ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٥، کاتێك کە لەگەڵی دادەنیشتم، هەستمکرد یەکێك لەدەستەکانی دەلەرزێت، هەروەها چرچ و لۆچی زۆر لەسەر دەموچاوی دەرکەوتبوو. ئەو مەسەلەیەم لای یەکێك لەعێراقیەکان باسکرد کە خاوەن شارەزایی و پسپۆڕی بوو بەدیاریکراویش لەوڵاتێکی ئەسکەندەنافیدا. چوو بۆ یەکێك لە تاقیگەکان، ئەم حاڵەتەی بۆ باسکردن بێ ئەوەی ناوی سەرۆکیان پێ بڵێت. ئەوانیش جەختیان لەوە کردەوە کە ئەو کەسە بەشێوەیەکی خاو ژەهری دەدرێتێ، داوایان لێکرد کە با کەسەکە کاغەزێکی سپی پاك کە هیچ کەسێك دەستی لێ نەدابێت بخاتە ناو لەپیەوە تا عارەق دەکاتەوەو پاشان کاغەزەکە بخرێتە ناو کیسێکی پاکەوە بهێنرێتەوە بۆ ئەوەی لەتاقیگەدا پشکنینی بۆ بکرێت، ئەمەش لەحاڵەتێکدا ئەگەر نەتوانرێت خوێن یان میزی کەسەکە دەست بخرێت. لەڕەوشی سەرۆکیشدا ڕێگە بەبردنی خوێن و میزەکەی نەدەدرا، لەبەر ئەوە سێ کاغەزی سپی پوختم برد بۆ ئەوەی سەرۆك بیخاتە ناو دەستیەوە تا دەستی عارەق دەکاتەوەو پاشان بیگێڕمەوە بۆ تاقیگەکە، حسابیشم بۆ ئەوە کردبوو کە ئەگەر ئەمریکیەکان نەیانهێشت دەڵێم ئەوە کاغەزێکە داومەتە سەرۆك بۆ ئەوەی ناوی ئەو پارێزەرانەی لەسەر بنووسێت کە هەڵیاندەبژێرێت بۆ ئەوەی لە دەستەی بەرگریدا لەگەڵمان بن. وە پێیان بڵێن کاغەزەکەمان گێڕاوەتەوە بێ ئەوەی سەرۆك هیچی لەسەر بنووسێت. دیاربوو ئەمریکیەکان بەئاگابوون لەوە، بۆیە پێش ئەوەی بیدەم بەسەرۆك لێیان سەندم و بردیان. لەخۆمم پرسی: ئایا ئەو ژەهرانە کە دەدرانە سەرۆك هۆکاربووبن لەپەلەکردن لەسێدارەدانیدا لەترسی ئەوەی نەکا ئەو نامونەگیە ئاشکرا بێت؟

هەروەها هەردەم سەرۆك باسی ئازارێکی دەکرد لەگەدەیدا، هەتا دادوەر ئەلجوحی بەووردی ئاگای لەم ئازارانە بوو، ڕۆژێکیشیان پرسیاری لێکرد لەبارەی چۆنیەتی ڕەوشی گەدەیەوە. هەروەها سەرۆك پێی ووتم کە جارێکیان بەشێوەیەکی کتوپڕ لەهۆش خۆی چووە، بۆیە بە هێلیکۆپتەری بلاك هۆك بردبوویان بۆ نەخۆشخانەی ئیبن سینا (لەناو ناوچەی سەوزدا). وێڕای ئەو نەشتەرگەری فتقەی بەبێ بێهۆشکردن بۆی ئەنجامدرابوو.

ئەمەش وامان لێدەکات گومان بکەین لەو مامەڵە تەندروستییە زیادەڕۆیی کەلەلایەن ئەمریکیەکانەوە لەگەڵ سەرۆکدا دەکرا، کەلەناو یەکێك لەژورەکانیدا بەندکرابوو. بەشی پزیشکی چاودێریان دەکرد کەهەڵدەستان بەپشکنینی پلەی گەرمای و ڕادەی شێی ژوورەکەو ڕۆژانەش سێجار لەلایەن پزیشکەوە پشکنینی بۆ دەکرا، ئەوەش ئەو گومانەمان لا دروست دەکات کە ئەمریکیەکان شتێکیان لەژێرسەردا بووەو ئەو چاودێرییە چڕە بایەخدان نەبووە بەتەندروستی سەرۆك. هەروەها بەرەو ئەوەمان دەبات کەوا کاتێك پارێزەرەکان سەردانی سەرۆکیان دەکرد لەگرتوخانە، زۆرجار لەگەڵ سەرۆکدا نانمان دەخوارد، یەکێك لەپارێزەرە بیانیەکان کە زۆر پارێزی دەکردو لەگەڵ ئێمەدا هەرگیز نانی نەدەخوارد، بەڵکو تەنها ئەو پارچە بسکیت و شەکلەمانەی دەخوارد کەلە عەممانەوە لەگەڵ خۆی دەیهێنا. لەبەرئەوەی کە ئێمە پزیشك نین، ئەوا ناتوانین لەم بابەتەدا پێداگریی بکەین..


بسم الله الرحمن الرحيم

انا لله وانا اليه راجعون

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

13 ذي القعدة الحرام

دەقی ئەو بروسکەیەی کە سەرۆك لەلایەن خێزانی سەیید محمد باقر ئەلصەدرەوە پێیگەیشتووەو لە ڕۆژنامەی ئەلقادسیەدا لەبەرواری ١٩٩٩/٣/٢دا بڵاوبۆتەوە.

# بەشی بیست وچوارەم

## دیداری کۆتایی لەگەڵ پارێزەرەکاندا



من ڕاسپاردە دەدەمە هەموو خەڵکەکەمان کە دەست بەیەکێتیانەوە بگرن و لەنێوان خۆتاندا لێبووردە بن. ئەو ئاشوب و فیتنەیەی کە پلانی ئەو دوژمنانەیە نەیانتوانیوە داگیرکردنەکەیان و فراوانخوازییەکەیان بەدی بهێنن، تەنها لەڕێگەی ورژواندنی ئەو هۆزگەرێتی و دەمارگیرییەوە نەبێت، کە لەلایەن هەمووانەوە ڕەتکراوەیە. پێتان دەڵێم خوا فەڕدارتان بکات، ئێوە کەسانێکی دڵسۆزو بڕوادارن، ژیانی خۆتان خستە مەترسییەوە.. لەئێوە جگە لە ئارامیی و خۆنەوویستی و قوربانیدانی بێ سنور هیچی ترم نەبینیوەتەوە..

(صەدام حسێن لەزیندان)

بەهۆی ئەوەی کە لەلایەن دەسەڵاتەکانی داگیرکەرەوە ڕێگە لەمن گیرا بچم بۆ بەغدا لەبەر هۆیەك کە نایزانم بۆیە سێ کەس لەهاوەڵە پارێزەرەکانمان نارد بۆ ئەوەی چاویان بەسەرۆك صەدام حسێن بکەوێت. لەکاتی چاوپێکەوتنی پارێزەرەکاندا لە ٢٦/١٢/٢٠٠٦دا، لایەنی ئەمریکی پەیوەندی کرد پێمەوەو پێیڕاگەیاندم کە دادگا ڕەزامەندی لەسەر بڕیاری حوکمەکە دەربڕیوە، ئەوەی لەسەرمە ئەوەیە کە وەفدێك بنێرم بۆ ئەوەی پێداویستی و شتومەکە تایبەتیەکانی سەرۆك وەربگرێتەوە. داوام لێکردن کە چاوپێکەوتنێکی تر ڕێکبخەن بۆ ئەوەی پارێزەرەکان لەڕۆژی دواتر سەردانی سەرۆك بکەنەوە، بۆ ئەوەی بڕیاری ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر فەرمانەکە بەسەرۆك ڕابگەیەنن. دوای ئەوەی چاوپێکەوتنەکە کۆتایی هات، گەیشتنی پارێزەرەکان بۆ ئەو شوێنەی کەتەرخانکرابوو بۆنیشتەجێ بوونیان، مۆبایلەکانیان کردەوە، پەیوەندیم کرد پێیانەوەو پێمڕاگەیاندن کە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ لای سەرۆك و منیش ئەوەم بۆ ڕێکخستوون. دوایین دیدار دیاریکرا کەڕۆژی ٢٨/١٢/٢٠٠٦ بوو. بەڵام یەکێك لەپارێزەرەکان بەهۆی ڕەوشێکی تایبەت بەخۆیەوە پۆزشی هێنایەوە، ڕۆژی ٢٧/١٢/٢٠٠٦ گەڕایەوە بۆ عەممان.

لە بیست و هەشتی مانگی کانونی یەکەم/ دیسەمبەری ساڵی ٢٠٠٦دا، دوایین دیدار لەنێوان سەرۆك و پارێزەرەکاندا ئەنجام درا دوای دەرکردنی بڕیاری حوکم بەسەر سەرۆك و بەڕێزان بەرزان تکریتی و عەواد بەندەردا. ئەو دیدارەش لە بنکەیەکی ئەمریکادا ئەنجامدرا لەنزیك فڕۆکەخانەوە.

سەرۆك پێشوازی لەپارێزەرەکان کرد. کاتێك کە گوێی لە هەواڵی ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر بڕیارەکە بوو، خۆڕاگر دیاربوو، تا ئەوپەڕی ڕادە متمانەی بەخۆی هەبوو. دیاربوو گاڵتەی دەهات بەبڕیارەکەو ووتی: " ئەمە مەسەلەیەکە بێزارم ناکات، بەڵکو سوپاسی خوا دەکەم لەسەر هەموو شتێك، نرخەکەی هەر چەندێك بێت، ئەوا هەموو ئەمە کەمە بۆ عێراق. کاری دوژمنانمان ئاشکرا بوو، ڕووی ڕاستەقینەیان دەرکەوت، لاوازتر دەرکەوتن زیاتر لەوەی کە هەندێك کەس پێیان وابوو. بەڵام پیاوەکانمان، ئەوا گورزی کوشندەیان لێوەشاندن و شکستیان پێخواردن، زۆر سوپاسی خوای گەورە دەکەین لەسەر ئەوەو داوای

پاشەرۆژێکی باش بۆ خۆمان و هەمووان لەخوا داواکارین".

پاشان سەرۆک سەیری ئامادەبووانی کرد و ووتی:

" من دڵنیابووم لەوەی کە ئەوان دەیانەوێت ئەم حوکمە ستەمکارانەیە جێبەجێ بکەن، ئەوا ئەو ڕادیۆیەیان لەکارخستبوو کە بەهۆیەوە گوێم لەهەواڵ دەگرت، درکم بەوە کرد کەدەیانەوێت هەواڵی ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر حوکمی لەسێدارەدانەکە لەمن بشارنەوە.. بەڵام ڕادیۆیەکی تری گەورەیان بۆ هێنام کە وەرگێڕەکە کاری پێدەکردو ئەوەی کە بیەوێت و بەگونجاوی بزانێت ئەوە لێیدەدا. لەبەرئەوە دوای ئەو لێپێچینەوانەو پرۆسەکانی توندکردنەوەی ئەمنیی و پاسەوانی لەلایەن ئەمریکیەکانەوە، هەستمکرد شتێك هەیەو ئەوان بڕیارەکەیانداوە".

لێرەدا یەکێك لەپارێزەرەکان پرسیاری لێکردووە کەئایا دەیەوێت داخوازییەك یان پەیامێك ئاراستە بکات لەپێناو جێبەجێنەکردنی حوکمی لەسێدارەدانەکە، سەرۆك وەڵامی دایەوە:

" من ڕازی نابم، پاشان بانگ لەکێ بکەم، ئایا داوا لەدوژمنەکانم بکەم؟ ئەوان خۆیان ئەم دادگا نادادپەروەرانەیان ڕێکخستووە، هەر ئەوانیشن ئەم سیناریۆیەیان لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئامادەکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا پێتان دەڵێم کە من ئاسوودەم، ئاسوودەم چونکە بەدڵێکی پاك و پتەوەوە، پاکیەتی دەست و دڵسۆزی لەکارو ئەرکەکانداو لایەنداری هەمیشەیی بۆ هەق و دادپەروەریی دەگەڕێمەوە بۆ لای خوای خۆم. من ڕووبەڕوی پوچی و بەتاڵی بوومەوەو بەڕوویدا وەستامەوە. من ئەگەر بمویستایە ئەوا دەمتوانی لەگەڵیاندا ڕێکبکەوم و پاساوێك بۆ خۆم بهێنمەوە، بەڵام پەیمانم بەخوا داوە هەمیشە ئەوە بکەم کەمایەی ڕەزامەندی ویژدان و ئایین و خۆشەویستی و ئینتیمام بێت بۆ عێراق و نەتەوەکەم. دوای هەموو ئەوە، لەدوای هەموو ئەم تەحەدایانەو ڕەتکردنەوەی هەموو هەوڵانەی کە لەگەڵمدا ئەنجامیاندا، ئایا دەکرێت ئێستا صەدام حسێن سازش لەسەر گەردنی بکات، داوا بکات لەبەر هەر هۆیەك بەری بدەن؟ ئەوە ئەو صەدامە نییە کە ئێوە دەیناسن بکرێت ئەوە بکات.. باشە ئەگەر ئەوەم کرد، چی بەخواو بەخەباتگێڕەکان بڵێم؟.. بەو کەسە بڵێن کە ئەمەی خستۆتە ڕوو پێشنیاری کردووە صەدام حسێن تەنها داوا لەخوا دەکات، جگە لەو داوایەك لەکەس ناکات. خوا دوژمنان سەرشۆڕ بکات و

باوەڕدان سەرکەوتوویکات.

" دوای ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر فەرمانی لەسێدارەدانەکە، پزیشکێك هات بۆ لام و لێی پرسیم: ئایا پێویستت بەدەرمانی هێورکەرەوە نییە؟ پێمووت: چیا پێویستی بەهێورکەرەوە نییە. خوای گەورە ئەوەندە باوەڕی پێداوین کە وامان لێبکات پێویستمان بەو جۆرە شتانە نەبێت. هێورکەرەوەکان بەکەسانی لاواز دەدرێن ئەوانەی بەهەر نرخێك بێت ژیانی دونیا بەلایانەوە لەپێشترە، بەڵام من ئەوا دەڵێم بەجێگیریی و باوەڕەوە ڕوویەڕووی مردن دەبمەوە و سوپاسی خوا دەکەم لەسەر ئەوە..

" من داواتان لێدەکەم بە بەردەوامی باوەڕی خۆتان لەیادبێت هەرکاتێك دەرووناتان تووشی لاوازیی یان خەمۆکیی بوو. ئارامیی و قوربانیدان و کۆششکردن و دەروونباشیی لەپێناو ڕاستی و بنەما شەریفەکاندا کەباڵاترین ماناکانی باوەڕن. لەیادتان بێت کە دادپەروەریی بوونی ویژدانە نەك یاسا، واتە یاسا دەکرێت لەسەر ویژدان بوونیاد بنرێت، ئەگەرنا دادپەروەریی بەدی ناهێنێت..

" لەوکاتەوە کە هەواڵی ڕەزامەندی دەبڕین لەسەر حوکمەکەم زانیوە، ئەو پاسکیەلەی کە بۆیان هێناوم وەرزشی پێبکەم ، زیاتر و بەکۆششێکی گەورەتر بەکاری دەهێنم بۆ ئەوەی سروشتی کەسایەتی عەرەبیی باوەڕداریان بۆ بسەلمێنم. لەدوێنێوە ئەوکاتەی کە تەرخانم کردبوو بۆ وەرزش لە ١٢ خولەکەوە کردوومە بە ٣٥ خولەك. پێویستە لەسەریان بزانن کە ئێمە گەلێکین ژیانمان خۆش دەوێت، بەڵام کاتێك کاتی قوربانیدان دێت، ئەوا ئێمە بەبێ هیچ ترس و بیمێك مەرگ قەبوڵ دەکەین".

لێرەدا سەرۆك باسی چیرۆکی پەڕینەوەی لەڕووباری دیجلەیان بۆ دەگێڕێتەوە پێش دەستگیرکردنی لە کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٣و پاشان دەڵێت:

" هیوادارم تووشی نائومێدی نەبنەوە، ئەمە قەدەرو ویستی خوایە. بەڵام ئەوەی کە گرنگە عێراق و نەتەوە دەرپەڕاندنی داگیرکەران و بەزاندنیان. من بڕوام وایە کە بەهاری داهاتوو یەکلایی کەرەوە دەبێت چونکە ئەوان خەریکە توانایان نامێنێت، ئەمە لەکاتێکدا پیاوەکانی ئێمە ئێستا جڵەوی دەستپێشخەریی و پێشڕەویان بەدەستەوەیە. خوای گەورە گەل و نەتەوە لەدوژمنەکانی دەپارێزێت و سەرمان دەخات بەسەریاندا سەرکەوتنێکی گەورە، نەتەوەکەمان شایەنی ئەو سەرکەوتنە پڕبەهاو بەنرخەیە کە ئێستا بەخوێنی ڕۆڵە

بەوەفاکانی دروستی دەکات. ئەو ئەنجامەی کە خوازیارین و باشترە ئەوەیە کە بەڕێگەو ئامرازی ئاشتیانە سەرکەوتن بەدەست بهێنیت، بەڵام ئەگەر ناچار بوویت، ئەوا بە بەرهەڵستیی و بەرەنگاربوونەوەو دەرپەڕاندنی ستەمکاران. گومانی تێدا نییە ئەو ستەمەی لەعێراق کراوەو لەڕێگەیەوە لەنەتەوە هیچ پاساوێکی نەبووە. ئەوان باسیان لەهۆکارەکانی داگیرکردن و دوژمنکاریی کرد، بەڵام هەموو درۆکانیان ئاشکرابوو، ڕەوشیان لەبەردەم ڕای گشتیدا لەوپەڕی خراپیدایە. بەڵام ئەوەی سەیرو نامۆیە ئەوان هێشتا بەردەوامن لەسەر گومڕایی و تاوان و داگیرکارییەکەیان و کوشتنی خەڵکان و کەسانی بێ گوناح و بەفیڕۆدانی سامانەکانی ولاتێکی عەرەبی سەربەخۆو خاوەن سەروەریی. جارێك دەڵێن سەرکەوتن بەدەست دێنین، جارێکیش دەڵێن نەسەرکەوتووین و نە شکستخواردووین. پاشان سەرلەنوێ دەگەڕێنەوەو دەڵێن ژمارەی هێزەکانمان لەعێراق زیاد دەکەین. بەوشێوەیە بێ سەروبەرەیی دەکەن دوای ئەوەی بەهۆی بەرهەڵستیی پاڵەوانانەوە زەرەرو زیانێکی زۆریان لێکەوتووە. ئەوان هەوڵیاندا تۆوی ئاشوب و فیتنە لەناو ڕۆڵەکانی گەلەکەماندا بچێنن، لەبیریان چوو کە گەلەکەمان خاوەنی شارستانیەت و مێژووەو بەدرێژایی سەدەکان وەك یەك ڕستەی چنراو ژیاوە، نە ناکۆکی دەزانێت و نە تایەفەگەریی یان مەزهەبچیەتی و ڕەگەزچێتی.

" لەو هەواڵە گرنگانەی کە پێیان دڵخۆش دەبم ئەوەیە کاتێك گەلەکەمان لە باشور لەدژی هێزەکانی داگیرکەر دەوەستێتەوە. هەروەها ئەوە لەو هەواڵە خۆش و نایابانە لەبارەی گەلەکەمان لەناوچەی خودموختاری و بەشێوەیەکی دیاریکراوتریش لەهەڵەبجە، کەوا چەندین کەس لە گەلی کوردمان دەستگیرکراون چونکە داگیرکاریان ڕەتکردۆتەوەو پابەندن بە یەك عێراقی یەکگرتووەوە.

من ڕاسپاردە دەدەمە هەموو خەڵکەکەمان کە دەست بەیەکێتیانەوە بگرن و لەنێوان خۆتاندا لێبوردەبن. ئەو ئاشوب و فیتنەیەی کە پلانی ئەو دوژمنانەیە نەیانتوانیوە داگیرکردنەکەیان و فراوانخوازییەکەیان بەدی بهێنن، تەنها لەڕێگەی ورژواندنی ئەو هۆزگەرێتی و دەمارگیرییەوە نەبێت، کە لەلایەن هەموانەوە ڕەتکراوەیە. من متمانەم هەیە کە گەلەکەمان و نەتەوەکان سەلامەتە، هەرگیز ڕێگە بەداگیرکەران و بەکرێگیراوەکانیان نادەن کەسەرکەوتووبن لەپلانەکانیاندا کەدەیانەوێت عێراق و نەتەوەکەمان پەرت و دابەش

بکەن.. من داواتان لێدەکەم کە پەیامێك بنێرن بۆ هەموو رۆڵەکانی گەلەکەمان بۆ ئەوەی یەکێتیان بپارێزن و رووبەرووی دوژمنە هاوبەشەکەیان ببنەوە کە خێرو چاکەی بۆ هیچ یەکێك لەرۆڵەکانی عێراق ناوێت.

" من بە رۆڵەکانی گەلەکەمان دەڵێم: ئارام بگرن، ساتەکانی سەرکەوتن بەرێوەن، رەوشی نێودەوڵەتیش بەناچاری لەجولاندایە، سیاسەتی ئەمریکیش هەموو هەڵەکانی لەناوبردو وای لێکردین تاکە رێگە کەلەبەردەمماندا ماوەتەوە بەرەنگاریی و وەستانەوە بێت لەرووی دوژمندا.. زۆر باسیان لەئاشتەوایی کرد، ئەم مەسەلەیەشیان زیاد لەجارێك باس کردووە، وە من پێم وتن: ئەمە مەحاڵە. ئەگەر صەدام حسێن بەبێ حزبی بەعس رۆیشت بۆ ئاشتەوایی و رێکەوتن، ئەوا هیچ سوودو بایەخێکی نابێت. هەر ووتوێژو دانوستانێك، ئەگەر لەگەڵ حزبدا نەبێت وەك دامەزراوەیەکی فەرمیی و پەیوەندیدار، هیچ بەهاو سودێکی نابێت. ئەوانەش بەدوور لەحزب خۆیان پێشکەش دەکەن، ئەوا ئەوانە نوێنەرایەتی حزب ناکەن.

" عەقڵی ئەمریکی هێشتا کەمتەرخەمە لەچارەسەرکردنی هەڵەکانی، ئەوان تائێستا نەیانتوانیوە لەدەرگا راست و دروستەکان بدەن، دان بەداخوازییەکانی گەلی عێراقماندا بنێین، بەلام بەوپەڕی متمانەوە دەڵێم، کەلەماوەی دوو مانگدا، ئەوا شۆڕشەکە جیاواز دەبێت و داگیرکەران لەرەوشێکدا دەبن کە ئەم رەوشە نابێت ئێستا تێیدان، ئەویش ئەو کاتە کەدیموکراتیەکان ئەرکە فەرمییەکان وەردەگرن، بەتەواوەتی لەبەڵگەنامەو کاغەزەکان وورد دەبنەوە.. لێرەدا کاردەکەن و هەوڵدەدەن چارەسەرێك بۆ کێشەی عێراق بدۆزنەوە. بەبڕوای من، ئەوە لەماوەی سێ مانگدا دەکرێت.

" بڕوام پێبکەن، ئەوەی کەزیاتر نارەحەتم دەکات چارەنووسی خۆم و چارەنووسی عێراقیش نییە، چونکە عێراق پیاوانی خۆی هەیە بەدڵنیاییەوە لەداگیرکەرانی دەسێننەوە رزگاری دەکەن. بەلام ئەوەی کە نیگەرانم دەکات ئەوەیە کە من قەبارەی ئەو کینەیە نازانم کەلەدەروونی زۆرێك لەعێراقیەکاندا گەشە دەکات ئەگەر من لەسێدارە بدرێم، چونکە ئەوەی دڵی کینە پڕیکرد ئەوا بەرچاوڕوونی نامێنێت..

" من بەرۆڵەکانی گەلەکەم دەڵێم: ئاگاتان لێبێت و جارێکی تریش دەڵێم ئاگاتان لەخۆتان بێت با رق و کینەتان نەبێت. من بۆ ماوەی هەشت ساڵ لەدژی خومەینی جەنگام

ئەویش بۆ بەرگریکردن لەعێراق و لەنەتەوەی عەرەب لەبەرامبەر پلانگێڕییە فراوانخوازییەکان و هەناردەکردنی شۆڕشدا، بەڵام سوێند بەخوێنی ڕۆڵەکانم دەخۆم تەنها جارێکیش ڕق و کینەم بەرامبەر خومەینی نەبووە. ئەمە دژو نەیارمەو بەشەرەفەوە لەدژی جەنگاوم.. هەمان ئەمەش بەسەر جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمریکدا جێبەجێ دەبێت، بۆش وڵاتەکەمی وێرانکردو گەلەکەمی پەرتەوازەو بێ لانەو جێ کرد، وە من بەهەموو ئیرادەمەوە ڕووبەڕووی دەوەستمەوەو داوای بەرەنگاربوونەوەی و شکست پێهێنانی دەکەم. بەڵام ڕق و کینەم نییە بۆی. هێڵێکی جیاکەرەوە هەیە لەنێوان کینەو لەنێوان دژبوون لەگەڵ نەیاریدا.

" پێتان دەڵێم لەبیرتان نەچێت "صەدام" بە خەباتگێڕی دەستی پێکرد، بە خەباتگێڕیشەوە چووە ناو ڕیزەکانی حزبی (بەعس)ەوە، بەعەقڵیەتی خەباتگێڕیشەوە دەسەڵاتی لەفەوزاو کاولکارییەوە دەرکێشا. ئێمە عێراقمان خشت بەخشت بوونیادنا، کاتێکیش ساتی یەکلاییکەرەوە هات، بەرۆحی خەباتگێڕو بەرهەڵستکارەوە ڕووبەڕووی دوژمنانی عێراق و دوژمنانی نەتەوە بوومەوە.

" من دەمزانی خۆم و کوڕەکانم شەهید دەبین، هەموو ئەوانەش پاڵنەرم بوون بۆ ئەوەی بەردەوام بم لەسەر بەرگریی، نەك هەڵهاتن، بەڵکو مانەوە لەناو ڕۆڵەکانی گەلەکەمدا بەهەر باج و نرخێك بێت.

" لەماوەی هەشت مانگا خۆم حەشاردا، تێیدا بەهەموو ناوچەکانی عێراقدا دەگەڕام، لەگەڵ پیاوانی بەرگرییدا پەیوەندم هەبوو بەدوایاندا دەچووم و دەمدۆزینەوە. لای کەسانێك خەوتووم کەنایاناسم.. تەنها دوای سێ هەفتە لەداگیرکردنی بەغدا، هەموو پاسەوانە تایبەتیەکانم مۆڵەتداون تەنها یەك دانەیان لام مایەوە.

" من بۆ ماوەی ٣٥ ساڵ خزمەتی ئەم گەلە مەزنەم کرد. ئێستا خۆمی پێدەسپێرم. دڵنیاشم لەوەی لەئامێزم دەگرێت، ئەگەر ئەوەشی نەکرد، ئەوا بێگومان هەڵەیەك هەیە...

" لەکاتی گەڕانمدا، جلی جۆراوجۆرم لەبەرکردووە، بەناو کێڵگەو باخ و چیاکاندا گەڕاوم. بەدرێژایی ئەو کاتانە، بەعەقڵیەتی خەباتگێڕەوە جوڵاومەتەوە، هەروەها لەماوەی دەستگیرکردنیشدا کەوویستیان خراپی و سووکایەتیم دەرهەق بکەن. هەروەها لە کاتی دادگایشدا.

" من لەخوا نەبێت لەکەس ناترسم، وە من بەتەواوەتی لەخۆم ڕازیم. خەباتێگڕ جیاوازە

لە مرۆڤی ئاسایی. مرۆڤی ئاسایی، بەپێی ئەرك و كارەكەی، بەوشێوەیە منداڵەكانی ڕادەسپێرێت كە بۆیان دارێژراوە. كاتێكیش خانەنشین دەبێت، وای دادەنێت كە هەموو شتێك تەواو بووەو ژیان وەستاوە. ئەمە لەكاتێكدا كەسی خەباتگێڕ وای دادەنێت ئەركەكەی بەردەوامە هەتا دوایین ساتی ژیانی. لەبەرئەمە، ئەو كۆتایی نایەت.. ئێمە پێویستمان بەحاڵەتێكی لەم شێوەیەیە بۆ ئەوەی پاكببینەوە، چونكە خەبات لەسایەی یاساو دەوڵەتدا جیاوازە لەخەبات لەدەرەوەی چوارچێوەی دەوڵەت و یاساوە.

"كاتێك شۆڕشی ساڵی ١٩٦٨ بەرپابوو، ژمارەی ئەندامانی حزبی بەعس تەنها نزیكەی ٧٧٠ ئەندام بوو. ئێمە پێویستمان بەڕەوشێكی خەباتگێڕیی نائاسایی هەبوو، كاروانەكە ئاسان نییە، ئەویش قورسترین حاڵەتێكە كەتائێستا بەسەر حزبدا هاتبێت. دوژمن لەناوخۆدا هەیە، داگیركەریش گەورەترین هێزە لەجیهاندا. هەڵبژاردنی كرداریش ئەوەیە كە چۆن حزبمان لەم نەهامەتییە دەربێنین بێ ئەوەی سازش بكەین یان بكشێتەوە لەبنەماو بیروباوەڕەكانی.

" وا دیارە سەرتانم ئێشان. پێتان دەڵێم خوا فەرپارتان بكات، ئێوە كەسانێكی دڵسۆزو بڕوادارن، ژیانی خۆتان خستە مەترسییەوە.. لەئێوە جگە لەئارامیی و خۆنەویستی و قوربانیدانی بێ سنوور هیچی ترم نەبینیوەتەوە.. خوا فەرپارتان بكات خۆتان و خێزانەكانتان كە دەستیان لێهەڵنەگرتن كاتێك بڕیارتاندا بەرگریی لەمن و لەهاوەڵەكانم بكەن. داوا لەخوای گەورە دەكەم لەدونیاو دوارۆژدا پاداشتتان بداتەوە، ڕەحمەتیش لە پارێزەری شەهید ،خەمیس ئەلعوبەیدی، داوا لەخوای گەورە دەكەم سوپاكەمان و گەلەكەمان بەرزو بەهێز بكات.

" سڵاوی من بگەیەنن بەدایكی عەلی و دایكی و خوشكەكانی و كوڕەكانی و نەوەكانم هەموویان و هەموو خێزانەكەم. ئەوان بڕوایان بەكارو فەرمانی خوا هەیە. هەموو مرۆڤێك كات و ئەجەلی نووسراوە. پێویستە لەسەریان بەدڵێكی باوەڕدارانەوە ڕازی بن بەوەی خوای گەورە بۆی نووسیووین، ئەوەیان لەیادبێت كە باوكیان بەشەرەفەوە كۆشاوەو خەباتی كردووە، بەدوای پلەو پایەوە نەبووە، بەڵكو لەپیناو گەل و نەتەوەو مافەكاندا بووە. ئەوەی هەڵمگرتووە متمانەمە بەگەلەكەو سوپاكەم هەتا ئەگەر هەندێك كەسیش بلەرزێت، ئەوا بەشێك هەن لەخەڵك پێیان دەوترێت پێشەنگ و ئەوانی تریش پێیان دەوترێت ئەوانی

تر. ئەزموونەکانیشمان دەریایەکی لێوان لێوە، گەلەکەمان گەلێکی ڕەسەنە، حزبەکەمان حزبێکی ڕەسەنە لەبنەماکان و پێداگریی لەسەر هەق و دادپەروەریی".

لەم دیدارەدا، بیری منی کردووەو ئازاری چەشتووە لەوەی کە نەیانهێشتووە چاوم پێیبکەوێت بەتایبەتی لەڕۆژەکانی کۆتایی ژیانیدا کەپێویستی بەوە هەبوو کە من لەنزیکیەوە بم، ڕۆڵی من لەگەڵ سەرۆکدا تەنها خوا سنووری دەزانێت.

وادیارە ئەو لەنێوان دێڕەکاندا ئەوەی خوێندۆتەوە کە چەند لایەنێکی دیاریکراو هەوڵیانداوە منی لێدووربخەنەوە ئەویش بۆ چەند ئامانج و مەبەستێکی دیاریکراو..

ئەو لەگەڵ پارێزەرەکاندا ئەم هۆنراوەیەی بۆ ناردووم کە شانازیی پێوە دەکەم[١٤]:

---

[١٤] — پێویستە وەك وەرگێڕی کوردی ئەوە بڵێم کە ڕای من لەگەڵ تەنها یەك ووشەی ئەم کتێبەدا یەکناگرێتەوە. بەڵام لەبەر ئەمانەتکاریی لەوەرگێڕاندا دەستکاری دەقەکانم نەکردووەو وەك خۆی وەرمگێڕاون. بەڵام هۆنراوەکانی سەدامم وەرنەگێڕاون، ئەویش لەبەر دوو هۆ یەکەم: هەموو پیاهەڵدانن بە باڵای پارێزەر خەلیل دلیمیداو ستایشکردنی ئەوە. دووەمیش حەزمکرد دەقە شیعرییەکانی سەدام بێ وەرگێڕان بیانهێڵمەوە، چونکە لەلایەکەوە هۆنراوەکە بەوەرگێڕان دەشێوێت و دووەمیش حەزمکرد مۆرك و سیماو بایەخی ئەدەبی و ئاستی شیعریی دەقەکە بخەمە بەرچاوی خوێنەر. وەك ئەوەی دەقێکی شیعری سەدام حوسێنە کە لەدواساتەکانی تەمەنیدا نووسیوویەتی. (وەرگێڕی کوردی)

أصيل خليل وليس له بديل

عذب الماء هو وأعداؤنا سحول

ما ارتجف خيانة في صعبة

وانما يلطم سفينة تجرهم وتصول

يشتد وقد صابرها مسفرا

ويطغى موجه لو واجهه غول

كالنار مستعرة واجهها هوى

لايحتويها عرض ولا طول

يشمخ في العالي ويعلوها بهمة

لا يلتوى له في الجذور أصول

كالبحر الزاخر لو تغضب أمواجه

وسيف له لو واجهة هبيل

صابرها أول وهو بها اول

إذ تكاثرت علينا بظلمها الدول

وها هي الان وقد اشتد ظلمها

يعلو العقوب وللسيوف صليل

أبا علاء لايظن فيك سوى كرم

وهل ظننا سوى مايستحق الفحول

ما جفلت عنها وتلطم شرها

أصيل الفرع اصيل نبيل

صەدام حسێن

سەرۆك كۆماری عێراق و سەركردەی گشتیی هێزە چەكدارە خەباتگێڕەكان

لە ٢٠٠٦/١٢/٢٨

# بەشی بیست و پێنجەم

## ساتەکانی کۆتایی

من داواتان لێدەکەم بە بەردەوامی باوەڕی خۆتان لەیادبێت هەرکاتێك دەروونتان تووشی لاوازیی یان خەمۆکی بوو. ئارامیی و قوربانیدان و کۆششکردن و دەروونباشیی لەپێناو ڕاستی و بنەما شەریفەکاندا کە بالأترین ماناکانی باوەڕن. لەیادتان بێت کە دادپەروەریی بوونی ویژدانە نەك یاسا، واتە یاسا دەکرێت لەسەر ویژدان بوونیاد بنرێت، ئەگەرنا دادپەروەریی بەدی ناهێنێت..

(صەدام حسێن لەزینداندا)



مباشر

نوري كامل المالكي
رئيس الوزراء
٢٠٠٦/١٢/٢٩

ڕەزامەندی دەربڕینی نوری مالیکی لەسەر بڕیاری لەسێدارەدانی سەرۆك صەدام حوسێن

لەو ماوەیەدا چەندین نامە گۆڕینەوە لەنێوان باڵیۆزخانەی ئەمریکاو سەرکردە سەربازییە ئەمریکیەکاندا ڕوویدا. وا دیارە ئەوانە دواجار دەرکیان بەوە کردووە کە هەڵەیان کردووە لەداگیرکردنی عێراقدا. ئەوەش کەوا لەئەنجامی ئەو داگیرکردنەوە ڕوویداوە لەوێرانکاری و زیانکەوتنەوە زۆر گران و قورسە بۆ هەردوولا، عێراق و ئەمریکا، هەروەها ناکرێت حوکمی عێراق بکرێتەوە بەڕێوەببرێت بەشێوەیەکی باشتر لەوەی کە صەدام حسێن، بەڕێوەی دەبرد بۆ گەلێکی فرە ڕەنگو فرە چەشن بەتایبەتی هەندێك لەڕاوێژکارەکانی دادگای ئەمریکی وتبوویان کە تۆمەتی دوجەیل ناگاتە ئاستێك کە سەرۆك لەدوو ساڵ زیندانی زیاتری بەسەردا بدرێت.

کێشەی دوجەیل بەشێك بوو لەبەشەکانی پلانگێڕیی دژی سەرۆك لەناو دادگایەکی ئێرانی ئەمریکیدا. سەرۆك ڕووبەڕووی تیرۆرکردن بۆوە لەلایەن حزبی دەعوەی یاساغکراوی سەر بەئێرانەوە ئەویش ئەو کاتەی کە عێراق لەجەنگێکی وێرانکاردا بوو لەگەڵ ئێراندا. لەنەریتەکانی سەرۆکیش لەوکاتەدا ئەوە بوو کە بەجلی سەربازییەوە سەردانی ناوچە جۆراوجۆرەکانی دەکرد. وەك هەر سەرکردەیەکی تر کەڕووبەڕووی تیرۆرکردنی دەبێتەوە، ئەوە لایەنە تایبەتەکانن هەڵدەستێن بەلێکۆڵینەوە بۆ گەیشتن بە هەموو ووردەکارییەکان، پاشانیش دەسەڵاتە دادوەرییە سەربەخۆکان بەڕۆڵی خۆیان هەڵدەستن بەپێی ئەو دەسەڵاتانەی کەپێیان دراوە. وەك هەر سەرۆکێکی تری دەوڵەتیش، ئەوا صەدام حسێن دەستی لەبەڕێوەچوونی لێکۆڵینەوەکان و مەسەلەکانی دەستگیرکردن یان حوکمدانی تومەتبارەکان وەرنەداوە. بەڵام وەك سەرۆکی وڵاتێك، مومارەسەی دەسەڵاتەکانی دەکات کە دەستور ڕێپیێداوە، واتە ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر حوکمە یاساییەکان یان سووککردنی حوکمەکان یان لێبوردن بەپێی قەناعەتی خۆی. کاتێك دەستور ئەم هەلەی داناوەو بەتەنهاش سپاردویەتی بەسەرۆك کۆمار، وەك دوا هەلێك لەبەردەم تۆمەتباردا بۆ ئەوەی سوودی لێببینێت. بەتایبەتیش لەم مەسەلەیەدا، سەرۆك ڕەزامەندی لەسەر هەندێك

لەحوکمەکان دەربڕیوە، لەهەندێکیش بووراوە. وەك دەشزانین، ئەوا حزبی دەعوە بەپێی یاسا حزبێکی یاساغە لەعێراق کە هەرکەسێك بەسەریدا بسەپێت پەیوەندی بەو حزبەوە هەیە ئەوا سزای لەسێدارەدانی بەسەردا جێبەجێ دەبێت، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە پەیوەندی بە (ئێران)ی دوژمنەوە هەیە کە پەلاماری عێراقی داو دوای ئەوەش شەڕێکی هارەرو وێرانکەر بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەدژی عێراق بەرپاکرد، هەر وەك چۆن ئەندامانی ئەم حزبە (کە زۆربەیان لەوانە بوون لەخزمەتی سەربازی هەڵهاتبوون) تاوانی خراپیان لەدژی ڕۆڵەکانی گەلی عێراق ئەنجامدا بەتەقینەوەی تیرۆریستی لەژمارەیەکی زۆر لەناوچە گشتیی و حکومیەکاندا وەك زانکۆی موستەنسریە و وەزیرییە و بینای ڕادیۆو تەلەفزیۆن و بارەگای وەزارەتی ڕاگەیاندن و شوێنانی تریش. سەرۆك لەقسەیەکیدا لەدانیشتنی دادگایی لەبەرواری ٢٠٠٥/١٢/٥دا دەڵێت: " ئایا کاتێك تەقە لەسەرۆك کۆمار دەکرێت، هەتا ئەو سەرۆکەش کە ئەمریکا دایناوە، ئایا لێپێچینەوە ئەنجام نادرێت؟ ئایا مافی دەزگا ئەمنیەکان نییە کە بەدواداچوون بکات و لێکۆڵینەوە لەڕووداوێکی لەمشێوەیە بکات؟

ئەو دەیتوانی فەرمان بکات لێکۆڵینەوە نەکرێت و ڕەزامەندی بەرپرس صەدام حسێنە، لەسەر حوکمەکانی لەسێدارەدان دەرنەبرێت، ئەگەر گەردنی صەدام حسێنتان دەوویست ئەوا فەرموون ئەوەی کە داواتان کردووە، ئەگەر دەشتانەوێت لێپرسینەوە بکەن، یان ئەگەر ئەمریکیەکان دەیانەوێت لێپرسینەوە بکەن، ئەوا من بەرپرسیارم و وەك سەرۆکی عێراق.. ".

مومارەسەی دەسەلاتی دەستورو یاسایی خۆمم کردووە بەلام دوای زاڵبوونی حزبی دەعوە بەسەر حکومەتی داگیرکەرو دەزگاکانیدا و لەوانەش ئەم دادگا گاڵتەجارە، ئەوا شتێکی سروشتی بوو سەرۆك بەئاراستەی لەسێدارەداندا بەرێت. بەلام دەستەی بەرگریی لەسەرۆك، بەهەموو توانستی ئەندامەکانیەوە چ وەك تاك و چ وەك کۆمەڵ و دەستەی بەگریی، هەستان بە پوچەڵکردنەوەی درۆو دەلەسەکانی. شایەتەکانی بەرگریش ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە تەنگەتاوکردنی ئەوانەی هەستابوون بە بەرپاکردنی دادگاییەکە، ئەمەش وای لەوانە کرد، دوای ئەوەی کەژێریی خۆیان لەدەستدا کە شایەتەکان زیندانی بکەن . ئەوەش ڕەفتارێکە گۆڕەپانەکانی دادوەریی لەهیچ ولاتێك و لەهیچ سەردەمێکدا بەخۆیەوە نەیبینوە.

## یارییپێکردن و پلانگێڕییەکان

ڕۆژی ٢٠٠٦/٤/٢٨ لەعەممان بووم، کەسێك پەیوەندی کردپێمەوە کە هەر لەیەکەم ساتدا پێم وابوو لەوانەیە ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی بێت لەڕۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز یان ڕۆژنامەی واشنتن پۆست یان یەکێك لە کەناڵە تەلەفزیۆنیە ئەمریکیەکان، بەتایبەتی کە ژمارەی تەلەفۆنەکە ئاماژەی بەوە دەکرد کە ژمارەیەکی ئەمریکیە. قسەکەرەکە وەك وەرگێڕێك کاری بۆ یەکێك لە کەسایەتیە ئەمریکیە گرنگەکان دەکرد لە دادگادا، ئەم وەرگێڕە لەبنەڕەتدا عەرەب بوو هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەمریکی بوو، لەباڵیۆزخانەی ئەمریکا لەناو ناوچەی سەوزەوە پەیوەندی دەکرد. داوای لێکردم کاتێك دابنێم بۆ ئەوەی چاوم بەکەسایەتیەك بکەوێت کە بەتایبەتی دێت بۆ عەممان بۆ ئەوەی من ببینێت و پاشانیش دەڕوات بۆ قەتەر بۆ ئەوەی لەوێ چاوی بە پارێزەر نەجیب ئەلنعێمی بکەوێت. هەروەها پێیڕاگەیاندم کە ئەم کەسە لە ٢٠٠٦/٥/٦دا دێت بۆ عەممان. لەو ڕۆژەدا، کەسەکە پەیوەندی کرد پێمەوەو ڕێکەوتین کە ڕۆژی دواتر، واتە لە ٢٠٠٦/٥/٧دا چاومان بەیەك بکەوێت.

لەوکاتەدا دادگا بەڕەوشێکی قورسدا دەڕۆیشت، لەدەست لەکارکێشانەوەو وازهێنانی دادوەرەکانی، سەرەڕای ئەو سەرپێچییە ترسناکانەی کە دادگا ئەنجامی دەدان، دوای ئەوەی کە شایەتەکانی بەرگریی کارێکی باشیان کرد لە پوچەڵکردنەوەی بەڵگەکان سەرەڕای ساختەبوونیشیان. لەیەکێك لە میوانخانەکانی عەممان چاوم بەم کەسە کەوت، کە یەکێك لە هاوەڵە پارێزەرەکان لەگەڵمدا بوون، سەرەڕای وەرگێڕێکی ئافرەت کە سکرتێرەکەی خاتوو ڕەغدیشی لەگەڵدا بوو بۆ ئەوەی هەستێت بەوەرگێڕانی قسەکانمان. پێی وتین: بەوپێیەی کە ڕاوێژکارێکی یاسایم، ئەوا ئەمریکیەکان مووچەیەکی مانگانەی زۆرم دەدەنی بۆیە منیش ئەمریکی نیم!! ( لەهەواڵگریی ئەمریکیی)، ئەرکەکەم یارمەتیدانی بەرگرییە، هیوای خواست کە ئەم دیدارە نهێنی بێت و بەدووربێت لەدەزگاکانی ڕاگەیاندن، هەروەها ئەو پارێزەرانەی کەلەدادگاکەدا و هەتا دادگاش بەم دیدارە نەزانێت. من و هاوەڵەکەم زۆر بەووریاییەوە مامەڵەمان دەکرد. بڕیارەکەمان ئەوە بوو کە گوێی لێبگرین بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بڵێین هەتا ڕاوێژ بە هاوەڵە پارێزەرەکانمان نەکەین و وردەکارییەکان تێنەگەیەنین. پاشان (ڕاوێژکارەکە) بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و وتی:

من بایەخ بەو گرفتانە دەدەم کەلەدادگادا رووبەرووتان دەبێتەوە، هەوڵ دەدەم خاڵێك بۆ پێگەیشتن لەنێوان هەردوولاتاندا بدۆزمەوە، داواتان لێدەکەم جەخت لەلایەنی یاسایی بکەنەوە هەروەها لەسەر ئەو سەلماندنانەی داواکاریی گشتی، چونکە هەموو بەڵگەکانیان لاوازەو دەکرێت بەئاسانی بەرپەرچ بدرێنەوە، هیچ بەڵگەیەکیش نییە بۆ ئەوەی داواکاری گشتیی پێشکەشی کردووە. پاشان ووتی: ئەوپەڕی سزایەك کە بکرێت صەدام وەریبگرێت لەم کێشەیەدا بریتیە لەزیندانیکردنی بۆ ماوەی دوو ساڵ. بەڵام ئاگادارتان ددکەمەوە لەکێشەی دووەم کەئەویش (ئەنفال)ە. لەدۆسێیەی دوجەیلدا، من دڵنیاتان دەکەمەوە کە سەرۆك مەبەست نییە بەڵکو ئەوەی کراوەتە ئامانج بەرزانە. پێویستە لەدۆسێی ئەنفالدا ووریابن چونکە چەکی ناتەقلیدیی تێدایە، پێویستە لەسەرتان لەناو هۆڵی دادگادا ئارامیی و هێمنی بپارێزن و پابەندبن پێیەوە.

پێمان وت ئێمە گرفتی گەورەمان هەیە لەگەڵ لایەنی ئەمریکیدا کە رێگە لەئاڵوگۆڕکردنی کاغەزەکان و بەڵگەنامە یاساییەکان و یاداشتەکان دەگرێت لەنێوان ئێمەو سەرۆك و هاوەڵەکانیدا، وێڕای گرەنتی نەکردنی پاراستنی پارێزەرەکان، وتی: بەنسبەت پارێزگاریکردن لە پارێزەرەکان، دەتوانن نووسراوێك ئاراستەی کاپتن (لیی) (ئەفسەری مارێنز بەپلەی نەقیبی بەرەچەڵەك چینیی بکەن) ، ئەو بەرپرسیاربوو لەپاسەوانیکردنمان. بەڵام بەنسبەت ئاڵوگۆڕکردنی کاغەزو بەڵگەنامەکانەو هەر کاغەزێك هەتا ئەگەر سپیش بێت لەگەڵ صەدام، ئەمریکیەکان لەوە دەترسن یەکێك بەهۆی کاغەزەوە ژەهراوی بکەن، کەبیدەن بەئێوەو لەرێگەی ئێوەوە بیدەنە دەستی ئەو. وتمان: باشە، ئەو کاغەزانە فۆتۆکۆپی بکەن و کۆپیەکەی بدەنە سەرۆك، پاشانیش خۆتان نوسخە ئەسڵیەکان بپشکنن کەلای خۆتانە. بەمەش هیچ گرفتێك لەو رووەوە دروست نابێت چونکە ئەوەی بەدەست سەرۆك گەیشتووە نوسخەی کۆپیەو ئێوە پێتانداوە ئیدی بۆچی رێگە بەئێمە نادەن ئەو کاغەزانەی لێوەریگرینەوە. قسەی زۆرمان کرد لەبارەی ئەو ئاستەنگانەوە کەپەیوەندیان بەکاری دەستەی بەرگرییەوە هەیە لەساختەکردنی ئەنقەستی بەڵگەنامەکان، دوالیزمەیی مامەڵەکردن لەناو دادگادا سەبارەت بەوەی کەتایبەتە بەدەستەی بەرگریی و داواکاری گشتیی. لەکۆتایی دیدارەکەشدا ووتی: پێویستە هەستن بەجیاکردنەوەی پەیوەندی لەنێوان ئێوەو لەنێوان موەکیلەکانتاندا، واتە پارێزەر یا بەرگریی لە تۆمەتبارێکی تر نەکات ( یەکگرتووی پارێزەرەکان و هەماهەنگی پلانەکانی نێوانیان، دادگاو راوێژکارەکانی تووشی شڵەژان کردبوو). هەروەها وتی: بۆ نمونە پێویستە ئەو پارێزەرەی کە بەرگریی

لەصەدام دەکات بەرگریی لە بەرزان یان ڕەمەزان یان هەر تۆمەتبارێکی تر نەکات، هەروەها پێموایە کە تۆمەتباری سەرەکی کە تاوانبار دەکرێت لەم کێشەیەدا بەرزانە.

پێش ئەوەی دیدارەکە کۆتایی پێ بێت کە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك بەردەوام بوو، پێمووت: پێویستە لەسەرت بەئەمریکیەکان ڕابگەیەنیت کە یەکێتی عێراق و ئایندەی و صەدام حوسێن هێڵی سووریان هەیە.

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، ئەگەر ئەمریکیەکان دەزانن کە دۆسێی دوجەیل تۆمەت لەسەر سەرۆك ساغناکاتەوە، ئەی بۆچی خێرا ڕادەستی دوژمنەکانیان کرد تا لەسێدارەی بدەن، تاوانی کوشتنەکەی لەخۆیان دووربخەنەوە..

هەموو کەسێك لەدوور و نزیك دەزانێت کە بڕیاری لەسێدارەدانی سەرۆك صەدام حسێن پێشتر ئامادەکرابوو، ئەوانەیش کە دادگاییەکەیان بەمشێوەیە پێکهێناوە لەدوژمنانی سەرۆکن، دادگاییکردنی سەرۆکیش بۆ ئەوە بوو کە بووترێت سەرۆك بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دادگاییکراوە. بەڵام بڕیاری خێرا لەسێدارەدانی زۆر کتوپڕ بوو بەتایبەتی ئەمریکیەکان قەناعەتیان وابوو کە دۆسێی دوجەیل پێویست بەلەسێدارەدان ناکات، یەکەم دۆسێیەی زنجیرەیەك دۆسێیە کە دواتر سەرۆك لەسەریان دادگایی دەکرێت.

ئەمە ئەو سیناریۆیەیە کە ئامادەیان کردبوو، کە دابەشکردنی تاوانبارکردنەکانە بەسەر دۆسێیەکاندا. وەك سەرۆك صەدام حوسێن وتی، بڕیارەکان بەپێی ناوەکان دەبێت و بەدابەشکردنیان بەسەر دۆسیێ و کێشەکاندا. پرسیارەکەش ئەوەیە بۆچی حوکمی لەسێدارەدانەکە لەمانگی حوزەیرانەوە بۆ مانگی تشرینی دووەم دواکەوت؟

هەندێك زانیاری هەیە کە ئەوە دەگەیەنن چەند لایەنێك لەسەرکردایەتی هەردوو حزبە کوردییەکە، سەرەڕای چەند لایەنێکی تری ناوچەیی و هەرێمیی، ئامۆژگاریی ئیدارەی ئەمریکیان کردبوو کە سەرۆك لەسەر دۆسێیەك لەسێدارە بدرێت لەسەر تاییفەیەکی عێراقی بکەوێت کە زۆر گەورەتر بێت لەکوردەکان، هەروەها خاوەن ئەو حزبانە بێت کە ئامادەیی زیاتریان هەبێت بەرپرسیارێتی ئەوکارە لەئەستۆ بگرن، چونکە متمانەیان بەوە هەبوو کە ڕۆڵەکانی گەلی کورد بەرێژەیەك کە دەگاتە ٩٠٪ بەوە ڕازی نابن.

## ئەمریکاو ئێران و هەڵەبجەو پارێزەرەکان

لێرەدا هەروەها دەپرسین: ئایا رێکەوتنێك لەنێوان ئەمریکیەکان و ئێرانییەکاندا هەبووە بۆ ئەوەی عێراق لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن کە ئەمەش یارمەتی دەرێك بێت بۆ ئەوەی ئەمریکا لەو تەنگو چەڵمە گەورەیەیان دەرچن کەلەعێراقدا تێیکەوتوون؟

پتەوی و خۆڕاگریی سەرۆك بۆ ئەمریکیەکان سەلمابوو، کە ئەو لەناو زیندانەکەیەوە لەگەڵ رۆڵە پاڵەوانەکانیدا لەناو ڕیزەکانی بەرگرییدا لەپەیوەندیدا بوو و کاری لەشەقامی عێراقی دەکرد، هەروەها خۆڕاگریی و پتەویی و باوەڕی بەدادپەروەری کێشەکەی و هەڵوێستی ئازایانەی لەناو دادگادا، هەموو ئەمانە کاریگەرییەکی گەورەیان بەجێ هێشت لای هاوەڵە دیلەکانی لەناو گرتووخانەدا، هەروەها کاریگەرییەکی زۆریشی لای شەقامی عەرەبی و ئازادیخوازانی جیهان بەجێ هێشتبوو لەرۆژنامەنووسان و نووسەران و پەرلەمانتاران و سیاسیەکان و سەرۆکەکانی چەندین وڵات، هەتا زۆرێك لە ئەفسەرە ئەمریکیەکان لەوانەی لەناو زینداندا چاویان پێدەکەوت، هاوسۆزیی خۆیان لەگەڵیدا دەنواندو سەرسام بوون بەکەسایەتیەکەی. پەلەکردن لە لەسێدارەدانی سەرۆك صەدام حسێن لەدۆسیێ دوجەیلدا چەند ڕاڤەو لێکدانەوەیەك هەڵدەگرێت. ئەگەر سەرۆك ئامادەی دۆسێیەی ئەنفال بوایە، ئەوا ئەگەری ئەوە هەبوو ڕەنگە باسی لەهەندێك مەسەلە بکردایە کە ببووایەتە مایەی تەنگەتاوکردنی هەڵوێستی زۆرێك لەوڵاتان، لەوانەش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لەرێگەی هەندێك لەوڵاتانی عەرەبیەوە زانیاریی وەهمی دەدایە عێراق لەبارەی جموجوڵ و شوێنەکانی سوپای ئێرانی. لەهەمانکاتیشدا، ئەمریکاو ئیسرائیل چەکیان دەدایە ئێران (ئێران گێت)، واتە ئەمریکا لەیەککاتدا پەیرەوی لەسیاسەتێکی دووجەمسەرانە دەکرد، تێدەکۆشا بۆ بەهەدەربردن و بەفیڕۆچوونی ووزەو دەرامەتەکانی هەردوو وڵات، عێراق و ئێران، لەیەککاتدا، لەپێناو بەتەنها مانەوەی خۆی و هەژموونکردنی تەواو بەسەر تواناو داهات و دەرامەتەکانی وڵاتانی کەنداوی عەرەبیدا، نزیك بوونەوە لەئاسیای ناوەڕاست و تەحەکومکردن بە چارەنوسی ڕوسیاو چین، لاوازکردنی عێراق و ئێران بۆ ئەوەی قەوارەی جوولەکە وەك تاکە هێزێك بمێنێتەوە لەناوچەکەدا.

سەرەڕای ئەوەش، ئەگەری ئەوە هەبوو کە سەرۆك صەدام حسێن هەندێك زانیاری بدرکێنێت کە هەردوو سەرکردەی دوو پارتە کوردییەکە دەیزانن لەبارەی هەندێك

ووردەکاریی ئەو دانوستانانەی لەنێوان سەرکردایەتی هەردوو پارتەکەو حکومەتی نیشتمانی لەبەغدا ئەنجامدراون. لەوانەش سەرۆک ڕۆژێکیان داوای کردبوو کە جەلال تاڵەبانی لەلێکۆڵینەوە لەدۆسیێەی ئەنفالدا ببێتە شایەت. هەروەها سەرۆک باسی لەزانیاریی و بەڵگەنامە دەکرد کەلای وەزارەتی دەرەوەی نیشتمانی عێراق هەیە، دەربارەی مەسەلەی هەڵەبجە، کەلەوانەیە ئەمریکیەکان و ئەڵمانیا و وڵاتانی تر کەپەیوەندیان بەمەسەلەی هەڵەبجەوە هەیە تەنگەتاوبن، هەروەها نهێنییەکی مەترسیدارو بەڵگەنامەیەکی تەواو بایەخدار هەیە کە ئەم نهێنیە تەنها جەلال تاڵەبانی دەیزانێت. ئەگەر دۆسیێی هەڵەبجە والآبکرێتەوە ئەوا سەرۆك ئەو نهێنییە ئاشکرا دەکات و تیێدا جەلال تاڵەبانی ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبێتەوە. لەبەرئەوە ئەمریکاو شوێنکەوتەکانی هەستان بە جیاکردنەوەی بابەتی ئەنفال لەبابەتی هەڵەبجە تا سەرۆك باس لەبابەتی دووەم نەکات. لەسەرئەمەش ئامۆژگاریی درا بەلەسێدارەدانی سەرۆك. لەم ئامۆژگارییەشدا هەندێك سەرکردایەتی عەرەبی ناسراو بەشداریان کرد!

لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەم کە ئێرانیش هەوڵیدەدا باس لە بابەتی هەڵەبجە نەکرێت لەدادگادا. بەپێی ئەو زانیاریانەش پێمگەیشتوون، ئەوا دەسەڵاتدارانی ئێرانی چاویان بەهەندێك لەئەندامانی دەستەی بەرگریی لەسەرۆك کەوتبوو لەپارێزەرە عەرەبەکان پێش یەکگرتنی هەردوو دەستەی عەرەبی و نێودەوڵەتیی لەپاریس، بە ملیۆنان دۆلاریان خستبووە بەردەستیان لەبەرامبەر ئەوەی لەدۆسیێی هەڵەبجەدا قسە نەکەن، بەرپرسیارێتییەکەی بخەنە ئەستۆی موجاهیدینی خەلقی ئێرانیی ئەگەر ئەو مەسەلەیە وروژێنرا. دەزگای هەواڵگریی ئەمریکاش گروپێکی ناردبوو بۆ ئەوەی چەند نمونەیەك لەخاکی ناوچەکە و ئەو کەسانە وەربگرێت کەلەهەڵەبجە بریندار بوون پاشان هەستابوون بەپشکنینی و سەلمابوو ئەو گازەی بەکارهاتبوو عێراق نییەتی، بەڵکو ئێران لەمێژە چەکدارەکانیدا بەکاری دەهێنێت، ئەوەی کەپێی دەوترێت غازی سیانید، ژەنراڵی ئەمریکی ستیڤن بلیتیریش ئەمەی ڕاگەیاندبوو. لەم بارەیەوە، ئەوە بەیاد دێنینەوە کە سەرۆك صەدام حسێن لەدیدارێکیدا لەگەڵ سیناتۆر بۆی دۆل وتی لەساڵی ١٩٩٠دا، کاتێك ئەمەی دوایی لێی پرسی دەربارەی بەکارهێنانی غازی کیمیاوی لەلایەن عێراقەوە لەهەڵەبجە، وەڵامی سەرۆك ئەوە بوو کە عێراق ئامادەیە کە فڕۆکەی هەلیکۆپتەر بۆ وەفدەکە ئامادە بکات بۆ ئەوەی بیان بات بۆ هەڵەبجەو شارە کوردییەکانی تر بۆ ئەوەی لەوێ چاویان بەخەڵك بکەوێت، هەروەها نموونە لەخاکەکەی وەربگرن بۆ ئەوەی دڵنیابن لەوەی عێراق

ئەو غازانەی بەکارنەهێناوە.

لەبەرامبەر هەموو هەڵوێستە ڕەق و خۆڕاگرانەکەی سەرۆکدا، ئەمریکیەکان گەیشتنە ئەو ڕایەی کە مەحاڵە سازشی لەگەڵدا بکرێت بەتایبەتی لەمەسەلەی ڕوو لەزیادبوونی بەرهەڵستی عێراقیی و درێژبوونەوەی لەمپەڕی باکورەوە بۆ ئەوپەڕی باشور، هەروەها مەحاڵی هەڵگیرسانی جەنگێکی ئەهلیی لەنێوان پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی گەلی عێراقدا. هەروەها لەوە دڵنیابوون کە مەحاڵە ڕیزەکانی سەرکردایەتی عێراقی و هەموو دیلەکانی ناو گرتووخانەکانی ئەمریکا ببڕێت بۆ ئەوەی ببنە شایەتی دەری درۆ لەدژی سەرۆک سەرەڕای هەڵفریواندن و بەڵێنەکان و هەڕەشەکان، هەروەها سەرەڕای لاوازی هەندێك لەقۆناغی یەکەمدا بەهۆی قەبارەی فشارەکانەوە کە ڕووبەڕووی دیلەکان دەبووەوە، بەتایبەتی کەلە هەڵوێستی سەرۆکەوە فێری ئەوە بوون کە بەهیچ نرخێك سازش لەسەر زەوی عێراق و ئازادییەکەی ناکات. سەرۆك فەرمانی بۆ هەموو عێراقیەکان دەرکردبوو، بەعسییەکان و سەربازەکان و پیاوانی بەرهەڵستیی و کەسانی تریش کە دانوستان لەگەڵ ئەمریکیەکاندا نەکەن، بابەتەکە بمێنێتەوە بۆ تەنها سەرۆك و هاوەڵەکانی لەناو گرتووخانەدا، بۆ ئەوەی ئەمریکیەکان بێبەش بکرێن لە لێکۆڵینەوەیان بۆ بڕینی ڕیزەکانی بەرهەڵستیی و دەرهێنانی زانیاری لێیان و کەشفکردنی سەرکردەکانی و پەلکێشکردنیان بۆ سازشکردن لەژێر هەژموونی ئەواندا. ئەمریکیەکان گەیشتبوونە ئەو ڕایەی کە هەر سازشێك لەگەڵ سەرۆکدا کارێکی مەحاڵە، دانوستانیش مەبەست و تەماحکارییەکانیان لەعێراقدا بەدی ناهێنێت.

کۆمەڵێك ئەجندا لەدەوری لەسێدارەدانی سەرۆکەوە ئاڵێنرابوو، کە ئەجندای ئیدارەی ئەمریکی و ئیسرائیلی و ئێرانی سەفەوی و هەندێك لایەنی کوردی ناو دوو حزبە سەرەکیەکە و میلیشیاکانی ئێران بوون کەلەعێراقدا خزمەتی داگیرکاریی ئەمریکیان دەکرد، هەروەها بەکرێگراوەکانی ئەمریکاو بەریتانیاش.

بەپێچەوانەی بەرپرسیارێتیە یاساییەکان و بەپێی ڕێکەوتننامەکانی ژنێف، ئەمریکا هەستا بەڕادەستکردنەوەی سەرۆك صەدام حسێنی دیلی جەنگ بەدوژمن و نەیارە کینە لەدڵەکانی، بۆ ئەوەی لەپیرۆزترین ڕۆژی موسڵمانان و جیهاندا لەسێدارەی بدەن و سوکایەتی پێکردنێکیش ئاراستەی عەرەب و موسڵمانەکان بکەن، هەروەها پەیامێکیش ئاراستەی سەرکردەکانی جیهان و بەتایبەتیش سەرکردەکانی عەرەب بکەن کە ئەمە چارەنووسیی هەر کەسێکە بیەوێت لەماڵی گوێڕایەڵی ئەمریکا بچێتە دەرەوە، پەیامێکیش ئاراستەی کوڕەکان و براکانی بکەن لەڕۆڵەکانی گەلەکەی و بەرهەڵستیی عێراقی بەهەموو

توێژو بەشەکانیەوە لەهەوڵێکدا بۆ شلەژاندنیان و لەرزاندنی باوەڕو پێداگرییان. بەڵام ئەوەی کە ڕوویدا تەواو بەپێچەوانەوە دەرچوو. وا ئەوەتا گەلی عێراق زیاتر بەهێزو یەکریزانە دەوەستێتەوە، ئەوەتا بەرهەڵستیی بەهەموو توێژو ڕیزەکانیەوە یەکدەگرێتەوەو بەهێز توندوتیژترو جێگیرو باوەڕدارتر دەبێت.

## مامەڵەکردن ( ڕێکەوتن ) لەسەر کوشتنی سەرۆک

لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ ئەو چیرۆکانەی کەسەرچاوە ئەمریکیەکان دەیگێڕنەوە سەبارەت بەوەی کەلەکاتژمێرەکانی کۆتاییدا ڕوویداوە:

لەهەوڵێکدا بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی ئەنجامدانی تاوانی کوشتنی سەرۆکێکی شەرعیی دەوڵەت بەتەواوەتی بخەنە ئەستۆی حکومەتی داگیرکەری سەر بەئێران، سەرچاوە ئەمریکیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گەورە ئەفسەرانی ئەمریکی فشاریان خستۆتە سەر باڵیۆزخانەی ئەمریکا بۆ ئەوەی پەیوەندی بەواشنتۆنەوە بکات تا جێبەجێکردنی پرۆسەی کوشتنی سەرۆك دوابخرێت. ئەو سەرچاوانە تا ئەو ڕادەیە دەڕۆن کە هەندێك لەو ئەفسەرانە ئاماژەیان بەوەداوە کە ڕەتیان کردۆتەوە سەرۆك ڕادەستی حکومەتەکەی مالیکی بکەنەوە، حاکمی ئەمریکی کرداریی بۆ عێراق زاڵمای خەلیلزاد، باڵیۆزی ئەمریکا لەناوچەی سەوز شکستی هێناوە لەوەی کە پرۆسەی کوشتنەکە دوابخرێت. هەمان ئەو سەرچاوانە لەدەست نیشانکردنێکدا کە نزیکە لەڕاستیەوە دەڵێن سەرکردەکانی میلیشاکان و چەتە ئێرانییە هەژمونکەرەکان بەسەر حکومەتی داگیرکەردا ڕێکەوتنێکی کراوەیان لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکادا ئیمزا کردووە کاتێك کە سەردانی یەکێك لەپایتەختە عەرەبیەکانی کردووە. لەم ڕێکەوتنەدا مالیکی و عەبدول عەزیز حەکیم و موقتەدا سەدر بەشێوەیەکی ناڕستەوخۆ (لەرێگەی مالیکییەوە) بەشداربوون.

لەبەردەم ئەو بەڵێنە کراوانەدا بەخزمەتکردنی داگیرکەری ئەمریکی و ئامانجەکانی و بەرژەوەندییەکانی لەعێراق، وەڵامی بۆش ئەوە بووە: " سەری صەدامیان ڕادەست بکەن". پێشتریش بۆش پێش سالێك ڕایگەیاندبوو کە ئەرکەکە لەگەڵ کۆتایی هاتنی سالی ٢٠٠٦دا ئەویش کۆتایی پێدێت. باشە لەبارەی چ کارو ئەرکێکەوە دەدوێت جگە لەکوشتنی سەرۆك صەدام حسێن. هەرچیش وتراوە لەبارەی ڕێکەوتنەکان و تاوانی تیرۆرکردنی سەرۆکەوە، ئەوا ئەمریکا بە بەرپرسیاری یەکەم تاوانکاری یەکەم دەمێنێتەوە لەکوشتنی سەرۆك و وێرانکردنی عێراق و ئاوارەکردنی گەلەکەی و دزین و تالأنکردنی سامانەکانیدا.

مامۆستا مازن شندب لە کتێبەکەیدا " گەردەلوولەکان" کەلە ساڵی ٢٠٠٧ دەرچووە دەڵێت: "... سیناریۆی ئەم کردەوە بۆربۆڕێنە ئێرانییە لەو هەڵوێستەوە دەست پێدەکات کە موقتەدا سەدر وەریگرت لەچاوپێکەوتنێك کە بڕیاربوو لەنێوان جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمریکاو نوری مالیکی سەرۆك وەزیرانی عێراقیدا لە عەممانی پایتەختی ئۆردن ئەنجام بدرێت لەکۆتاییەکانی مانگی تشرینی دووەمدا، ئەوکات موقتەدا سەدر هەڕەشەی ئەوەیکرد کە ئەندامێتی وەزیرەکانی لەحکومەتدا هەڵدەواسێت ئەگەر ئەو چاوپێکەوتنە بەئەنجام بگات. موقتەداش دوای بەئەنجامگەیشتنی دیدارەکە لەنێوان ئەو دووپیاوەدا هەڕەشەکەی جێبەجێ کرد، بەڵام یەکێك لە ئەندامانی کوتلەی سەدریی ئەسار ئەلروبەیعیی دواتر ڕایگەیاند، بەدیاریکراویش لە ١٤ کانونی دووەمدا، واتە دوو هەفتە دوای لەسێدارەدانی سەرۆك صەدام حسێن، ڕۆژێك پێش لەسێدارەدانی (بەرزان)و (عەواد بەندەر)، ڕایگەیاند کەبەمزوانە سەدرییەکان دەگەڕێنەوە بۆ حکومەت و پەرلەمان. بەکردەوەش لە ٢١ی هەمان مانگدا گەڕانەوە. ئەم گەڕانەوەیەش ئەو پرسیارەی لای هەموو کەسێك دروستکرد بۆچی موقتەدا سەدر پاشگەزبووەوەو وەزیرو ئەندام پەرلەمانەکانی گەڕانەوە بۆ سەر کارەکانیان دوای ئەوەی بەهۆی ناڕەزایی دەربڕین لەدیداری نێوان بۆش و مالیکی پاشەکشەیان کردبوو؟.. ئەوەی وەڵامێکی دڵسارێژکەری دەوێت بۆ هەموو ئەم جەمسەرە شاراوانە، پێویستە لەسەری قەناعەت بەوە بکات کە هەڕەشەی موقتەدا سەدر بەکشانەوە لەحکومەت و پەرلەمان شتێك نەبوو تەنها ناردنی جفرەیەکی توندو تەواو نهێنی کە موقتەدا ناردی بۆ مالیکیی پێش ئەوەی ئەمەی دوای بڕوات بۆ دیدارکردن لەگەڵ بۆش، پەیامە پێداگرەکەش دەڵێت: " ئەگەر ئەمریکیەکان ڕێگە بەجێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدانی صەدام نەدەن لەیەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان‌دا، ئەوا شیعەکانی عێراق جەنگ لەدژی زیاتر لە ١٥٠٠٠ هەزار سەبازی ئەمریکی ڕادەگەیەنن کەلەناو عێراقدان". لەڕاستیشدا هیچ هەڵبژاردنێك لەبەردەم سەرۆکدا نەمایەوە جگە لەڕازیبوونی ناچاریی بەهەڕەشەکانی موقتەدا، ئەوەش ئەو ڕازیبوونە بوو کەموقتەدا بەگەڕانەوەی وەزیرەکانی بۆ حکومەت وەڵامیدایەوە" (ص ٢٥٠–٢٥٢).

سەرۆك صەدام حسێن لەگرتوخانەکەیدا لەنهۆمی زەمینی لەخانویەکیدا لەسەر دەریاچەی نور، کە دەکەوێتە لای چەپی ئەو پردەی کەبەسەر ئاوەکەدا ڕاکێشراوە بۆ ئەو دەریاچەیە. ئەم خانووە (گرتووخانە)، شارابۆوەو لەڕووی دەرەوە ڕووکەشکرابوو بۆ ئەوەی مانگە دەستکردەکانی سەر بەوڵاتانی تر نەیدۆزنەوە و لەڕووی ناوەوەش بەهەمان

شێوە بەتەپەدۆر ڕووکەش کرابوو بۆ ئەوەی سەرۆك نەیناسێتەوە، چونکە ئەو سەرپەرشتی بوونیادنانی کردبوو، هەروەها لەترسی ئەوەی نەك ئەم زانیارییە بداتە پارێزەرەکانی تا دیاریکردنی ئامانجە بۆ بەرهەڵستیی ئاسان بکرێت.

## دوایین داوای سەرۆك

لەکاتژمێرەکانی یەکەمی شەوی هەینیدا، پێش لەسێدارەدان، هەندێك لەئەفسەرە ئەمریکیەکان ڕیزیان گرت، لەوانەش سەرۆکی گرتووخانەکە، هەستان بە خواحافیزیکردن لەسەرۆك، ئەویش داوای کردبوو خواحافیزی لەهەردوو براکەی بەرزان و سەبعاویی بکات.. کاتژمێرەکان دەڕۆن و سەرۆکیش ئەو شەوە وەك نەریتی خۆی لەسەر نوێنەکەی خۆی دوای نوێژی شێوان قورئان دەخوێنێت.. دوای ئەوەی کە ئەفسەرە ئەمریکییەکە کەسەرۆکی گرتووخانەکە بوو پێیڕاگەیاند کەوا کاتی لەسێدارەدانەکە سبەینیٚ بەرەبەیانە. پاسەوانە ئەمریکیەکان بەوپەڕی وورياییەوە چاودێریان دەکرد پێیان وابوو لەوانەیە خۆی بخنکێنێت.. کاتژمێر چواری بەیانی، سەرۆکی گرتووخانەکە هات بۆ لای سەرۆك، پێیڕاگەیاند کەتەسلیم بەعێراقیەکانی دەکەنەوە، لێیپرسی کە چی داوا دەکات. سەرۆك دەستنوێژی گرتوو و قورئانەکەی هەلگرت ئەوەندە قورئانی خوێند کەلەو کاتە کورتەدا بواری هەبوو. پاشان داوایکرد کە پێداویستیە تایبەتیەکانی بدەنەوە بەپارێزەرەکانی و بۆ ئەوەی بیدەنەوە بەڕەغدی کچی. هەروەها داوای لێکردن کە بەکچەکەی ڕابگەیەنن کە ئەو بەویژدانێکی ئاسوودەو دەستێکی پاکەوە بەڕێوەیە بۆ بەهەشت، بۆ گەیشتن بەدیداری خوای خۆی، ئەو وەك سەربازێك دەڕوات کە قوربانی بەخۆی و خێزانەکەی دەدات لەپێناو عێراق و گەلەکەیدا.

چاکەتە خۆڵەمێشیەکەی لەبەرکرد لەگەڵ کراسە سپیەکەی و قەمسەڵە ڕەشەکەیدا، هەروەها سدارەیەکی بەغدادی لەسەرکرد، پاشان ئەو چاکەتە پارێزەرەی کردە بەری کەوا کاتێك دەڕۆیشت بۆ دادگا یان کاتێك چاوی بەپارێزەرەکانی دەکەوت لەسەربازگەی کرۆبەری باشوری فرۆکەخانەی بەغدادی نێودەوڵەتیی لەبەریدەکرد.

سەرۆك و پاسەوانە ئەمریکییەکانی سواری یەکێك لەو ئۆتۆمبیلانە بوون کە تەرخانکرابوو بۆ گواستنەوەی سەرۆك، کە زرێپۆشێك بوو نیشانەی خاچی سووری نێودەوڵەتی لەسەر بوو، پاشان گوێزرایەوە بۆ یەکێك لە فرۆکەکانی جۆری بلاك هۆکی

ئەمریکی بەپێی هەمان سەرچاوەی ئەمریکی، سەرۆک داوای لێکردن کەچاوی نەبەستن..بۆ ڕامان لەبەغدا... لەوانەشە بەغدا دوایین نیگای خۆشەویستی لەکوڕە کۆچکردووەکەی بڕبێت.. ئاسمانی بەغدای بڕی وەك ئەوەی کەدوایین نیگایی لێبڕوانێت، وەك ئەوەی ئەم شارە کە بوونیادی ناو خۆشی وویست و تەمەنی خۆیی پێبەخشی..وورده وورده دەڕوات و دووردەکەوێتەوە. تەنها چەند خولەکێکی دیاریکراوی پێچوو، هێندەی نەبرد کە فڕۆکەکە لەسەربازگەیەکی ئەمریکی نیشتەوە کە دەکەوێتە ناو دەزگای هەواڵگریی سەربازییەوە لەلای خۆرئاوای ڕوباری دیجلە لەناوچەی کازمییە، ئەم بەڕێوەبەرایەتیە لەسەردەمی داگیرکەردا دابەش کرابوو بۆ سێ ناوچە، یەکێکیان بوو بووە سەربازگەیەکی ئەمریکیی، دووەمیشیان سەر بە هێزەکانی بەناو پاراستی ڕژێم بوو، بەشەکەی تریشی بەرێوەبەرێتی پاراستنی سەر بەوەزارەتی دادی حکومەتی داگیرکەربوو.

سەرۆك لەفرۆکەکە دابەزی بەرەو سەربازگە ئەمریکیەکە چوو، چاوەکانیان بەو چاویلکە تاریکانە داپۆشی کە سوپای ئەمریکی بەکاری دەهێنن کاتێك کە دیلەکان لەشوێنێکەوە دەگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر. سەرۆك بەژمارەیەك لەئەمریکیەکان دەورە درابوو (پیاوانی پۆلیسی سەربازی) (مارشاڵ). برایە ناو بەڕێوبەرایەتیەکەوە، لێرەداو لای یەکەم دەروازەوە ڕۆڵی ئەمریکیەکان کۆتایی هات و بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە.

## ڕادەستکردنەوەی سەرۆك بەحکومەتی داگیرکەر

دوای لابردنی هێلەك یان چاکەتە پارێزەرەکەو چاویلکەکەی چاوی، برایە ناو یەکەم بەش لەبەڕێوەبەرێتیەکە کە ئەویش بنبڕکردنی تیرۆرە، ئەم بەشە تایبەتە بە جێبەجێکردنی لەسێدارەدان (کردەوەکانی کوشتن) بەسەر سەرکردەکان و پاڵەوانەکانی عێراق ئەوانەی کە حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەردەچێت لەدادگا گاڵتەجارییە نا شەرعیەکانەوە لەم سەردەمی ناشەرعیەتی بوونەدا. کاتژمێر پێنج و نیوی بەرەبەیان بوو، کاتی چوونە ژوورەوەی سەرۆك، چەند قەفەسێکی ئاسنینی بینی کە تێیاندا ژمارەیەك لەپیاوە عێراقی و عەرەبەکانی ڕیزی بەرهەڵستیی هەبوو کە فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو بوو.

سەرۆك بەزەردەخەنەیەکەوەو بەشانازیکردنەوەی لێی ڕوانین، ئەو لەڕێگەی

وەستانیانەوە لەوێ هەڵوێستە پاڵەوانانەکانی ئەوانی بۆ دەرکەوت. بەئاراستەی یەکێك لەژوورەکان لەسەر ڕۆیشتنەکەی بەردەوام بوو.. ئەو ئێستا بەو میلیشیا تایبەتیانە دەوری گیراوە کە بەهۆی شەڕی عێراق ئێرانی ساڵەکانی هەشتاوە جنێویان پێدەدا. کاتێك سەرۆك چووە ناو یەکێك لە ژوورەکان پارێزەر منیر حەدادی لەبەردەم خۆیدا بینینەوە کە لەسەردەمی داگیرکردندا بووە دادوەری لێکۆڵینەوە، لەیەکێك لە دانیشتنەکانی لێکۆڵینەوە لە دۆسێی (ڕاگواستنی کوردە فەیلیەکاندا) لەگەڵ سەرۆك صەدام حسێن ساڵی ۲۰۰۵ ڕایگەیاند، کەئەو لەیەکێك لەوڵاتانی کەنداو نیشتەجێیە، ملیۆنێرەو هیچ کەسێك کار ناکاتە سەر بڕیارەکەی. پاشان ووتی بەسەرۆك بەس باس لەسیاسەت بکە صەدام حسێن. تۆ بۆ ماوەی سی و پێنج ساڵ قسەت کرد و تێربووین لەم قسەیە، ئێستا تۆ بەتاوانی جەنگ تاوانباریت.

لەو کاتەدا، گروپەکانی مردن کەسەر بەمیلیشیاکانی سوپای مەهدی بوون لەوێ بوون پێداگرییان دەکرد بۆ ئەوەی بچنە ناو بەڕێوەبەرێتیەکەوە کەسەرۆکی لێ بوو بۆ ئەوەی بیڕفێنن و لەبەرامبەر بڕە پارەیەکی خەیاڵیدا ڕادەستی ئێرانی بکەن. بۆ ئەمەش مالیکی هاتەقسە لەگەڵ موقتەدا سەدردا بۆ خۆلادان لەفەزیحەتێك بخرێتە بارەتەقای فەزیحەتەکانی تریانەوە لەعێراق، هەروەها بۆ ئەوەی ئەمریکاش تورە نەبێت. تاوانی لەسێدارەدانەکەش هەندێك کات دواکەوت تا موقتەدا هات کەهەندێك سەرچاوە باس لەوە دەکەن کە ئەو لەوێ نەبووە لەبەر چەند هۆکارێك کە زانراوە هەروەها بۆ ئەوەی حکومەتی داگیرکەرو هەتا خودی داگیرکەریش تەنگەلاَن نەبن. پاشان موقتەداو پاسەوانەکانی هاتن، کاتێك بینی سەرۆك دانیشتووەو قورئان دەخوێنێت، پێی ووت: ئەمە چۆن ستەمکارێکە؟، سەرۆك بە سووك تەماشاکردنێکەوە لێی ڕووانی کەوای لەیەکێك لەپاسەوانەکانی کرد بەقۆناغی تفەنگەکەی بدات بەسەری سەرۆکدا.

دادوەر مونیر حەداد داوای لەسەرۆك کرد لەسەر ئەو کورسییە دابنیشێت کە بۆی تەرخان کرابوو. پاشان بەو بڕیارەی حوکمی لەسێدارەدانەکەی بەسەردا خوێندەوە لەگەڵ ئیمزای نوری مالیکیدا لەسەری و بێ ئەوەی لەلایەن ئەنجومەنی بەناو سەرکردایەتیەوە ڕەزامەندی لەسەر بدرێت وەك ئەوەی کە خودی یاسای دادگا گاڵتەجاڕەکە دیاری کردبوو.

## سەرۆك لەبەرامبەر پیاوکوژەکاندا چۆن هەڵسوکەوتی کرد

لەو کاتەدا سەرۆك دەستی بەهاوارکردن کرد: بژی گەل، بژی خەبات، بژی نەتەوە، بژی عێراق، بژی فەلەستینێکی ئازادی عەرەبی، کەوتن و شکست بۆ بەکرێگیراوان.. پاشان: ئێمە لەبەهەشتداین و دوژمنەکانمان لەدۆزەخ، هەروەها بەڕووی دادوەری گشتیدا هاواریکرد: بڕوخێت فارس و ئەمریکیەکان و بەکرێگیراوان.. دواتر سەرۆك برایە ژووره شومهێنەرەکەوە کەهەموو سەرکردەکانی گروپی مردن لەوێ بوون لەوانەش: عەبدول عەزیز حەکیم و موەفەق روبەیعیی و عەلی دەباغ و سامی عەسکەریی و بەها ئەعرەجیی و مەریم ڕیس، هەروەها منقز ئەلفرعەون. بێ ئەوەی هیچ ئیمامێکی سوونی لەوێ بێت. سەرەڕای ژمارەیەك ئەفسەری هەواڵگریی ئێرانی کە زمانی عەرەبیان دەزانی و لەژێر ناوی عێراقیدا، لەوێ بوون بۆ ئەوەی دڵنیابنەوە لەکەسێتی سەرۆك کەهاوشێوەکەی نییە وەك بڵاوکرابووەوە. هەروەها ئەفسەرە ئێرانیەکان ئامادەی هەموو حاڵەتەکانی لەسێدارەدان بوون کەبەسەر ئەندامانی سەرکردایەتیدا جێبەجێکران، بەڵکو لێکۆڵینەوەیان کرد لەگەڵ (بەرزان)دا پێش ئەوەی بەچەقۆ سەرببڕن کە عەلی دەباغ وتی گوایە حاڵەتی جیابوونەوەی سەر لەجەستە، حاڵەتێکە بەدەگمەن ڕوو دەدات، یەکێك لەو ئەفسەرانەی ئیتلاعاتی ئێرانی، چووە سەر تەختەی لەسێدارەدانەکەو دەموچاوی داپۆشی بوو. لەدیارترین ئەو ئەفسەرانەش، ئەحمەد فروزەندی گەورە ئەفسەر بوو، بەرپرسی ئیتلاعاتی ئێرانی لەعێراق، کە خێرا دوای ئەوەی لە ئەوروپا گەڕابووەوە و پێش جێبەجێکردنی تاوانەکە، لەگەڵ ئەحمەد چەلەبی و موەفق روبەیعی و جەلالەدین سەغیردا کۆببووەوەو فشاری خستبووە سەریان تا زوو پرۆسەی لەسێدارەدانەکە ئەنجام بدەن. هەروەها ژمارەیەك لەسەرکردەکانی سوپای مەهدی و عەلی ئەدیب و خزیر ئەلخزاعی و سادق ئەلرکابی و کەسانێکی تر لەباڵیۆزخانەی ئێرانی لەوێ ئامادەبوون. بەڵام هۆکاری سەرەکیی لەڕێگرتن لەپارێزەرەکان یان هەر کەسێکی تر لەتایەفەی سوننی لەوێ ئامادەبن، لەبەر بوونی ژمارەیەك لەگەورە سەرکردەکانی هەواڵگریی ئێرانی و سوپای پاسداران و سەکردەکانی فەیلەقی قودسی ئێرانی و لەوانەش ژەنراڵ سلێمانی بوو. ئەمانە پێش ئەوەی سەرۆك سەرکەوێتە سەر تەختی لەسێدارەدانەکە بەزمانی فارسی لەگەڵی قسەیان کردبوو بۆ ئەوەی پەیامێکی ڕوون بدەن بەگوێی سەرۆکدا کەچارەنووسی کۆتایی و چارەنوسی عێراق ئێستا بەدەستی ئێرانیەکانە. ئەم فەزیحەتەش داگیرکەرو حکومەتەکەی پەردەپۆشیان کرد.

## لەسێدارەدانی سەرۆك

سەرۆك بەوپەڕی بەرزیی و بڵندییەوە چووە پێش، بۆ ئەوەی بەباوەڕێکی قووڵەوە پێشوازی لەقەدەری بکات. ئەو کۆمەڵانەش بەجوێن و قسەی ناشیرین پێشوازیان لێکرد، بەڵکو هەندێك لەو بەرپرسانە و سەکردەکانی گروپەکانی مردن وویستان پەلاماری سەرۆك بدەن و لێی بدەن، لەکاتێکدا ئەو هەردوو دەستی بەسرابوو، بەرزو بڵندو خۆڕاگر. وەڵامی دانەوەو پێی ووتن: ئێوە خیانەتکارن... بەکرێگیراون.. دوژمنانی گەلن.. بڕوخێت ئەمریکاو بەکرێگیراوەکانی.. بەسەری ئاماژەی بۆ دەکردن. موفەق روبەیعی قسەی پێ دەووت، سەرۆك پێی وت.. ئێوە تیرۆریستن.. تیرۆریست.. پاشان.. بژی بەرەی بەرهەڵستی.. بژی گەل.. بژی عێراق.. بژی فەلەستین... بژی نەتەوەی عەرەبی. پاشان ووتی کە ئەو خزمەتی عێراقی کردووەو بوونیادی ناوە.

لەو ماوەیەدا. وێنەگرەکەی مالیکی (عەلی ئەلمەسعەدیی) چەند گرتەیەکی وێنەگرت. پاشان میلیشیا خوێنرێژەکان دەستی سەرۆکیان کردەوە کەلەپێشەوە بەسترابوون و دەستەکانیان لەدواوە کەلەپچە کرد، هەروەها ئەو زنجیرانەی کە قاچەکانیان پێبەستبووەوە گۆڕیان بەیەکێکی تر کەتایبەت بوو بەحاڵەتی لەسێدارەدان. سەرۆك داوای لە منقز ئەلفرعەون کرد کە ئەو قورئانەی پێی بوو تەسلیم بە (پارێزەر بدر ئەلبەندر) بکات بۆ ئەوەی بیداتەوە بەخێزانەکەی. سەرۆك لەبەردەم گوریسی هەڵواسینەکەدا وەستا، بەوپەڕی بڵندیی و ئارامیی و باوەڕەوە، وەك ئەوەی کە هەموو جیهانی بینی. ئەم دیمەنە مەزنەی سەرۆك، بەپێچەوانەی ئەوەوە بوو کە ئەلروبەیعیی وتی کە سەرۆك صەدام حسێن ترساو دیاربوو. سەرکەوت بۆ سەر تەختی هەڵواسینەکەو دەیووت: یا ئەڵڵا یا ئەڵڵا. لەبەردەم گوریسەکەدا وەستا بەوپەڕی ئازایەتیەوە، خۆڕاگرو بەرزو بڵند، وەك دارخورمایەکی عێراقی هەڵکشاو.. ئەو وەستانە ئازایانە پێچەوانەی ئەوە بوو کە پیلانگێڕەکان پێشبینیان دەکرد.. ئامادەبووەکان.

ئەو چوار چەتەیەی کەلەبەردەم و دواوەی سەرۆکەوە بوون، لەگەورە سەرکردەکانی گروپی مردن بوون (سوپای مەهدی). ریاز نوری زاوای موقتەدا سەدر پەتی سێدارەکەی خستە ملی سەرۆك، بۆ ئەوەی هیچ کەسێکیشیان ئاشکرا نەبن هەموویان دەمامکیان کردبوو.

چەندێکیش شاردیانەوە نکوڵیان لێکرد ئەوا ئێمە دڵنیاین لەوەی کەلەواقیعدا ڕوویدا، لەناو ئەوانەشدا کەلەوێ بوون و لەسێدارەدانەکەیان جێبەجێ دەکرد موقتەدا سەدر بوو کە

پەتەکەی ملی سەرۆکی ڕێکخستەوە دوای ئەوەی کردبوویانە ملیەوە کە لەلای ڕاستی سەرۆکەوە وەستابوو، دەمامکێکی پۆشی بوو بۆ ئەوەی شوناسی خۆی بشارێتەوە، ئەوەی کردبوو بەمەرج بەسەر مالیکیەوە کە دەبێت بۆ خۆی پرۆسەی کوشتنی سەرۆك ئەنجام بدات.

## بۆچی ٣٩ گرێ؟!

سەرۆك نەیهێشت کیسە ڕەشەکە بکەنە سەری، ڕێگەی پێدان کە بیخەنە ژێر ئەڵقەی گوریسەکەی ملیەوە. ئەم گوریسە ئەمریکییەکان لەسەربازێکی زایۆنیان وەرگرتبوو، بەشێوەیەك دروستکرابوو کە پێچەوانەی یاسا بوو لەڕووی جۆرو درێژی گوریسەکەوە.. وەك ئەوەی وویستی خرایە ملی سەرۆکەوە.. پێش ئەوە، یەکێك لەسەربازە ئەمریکییەکان کەلەبنەڕەتدا جولەکە بوو هاتە ناو هۆڵەکەوە، دەستی کرد بە پێوانەکردنی درێژی گوریسەکە تا گەیشتە ٣٩ گرێ ( کە ئەوە ژمارەی ئەو موشەکانەیە کە عێراق لەساڵی ١٩٩١دا نای بە تەلئەبیبەوە، کە ئەوە لەهۆکارەکانی کینەی جولەکەکان بوو لەسەرۆك سەدام حسێن و هەوڵدان بۆ لەسێدارەدانی )[١٥]، داوای لەئامادەبووان کرد کە ئامێرێکی بڕینی بدەنێ، یەکێك لە پیاوەکان چەقۆیەکی سەربڕینی پێدا، کەئامادە کرابوو بۆ ئەوەی ملی صەدامی پێ بپەڕێنن و سەری لەجەستەی بکەنەوە تا دواتر لەشاری پورە مەراسیمێکی گەورە ڕێکبخەن و تێیدا سەری سەرۆك هەڵگرن و لەگەڵ ووتنی دروشمی تایەفیدا بیسوڕێننەوە، تا دڵیان ئاو بخواتەوە.

موقتەدا سەدر هاتەپێشەوەو گوریسەکەی لەملی سەرۆکدا ڕێککرد دوای ئەوەی دڵنیابوو لەوەی کە ئەوەی لەسێدارەی دەدات صەدام حسێنە نەك هاوشێوەکەی. سەرۆك بەوپەڕی خۆڕاگرییەوە هاتەپێش و چووە سەر ئەو دەرگا ئاسۆییەی کە پانتاییەکەی ٨٠ بە٨٠ سم.

[١٥]- لە ١٩٩١/١/١٧دا سەرۆك نامە بەناوبانگەکەی ئاراستەی هێزی موشەکی عێراقی کرد بۆ ئەوەی دوژمنی زایۆنی موشەك باران بکات. ئەمە دەقی پەیامەکەیە: (( بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان. عەمیدی روکن حازم عەبدولڕەزاق. سڵاوت لێبێت. لەسەر بەرەکەتی خوا دەست بکەن بەلێدانی ئامانجەکان لەناو قەوارەی زایۆنیزمی تاونکاردا بەقورسترین شێوە لەگەڵ پێویستی بەئاگابوون لەبەرامبەر ئەگەرەکانی کەشف بووندا و دەبێت لێدانەکان بەچەکی تەقلیدی (ئاسایی) مووشەکەکان بێت ئەو بۆردومانەش تا ئاگادارکردنەوەیەکی تر بەردەوام دەبێت.

سەدام حسێن ٢٠٠٩/١/١٧

لێرەدا یەکێك لەئەندامانی حکومەت (نەك پاسەوانەکە وەك دەڵێن) بەوشێوەیە تایەفیانەو لەسەر شێوازی ئێرانی هاواریکرد " بەسەلاَواتدان لەسەر موحەممەدو ئالی موحەمەد)، پاشان یەکێکی تریان ناوی محمد باقر ئەلسدری هێنا و ئامادە بووەکانیش ناوی موقتەدایان هێنا..

دوای ئەوە شەڕە قسە ڕوویدا لەنێوان ئەو داخ لەدلاَنەو سەرۆکدا، کە وایکرد سەرۆك وەلاَمیان بداتەوە " موقتەدا ... ئەم قازانە پێشخواردووەیە؟" ..سەرۆك تەنانەت لەو کاتەشدا لەدەست و دەمی ئەو جەلادانە سەلامەت نەبوو. لەدوایین ساتەکانی ژیانیدا.. یەکێکیان کە لەگەورە ئەندامانی حکومەتەکەی مالیکی بوو ووتی " بۆ دۆزەخ" ، سەرۆك وەلاَمی دایەوە: " بۆ بەهەشت بەوویستی خوا لەپێناو عێراقدا. لەوکاتەدا دوان لە گەورە ئامادەبووان دیمەنەکەیان بەمۆبایل وێنەگرت کەیەکێکیان فیلمەکەی بە ١٨٠٠٠ دۆلار فرۆشت بەکەناڵێکی ئاسمانی ئەمریکی!

منقز ئەلفرعەون جێگری داواکاریی گشتیی لەدادگا تایەفییە ناشەرعیەکەدا هەوڵیدا ئەو هاتو هاوارو سوکایەتیکردنانە بەسەرۆك بوەستێنێت، بەلانی کەمەوە لەبەردەم کامێرادا، نەك لەنیازباشیەوە بێت وتی: برایان.. داواتان لێدەکەم، پیاوەکە لەحاڵەتی لەسێدارەداندایە، بەلاَم لەناو ئەو هاتوهاوارەدا بانگەوازەکەی بەر گوێی هیچ کەسێك نەکەوت.

ئەمەش نامۆ نییە بەنسبەت ئەو کەسانەوە کە هێشتاو تائێستاش فەزیحەتەکانیان بەردەوامە لەوکاتەوە کە پیلانیان لەدژی عێراق و سستمە نیشتمانیەکەی داڕشت، هەتا دەگاتە سەر ئەم دادگا گاڵتەجاڕە، هەتا ئەوان پارێزەرێکیان ڕاسپاردبوو کە عبدولسەمەد حسەیینیە و شەهادەیەکی ساختەی پارێزەریی هەیە، تا لائیحەی بەرگریی لەشەهید صەدام حسێن بخوێنێتەوە کەئەمریکییەکان خۆیان ئامادەیان کردبوو، دوای ئەوەی هەستان بەڕێگرتن لەپارێزەرە خۆبەخشەکانی دەستەی بەرگریی و دانانی هەموو بەربەستەکان لەبەردەمیاندا بۆ ئەوەی نەهێڵن بگەنە دادگا.

## ئایا خنکێنرا یان کوژرا؟

سەرۆك بەتەواوەتی شایەتی خوێندو نەیانهێشت شایەتیەکەی دووبارەبکاتەوە.. جەستەی پاکی لەو دەروازە نەفرەتیەوە کەوتە خوارەوە، بەشێوەیەکی ئەنقسەت گوریسەکە درێژکرابوو بۆ ئەوەی سەرۆك بەزیندووی بکەوێتە سەر زەوی و بە لەقەو

ئەقلیدان بیکوژن، هەرواش بوو سەرۆك کەوتە سەر زەوی، بەزەردەخەنەوە سەری بەرزکردەوە، بەلام ئەوان بەشەق تێی کەوتن و بەتوندی لێیاندا بەتایبەتی مۆفەق ئەلروبەیعیی و مەریم ڕیس هەتا لەژێر شەق و تێهەلدانەکانیاندا و بەدوور لەچاوی کامێرا گیانی لەدەستدا. پاشان جەستەی ساردو سڕیان هێناو هەلیانواسیەوە بۆ ئەوەی ئەو ئینتیباعە دروست بکەن کە سەرۆك بەشێوەیەکی یاسایی لەسێدارەدراوە.

دوای ئەوەی فیرعەون هەستا بەسەرۆکایەتیکردنی خۆپیشاندانێك کە تێیدا ئەفسەرە ئێرانیەکان و چەند ئەندامێك لە گروپەکانی مردنی سەر بەئێران تێیدا بەشداریان کرد، خستیانە سەر شانیان و دەستەواژەی ئێرانی و تایەفیان دەوتەوە کە گوزارشتی لە ڕادەی دادپەروەریی و بێگەردی و بێ لایەنی ئەو دادگایە دەکرد کە داگیرکەر دایمەزراندو لە میلیشیاکان و ئەو لایەنانەی کە پەیوەندیان بە دوژمنانی عێراقەوە هەیە (ئێران و ئیسرائیل) پێکیان هێنابوو.

پاشان جەستەی سەرۆك برا بۆ مالی یەکێك لەسەرکردەکانی میلیشیاکان بۆ ئەوەی کارە فارسییە مەجوسیە بەدەکەیان تەواو بکەن. لەوێ چەتە ئێرانیە سەفەوییەکان بە جنێوپێدان و تێهەلدان و چەقاندنی ئامێری تیژ (چەقۆ) بەچەندین شوێنی جەستەیدا پێشوازیان لەجەستەی پاکی شەهیدی عێراق و نەتەوە کرد. لەهەموو ئەمانەشدا هەموو سەرکردەکان و ڕەمزەکانی حزبە ئێرانیەکان و سەرکردەکانی میلیشیا سەفەوییەکان و ئەوانی تر لە پیاوکوژو جەلادەکان لەئێرانیە داخ لەدلەکان لەبەرامبەر ئیسلام و مرۆڤایەتیدا بەشداریان کرد، لەو کاتەدا بەشێوەیەکی هیستریایی هاواریان دەکرد. پاشان هەندێك لە ئەفسەرانی هەوالگریی و پسپۆڕە ئێرانیەکان هەستان بەدلنیابوون لە جەستەکەو شوناسی سەرۆك. دوای ئەوە قوڕقوڕاگەیان بەچەقۆ بڕی لەترسی ئەوەی نەکا بگەڕێتەوە بۆ ژیان. !![16]

وا پلان دانرابوو کە دەزگاکانی وەزارەتی ناوخۆ لەحکومەتی داگیرکەر پرۆسەی لەسێدارەدانی سەرۆك صەدام حوسێن ئەنجام بدەن دوای ئەوەی کە جلی فەرمیی تایبەت بە ڕەوشێکی وەك ئەمە لەبەر دەکەن، بەلام سووربوونی هەندێك لە سەرکردەی

---

[16]- مامۆستا عەبدول باری عەتوان سەرنووسەری رۆژنامەی (القدس العربی) دەلێت، موفەق ئەلروبەیعیی " دانی بەوەدا ناوە کە کاری شەرمەزارمکەر بەرامبەر جەستەی سەرۆك کراوە، دوای ئەوەی کە لەسێدارە دراوە لەلایەن پاسەوانانی دادەوە، کەنایەوێت باسی بکات و خۆیی لێ قوتار دەکات". رۆژنامەی قودسی عەرەبی لە ١/٥/٢٠٠٨دا.

میلیشیاکان بۆ ئەوەی سەرۆك بەدەستی خۆیان لەسێدارە بدەن، پلانەکەی حکومەتی داگیرکەری شێواند.

## ئاماژەکانی شوێنی لەسێدارەدانەکە

جێبەجێکردنی پرۆسەی کوشتنی سەرۆك و هاوەڵەکانی لە بینای هەواڵگریی، زیاتر لەمانایەك لەخۆدەگرێت، سەرەڕای ئەوەی کە داخوازییەکی ئێرانی بوو بەهەماهەنگی لەگەڵ شوێنکەوتەکانیان لەحکومەتی داگیرکەر بڕیاری لەسەر درابوو. پرۆسەی کوشتنەکە لە بینای شوعبەی پێنج لە بەڕێوەبەرێتی هەواڵگریی سەربازیی پێشوو ئەنجامدرا لەهەنگاوێکدا کە هەڵگری کۆمەڵە ئاماژەیەکە پەیوەندی بە ڕق و کینەی سەفەوییەوە هەیە لەعێراق و سەرکردەکەی. ئەویش ئەو شوعبەیەیە کە زانیاری بە هێزە چەکدارەکانی عێراق دەدا لەبارەی دوژمنی ئێرانیەوە لەکاتی جەنگی عێراق ئێراندا. لەبەرئەوە ئەو بینایە هەڵبژێراوە وەك تۆڵەکردنەوەیەکی ئێرانی لەعێراق کە بەسەرۆکایەتی شەهید صەدام حسێن توانی هێرش و هەڵمەتی خومەینی بەرپەرچبداتەوە کە دەیویست داگیری بکات و خاکەکەی بۆ خۆی حەلاڵ بکات پاشانیش وڵاتانی عەرەبی لەکەنداو نیوە دورگەدا داگیربکات.

لەڕۆژی دواتردا، مالیکی بەم بۆنەیەوە ئاهەنگی گێڕا دوای ئەوەی لەگەڵ چەتەکاندا لەڕۆژی جەژنی قوربان‌دا سوکایەتی بە ئیسلام و موسڵمانان کرد، لەم ڕۆژەدا ژنی بۆ کوڕەکەی ئەحمەد هێنا. لەئاهەنگەکەشیدا هەموو ئەو ئێرانیانە بەشداریان کرد کە بەشدارییان کردبوو لە پرۆسەی تیرۆرکردنی سەرۆکداو ئەوانی تریش، دوای ئەوەی هەستان بەدواخستنی جەژنی قوربان بۆ ڕۆژی دواتر بەپێچەوانەی هەموو گەلانی موسڵمان و تەقالیدی شەرعیی کە نابێت بەهیچ شێوەیەك جەژنی قوربان ناکۆکی لەسەربێت چونکە پەیوەندی بە دروشمەکانی حەجەوە هەیە، ئەمەشیان بۆ ئەوە کرد کەلەگەڵ ئێرانیەکاندا جەژن بکەن کەهەمیشە بەجیاوازی ڕۆژێك لەگەڵ وڵاتانی تری ئیسلامیدا جەژن دەکەن کەئەوەش پێچەوانەی دروشمە ئیسلامییە ڕاستەقینەکان و کاتەکانیەتی.

بەڵام پێداگریی مالیکی و لەپێش ئەویشەوە ئەلجەعفەریی کەلەسێدارەدانی سەرۆک صەدام حسێن لەکاتی حوکمڕانیی ئەودابێت، لەبەرئەوە بوو کە دۆسیێی دوجەیل دۆسیێیەی حزبی دەعوە بوو کەهەر دوو مالیکیو جەعفەریی سەر بەم حزبەن، ئەمەش یەکێك بوو لەخاڵەکانی ڕێکەوتنەکەی نێوان ئەمریکاو مالیکی. لەبەرئەمە مالیکی دوای لەسێدارەدانی سەرۆک ووتی بەلایەوە گرنگ نییە کە ئەگەر لەسەرۆک وەزیری لاببرێت چونکە ئەوەی کە دەیوویست بەدیهێنا.

هەندێك پەیوەندی و ووتووێژ هەبوو کە خێزانەکەی سەرۆك و پارێزەرە سەرەکیەکەی سەرۆك لەگەڵ دوو وڵاتی عەرەبیدا ئەنجامیاندا بۆ ئەوەی ئیدارەی ئەمریکی بێتە ناوەوە تا جەستەی سەرۆك بگوازرێتەوە بۆ یەمەن بۆ ئەوەی لەوێ بنێژرێت. لەو ماوەیەدا سکرتێری سەرۆکی یەکێك لەو دوو وڵاتە عەرەبیە پەیوەندی کرد پێمەوە بۆ ئەوەی بەداخەوەبوون و بێزاری خۆی دەرببرێت سەبارەت بەوەی کە روویدا.

جێگری پارێزگاری سەلاحەدین و شێخی هۆزی ئەلبوناسر جەستەی سەرۆکیان وەرگرتەوە. گروپەکانی مردن (میلیشیا تایبەتیەکان و سوپای مەهدی) پلانیان داڕشتبوو بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی ڕێگەی بەغدا- سەلاحەدین بکەن، ئەوانەی تەرمەکەی سەرۆکیان پێیە بیانکوژن و جەستەی سەرۆك برفێنن بۆ ئێران، نرخەکەی هێشتا ئامادەیە و بەملیۆنان دۆلارە، بەڵام هەلیکۆپتەرە ئەمریکیەکان جەستەی سەرۆکیان گوێزایەوە بۆ بنکەیەکی سەربازیی لەتکریت، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی پلانی ئەو تاوانکارانە بەئەنجام نەگات.. لەوێش لە بنکە ئەمریکیەکە، هەزاران خەڵکی عێراقی چاوەڕوانی هاتنەوەی جەستەی سەرۆکیان دەکرد لەگەڵیشیاندا شێخی هۆزو عەشیرەتەکان و ڕۆڵەکانی پۆلیسی پارێزگای سەلاحەدین بەگریانەوە جەستەکەیان وەرگرتەوە لەناو ئەمریکیەکاندا کە سەیری دیمەنەکە سەرسامی کردبوون. لەوەسیتەکەیدا بۆ خێزانەکەی، داوای کردبوو کە تەرمەکەی یا لەشوێنی لەدایك بوونی بنێژرێت یان لەشاری ڕومادی ئەویش وەك ڕێزلێنانێك لەم شارە کە لێیەوە دەستەی بەرگریی دەرچوون، لەبەرئەوەی کە بەرهەڵستیی چۆکی بەئەمریکیەکان داو شکستی پێهێنان لە جەنگەکانی فەلوجەی دلێرو دەستەخۆشکەکانی لە شارەکانی پارێزگای ئەنبار.

مەترسی داگیرکەران و حکومەتی داگیرکەر لەدوای شەهیدبوونی سەرۆکەوە ڕووی لەزیادبوون کرد، گەل لەزۆربەی پارێزگاکانی عێراق و شارەکانیدا ڕاپەڕی، بە ئیدانەکردنی تاوانی داگیرکردن و داردەستەکانی، سەرەڕای شاردنەوەی ڕاگەیاندنی و یاساغکردنی لێپێچینەوە ئەمنیە توندەکان.

لێرەدا ڕێنومایی ئەمریکی هات کە ڕازی نابن تەرمی سەرۆك ببرێتە دەرەوەی عێراق، دەبێت شەوی تەسلیمکردنەوەی لەکاتێکی درەنگی شەودا واتە کاتژمێر سێ و نیوی سەرلەبەیانی لەشوێنی لەدایکبوونی خۆی ، واتە لەعوجە بەخاك سپێردرا.

## سەرۆك تەسلیمکردنی بەرپرسیارێتیە دەستورییەکانی

بەپێچەوانەی نوقلانە لێدان و پڕوپاگەندەکانەوە کە دەوترا سەرۆك، دوای دەرچوونی بڕیاری تیرۆرکردنی، یان لەدوای ڕەزامەندی لەسەر بڕیاری تیرۆرکردنی، فەرمانی کردووە بەرپرسیارێتیە دەستورییەکانی لەحزب و دەوڵەتدا بداتە بەرێز عزەت ئیبراهیم، ئەمە قسەیەکی ڕاست نییە، چونکە سەرۆکی شەهید دەزانێت کە ئەوە پێچەوانەی واقیع و پێچەوانەی دەستوری عێراقی و پەیڕەوی ناوخۆیی حزبە. دەستوری عێراقی مومارەسەکردنی هەموو دەسەلاتە دەستورییەکانی سەرۆك دەداتە جێگرەکەی لەکاتێکدا ئەگەر خۆی نەیتوانی ئەو دەسەلاتانە مومارەسە بکات وەك لە حالەتەکانی (دیلی، مردن، شەهیدبوون یان هەر حالەتێکی تری ڕێگر) بەبێ ئەوەی پێویست بەوە بکات بڕیارێکی تر لەو بارەیەوە دەربچێت. دوای مومارەسەکردنی ئەو دەسەلاتانەی سەرۆك و ئەمینداری هەرێمیەوە بەشێوەیەکی کرداریی، پرۆسەیەکی هەلبژاردنی نوێ دەکرێت، لەکاتێکدا کە ڕەوشەکە گونجاو بوو.

بەلام پەیڕەوی ناوخۆی حزب، ئەویش هەموو دەسەلاتەکانی سەرۆکی ئەمینداری هەرێم دەداتە جێگرەکەی لەحالەتێکدا ئەگەر سەرۆك نەیتوانی موماسەرەی دەسەلات و بەرپرسیارێتیە حزبیەکانی بکات، بەشێوەیەکی خۆبەخۆیی جێگر دەبێتە ئەمینداری هەرێم بەوەکالەت و دوای ئەمە هەلبژاردنێکی نوێ دەکرێت بۆ هێشتنەوەی سەرۆك یان گۆڕینی.

بەپێی ڕێسا دەستورییەکان و دەقەکانی پەیڕەوی ناوخۆی حزب، وەك مافی خۆی، ئەوا بەڕێز عیزەت ئیبراهیم جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و جێگری سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان لەدوای دیلکردنی سەرۆکەوە مومارەسەی ئەو دەسەلآتانەی سەرۆکی کردووە، چونکە ڕەوشی سەرۆك ڕێگەی پێنەداوە خۆی بەشێوەیەکی تەواوەتی مومارەسەی دەسەلآتە دەستورییەکانی بکات، لە ٢٠٠٣/١٢/١٣ەوە کە مێژووی دیلکردنی سەرۆکە، بۆ ئەوەی هیچ بۆشاییەك لەسەرکردایەتیدا دروست نەبێت چ لەحزب یان لەدەوڵەتدا بەڕێز عیزەت ئیبراهیم مومارەسەی ئەو دەسەلآتانەی کردووە. لەیەکەم دیداریشمدا لەگەڵ سەرۆك لەکۆتایی ساڵی ٢٠٠٤دا جەختی لەوە کردووە کە هەموو دەسەلآتەکانی بەشێوەیەکی خۆبەخۆیی گوێزراوتەوە بۆ جێگرەکەی. پاشان لەدیداری دووەمیشدا لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٥دا جارێکی تر سەرۆك جەختیکردەوە کە ووتی: " بڵێ بە ئەبو ئەحمەد" لەشوێنی ئاسایی خۆیدا بێت و مومارەسەی دەسەلآتەکانی بکات و ڕێگە نەدات هیچ گرفت و بۆشایەك دروست بێت".



صەدام حوسێن چەند ساتێك
پێش لەسێدارەدانی



وێنەیەك لەنامەی سەرۆكی شەهید صەدام حوسێن لەرۆژانی پەلامارە سی دەوڵەتیەكە بۆ سەر عێراق لەساڵی١٩٩١دا، كە بۆ سەرۆكی هێزی مووشەكی عێراقی ناردوویەتی تا دوژمنی زایۆنیی بۆمباران بكات.

# بەشی بیست و شەشەم

# ڕاسپاردەکە - بەڵگەنامە مێژوییەکە

داواتان لێدەکەم کە پارێزگاریی لەو مانایانە بکەن کەوای لێکردوون بە لێهاتووییەوە هەڵگریی باوەڕبن، ببنە چرای درەوشاوە لەشارستانیەتدا، هەروەها زەویەکەتان لانکەی پێغەمبەران ئیبراهیمی خەلیل و ئەوانی تر بپارێزن لەسەر ئەو مانایانەی کە وایلێکردن ماناکانی مەزنیی بەشێوەیەکی متمانەپێکراو فەرمیی لەپێناو نیشتیمان و گەلدا هەڵگرن.

(صەدام حسێن لەزیندان)

سەرۆک صەدام حسێن بە پێنوسەکەی خۆی ڕاسپاردەکەیی نووسی و ئاراستەی گەلی عێراق و نەتەوەی عەرەب و ڕۆڵەکانی هێزە عێراقییە چەکدار و خەباتگێڕەکانیی کرد.
ڕاسپاردەکە وەک بەڵگەنامەیەکی مێژوویی گشتگیر هاتووە بۆ هەموو ماناکانی جەنگی نیشتمانی و باوەڕداریی و خەباتگێڕیی کە عێراقیەکان پێی هەستان و هەتا ئێستاش هەڵگریی پەرچەمەکەیین بەڕووی هێزە داگیرکەرو زایۆنیزمەکان و گەلچییەتیدا کە چاوی بڕیوەتە سەروەت و سامانەکانی عێراق، هەوڵی وێرانکردن و پارچە پارچەکردنی دەدات بۆ خزمەتکردن بە تەماحکاریی و ڕق و کینەکانی، لەپێناو جێبەجێکردنی پرۆژەکانی زایۆنیزمدا، کە سەرۆکی شەهید شەرەفی سەرکردایەتیکردنی لایەنێکی گەورەو بنچینەیی هەبوو تێیدا.
ئەمەی خوارەوەش دەقی ئەم بەڵگەنامە مێژووییەیە:

وێنەی لاپەڕەی یەکەم لەوەسیەتەکە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قل لن يصيبنا إلا ما كتب الله لنا هو مولنا وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾

ئەی گەلی عێراقی مەزن..

ئەی هێزە چەکدارە دلێرو خەباتگێڕەکان

ئەی خاتوونە عێراقیە شکۆمەندەکان

ئەی ڕۆڵەکانی نەتەوە مەزنەکەمان

ئەی ئازاو باوەڕدارەکان لەنێو ڕیزەکانی بەرهەڵستیدا

وەك دەزانن لەڕۆژانی ڕابردوودا، خوای گەورە ویستی وابوو جارێکی تر لەمەیدانی خەبات و تێکۆشاندا بمەوە لەسەر ئەو شێوازو ڕۆحیەتەی کە پێش شۆڕش تێیدا بووین لەگەڵ نەهامەتیەکی قورس و ناڕەحەتتر. خۆشەویستان، ئەم ڕەوشە سەختە کە هەموومانی تێداین و عێراقی مەزنی پێوە گیرۆدە بووە، وانەیەکی نوێیە و بەڵایەکی نوێیە بۆ ئەوەی هەرکەسێك بەپێی توانای خۆی دەرکی پێبکات و بیناسێت، کەلەئێستادا لەبەردەم خوای گەورەو لەبەردەم خەڵکدا ناونیشانێکی نوێی بۆ دەبێت، کاتێك ئەم ڕەوشەی کە ئێستا ئێمە تێیداین دەبێتە مێژووییەکی مەزن و دەبێتە بنچینەیەك کە سەرکەوتنی لەسەر بوونیاد دەنرێت بۆ قۆناغە مێژوویەکانی ئاییندە، هەڵوێست تێیدا ڕاست و ڕەسەنە نەك بەپێچەوانەوە، جگە لەمەش هەر هەڵوێستێکی تر ساختەو دژە.. خۆبەهێزکردنی هیچ و پوچەکان بەپەنابردنیان بۆبیانیەکان و بۆ زاڵ بوون بەسەر خوێش و هاوڕەگەزەکانی خۆیاندا هیچ و پوچ و بێ ڕێزییە وەك خودی ئەو کەسانەی ئەمە دەکەن.

سەرئەنجام ئەوەی کە ڕاست و دروست دەمێنێتەوەو ئەوەش ناڕاست و ساختەیە دەڕوات و نامێنێت " اما الزبد فيذهب جفاء، واما ما ينفع الناس فيمكث في الارض" صدق الله العظيم.

ئەی گەلی مەزنی عێراق... ئەی خەڵكانی نەتەوەكەمان و مرۆڤ دۆستان... زۆرێك لەئێوە خاوەنی ئەم وتارەی ناسیوە لەڕاستگۆیی و بێگەردیی و دەستپاكیی و سووربوونی لەسەر مافەكانی گەلەكەی و دانایی و تێڕوانینی و دادگەریی و پێداگریی لەسەر چارەسەركردنی مەسەلەكان و پێداگریی لەسەر پاراستنی ماڵ و موڵكەكانی خەڵك و دەوڵەت، هەروەها ئەوەی كە هەموو شتێك لەویژدان و عەقڵیدا بژی، دڵی بەئازار بێت، دەروونی ئارام نەبێتەوە هەتا لەئاست و ڕێزی هەژاران بەرزنەكاتەوەو پێداویستییەكانی كەمدەرامەتەكان دابین نەكات، هەروەها دڵ بكاتەوە بۆ هەموو گەل و نەتەوەكەی، هەروەها باوەڕدارو سەرڕاست بێت.. بێ ئەوەی جیاوازی بكات لەنێوان ڕۆڵەكانی گەلەكەیدا تەنها بەكۆششی دڵسۆزانەو توانستی نیشتمانی نەبێت. ها من ئەمڕۆ و بەناوی ئێوەوەو لەپێناو چاوەكانی ئێوەو چاوەكانی نەتەوەكەمان و چاوەكانی ئەوانەی دادپەروەرانی ئەهلی هەق و ڕاستیەوە كە من بەیداخەكەیم بەرزكردۆتەوە دەڵێم: ئەی عێراقیەكان.. ئەی گەل و كەسوكارەكانمان، ئێوە براو سەركردەی خۆتان ناسیووە وەك چۆن كەسوكارەكەی خۆی دەیناسن، سەری بۆ ستەمكارە لەخۆبایی و لوتبەرزەكان نەوی نەكرد، وەك شمشێرو ئاڵایەك مایەوە لەڕووی ستەمكاراندا. ئایا ناتانەوێت هەڵوێستی براو كوڕو سەركردەتان بەوشێوەیە بێت..؟! بەڵێ بەوشێوەیە... پێویستە صەدام حسێن وابێت و هەڵوێستەكانیشی بەمشێوەیە بێت، ئەگەر خوا نەكردەش، هەڵوێستەكانی بەمشێوەیە نەبوایە، ئەوا هەر خۆی ڕەتیدەكردەوە، لەسەر ئەمەش پێویستە هەڵوێستەكانی ئەو كەسەی كەدەبێتە سەركردەتان و دەبێتە بەیداخێك لەنەتەوەدا بەهەمان ئەم شێوەیە بێت..

ئەوەتا من خۆم دەكەمە قوربانیی، ئەگەر خوای بەخشندە وویستی لەسەری بوو، ئەوا بەرزی دەكاتەوە بۆ ئەو شوێنەی كەخۆی فەرمانی پێدەكات لەگەڵ شەهیدان و ڕاستگۆیاندا، ئەگەر بڕیارەكەشی دواخستن بەو شێوەیی كەخۆی ئیرادەو خواستیەتی ئەوا هەر خۆی بەخشندەو میهرەبانە، هەر ئەو دروستیكردوین و هەر بۆ لای خۆیشی دەگەڕێینەوە. ئارامیەكی جوان و داوای كۆمەك و یارمەتی لەو دەكەین بۆ ئەوەی بەسەر زاڵمان و ستەمكاراندا سەركەتومان بكات.

برایان.. ئەی گەلی مەزنی عێراق.. داواتان لێدەكەم كە پارێزگاریی لەو مانایانە بكەن كەوای لێكردوون بەلێهاتوویەوە هەڵگری باوەڕبن، ببنە چرای درەوشاوە لەشارستانیەتدا، هەروەها زەویەكەتان لانكەی پێغەمبەران ئیبراهیمی خەلیل و ئەوانی تر بپارێزن لەسەر ئەو

مانایانەی کە وایلکردن ماناکانی مەزنیی بەشێوەیەکی متمانەپێکراو فەرمیی لەپێناو نیشتیمان و گەلدا هەلگبرن. بەلکو هەموو ژیانی خۆی و ژیانی خێزانەکەی گەورەو بچوکیانی هەر لەسەرەتاوە کردۆتە بارمتەی نەتەوەو گەلە مەزن و بەوەفاو جوامێرەکەی، بەردەوام بووە لەسەری و نەچەماوەتەوە.. سەرەڕای هەموو ئاستەنگ و گەردەلولەکان کە پێش شۆڕش و دوای شۆڕش خۆمان و ولاتەکەمان پێیدا گوزەری کرد. خوای گەورە وویستی وا بوو صەدام نەمرێت، ئەگەر ئەم جارە وویستی ئەوەی لەسەربێت، ئەو ڕواندویەتی و.. ئەو پێیگەیاندووەو تائێستاش پاراستوویەتی.. بەوەش نەفسێکی باوەڕدار شانازیی بەشەهیدبوونیەوە دەکات، کەسانێکیش هەبوون کە بەدەرونێکی ئاسوودەو لەسەر ئەم ڕێگەیە ڕۆیشتوون لەصەدام حسێنیش تەمەنیان کەمتر بووە. ئەگەر خوای گەورە وویستی شەهید بێت، ئەوا ئێمە سوپاسگوزاریی دەکەین پێشترو دواتریش.. ئارامێکی جوان دەگرین لەسەری و داوای کۆمەکیش لەو دەکەین بۆ زالبوون و سەرکەوتن بەسەر زالمان و ستەمکاراندا لەسایەی مەزنی پەروەردگاری بەرزو بالادەست و سایەداریی بۆ ئێوە... لەنمونەی ئەو سایەدارییەی خوای پەروەردگاریش بۆتان ئەوەیە کەجۆرو تایبەتمەندییەکانی بۆ سانا کردوون بۆ ئەوەی تێیدا ببنە نمونەیەك چاوی لێبکرێت لەخۆشەویستی و لێبوردەیی و پێکەوە ژیانی برایانە لەنێوانتاندا.. هەروەها بوونیادێکی بلندی مەزن لەسایەیەکدا کە خوای بەخشندە فەراهەمی کردووە لەتواناو شیاوییەکان.. خوای گەورەش نەیوویستوە ئەو ڕەنگ و جۆرانە ببێتە قورساییەك بەسەرتانەوە، بەلکو وویستویەتی تاقیکردنەوەیەك بێت بۆ پرداخکردنی دەروونەکان، لەناو ڕیزەکانی ئێوەشدا کەسانێك هەبوون، یان لەوانەی کە لەپشتی ئەتلسیەوەن، هەروەها لە فارسە کینە لەدلەکانیش بەهۆی کردەوەی فەرمانڕەواکانیانەوە کە لەکیسراوە بۆیان ماوەتەوە، بوونەتە جێگرەوەی شەیتان، بیرو هاوردەی خراپی خستۆتە دلی ئەو کەسانەوە کە گوێڕایەلی لێدەکەن بۆ پلانگێڕیی لەدژی هاوڕەگەزو هاونیشتمانیەکانی خۆیان یان لەسەر دراوسێکەی، یان ئاسانکاریی کردووە بۆ تەماح و ڕق و کینەی زانیۆنیزم کە نوێنەرەکانی لەکۆشکی سپی بجولێنێت بۆ ئەوەی هەستن بەدوژمنکاریی، ڕق و کینەیەك بخولقێنن کە بەدوورە لە بەها مرۆڤایەتیەکان و لەبیرو باوەڕەوە..

لەسەر بنچینەی مانای باوەڕو خۆشەویستی و ئاشتی، نەك ڕق و کینە، بەبێ هیچ ململانێیەك کۆشکەکەتان بوونیادناو بەرزتان کردەوە. لەسەر ئەم بنچینەیەش ئێوە بە ئاشتی و سەربەرزیی و لەڕەنگو ڕشیدارەکەتانداو لەسایەی نیشتماندا و لەڕابردوویەکی نزیکدا ڕێتان دەکرد، بەتایبەتیش دوای شۆڕشە مەزن و تێکۆشەرەکەتان شۆڕشی حەڤدە–

سی ئەمموزی ساڵی ۱۹٦۸، سەرکەوتن و نیوە بەشێوەی عێراقیکی مەزن و یەککرتوو هەڵتانگرت.. وەك براو خوشەویستانی یەکتر، ئەگەر لە سەنگەری جەنگدا بووبن یان لەگۆرەپانەکانی بوونیادناندا.. دوژمنانی وڵاتەکەشتان لە داگیرکەران و فارسەکان کە ئاوێتەیی و شەپۆلی سیفەتەکانی یەکێتی نێوەیان بینیەوە کە بۆتە بەربەست لەنێوان ئەوان و لەنێوان ئەوەدا کەوا بتانکەنە کۆیلە خۆیان، فیڵ و پلان و کینەی کۆنی خۆیان لەنێوانتاندا چاندووە کە بەنسبەت نێوەوە ئەوانە نوێن، لەبەرامبەریشدا کەسانێکی نامۆ کە هەڵگری ڕەگەزنامەی عێراقین چوون بەپیریانەوەو وەلامیان دانەوە و دڵیان پڕکردن لەڕق و کینە. پێیان وابوو کە خستنەوەی جیاوازی و ڕکابەری لەنێوانتاندا زاڵ دەبن بەسەرتانداو لاوازتان بکەن و دەتوانن مەرامەکانیان بهێننە دی لەوەی کە بتانکەنە دوژمنی یەکتری و ڕووبەڕووی یەك ببنەوە لەبری ئەوەی بەیەکرێزی و خۆڕاگیری و هیممەتەوە وێڕای جیاوازی ڕەنگ و شێوەتان هەمووتان لەژێر پەرچەمی مەزنی (الله أكبر)دا لەدژی دوژمنە ڕاستەقینەکانتان بوەستنەوە.

برایان، خەباتگێڕان و تێکۆشەران، لەپێناو ئەمەدا ئێستا داواتان لێدەکەم با ڕق و کینەتان نەبێت، چونکە کینەو ڕق هیچ بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ خاوەنەکەی کە بەویژدان و دادپەروەر بێت، چونکە ڕق بەرچاو ڕوونی کوێر دەکات، پەنجەرەکانی بیرکردنەوە دادەخات، خاوەنەکەی دووردەخاتەوە لەبیرکردنەوەی هاوسەنگ و هەڵبژاردنی ڕاست و دروست و خۆلادان لەچەوتیی، هەروەها بینینی گۆڕانکارییەکان لەزەینیدا دەگرێت سەبارەت بەوەی کە بەدوژمنی دادەنێیت لەناویشیاندا ئەو کەسە لادەرانە کاتێك کە دەگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و دروست، ڕێگەی گەلی ڕەسەن و نەتەوەی مەزن و شکۆدار..

هەروەها خوشك و برایان، ئەی ڕۆڵەکانم و ڕۆڵەکانی عێراق و هەڤاڵە تێکۆشەرەکان داواتان لێدەکەم ڕقتان لەگەلانی ئەو وڵاتانە نەبێتەوە کەدوژمنکارییان لەدژتان نواندووە، بەڵکو تەنها ڕقتان لە کارەکەیان بێتەوە، بەڵکو هەتا ئەوەی کارەکەی شایانی ئەوەیە لەدژی بجەنگێن و ڕووبەڕوویان ببنەوە، با وەك مرۆڤ وەك کەسانی شەڕانگێز ڕقتان لێیان نەبێتەوە، بەڵکو ڕقتان لەکارە شەڕەکە بێت، بە هەقی خۆی بەرپەرچی شەڕو خراپەکارییەکانی بدەنەوە.. ئەوەیش کەچاك بوو هاتەوە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست، ئەگەر لەناوخۆی عێراقدا بوون یان لەدەرەوەی، ئەوا لێی ببورن، لاپەڕەیەکی نوێی لەگەڵدا بکەنەوە، چونکە خوای گەورە لێبوردەیەو ئەو کەسانەشی خۆش دەوێت کە لێبوردەن، بەلام خۆڕاگرییش پێویستە ئەگەر ڕەوشەکە ئەوەی ویست، بۆ ئەوەیش کە لەلایەن گەل و نەتەوەوە قەبوڵ بکرێت، پێویستە لەسەر بنچینەی یاسابێت، هەروەها دادپەروەرو

بەویژدانانە بێت، نەك دوژمنكاریانە بێت لەسەر بنچینەی كینەو تەماعی نامەشروع.. هەروەها پێویستە برایان ئەوە بزانن كەلەناو ئەو گەلانەدا كە دوژمنكاریان لەبەرامبەردا نواندون خەڵكانێك هەن پشتیوانی لەخەباتەكەتان دەكەن لەدژی داگیركەران، هەندێكیشیان خۆیان بەخشیوە بۆ ئەوەی بەرگریی لە گیراوەكان و لەناویشیاندا لەصەدام حسێن بكەن، هەندێكی تریش فەزیحەتەكانی داگیركەرانیان كەشف كردووە یان نارەزاییان لەدژی دەربڕیوە، هەندێكیشیان بەڕاستگۆیی بەكوڵ دەگریان كاتێك كە ئەركەكەی تەواو دەبێت و بەجێمان دەهێڵێت.. بۆ ئەمەش داواتان لێدەكەم یەك گەلی سەر ڕاست و دڵسۆزبن بۆ خۆتان و بۆ نەتەوەكەتان و بۆ مرۆڤایەتیی.. ڕاستگۆ لەگەڵ خۆی و لەگەڵ غەیری خۆیشیدا. ئەی گەلی بەوەفاو جوامێر ئێوەش و خۆشم دەسپێرم بە خوای بەخشندە كە لای ئەو ڕاسپاردە وون نابێت و دڵی باوەڕدارێكی ڕاستگۆو سەر ڕاست ناشكێنێت و بێ هیوای ناكات..

الله اكبر... الله اكبر.. بژی نەتەوەمان.. بژی مرڤایەتی بەئاشتی و ئارامیی مادام بە ویژدان و دادپەروەرانە مابێتەوە.. الله اكبر.. بژی گەلی خەباتێگڕی مەزنمان .. بژی عێراق.. بژی عێراق.. بژی فەلەستین و بژی خەبات و خەباتگێڕان.. الله اكبر..سووكیی ڕیسوایی بۆ دوژمنان.

**صەدام حوسێن/ سەرۆك كۆمارو**

**سەركردەی گشتیی هێزە چەكدارە تێكەشەرەكان**

**٢٠٠٦/١١/٤**

**وێنەی لاپەڕەی كۆتایی وەسیەتەكە**

# بەشی بیست و حەوتەم

# دەستەی بەگری .. ووشەی ڕاست

صەدام حسێن دەگۆڕن بۆ هێمایەك بۆ سەدان ساڵ چونکە ئەو بەرگریی لە کێشەی گەلەکەی و نەتەوەکەی کردووە کەلەناو ویژدانیدا سرەوتووە، ئەو و کێشە دادپەروەرەکان.. کەواتە لەسەرەتاوە تا کۆتایی سوپاسگوزاری خوا دەکەم لەسەر ئەم وێنەیە کەبەجێگیریی و چەسپاویی ماوەتەوە.

(صەدام حسێن دوای ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر بڕیاری لەسێدارەدانی)

- تشكلت هيئة الدفاع برئاسة الأستاذ خليل الدليمي
ولولاها منذ تشكلت، لم يكن تعيينه بقرار دولة ولا بقرار [illegible]
وإنما لدوره الوطني الشجاع ـــ إن ما يدافع [illegible]
الآن [illegible] بالموت [illegible] [illegible]
الشجعان وخليل في مقدمتهم، جزاهم الله خير جزاء في
الدنيا والآخرة، إنه سميع مجيب، [illegible]
أقول لهم [illegible] [illegible] القرار في كل [illegible]
مرة واحدة بصيغة توجيه، أنني أود [illegible].
[illegible] خير الرجال، [illegible] وإنني أتعامل مع
الأستاذ خليل وكأنه ابني في الثقة، [illegible]
وأحبه
والسلام عليكم.

٢٠٠٦/٧/٥

صورة منها إلى الأستاذ
خليل الدليمي للعلم والتفضل.

وێنەی نامەیەکی سەرۆك صەدام حوسێن کە پەیوەندی بەسەربەخۆیی کاری دەستەکەوە هەیە تێیدا دوو دەستەواژە شاردراوەتەوە بەهۆی چەند ئیعتیباراتێکەوە کە پەیوەندی بەسەرۆکەوە هەیە

هەر لەوکاتەوە کەدەستەی بەرگریی لەسەرۆک Sەدام حسێن و هاوەڵەکانی دامەزراوە، ئێمە لەپەیوەندیدا بووین لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا کە بایەخ پێدەرن و سوورن لەسەر سەلامەتی عێراق و سەرکردایەتیە شەرعییەکەی لەهەموو شوێنەکانی جیهانەوە. تێیاندا پیاوانی یاساو دادوەرو پیاوانی سیاسەت و شاعیران و خەڵکانی ئاسایی. ڕاو بۆچونەکانیانمان پێدەگەیشت، ئەوانیان بەسوود بوونایە وەرماندەگرتن. لەهەندێک لەبەرگریەکانیشماندا دەستەبژێرێک لە دیارترین پیاوانی یاساو زۆرێک لە بلیمەتەکانی ئەو بوارە بەشداریان کرد. ئێمە پەیوەندییەکان و ڕاسپاردەو ڕێنومایییەکانیانمان وەردەگرت، ئیجابی بوونایە یان سلبی. ئەو پەیوەندیانەو بەتایبەتیش ئەوانەیان کە من وەرمدەگرتن، تێیدا خاوەنەکانیان داوایان دەکرد کە سەرۆک صەدام حسێن هەستێت بەئاراستەکردنی نامەی ڕوونکردنەوە بۆ سەرکردەکان و لەوانەش سەرکردە عەرەب و ئەوروپییەکان و پاپای ڤاتیکان کە تێیدا ڕاستی مەسەلەکان ڕوون بکاتەوە، ئەوانەیان کەپەیوەندیان لە دوژمنکارییەوە هەیە بۆ سەر عێراق، ئەوەی کەڕوویداوە لەوێرانکاریی و ترسان لەئایندەیەکی نادیار بۆ عێراق. ئێمە هەندێک لەو تێبینیانەمان دەنارد بۆ سەرۆک کە دەیویست ئاگاداری هەموو وردەکارییەکان بێت بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕووداوەکاندا یەک یەک بڕوات.

یەکێک لە هاوەڵە پارێزەرەکانم ڕاسپارد کە ئەم تێبینیانە لە ٢٠٠٦/١٢/٢٦دا بگوازێتەوە بۆ سەرۆک و پرسیار لەسەرۆک بکرێت کە ئایا ئارەزووی ئەوە دەکات بەدەست و خەتی خۆی پەیامێک بنێرێت بۆ پاپای ڤاتیکان ئەوەی بۆ ڕوونبکاتەوە کەڕوویداوە، هەروەها بەسەرۆک ڕابگەیەنن کە من ئامادەم تا نامەکە بەرم بۆ پاپا بەڵکو ئەو نامەیەو هی تریش بەشداری بکات لەپەلەکردندا بۆ ئەوەی ئەوروپییەکان بێنە ناوەوە تا سیاسەتی ئەمریکی لەعێراق بگۆڕن، هاوشێوەی ئەو نامانە بێت کە سەرۆک پێشتر ئاراستەی گەلی ئەمریکی و عێراقی کرد. بەڵام وادیارە سەرۆک ڕایەکی تری هەبوو، بۆیە وتی: " چی بڵێم بەهاوەڵەکانم... من جگە لەخوای خۆم داوا لەهیچ کەسێک ناکەم".

## سەربازانی ڕاستی و دادپەروەریی

دەبێت لێرەدا، ووشەی ڕاست بووترێت لەبارەی برا پارێزەرەکانمەوە، لەدەستەی بەرگریی لەسەرۆکی شەهید صەدام حسێن و هەموو گیراوە عێراقیەکان، یان ئەوانەی کاریان کرد

لەگەڵ دەستەی بەرگری لەگروپی بەرگریدا. ئەوان سەربازی دڵسۆزو بەوەفابوون و بەهەموو مانایەكی ووشە پاڵەوان بوون. هەموویان وەك شانەیەكی هەنگ كاریان دەكرد، ژیانیان خستبووە خزمەتی ئەم كێشەیەوەو بەردەوام لەگەشت و هاتووچۆدا بوون ئیدی لەگەڵ دامەزرێنەرە بەراییەكانی دەستەكەدا بێت لەعێراقی و عەرەب و بیانییەكان، یان لەوانەی كە دواتر پەیوەندییان پێوە كرد، دوای ئەوەی هەلیان بۆ ڕەخسا بەتایبەتی هەموو هاوەڵە عێراقیە پاڵەوانەكانم بێ هەڵاوێردەی هیچ یەكێكیان لەوانەی كە ئەندامبوون لە دەستەی بەرگریدا یان ئەوانەی لەگەڵ دەستەكەداو لەناو گروپەكەدا كاریان دەكرد، ئەمانە خێزانەكانیان لەگەڵ ئەو هەموو نەهامەتیانەی كەتێیدا دەژیان بەجێهێشتبوو بەتایبەتی ئەو منداڵانەی كە بێبەش بوون لە خوێندنەكانیان بۆ ماوەی دوو تا سێ ساڵ، بەهۆی ئەو هەڕەشەو مەترسیانەوە كە لەناوەوەی عێراقدا هەبوون، هەندێك تووشی ڕفاندن بوون، یان بەهۆی زەحمەتی خوێندنەوە لەدەرەوەی عێراق، یان بەهۆی گواستنەوەوە لەوڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر، یان بەهۆی هۆكاری ماددییەوە كە بوو بووە هۆی ئەوەی نەتوانن پارەی خوێندنەكانیان بدەن بەتایبەتی لەهەندێك وڵاتدا كە خوێندن پارەی زۆری دەوێت.

هەروەها دەبێت لێرەدا ئاماژە بۆ بەشێك لەئەندامانی دەستەی پشتیوانی بەرگریی لەسەرۆك و هەموو گیراو و دیلەكان بكەم، كەبەرگریان لەسەرۆك كرد، ئەمە لەكاتێكدا كە بەشەكەی تریان بەرگریان لەگیراوەكانی تر دەكرد. بەڵام گروپی بەرگریی ئەوەیە لەناو دادگادا چاوی بەسەرۆك كەوتووەو بەرگریی لێكردووە، ئەندامەكانیشیان هەموویان ئەندام نین لەدەستەكەدا. بەڵام دەستەی سێیەم بریتیە لە "دەستەی كتوپڕیی"، بەڕێزان : ڕەمزی كلارك و ئەحمەد بن بیلاو دكتور مهاتیر محمد و ڕۆلان دۆما لەخۆ دەگرێت. كاری ئەم دەستەیە چاودێریكردنی ڕادەی جێبەجێكردنی دادپەروەرییە لەدادگادا. هەندێك لەهاوەڵە پارێزەرەكانیش ڕۆڵێكی دیاریان هەبوو لەدامەزراندنیدا، لەوانەش پارێزەر مامۆستا زیاد ئەلخەصاونە و پرۆفیسۆر كێرتیس دۆبلێر و دكتۆر نەجیب ئەلنعێمیی، سەرەڕای ئەندامەكانی تری. ئەم دەستەیە توانی هەموو سەرپێچییەكانی دادگا و پێشێلكارییەكانی بخاتەڕوو، بۆ ئەمەش قسەی لەگەڵ زۆربەی كەسایەتی و ڕێكخراوەكان و دامەزراوە نێودەوڵەتیەكاندا كرد سەرەڕای سەركردەكانی جیهان، هاوكاریی دەستەی پشتیوانی كردن لەچالاكیەكانیدا..

لێرەدا دەبێت لەپێشەوە ناوی پارێزەرە شەهیدەكان بێنم ئەوانە كە خۆیان كردە قوربانی بۆ عێراق، ئەوانیش شەهیدان خەمیس ئەلعوبەیدی جێگری سەرۆكی دەستەی بەرگریی

(لەساڵی ٢٠٠٦دا شەهید بوو) هەروەها شەهید سەعدون ئەلجەنابی و شەهید عادل ئەلزوبەیدی (ساڵی ٢٠٠٥ شەهید بوو) ، لیستەکەش درێژ دەبێتەوە تا هەموو ئەو شەهیدە پاڵەوانانە دەگرێتەوە کە لەدوای خۆیانەوە خێزانەکانیان بەبێ ڕێوشوێن و بەخێوکەرێك بەجێهێشت. هەروەها لەبیرم نەچێت کە بەوپەڕی ڕێزەوە سوپاسی کۆششی هاوەڵ و براکانم بکەم ئەندامانی دەستەی بەرگری کە پێکهاتوون لەو عێراقیانەی کەبەوپەڕی توندییەوە لەناو دادگادا بەرگرییان کرد، ووشەی ڕاستیان لەڕووی دەسەڵاتی ستەمکاری ئەمریکاو شوێنکەوتەکانی ئەمریکاو بەکرێگیراوەکانیدا وت، لەپێشی هەموویانەوە مامۆستای پارێزەرەکان دکتۆر مەجید سەعدون وتەبێژی دەستەکەو جێگری سەرۆکەکەی، هەروەها بەدر عەواد ئەلبەندەر کە جارێك بەرگریی لەباوکی و جارێکیش بەرگریی لە سەرۆك دەکرد، هەروەها سامر ئەلخزاعی. هەروەها من هەموو ڕێزو ستایشێك ئاراستەی هەموو پارێزەرە عێراقیەکان دەکەم ئیدی ئەوانەیان کە لەدەستەی بەرگریدا بوون یان لەپشتیوانانی بوون کە ناتوانم لەبەر هۆکاری ئەمنیی ناویان بهێنم، سەرەڕای سەدان کەس لەو پارێزەرە عێراقیانە لەهەردوو ڕەگەزەکە، کە لێرەدا ناوی پارێزەرانی ئەنبار دەهێنم کە کرۆکی دەستەکەو لانەی بنچینەیی بوون، کە لەبەر هۆکاری ئەمنی ناویان لێرەدا ناهێنم.

هەروەها ڕێزو سوپاسم بۆ مامۆستای پارێزەر وەدود فەوزی شەمسەدین، ئەندامی گروپی بەرگریی کەلەگەڵ دەستەکەدا بەڕۆحی جەنگاوەرەوە کاری کرد، هەروەها دکتۆر عەلی ئەلبەیاتی. هەروەك چۆن سڵاوم ئاراستەی دکتۆر محمد ئەلعوبەیدی دەکەم بۆ وتارە نایابەکانی و باسەکانی کە لە ئەرکە مێژوییەکەماندا یارمەتیداین. هەروەها سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی لەم جەنگەماندا تەنها یەك ووشەی نووسیوە. هەروەك چۆن سوپاسی مینبەری ئازادی عێراق و شۆڕشگێر دەکەم، مینبەری دەروازەی عێراق (بەسرە)، بۆ هەموو نووسەر و تێکۆشەرەکانی. هەروەك چۆن ڕێزو پێزانینم بۆ هەموو ئەوانەی کاریان کرد لەگەڵماندا لەپارێزەرە مووەکیلەکان لەلایەن خێزانی دیلەکانەوە، بۆ بەرگرییکردن لەئەندامانی سەرکردایەتی و وەزیرەکان و سەرکردە سەربازییە دیلەکان.

هەروەها دەبێت ئاماژە بکەم بۆ هەموو ئەو هاوەڵە پارێزەرە پاڵەوانە عێراقی و عەرەب و بیانیانە، لەهەردوو ڕەگەز کەوا کاریان کرد لەگەڵماندا ئیدی ئەندام بن لە دەستەی بەرگریدا یان لەگروپی بەرگرییدا، کەبەئارەزووی خۆیان هاتبوون بۆ ئەوەی بەرگریی لەسەرۆك صەدام حسێن بکەن، بێ ئەوەی هیچ شتێك لەبری ماندووبوونی کۆششەکانیان وەربگرن ئیدی ئەوانەی کەلەدەستەکەدا بوون یان لەخێزانی سەرۆك یان لەهەر لایەنێکی ترەوە،

ئەویش لەڕووی باوەڕبوونیان بەوەی کە بەرگریی لەسەرۆك، بەرگرییە لەشەرەفی پیشەی دادوەری و پیشەی پارێزەری، لەڕووی دەسەڵاتێکی ستەمکاردا کە زۆرداریی بەسەر دەسەڵاتی هەق و یاسادا دەکات. هەروەك چۆن هەموو پارێزەرەکان، ژن و پیاو، عەرەب و بیانی، دەیانزانی کە خۆبەخشینیان بۆ بەرگریکردن لەسەرۆك صەدام حسێن، بەرگرییە لە عێراق و گەلەکەی لەوەی کە ڕووبەڕووی بۆتەوە لەدوژمنکارییەکی هەمەجی و دڕندانە، دوژمنکارییەکی بەردەوام لەماوەی زیاتر لە سی ساڵی ڕابردوودا، پلانگێڕییەکان لەلایەن هێزی شەڕو تاریکیەوە، بۆ جەنگێکی پاکتاوکردن لەدژی گەلە خۆڕاگرە شۆڕشگێڕەکەی، دژی دەسکەوتەکانی کەوا گەلی عێراق بەدرێژایی مێژوو بوونیادی ناوە.

بۆ هەموو ئەو هاوەڵانەم هەموو ڕێزو ستایشێکم هەیە، لەمنەوەو لەگەلی عێراق و نەتەوەو خێزانی دیل و شەهیدەکانەوە.

هاوەڵەکانم لە پارێزەرە عێراقی و عەرەب و بیانیەکان، لەنووسینگەی دەستە هەتا کاتێکی درەنگی شەو کاریان دەکرد، بۆ ئەوەی لیستەکانی بەرگریی ئامادە بکەن. بەڵام هەندێکی تریان، لەوپەڕی زەویەوە ماوەی زیاتر لەچواردە کاتژمێر دەفڕین و لەوانەش زیاتر لەبیست کاتژمێریش، بۆ ئەوەی لەوێوە بێن بۆ ئۆردن کە ئەویّ خاڵی دەرچوون بوو بەرەو گرتوخانەکەی سەرۆك لەعێراق. هەندێکیان زیاتر پێداگربوون لەسەر بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیان، بۆ سەرخستنی ڕاستی، بێگوێدانە تەمەنی درێژی وەك دلاوەری پارێزەر ڕەمزی کلارك.

هەندێك لەئەندامانی دەستەی بەرگریی هەبوون، کارەکەی خۆیان بەجیّ دەهێشت وەك پارێزەرێکی نێودەوڵەتی بەناوبانگ، بۆ ئەوەی بێتە ڕیزی ئێمەوە بەئەزموون و شارەزایی و ئازایەتیەکانی دەوڵەمەندمان بکات، وەك پارێزەر دکتۆر نەجیب ئەلنعیمی، هەڵوێستەکانی پارێزەر خاتوو بوشرا خەلیل کە تەنها بوونی ئەو لەناو دادگادا بەس بوو بۆ ئەوەی دادوەر ڕەئووف تورەیی بیگرێت. هەروەها ڕۆڵی پشتیوانی نایاب و تایبەتی پارێزەر مامۆستا سەعد ئەلئەعزەمی، پارێزەر دکتۆر قەیس ئەلعەلوانی. هەروەها مامۆستاکانی یاسا دکتۆر غەسان ئەلجندی لەئۆردن و دکتۆر حەسەن عومەر لەمیسر. ئەم هەڵوێستانە هەڵوێستی ئێمە هەمووومانی بەهێز دەکرد سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی گۆڵمەزنانەوە لەنێوان پارێزەرەکاندا.

ئۆردن، بەگەلە ڕەسەنەکەیەوە، ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لەم ئەرکە مەزنەدا. لەپێشیانەوە مامۆستا محمد نەجیب ئەلراشدان کە یەکێك بوو لەدیارترین پیاوانی یاسا، یەکێك

لەدامەزرێنەرەکانی دەستەکە. ئەو هەڵبژێردرابوو بۆ ئەوەی ببێتە هەماهەنگیکارێکی دەستەکە، عەرەبیەکی ڕەسەن و ئازا، بەڵام لەبەرچەند هۆکارێکی دیاریکراو، خێزانی سەرۆک دوری خستەوە لەئەرکەکەی. لەدوای ئەو ئەم ئەرکە گرانە، کەوتە ئەستۆی یەکێك لەڕۆڵە ڕەسەنەکانی هۆزەکانی ئۆردن کەئەویش پارێزەر مامۆستا زیاد ئەلخەصاونەیە، کە بەوپەڕی ئەمانەت و دڵسۆزییەوە بەردەوامیدا بەکارەکەی مامۆستا ئەلرشدان. لەسەردەمی ئەودا هەردوو دەستەکە یەکخرا، عەرەبی و نێودەوڵەتیی و دەستەی بەرگریی لەعێراق کەپارێزەر خەلیل دلێمی لەشاری ڕومادی دایمەزراند کەدواتر بووە جێگری سەرۆکی دەستەی پشتیوانی. کە ڕادەی فشارەکان لەسەر دەستەی پشتیوانی و لەسەر مامۆستا خەصاونە گەیشتە ڕادەیەك کە نامەیەکی دەستنوس ئاراستەی خێزانەکەی سەرۆك و نامەیەکی تریش ئاراستەی سەرۆك صەدام حسێن بکات کە داوای ئەوە بکات ئەندامێتی هەڵپەسێردرێت، بەڵام لەچالاکیە ڕاگەیاندنە چڕەکەی بەردەوام بوو، لەپێناو ئەم ئەرکە نەجیبەدا زۆری چەشت. هەروەها ئەو مامۆستایانەی کەدامەزرێنەری دەستەکە بوون پارێزەری گەورە سالح ئەلعەرموتی و پارێزەرە پاڵەوانەکان زیاد ئەلنەجداوی، حاتم شاهین عسام ئەلغزاوی، عومەر ئەبوئەلراغب و سالح ئەلمەغریبی، سەرەڕای ئەندامەکان کەئەوانیش پارێزەران دکتۆر محمد ئەبو جەبارو پارێزەر حاتم ئەلغوری و پارێزەر سەمیح خریس و ژمارەیەکی زۆر لەپارێزەرە ئۆردنیەکان. کەموداخەلەکانی پارێزەر مامۆستا ئەمین ئەلدیب، وەك یەکێك پارێزەری خۆبەخش کەلەمیسرەوە هاتبوو، کە داواکاری گشتیی لەبەردەمیدا تەنگی پێهەڵچنرا لەبەردەم پرسیارەکانی ئەم پارێزەرە ئازایەدا، کەبووە مایەی سەرسامکردنی سەرۆك و زیاتر ڕێزگرتن لەگەڵ میسر لەڕێگەی ئەوەوە، هەروەها پارێزەر محمد جنیدی، کە ڕۆڵی تەواوکاریان هەبوو بۆ ئەم کۆبوونەوە نایابەی پارێزەرەکان.

ڕۆڵی پارێزەرە تونسیەکانیشم لەبیرناچێت، پارێزەر ئەحمەد ئەلسدیق و پارێزەر دکتۆر فەوزی بن موراد. بەڵام لەلیبیا ئەوا دکتۆرە عائیشە قەزافیی ڕۆڵی دیاری هەبوو لەدامەزراندنی دەستەکەو پشتیوانیەکەیدا، کە سەرۆك خۆشحاڵ بوو بە خۆبەخشی ئەو بۆ ئەوەی بەرگریی لێ بکات، سەرەڕای هاوەڵەکانی پارێزەرەکانی لیبیا لەئەندامانی دامەزرێنەر، پارێزەر مامۆستا محمد عەلاقی و پارێزەر مامۆستا سالح ئەلرغشی، پاشان ئەندامی دەستەکە دکتۆر عەبدوڵا حەبیب. هەروەها ڕۆڵی سودانمان لەیاد ناچێت کە باشترین پیاوانی یاسایان نوێنەرایەتیان دەکرد، لەپێشیانەوە مامۆستای پارێزەر تەیسیر مدسر کەیەکێك بوو لەدامەزرێنەرانی دەستەکە، نەقیبی پارێزەرانی سودانی پارێزەر

مامۆستا فەتحی خەلیل. هەروەها لەمەغریبیش پارێزەر مامۆستا خالد ئەلسفیانی.
لەبەرحرێنیش پارێزەر مامۆستا عیسا بو رەشید کەلەدامەزرێنەرانی دەستەکە بوون.
هەروەها پیاوە رەسەنەکانی یەمەن لەپێشانەوە مامۆستایان: پارێزەر محمد حەزام پاشان
پارێزەر عەبدولا نوعمان و هاوەڵەکانی تری. هەروەها لەئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو
پارێزەر دکتۆر ئیبراهیم مەلاو لەسعودیەش پارێزەر خاتوو ریم و هەموو هاوەڵە
پاڵەوانەکانی، نامانەوێت ناوی هەر هەموویان بێنین تا نەبینە مایەی تەنگپێهەڵچنینیان.
لەلوبنانیش، پارێزەر دکتۆر عەدنان زەناویی یەکێك بوو لەدامەزرێنەرانی دەستەکە.
لەفەرەنساش پارێزەر مامۆستا ئیمانۆیل لۆدۆ و هاوەڵەکەی پارێزەر مامۆستا ماسیۆ،
پارێزەر مامۆستا ئەندریە شامیە و مامۆستا رۆلان دۆما وەزیری دەرەوەی پێشوی فەرەنسا
کە بەوپەڕی ئازایەتیەوە رەتیکردەوە بەفرۆکە یان ئۆتۆمبیل یان هەر ئامرازێکی تر کە
ئالای ئەمریکی بەسەرەوە بێت بگوێزرێتەوە بۆ شوێنەکەی سەرۆك.. سەرۆك زۆر رێزی لەم
هەڵوێستەی دەگرت و دەیووت: " رێز لەم هەڵوێستە نایابە دەگرم، وای دادەنێم کە هاتووە
و لێرە بەرگریی لەمن کردووە، هەموو رێزو ستایشێك بۆ ئەو و بۆ فەرەنسای
خۆشەویستمان و خۆشەویستی هەموو گەلانی عەرەبی". لەئیسپانیاش پارێزەر مامۆستا
خافێر یافدراو لەژاپۆن ژمارەیەك لەپارێزەران. هەروەها رۆڵی ئەو ئافرەتە ئازاو دلێرانەمان
لەیاد ناچێت کە بوونە پشتیوان و هاندەری براکانیان لەدەستەی بەرگریدا هەندێکیان
پێداگرییان دەکرد لەسەر بەشداریکردنی راستەوخۆ. بەلام ئێمە رەوش و بارودۆخی
ئەوانمان لەبەرچاو دەگرت، لەبەر هۆکاری ئەمنی ناویان ناهێنین، چونکە لەناوەوەی
عێراقدا دەژین. هەروەها باس لەرۆڵی پارێزەر مامۆستا عەبدول حەق ئەلعانی و پارێزەر
سەبح ئەلموختارو پارێزەر دکتۆر محمد ئەلشێخلی دەکەین کە بۆ ووتنی قسەی هەق و
راستیی و بێ سڵکردنەوە عێراقیەکانی سەرسامکرد.

هەروەها رۆڵی گەورەی یەکێتی پارێزەرانی عەرەبمان لەیاد ناچێت کە کەمتەرخەمیان
نەنواند لەگەڵماندا لەمەسەلەی بەرگرییکردن لەسەرۆك صەدام حسێن و لەعێراق. ئەو یەکەم
رێکخراو بوو کە بەرروونی رایگەیاند کە دانناێت بەو دادگایەداو ئەوەی لەعێراقدا روو
دەدات، لەپێشی هەموو ئەمانەشەوە مامۆستا سامح عاشور و عەبدول عەزیم ئەلمەغربی و
هاوەڵەکانی تری کەخاوەنی هەڵوێستی بەرزو ئازایانەبوون. هەروەها سوپاس بۆ
سەندیکایی پارێزەرانی عەرەب لەپێشەنگیانەوە سەندیکای پارێزەرانی ئۆردنی دلێرو
قارەمان. ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە زۆربەی ئەو پارێزەرانەی کە خۆیان بەخشی بوو بۆ

بەرگریکردن لەسەرۆك لەعەرەب و بیانییەکان بوون کەبەهۆی ئەو ئاستەنگانەوە کە دادگا دای نابوو ڕەزامەندی لەسەر بریکارنامەکانیان دەرنەبڕا.

هەروەها پێویستە سوپاسی خۆم ئاراستەی پارێزەرە مالیزیەکان بکەم، لەپێشی هەموویانەوە دکتۆر مەهاتیر محمد و دکتۆر زەکریا خەلیل نەقیبی پارێزەرانی مالیزیا و دکتۆر مسایوس. هەروەها هەموو سوپاس و ڕێزێکم بۆ بەڕێز ئەحمەد بن بێللا و بەڕێز نیلسۆن ماندێللا و بەڕێز جۆرج گالوی و هەموو ئەو کەسایەتیانەی کەلەگەڵماندا وەستان.

هەموو ئەو پارێزەرانە نمونەی ئازایەتی و پارێزەرانی ڕاستی ودادپەروەری بوون. داوای لێبوردنیش ئەکەم کە ناویانم نەهێناو لەبەر ترسان لەوەی تووشی گرفت و تەنگەڵانی بن یان بەهۆی زۆری ژمارەکانیانەوە. هەموو دڵنیان کەگەلی عێراق و نەتەوەی عەرەبی بەهەموو ولاتەکانیانەوە، ڕۆڵی دەستەی بەرگریی لەیاد ناکەن، کە خشتی یەکەمیان دانا بۆ بەرگریکردن لەهەقی مافخوراوان لەبەرگریکردن لە نیشتمانەکانیان، ئەمە لەکاتێکدا کە لایەنەکەی تر دەستوری عێراقی هەڵدەوەشاندەوەو دادگاییەکی ساختەی پێکدەهێنا لەژێر قەمەو سونگ بەدەستانی بیانی و داگیرکەردا.

هاولاتی عەرەبی شانازی بەم دەستەی بەرگرییەوە دەکات. چونکە بەرگریکردن لە صەدام حسێن واتە بەرگریکردن لەهێمای نەتەوە کەخیانەتی لەو بەڵێنە نەکرد کە دابووی بەگەلەکەی و هەتا دوایین ساتەکانی تەمەنی دڵسۆزو وەفادار مایەوە بۆ بنەماکانی گەل و نەتەوەکەی.

هەروەها ڕۆڵی دیاری هەموو پیاوانی ڕاگەیاندن و پیاوانی ئایینی و سیاسەت و ئەوانی تر لەیاد ناکەین کە لەمێژوودا بەنەمریی دەمێنێتەوە کەپشتیوانی مەعنەویان لێکردین، هەروەها ئەوانەی کەلەگەڵ گەلی عێراقدا مانەوە لەنەهامەتیەکانیاندا بەجێیان نەهێشتن، هەروەها لەگەڵ بەرگریی عێراقی پاڵەواندا مانەوە، هەروەها لەگەڵ سەرۆکی شەهید صەدام حسێندا.

هەروەها من سوپاس و ڕێزم هەیە بۆ هەموو ئەوانەی لەگەڵ ئێمەو خێزانی دیلەکان و خێزانی عێراقیەکاندا وەستانەوە. هەروەها سوپاس بۆ هەموو ولاتانی عەرەبی کە لەگەڵ ئێمەو عێراقدا وەستان و پشتیان بەرنەداین. هەروەها هەموو سوپاسێك بۆ شانشینی ئۆردنی هاشمیی کە دەستەی بەگریی لەئامێز گرت، زۆرێك لەفشارەکانی قەبوڵکرد کە بەهۆی بوونی دەستەی بەرگریی لەسەر خاکەکەی لەسەری بوو، هەروەها سوپاس بۆ ڕۆڵەکانی و هۆزە بەڕێزو وەفادارەکانی بۆ عێراق و گەلی عێراق و سەرکردەی عێراق.

هەروەها من و هاوەڵەکانم سڵاوێکی پاکو دۆستانە دەنێرین بۆ خێزانی دیلە ئارامگرو خۆڕاگرە پاڵەوانەکان کە لەناو زیندانەکانی داگیرکەرو حکومەتەکەیدان.
وەئەگەر هەر دەبێت ووشەی کۆتایی بڵێین، دوای ئەم گەشتە قورس و زەحمەتە ئەوا دەڵێین:

ئێمە ڕووبەڕووی هەموو هەوڵەکانی ئازاردان بووینەوە لەلایەن دوژمنانی عێراق و دوژمنانی سەرۆك صەدام حسێنەوە، هەروەها ئەو پەڕی ئازارمان چەشت لەدەست هەموو ئەوانەی کە بوونە مایەی ئازار بۆمان یان هەوڵیاندا بەهەموو ڕێگەو شێوازەکان ئازارمان بدەن، پێش ئێمەش ئازاری سەرۆکیاندا، بەڵام لەپێناو عێراقدا ئارامیمان گرت و خۆڕاگربووین، هەروەها لەپێناو سەرۆکی شەهید صەدام حسێندا، هیوادارین توانیبێتمان ئەمانەتەکەمان گەیاندبێت. هەوڵیش دەدەین برینەکانی ئەو ڕۆژانە لەیادبکەین و بەردەوامیش دەبین لەسەر کاروانەکە هەتا هەموو دیلەکانمان و عێراق ئازاد دەبن، وڵاتی شارستانیەتەکان و کاسەی سەری عەرەب و ناوەندی شارستانیەتە گەورەکەیان.
لەکۆتاییدا دەڵێین ئەم یاداشتانە و ئەوەی کە سەرۆك بەدەستی خۆی نووسیوویەتەوە تاکە یاداشتێکن کە ڕاستیەکان دەخەنەڕوو ڕووداوەکان وەك خۆیان دەگوێزنەوە.
لەکاتێکدا کە هەندێك شت بڵاوکراوەتەوە، بەردەوامیش لێرەو لەوێ بڵاودەکرێتەوە، چیرۆکی ساختەو لاواز لەداهێنراوی ئەم یان ئەو لایان لەبارەی ژیانی سەرۆك و زیندانەکەی و شەهیدبوونیەوە، هەموو ئەوانە، جگە لەیاداشتەکانی سەرۆك و ئەم کتێبە کەبەشێکە لێی، هەرچیەکی تر بڵاوبکرێتەوە شتێك نییە جگە لەهەوڵگەلێکی بێ هودە کە دەدرێن ئیدیی یان بۆ بازرگانیکردنە، یان بۆ شێواندنی وێنەکەیە بەهەمان ئەو شێوەیەی کە ئامرازی پروپاگەندەی خۆرئاوایی پێش داگیرکردنی عێراق و لەدوای داگیرکردنیشیەوە کاری بۆ کرد.

شتێکی زانراوو تەواو ئاشکراشە کەبۆچی هەموو ئەو هەوڵانە بایەخیان پێدەدرێت و دەهۆڵیان بۆ لێدەدرێت، چونکە ئامانجەکەی چەواشەکردنە، چەواشەکردنیش بەشێکی جیانەبووەوەیە لەچەکی جەنگ بۆ هێشتنەوەی داگیرکەر و بەرگریکردن لە تاوانەکانی و تاوانی شوێنکەوتەکانیش. وە ئەگەر ئێمە لەدوو سەنگەردابین ئەوا ئەوان لەسەنگەری دژدان، بەڵام ئەمە، سەنگەری خودی شەهیدە، ئەمەش تاکە جیاوازییەکەیە، کە ئەمەش جیاوازییەکە بەتەنها خۆی یەکسان دەبێت بەهەموو شتێك.
بەسروشتی حاڵیش ئەوا ئەم یاداشتانە هەموو ئەوە لەخۆی ناگرێت کە سەرۆك ووتویەتی،

هەروەها هەموو ئەوەش نییە کەنووسیووییەتی، هەروەها هەموو ئەوەش نییە کە وویستوویەتی بیخاتە بەر ڕۆشناییەوە. چونکە مەسەلەگەلێگ هەبوو کە پەیوەندیان بەخۆیەوە هەبوو، لەڕووی ئەمانەو پیشەییەوە ئەوان وەك مولکی کەسیی خۆی دەمێننەوە.

پاشان مەسەلەی تریش هەبوون پەیوەندییان بە بەرهەڵستی و خەبات و تێکۆشانەوە هەبوو کەهێشتا هاوەڵەکانی سەرۆك بەردەوام لەبەخشینی خوێنی خۆیان لەپێناویدا، ئەمەش ناچاری کردین کەڕەچاوی ڕەوشەکە بکەین. ئەمە لەکاتێکدا کە ئامانجی ئێمە لەم کارە ئەوەبوو کە بەپاکو پوختی ڕاستییەکان بخەینەڕوو، لەبەرئەوەی جەنگەکە لەپێناو ئازادی عێراقدا هێشتا بەردەوامە، بۆیە وویستمان کە ئەم کتێبە. بەشێك بێت لەو جەنگە، لەبەرەو سەنگەری سەرۆکدا.

ئەم یاداشتانە دواهەمین نابن، هێشتا زۆرێك شت ماوە کەپێویستە بخرێنەڕوو و پێشکەش بکرێن وەك تۆمارێك لەگرنگترین تۆمارەکانی مێژوو، لەدۆسیەگەلێکدا کە هێشتا بایەخی زۆرێك لە مشتومڕەکانە.

وام دانەنابوو کە قەدەر ئەو شەرەفەم پێدەبەخشێت کە سەرۆك هەڵمبژێرێت بۆ ئەوەی ئەم یاداشتانەو ئەوانی تریش بخاتە ئەستۆمەوە. ئەشمزانی ئەم شەرەفە تا ئەم ڕادەیە سەخت و ستەمکارانە دەبێت. ئێمە ڕووداوو پێشهاتەکانمان کۆدەکردەوەو دەمانزانی پێشبڕکێ لەگەڵ کاتدا دەکەین. سەرۆك بەباشی کۆتایی قەدەری خۆیی دەزانی، بۆیە بەسنگێکەوە کە باوەڕی بەدادپەروەریی هەڵوێستەکەی پڕیکردبوو چاوەڕوانیی دەکرد، هەروەها بەڕاستی هەڵبژاردنەکان و لێهاتوویی بۆ ئەو تەحەدایانەی کە عێراق لەسایەی سەرکردایەتیەکەوە بەقوربانیدان ڕووبەڕوویان بۆتەوە، هەتا ئەگەر ئەو قوربانیدانانەش مانای ژیانی خۆشی بگەیەنێت. زۆرێك لەهاوەڵەکانیشی دەیانزانی، هەتا ئێستاش لەبیریانە کەچەند جار سەرۆك ژیانی خۆی خستۆتە سەر دەستی، زۆرجار سەرکێشی پێوە کردووە لەپێناو ئەوەدا کە لەمێڵێ پێشەوەدا بێت لەڕووبەڕووبونەوەی مردندا. ئەوانیش هەروەها دەیانزانی کە مردن ئەگەرچی خۆیی بۆ مەلاس دابێت، بەلام سەرۆك بەردەوام بوو لەسەر تەحەداکردن و سەرکێشیکردن لەگەڵیدا. ئەو بەوپەڕی باوەڕییەوە بە ئیرادەی خوای گەورە دەیزانی کەمردن ڕاستییە دواجار هەر دەیگاتێ و دەستی پێی دەگات.

ئەگەرچی قەدەر بەلەدەستدانی سنەمی لێکردین، بەلام سەرۆك چاوەڕوانی مردنێك لەمە باشتری نەدەکرد. بەڵکو ئەوە ئەم بوو کە خۆی بەرەو پیری ڕۆیشت. وە ئەم بوو بەوپەڕی

بلّندی ڕۆح و پێداگرییەوە چووە سەر تەختەکەی، هەروەها ئەو بوو کە وێنای مەشخەڵەکانی کێشا بۆ ئەوەی ببێتە چرایەك بۆ ئازادی و شەرەف و ئازایەتی و کەرامەت.

ئایا دەکرێت گوللەیەك کەتیرۆری بکات ئەوە بکات کە ئەو لەسێدارەدانە کردی؟

ئەوان دۆڕاندیان و ئێمە بردمانەوە. ئەوان جەنگێکیان دۆڕاندو ئێمە پاڵەوانێکمان بردەوە. پیلانێکیان دۆڕاندو ئێمەش بەرهەڵستییەکمان بردەوە، ئەوان جنگێك درۆو پڕوپوچیان لەبارەی (دیموکراسیەتەوە) دۆڕاندو ئێمەش ووشەی بەرگریمان لەهەق و ڕاستی بردەوە. دواجار ئەم داگیرکردنەش دەدۆڕێنن، ئێمە ئازادی دەبەینەوە، ئەوکات پیشانیان دەدەین کە دادپەروەریی و یەکسانی چۆن دەبێت، بەهاکانی هەق و ڕاستی نەك بەهاکانی ئەو دوو ڕووییەی کە ئەنجامی دەدەن. نیشانیان دەدەین کە چۆن دەگەڕێینەوە بۆ ئەوەی عێراق بوونیادبنێین وەك ئەوەی لەمەو پێش (١٢)جاری تر کردوومانە، هەر لەداگیرکردنی مەگۆلییەوە هەتا ئەمڕۆ.

ئەمە بەشێکە لەمێژوو، پاشان بەشێکی تر دێت کەئەمڕۆ دروستی دەکات هەموو ئەوانەی کە ئازادی عێراق و سەروەریی و سەربەخۆییەکەی وەك پشکۆیەك لەدڵیاندا هەڵدەگرن، خۆیان دەکەن بەقوربانی لە پێناویدا، هەموو ئەوانەی کە لەخوێنەکانیان ڕۆحی نەمریی .....

وەك هەموو شتێك، ئەوا لێرەشدا هەروەها داگیرکەران مەزەندەکەیان نەیبڕی و ڕاست دەرنەچوو، وەك کەسانی ترسنۆك و دڕندەو دز دەرکەوتن، شەهیدیش بەوپەڕی ئازایەتی و دڵپڕییەوە خۆی پێشکەش کرد. هەموو شتێك دیارو ڕوون بوو وەك ڕوونی خۆر لەبەرچاوی هەمواندا.

هەموو جیهان بینیان صەدام کێیە، هەموو جیهانیش بینیان کێن ئەوانەی کوشتیان. هەموو جیهان بینیان لەسەر کام زەوی ئازادیی ئەم شەهیدەو هاوەڵەکانی دەوەستن، هەموو جیهان بینیان لەچ گاڵتەجاڕیی و داڕوخانێکەوە جەللادو پیاوکوژەکان دێن.

وەك چۆن تیرۆرکردنی صەدام حسێن وەك یادەوەرییەکی نەمر دەمێنێتەوە بۆ هەتاهەتایە، ئەوا چوونە سەر تەختی مردنەکەشی هەروەها وەك تەحەدایەکی ئیلهام بەخش بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە. سەرشۆڕی تاوانە ڕۆژانەییەکانیش کە داگیرکەرو داروودەستەکانی ئەنجامی دەدەن دژ بەخەڵکانی بێتاوان هەتا هەتایە دەمێنێتەوەو بەشوێنیانەوە دەبێت.

صەدام مرد بەڵام ئەو نەمرد. ئەوانیش دەژین وەك ئەوەی کە نەژیابن. ئەمەش تاکە جیاوازییەکە کەبەتەنها خۆی یەکسان دەبێت بەهەموو شتێك.

# پاشکۆکان

## پاشکۆی ژمارە (١) چەند نامەیەك لەصەدام حسێنی بەرهەڵستکارەوە.

## پاشکۆی ژمارە (٢) دەقی ئەو بەڵگەنامەیەی کە یەکێك لەدیلەکانی هاوەڵی سەرۆك صەدام حسێن لەگرتوخانەکانی ئەمریکادا نووسیوویەتی.

### پاشکۆی ژمارە (١)

### چەند نامەیەك لەسەرۆك صەدام حسێنی بەرهەڵستکارەوە

لەڕابردوویەکی نزیکداو لەیەکێك لەدانیشتنی دادگاییە گاڵتەجاڕەکە، سەرۆك صەدام حسێن بەتوندی بە دادوەر ڕزگار محەمەد ئەمینی وت: " لەبیت بێت تۆ عێراقیت". عێراقی.. واتە تۆ خەڵکی ئەو وڵاتەی کە منارە بوو بۆ هەموو شارستانیەتەکانی دواتر، هەروەها پێشەنگ بوو لەهەموو مەعریفە مرۆییەکاندا، بەهەشتی خوا بوو لەسەر زەوی بەسامان و خێرو بەرەکەو سروشتە دڵڕفێنەکەیەوە، پێش هەموو شتێکیش بە مرۆڤە مەزنەکانیەوە، عێراق شارستانیەتێکی بونیادنا کە ڕۆچووەتە ناو مێژووەوە، عێراقی نوێش (خشت بەخشت )بوونیادنراوە وەك سەرۆك صەدام حسێن دووپاتیدەکاتەوە.

سەرۆك صەدام حسێن لەقوڵایی ناخیدا کەسایەتی جەنگاوەرێکی دلێرو ئازای هەڵگرتبوو کەڕۆحی بەمەزنەکانی مێژوو تێربوو بوو. لەبارەی شارستانیەتە جۆراجۆرەکانەوە خوێندوبوویەوە، کاریگەر بوو بەشارستانیەتی عەرەبی ئیسلامیی. هەروەها مێژووو

شۆڕشەکانی گەلانی خوێندبووەوە دژ بەزوڵم و سەرکوتکردن و ستەمکاریی. بەئاگابوو لەبزوتنەوەکانی ڕزگاریخوازیی جیهانی و عەرەبی، مەسەلەی فەلەستین سەرقاڵی کردبوو بەکێشەی سەرەکی و بنچینەیی عەرەبی دادەنا. چیرۆکی زۆری بیستبوو لەبارەی پاڵەوانیەتیەکانی گەلی عێراقەوە، ئەوکات کە هێشتا منداڵ بوو لەکۆڕی گەورە پیاوەکاندا ئامادە دەبوو، کەباسیان لەعوسمانیەکان و پاشان بەریتانیەکان و بەرهەڵستی گەلی عێراق دەکرد لەدژی داگیرکەران. ئەو بەهەستی تیژی خۆی ئەوەی هەست پێدەکرد کە گەلی عێراق بەدەستیەوە دەناڵێنێت لە هەژاریی و برسێتی و نەخۆشی.. کە ئەو خۆی یەکێك بوو لەوانە.. هەموو ئەمانە ئەو کەسایەتیەی سەرۆك صەدام حسێنیان بوونیادنا کە ئێمە دەمانناسی.. لەبەرئەوە هیچ کەسێك بەلایەوە شتێکی کتوپڕ نەبوو کاتێك لەدوای داگیرکردنەوە چووە ناو ڕیزەکانی بەرگرییەوە، ئەو درکی بەوە دەکرد کە پلانگێڕیی لەدژی عێراق هەر لەسەردەمی نەبو خوز نەسرەوە هەتا سەردەمی صەدام حسێن بەردەوامە.. کاتێکیش کەلەدوای داگیرکارییەوە دیارنەما، دووڕووەکان و کلکەکانی دوژمن بەوە تۆمەتباریان کرد کە هەڵهاتووە بۆ دەرەوەی عیراق.. ئەو هەموو فریودانانەی فرێدا کەپێشکەشی کران بۆ ئەوەی عێراق بەجێ بهێڵێت و لەوڵاتێکی (پێشکەتوودا) بژی، بەڵام ئەو پەیوەندیکردنی بەڕیزەکانی بەرگرییەوە هەڵبژارد بۆ ئەوەی لەنزیك خاکی وڵاتەکەیەوە بمێنێتەوەو، لەئامێزی بگرێت، بەچەکەکەی بەرگریی لێ بکات، ڕۆحی هیواو گەشبینی لەنێوان خەباتێکرەکاندا بڵاوبکاتەوە.. سەرۆکەکەیان لەناویاندایە، نەك لەناو ئەو کۆشکانەدا کەهەندێك دەیانووت لەناویدا ژیاوە.. ئەو چۆن ئەوەی بۆ دەبوو کە هەموو تەمەنی بەدوژمنانی دەرەکی و ناوخۆیی دەورە درابوو، لەبۆسەدا بوون بۆ عێراق.. ئەو ماوەی بەرهەڵستی لەناو ڕۆڵەکانی گەلەکەیدا ژیا، جەختی دەکردەوە کەهەرچەندێك بخایەنێت بەڵام هەر عێراق ڕزگاری دەبێت، خیانەتکاری بڵاببووەوەو پلانگێڕان بەوپەڕی ڕق و تۆڵەکردنەوەیانەوە پلانیان گێڕا.. ئەو درکی بەوە کرد کە بەرگریی چەکداریی تاکە ڕێگایەکە بۆ جەنگان لەدژی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و ڕەگەزپەرستی فارسیی، ڕزگارکردنی نەتەوە لەشەڕو خراپەکارییەکانیان.

لەکاتی گواستنەوە سەرۆك لەنێوان خەباتگێڕە پاڵەوانەکاندا لەناوچە جۆراوجۆرەکانی عێراقی خۆشەویست، نامەکانی ئاراستەی گەلی عێراق دەکرد، ڕۆحی هیوای تێدا بڵاودەکردنەوەو بەڵێنی سەرکەوتنی نزیکی پێدەدان.. ئەم نامانەش هەندێك لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنی عەرەبی بڵاویان کردەوە، هەندێکیان دەستنووس و هەندێکیشیان دەنگین،

بەپێی ئەو ڕەوشەی کەسەرۆکی تێدا بووە لەکاتی جموجوڵکرنی لەناو ریزەکانی بەرهەڵستیدا. ئەمەی خوارەوەش چەند کۆپلەیەکن لەو نامانە کەهەڵگری ئاماژەگەلێکی گرنگن.

## نامەی یەکەم

ئەی دۆستان و هاوڕێیان و ئەوانەی لەبەرامبەر چەپۆکی خراپەکاریدا وەستاونەتەوە لەجیهاندا، سلاوتان لێبێت.

وا بۆ خۆتان تێبینیتان کرد کەچۆن بۆشی نەفام سوکایەتیی بەهەڵوێست و ڕاو بۆچونەکانتان کرد کەلەدژی جەنگ ڕاتانگەیاندو بانگەشەی ڕاستگۆیانەتان بۆ ئاشتی کرد، ئەو لەم ڕۆژەدا تاوانێکی خراپ و نابەجێیکرد.

ئێمە بەناوی خۆمان و بەناوی سەرکردایەتی عێراقی و بەناوی گەلی عێراقی خۆڕاگرو سوپا پاڵەوانەکەیەوە لەعێراقی شارستانیەتەکان و مێژوو باوەڕەوە بەڵێنتان پێدەدەین، کە بەپشتیوانی خوا لەدژی داگیرکەران بوەستینەوە تا ئەو ڕادەیەی کە ئارامییان نامێنێت و بێ هیوا دەبن لەوەی کەپلانیان بۆ داڕشتبوو وە لەلایەن زانیۆنیزمی تاوانکارو داخ لەدڵانەوە هاندرابوون و بەرەو کەندەڵانی دۆڕان و شکستیان دەبەین..

## نامەی دووەم

بۆ مامۆستا عیزەت ئەلدوریی لەڕۆژی دووەمی داگیرکردنی بەغداد

**بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

﴿ وإن الله يفعل مايريد﴾

هەڤاڵی جێگیر، سلاوتان لێبێت

وویستم ناوەڕۆکی ئەوەتان بۆ بنێرم کەوەزیری بەرگریی پێیڕاگەیاندم بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کورت و پوخت بۆتانی ڕوونبکەمەوە، نامەکەم بۆ نووسین، بەلام هەڤاڵ عەلی پێیوابوو کەمێك چاوەڕوانبم ڕەنگە وویستبێتی تواناکانی لقی یەك لەناوچەی پێشەوەی بەرەی جەنگەکە بەکاربهێنێت بەهیوای ئەوەی کەپشتی ئەمریکیەکان لەبەغداد بشکێنێت، ئەمڕۆش دوای ئەوەی لەناو بەغداد ئەو هێزانەی کەمابوونەوە بەسەرمکردنەوە بینیم بەهیچ شێوەیەك لەشێوەکان هیوای ئەوە نەماوە چاوەڕوانی بکرێت بەتایبەتی هەلی ئەوەت بۆ فەراهەم بکەم کەپێشوەخت چاوێك بەو برگە سەربازیانەدا بخشێنیتەوە کە تۆ و یاریدەدەرەکانت سەرکردایەتیان دەکەن بەتایبەتی هەڤاڵ سەمیر نەجم.. ئەگەر ئەوەی

بەسەر برگەکانی تردا هاتووە بەسەر ئەوانیشدا نەهاتبن.
بەتوندی دەست لەملت دەکەم و دەستەکانت دەگوشم و بەپشتیوانی خوای گەورەو بەو شێوەیەی کە ئەو خواستی لەسەرە یەکتری دەبینینەوە، ئیدی یان لەبەهەشتی هەتاهەتایی کە خوای گەورە بەڵێنی پێداوە بۆ موجاهیدەکان و باوەڕداران و ئارامگرەکان، یان وەك پرۆژەیەکی هەمیشەیی بۆ شەهیدبوون، وەك موجاهید دەبین و دەگەڕێینەوە بۆ هەلگرتنی ئاڵاکە لەڕەوشێکی نوێدا کەڕەوشی ئەو سەرەتایەیە کە شۆڕشی ١٧-٣٠ ی تەمموزی مەزنی لێکەوتەوە.. دواتر بەپشتیوانی خوای گەورە پەیوەندیمان دەبێت، بەڵام مەسەلەکە لەگەڵ وەرگرتنی ڕێوشوێنی و تەکبیردا پێویستی بەئارامییەکی باش و جوان هەیە، بەپشتیوانی خوای گەورەش ئەوە دەکەین خوا گەورەیە.. مردن و سەرشۆڕی بۆ دوژمنان.. بژی نەتەوە مەزنەکەمان

صەدام حسێن ٢٠٠٣/٤/١٠

## نامەی سێیەم

وەك چۆن هۆلاکۆ هاتە ناو بەغداوە بەهەمان شێوەش بۆشی ڕەزاتاڵیش هاتە ناویەوە، سەرنەکەوتوون بەسەرتاندا، ئەی ئەوانەی کە زەلیلی و داگیرکردن ڕەتدەکەنەوە، ئەی ئەوانەی لەدڵ و عەقڵتاندا عروبەو ئیسلام هەیە، تەنها بەخیانەت نەبێت. سوێندبێت بەخوا ئەوە سەرکەوتن نییە مادام بەرگریی لەدەرونتاندا هەبێت و مابێتەوە.. ئێستاش لەو ڕەوشەدابن کە لەڕاستیدا دەمانووت، ئێمە لەئاشتی و ئارامیدا ناژین مادام قەوارەی جولەکەی ناشیرین و شێواو لەسەر زەوی عەرەبیمانە، لەبەرئەوە هیچ جیابوونەوەیەك نییە لەنێوان یەکێتی خەباتی عەرەبیدا.
ئەی ڕۆڵەکانی گەلە مەزنەکەمان
لەدژی داگیرکەر ڕاپەڕن، متمانە بەوە مەکەن کەقسە لەبارەی سوننەو شیعەوە دەکات، تاکە مەسەلەیەك نیشتیمانە مەزنەکەتان ئێستا هەیەتی داگیرکردنە. هیچ ئەولەویاتێکیش نییە جگە لەدەرکردنی داگیرکەری بێباوەڕو تاوانکارو بکوژی ترسنۆك کە دەستی هیچ کەسێکی شەریف درێژ نەبووەوە بۆ تەوقەکردن و بەخێرهاتنی جگە لەدەستی خیانەتکاران و بەکرێگیراوان نەبێت.

٢٠٠٣/٤/٢٨

## نامەی چوارەم

لەجەنگی فرۆکەخانەدا، خۆبەخشە عەرەبەکان لەگەڵ برا عێراقیەکانیان لەسوپاو گەل ململانێیەکی سەرسەختانەو ئازایانەیان کرد. هەتا زەرەوزیانەکانی تاوانکارە ئەمریکیەکان گەیشتە زیاتر لەدوو هەزار کوژراوو ژمارەیەکی زیاتریش لەبریندار، کەلوپەلێکی زۆری سەربازی ئەگەر ڕێگەیان بەوێنەگرەکان بدایە وێنەی بگرتایە، ئەوا دەبووە وێنەی سوتماکێك کە لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا تووشیان هات. بەڵام خیانەت لەلایەن کەسانێکەوە کە ئاین و نیشتیمان و نەتەوەو ناموسیان فرۆشتووە لەبەرامبەر نرخێکدا کە بەقەبارەی ئەو ئازارو ئێشەی کەبەعێراق و نەتەوەیان گەیاندووە، هەرچەندە ئەو نرخە زۆربێت ئەوا کەم و نزمە. ئێمە بەپیاوانەو شەرەف و سەربەرزیی و کەرامەتەوە جەنگاین و ناشبەزین مادام بڕوابوون بەخوا لەدەروونماندا ماوەتەوەو جیهادکردن هەڵبژاردن و بەرگرییش وەڵاممانە.. وێنای بکەن ئەوانەی ناوی خۆیان ناوە بەرهەڵستیی عێراقی هاتوون پشتیوانی لەداگیرکەر دەکەن بۆ ئەوەی دزیان لێبکەن و وڵاتەکەیان داگیر بکەن و لەنەتەوەکەیان جیابکەنەوەو دان بە دوژمنی زایۆنیدا بنێن. هەموویان وەك یەکن ئەگەر مێزەریان بەسەرەوە بێت یان کڵاوی ئەمریکیی، هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوانیاندا مادام ئەم ئازارو داگیرکارییەیان بەسەر گەلەکەیاندا هێناوە.. بۆیە ئەی ڕۆڵەکانی عێراق داواتان لێدەکەم مزگەوتەکان بکەنە پێگەو ناوەندی بەرهەڵستیی و سەرکەوتن بۆ ئاین و بۆ ئیسلام، بۆ ئەوەی دوژمن هەست بکات کەئێوە بەکردەوەو بەووشە ڕقتان لێی دەبێتەوە و دەیبێزرێنن.

٢٠٠٣/٥/٧

## نامەی پێنجەم

ئەی گەلی مەزنی عەرەبی

من بەڵێنم بەخوای خۆم داوە کەبەشەهیدی بمرم و خۆم نەدەمە دەستی دوژمنی ئەمریکیی و بەریتانی ترسنۆك و بکوژ. ئەگەر گەشتی یەکەم پڕیووبێت لەخیانەتکاری لەلایەن کەسانێکەوە کە ئایینەکەیان و نەتەوەکەیان و نیشتمانەکەیان و ناموسیان فرۆشتووە، ئەوا کۆتاییەکە تەنها باوەڕدارەکان دەینووسنەوە هەروەها ئەوانەش کە داگیرکەرە بکوژو دزەکان دەردەپەڕێنن. من کوڕو کچەڵاوەکان ڕادەسپێرم کەهەستن بەپرۆسەیەك لەدژی دوژمنی ترسنۆك و بکوژ، هەموو ساتەکانی مێژوویی ئیسلامی و عەرەبی پاکو بێگەردم بەیادهاتەوە. ئایندە نمونەی ئەم کەسانە دروستی دەکەن، هەروەك چۆن

رۆڵەکانی گەلی فەلەستینی موجاهیدو مەزنمان دروستی دەکەن.. تۆ ئەی برای عەرەبی رۆشنبیر یان ئەدیبی یان رۆژنامەنوسی یان وێنەگری یان وێنەکێشی پێویستە لەسەرت کەداگیرکەری ترسنۆک و تاوانەکانی ئاشکراو ریسوا بکەیت. رێگەش بەوە مەدەن کەپشتیوانی لەداگیرکەر دەکات و پاساوی بۆ دەهێنێتەوە لەناو ریزەکانتانابن. ئەی ئەوانەی کەوەرزش بوارتانە، رەتی داگیرکەر بکەنەوە، خۆتانیان لێدابڕن و یاری لەگەڵ یانەو تیپەکانیان مەکەن. با ئەم دابڕکارییەش هەموو بوارەکان بگرێتەوە، بۆ ئەوەی دەنگی هەمووتان دژی داگیرکردن بێت.

٢٠٠٣/٥/٩

## نامەی شەشەم

بۆ موجاهیدەکان لەهەموو شوێنێك رۆڵە ئازاکانی عروبە

بۆ ئەندامانی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی

سلاوتان لێبێت

ئێمە دەجەنگین و دوژمنی ئەمریکی و بەریتانی ترسنۆك راودەکەین، داواتان لێدەکەین رۆڵی سیاسیتان چالاك بکەن لەخۆدابڕکردن لەهەموو کەسێك کە هێزەکانی داگیرکەری تاوانبار دادەمەزرێنن لەپۆستە کارگێڕییەکاندا واتە لەبوارە عێراقییە حکومی یان میللیەکاندا.

هەروەك چۆن داواتان لێدەکەم ئەی برایانی موجاهید کە هەموو خیانەتکارێك کە پشتیوانی لەداگیرکەر کردووە یان لەگەڵیاندا هاتووەو بەدرۆ خۆیان ناو ناوە عێراقیی دەریان بکەن. خۆتانیان لێ دابڕن و هەڵگرتنی چەکیش بۆ تێکشکاندنی ئەمریکای تاوانبارو ئەوانەی لەگەڵیدا لێگەڕێن بۆ ئێمە.

برایانی موجاهید هەست بەوە بکەن کە هەموو ئەمریکیی و بەریتانییەك کە دەمێنێتەوە لەزەوی عەرەبدا دەژی ترساو و نیگەران و زەندەق چووە تا لەعێراق نەکشێنەوەو هەڵوێستەکانی خۆیان راست و رێك نەکەنەوە بەرامبەر داگیرکەری زایۆنیی تاوانکار لەدژی فەلەستینی عەرەبی..

## نامەی حەوتەم

ئێمە بەڵێنمان بەخوا داوە کە نەهێڵین هێزەکانی ئەمریکاو بەریتانیای تاوانکار سەروەت و سامانەکانی گەلی عێراق بدزن و نۆشی بکەن، بۆیە رۆڵەکانی گەلەکەمان لەپیاوانی سوپاو

پاسەوانانی کۆماریی و کەتیبەکانی فاروق و کۆمەڵەی ڕزگارکردن و ئەندامانی حزبی بەعس و گرووپەکانی حسێن شەڕێکی ڕاستەقینە دەکەن کە جەنگێکە بەرەو ڕووبەڕووبوونەوە هەرە گەورەکە بۆ دەرکردنی هێزە داگیرکەرە بێباوەڕەکان لەعێراق..

ئەی ڕۆڵەکانی نەتەوەی عەرەبی و ئیسلامی لەهەموو شوێنێك، تێبینی دزێوی تاوانەکانی ئەمریکا بکەن لەعێراق، هەروەها تێبینی تاوانەکانی شارۆنی تاوانکار بکەن، هەردووکیان لەیەککاتدان، مەبەست لێیان ئیسلام و عروبەو نیشتمان و مرۆڤە...

بۆشی تاوانکاری کافرو دزو پیس و ئەوەی لەگەڵیدایە بچوکی بەدڕەوشت بلێر بەخراپترین شێوە پەشیمان دەبنەوە، هەروەها هەموو ئەو حکومەتانەش پەشیمان دەبنەوە کەهێزەکانیان ناردووە بۆ عێراق بۆ ئەوەی داگیرکەر ماوەیەکی درێژتر لەعێراقدا بمێنێتەوە.

مانای چیە داگیرکەر زیاتر لەدوو سەد دیل بکوژێت، زیاتر لە دووسەدو پەنجا مەدەنیش لە ٧٢ کاتژمێردا لەناوبەرێت، هەموو ئەمە مانای چییە ڕزگاریخوازانی عێراق و عەرەب و ئیسلام و جیهان..

٢٠٠٣/٦/١٢

## نامەی هەشتەم

ئەی برایان و ڕۆڵەکان، ژنانی خەباتگێڕو نەبەرد، مژدەتان دەدەمێ کە شانەکانی بەرهەڵستیی و تێکۆشان لەچوارچێوەیەکی فراواندا لەگەڵ ژنان و پیاوانی خەباتگێڕدا پێکهاتوون و خۆیان ڕێکخستووەتەوە، هەروەها دەستیان بەکارە شەریفەکانیان کردووە لەڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن و دوژمناندا، دەبێت ئێوەش لەبارەیانەوە بیستبێتان، ئەگەر نەشتان بیستووە لەبارەی ئەو زیانانەوە کە لەناو ڕیزەکانی داگیرکەرە کافرەکاندا دەکەوێتەوە، ئەوا بەهۆی ڕاستەقینەیی کەوتنەوەی ئەو زیانانەوە ئاسانە کەپێتان بڵێم: لەماوەی ئەم چەند هەفتەیەی کۆتاییدا هیچ ڕۆژێك لەڕۆژەکانی هەفتە تێنەپەڕیوە کە خوێنی کافران و بێباوەڕان لەسەر ئەم خاکە پاکەماندا نەڕژێت ئەویش بەهیمەت و خەباتی موجاهیدەکانمان، ئەوەش کەلەڕۆژانی ئایندەدا بەڕێوەیە بەپشتیوانی خوا زۆر زەحمەت و قورس دەبێت بۆ داگیرکەرە بێباوەڕەکان.

لەبەرئەوە داواتان لێدەکەم موجاهیدە پاڵەوانەکان بپارێزن و بیانشارنەوە، هیچ زانیارییەکیان لەبارەیانەوە مەدەنە داگیرکەرە بێباوەڕەکان، هەروەها لەکاتی ئەنجامدانی چالاکیەکانیاندا لەپێش ئەنجامدان و لەدوای ئەنجامدانیشیەوە هیچ قسەیەك مەکەن و

زانیارییەکی ڕاستەقینە لەبارەی ناوەکانیانەوە مەدرکێنن، چونکە موجاهیدەکان بەوشێوەیەی کە مایەی ڕەزامەندی خواو گەل و نەتەوەو نیشتمانەکەیانە بەکارەکانیان هەڵدەستن و ئەنجامی دەدەن.

٢٠٠٣/٦/١٤ (نامەی دەنگیی)

## نامەی نۆیەم

ئەی براو ڕۆڵەکانم .. هەواڵی مەرگێکی قورس و ناڕەحەتتان پێڕادەگەیەنم کە هیواو ئاواتی هەموو باوەڕدارێکی تێکۆشەرە لەپێناو خوادا کەڕۆحی کۆمەڵێکی تری نوێ لەشەهیدان بۆلای خوای خۆیان بەرز بوونەوە.. باڵندەی سەوز..لەئاسمان و میوانداریی خوای بەخشندەدا لەوێ کەبەهەشتەو ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و ئەوانەی خوا لێیان ڕازیی بووەو ڕەزامەندی کردوون.

هەڵوێستی ئەم کۆمەڵەش وەك هەڵوێستی هەموو شەهیدەکان کە ڕاستگۆیانەو باوەڕدارانە لەپێناو خوادا جیهاد دەکەن، دڵسۆزو ڕاستگۆو سەر ڕاستانە بوو بۆ ئەو بەڵێن و پەیمانەی کەلەبەردەم خوادا بەخۆیان و بەئێوەیان دابوو بۆ خۆبەختکردن لەپێناو خواو نیشتیمان و گەل و نەتەوەدا، هەروەها ڕۆڵەو براکانتان ئەی عێراقییە خۆشەویستەکان، لەدژی داگیرکەر وەستانەوە وەك وەستانەوەی عودەی و قوسەی و موستەفای کوڕی قوسەی وەستانەوەیەکی بڕوادارانە کەخواو پێغەمبەرەکەی پێی ڕەزامەندو دڵخۆش بن لەگۆڕەپانی جیهاد لەدایکی ڕمەکان موسڵی حەدبا، ئەویش دوای جەنگێکی ئازاو دلێرانە لەگەڵ دوژمندا کە بۆ چەند کاتژمێرێکی تەواو بەردەوام بوو، هێزە بڵاوبووەوەکانی دوژمن بەهەموو جۆرەکانی چەك و هێزی زەمینییەوە نەیانتوانی بیان بەزێنن، تەنها ئەوکاتە نەبێت کەفرۆکەیان لەدژیان بەکارهێنا. بەوشێوەیە وەستانەوە لەدژی داگیرکەر وەستانەوەیەك کەخوا ئەم خێزانە حسێنییەی پێ شەرەفدارکردووە ...

٢٠٠٣/٧/٣٥

## نامەی دەیەم

لەڕەوشی کارەساتەکان و جەنگەکاندا، بەرپرسان و دڵسۆزان بۆ گەلەکەیان و نەتەوەکەیان هەوڵدەدەن گرانترین و بەنرخترینی شتەکان دەرباز بکەن، دانانی قوربانیدانەکان و زیانەکانیش بەئاست و قەبارەی هەر کارەسات و ڕەوشێکی سەخت دیاری دەکرێت و دەزانرێت، چونکە ئەوەش کەبەسەر گەلەکەماندا هاتووە لەقوربانیدان و زیانەکان بەهۆی

دوژمنکاریی بیانییەوە گەورەو قورسە بەپێوانەکردن بەو کارەسات و نەهامەتیانەی کەپێشتر بەسەر گەلەکەماندا هاتووە پێشترو لەمێژووی نوێیدا، ئەوا بنەمای ڕزگارکردنی ئەوەی کەدەکرێت ڕزگاربکرێت لەشتە بەنرخ و گرانبەهاکان ئەرکێکە لەئەرکەکانی بەرپرسان لەم گەلە...

دەستەیەك لەخەڵکان لەڕۆژانی جەنگدا تێکچووە کەلەنێوان کوتلەکانی سوپادا لەهەردوولایەکەیەوە وەك ئەوەی لەدوای ئەوەشەوە بەماوەیەك، ئەو تێکچوونی هاوسەنگیەش نەوەستاوەتەوەو ناشوەستێنێتەوە تەنها وەستانەوەی ئەو کەسە نەبێت کە خۆی خەباتکردووە لەپێناو خزمەتکردنی ئەو بنەمایانەدا کە لەداوی ڕەزامەندی خوای گەورەوە دەبێتە مایەی ڕەزامەندی گەل و میللەت.. دەڵێم نەلەئێستاو نەلەداهاتووشدا ئەو ناهاوسەنگ بوونە ناوەستێنرێتەوە کەئاماژەمان پێدا تەنها هەڵوێست و کرداری باوەڕدارە بەوەفاو دڵسۆزو موجاهیدەکان نەبێت ئەوانەی کەوا کاریان کردووەو خەباتیان کردووە لەڕووبەڕووبونەوەی داگیرکەرو دەرکردنی داگیرکەران لەعێراق، بۆ ئەوەی عێراق بگەڕێتەوە بۆ ڕووە باوەڕدارەکەی و بێتەوە سەرخۆی دوای ئەوەی تووشی ئەو بەڵاو نەهامەتییە بوو کەتووشی هات. لەنێوان ئەوەشدا تێکچوون و بەربادی ئەو دەروونانەی کە هەستیان بەداڕوخان و نائومێدی کردووە، چونکە ڕۆڵەی گەل لەپێشترەو زیاتر لەداگیرکەران مافی بەسەر ماڵ و دارایی دەوڵەتەوە هەیە کەداگیرکەران هەوڵدەدەن لەناوی بەرن یان دەستی بەسەردا بگرن و بۆ مەبەستە گڵاوو پیسەکانی خۆیانی بەکاربهێنن لەناویشدا بەکارهێنان و فەراهەمکردنی بۆ شوێنکەوتە خیانەتکارەکان کەهاوشان و لەگەڵ تانکەکانیاندا وەستان، کە زەلیل و سەرشۆڕبوون لەبەردەم نیشتمان و باوەڕو ڕۆڵە هاوخوێن و هاونیشتیمانیەکانی خۆیاندا...

٢٠٠٣/٧/١٧

(بەیاننامەیەك بۆ گەلی عێراقی بەوەفاو مەزن)

## نامەی یانزەیەم

(قسە لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکادا دەکات)

بەناوی گەلی عێراقی مەزنەوە دەڵێم تۆ درۆت لەگەڵ خۆت و گەلەکەت و هەموو خەڵکدا کرد، تۆو ئەوەی کە لەگەڵ خۆتدا تێوەتگلاندوون، یان کەسانێك کە هەن و درۆیان لەگەڵت کرد. وەك چۆن زایۆنیزم تۆ و سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکای تێوەگلاند

لەدوژمنایەتیکردنی هەردوو میللەتی ئیسلام و نەتەوەی عەرەبی و سوکایەتیکردن بەجیهان، تێوەگلاندنت لە دوژمنایەتیکردنی عێراق و هێرشکردنە سەر...

لەبەرامبەر تەنگەلأنبوون و ڕێژەی ئەو زیانانەی کە بەسوپاکەت دەگات کەوا ناتوانایی بوونی بەڕوونی دیارە، چونکە خاوەن مەسەلەیەکی شەریفانەنییە لەڕووبەڕووبوونەوەی گەلی شارستانیەتەکاندا، ئەوا هەڵوێستەکە بۆ بەرگریکردن لەهەموو ئەوەی شەریف و شەریفانەیە واتان لێدەکات بەشێوەیەکی فەرمیی و ئاشکرا شکستی خۆتان ڕابگەیەنن و کشانەوەی حەتمیتان لەوڵاتەکەمان ڕابگەیەنن.

٢٠٠٣/٩/١٧ (نامەی دەنگیی)

## نامەی دوانزەیەم ( دوایین نامە پێش دیلکردن )

ئەوان دەڵێن و هەموو دەنگەکانیش لەجیهاندا بەدەنگی بەرز دەڵێن ئەوە دەڵێنەوە کە ئێمە پێش هێرشکردن و دوژمنکارییەکە ووتمان کەعێراق هیچ جۆرە چەکێکی تێدا نیە لەوەی کە ئەوان دەیڵێن، عێراقیش بەپشتیوانی خوا یاخی دەبێت لەهەموو نیازە خراپەکانیان لەداگیرکردن و سەقامگیرکردنی هێزەکانیان قەڵەمڕەویان تێیدا.. بۆیە درۆزنەکانی ئەمریکاو بەریتانیا بەنۆرە دەستیان کردووە بەگەڕان بەجیهاندا بۆ پەیداکردنی پارەو هێنانی سەربازی ئەو وڵاتانەو بەدەستهێنانی هەڵوێست و پشتگیریی وڵاتان.. ئەو بەکرێگیراوانەی کەئەمانەیان هێنا کەمترین کێش و قورساییان نییەو کار ناکەنە سەر گەلی عێراقی مەزنی ڕاستگۆو بەوەفا، بەڵکو هیچ کەسێك لەوانە تەنانەت ناتوانێت بەناو شەقامەکانی بەغداد یان هەر شارێکی تری عێراقیدا بڕوات، هەر بۆیە هەستیان بەبێ ئومێدی کردووەو نوێنەرەکانیان ڕەوانەی وڵاتانی عەرەبی کردووە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن کەپێی دەوترێت (ئامۆژگاریی وەرگرتن)لەبارەی عێراقەوە. بەوان و غەیری ئەوانیش دەڵێین: سەرەڕای ئەوەی عێراق بەشێکە لەنەتەوەکەی هەرکاتێك ڕەوشەکە بۆی لەبارو گونجاو بوو ڕۆڵی پێشڕەوی دەبینێت یان دەبێتە بەشێك لەپێشڕەویی تێیدا، ئەوا عێراق ئەگەر گوزارشتەکە شیاو بێت پێکهاتەیەکی کیمیایی تایبەتی هەیە کەهێما نهێنییەکانی تەنها بەکەسانێك دەکرێنەوە کە لەڕۆڵەکانی خۆی بێت یان لەو باوەڕدارە پیاوچاکانە بێت لەڕۆڵەکانی نەتەوەکەی ئەگەر هاوکارییان کردوو بەبێگەردی و نەزاکەتەوە ڕاوێژیان لەگەڵ عێراقییە دڵسۆزو سەر ڕاستەکاندا کرد..

**ناوەڕاستی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ( تشرینی دووەم ٢٠٠٣ )**



**وێنەیەك لەنامەی سەرۆك صەدام حوسێن بۆ هاوەڵی ڕێگەو خەباتی مامۆستا عیزەت ئیبراهیم ئەلدوریی لە ١٠/٤/٢٠٠٣دا.**



سەرۆك ماوەیەكی كەم لە دەستگیركردنی

## ئەوەی کە ڕوویدا....



# ساتەکانی دادگاییکردنی وێنەی ئەو یاداشتەی کە یەکێك لەدیلەکانی هاوڕێی سەرۆك لەگرتوخانەکانی ئەمریکادا نووسیوویەتی

صدام حسين
في ميزان التاريخ

بقلم: أسير من رفاقه
صدام حسين

"بسم الله الرحمن الرحيم"
ما القارعة
"القارعة ۝ وما ادراك ما القارعة ۝
يوم يكون الناس كالفراش المبثوث ۝
وتكون الجبال كالعهن المنفوش ۝
فأما من ثقلت موازينه ۝ فهو في عيشة
راضية ۝ وأما من خفت موازينه ۝
فأمه هاوية ۝ وما ادراك ماهية ۝
نار حامية ۝
سورة القارعة

الصفحة الأولى من الوثيقة

